بروانە/ تەجريد/١/٥٣، ژمارە: ٣٢/٣٤ + رياضی كوردی/٢/٢٠٧، ژمارە: ٦٩٠ = ش = شەيخان = بوخاریو موسليم).

**روونكردنەوە:**

بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم جۆرە فەرموودەیە كە بۆنی ئەوەی لێ دێ، موسوڵمان بەهەندێ تاوان لە جەغزی باوەڕ دەردەچێو دەچێتە خانەی ناپاكو مونافقو بێباوەڕەوە، بفەرموو بڕوانە روونكردنەوەی زانایان كە لە ریاضی كوردی/٢ لە لاپەڕە/ ٢٠٨دا تۆمار كراوە، كە مەبەست پێی ئەمەیە: (موسوڵمان بە تاوان لە خانەی ئیمان دەرناچێ، مەبەست لەم جۆرە فەرموودانە زۆر شتە، وەك هەڕەشەو سڵ كردنو كۆكردن لە گوناهو تاوانو دووركەوتنەوە لەم جۆرە شتانەو خۆ نزیك كردنەوە لە دژە كانیانو دڵو هەست لاواندنو هەژاندنو راهێنانیان لەسەر خووی جوانو تەكاندنەومیان لە خووی بەدو بەرە بەرە مرۆڤ خۆی لە كۆڕی پیاو چاكان نزیك بكاتەوە!).

عەبدوڵڵای كوڕی عەمری كوڕی عاص یەكێكە لە هاوڕێ ناودارەكانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لە هەموو هاوڕێ بەرزەكانی) دوازدە ساڵ لە باوكی خۆی منالتر بووە، زانایەكی پایە بەرز بووە، زۆر زاناو بلیمەت بووە، زۆر بەدین بووە، حەوت سەد فەرموودەی هەیە، كە لە كتێبە بایەخدارەكانی فەرموودەدا تۆمار كراون، لە بوخاریدا (٢٥) فەرموودەی هەیە. لە موسلیمدا (٣٧) فەرموودەی هەیە، حەڤدەیان پەسەندی هەردوو لایە، واتە: (متفقٌ علیه)ین، كۆی فەرموودەكانی لە صەحیحەیندا، واتە: لە بوخاریو موسلیمدا یەكسانە بە {١٧ + ٨+ ٢٠ = ٤٥ = ١٧ پەسەندی هەردوولا (٨) لە

ئـــەفرادی بوخـــاری (٢٠) لـــە ئـــەفرادی موســـلیم، دەکاتـــە (٤٥) فـــەرمووده لـــە صەحیحەیندا}.

عەبدوڵڵا رۆژنا رۆژێ بەرۆژوو بوو، وە شەو نوێژێـکی زۆری دەکـرد هـەتا مرد، (بڕوانە: تەجرید: ژمارە: ٥٦٤ + بەرگی/٢، لاپەڕە: ٢٩٣، ژمارە: ٩١٢).

لە مانگی قوربانی ساڵی شەستو پێنجی کۆچیدا، لە مەککە، یا لـە تـائیف، یا لە میسر، لە تەمەنی حـەفتاو دوو سـاڵیدا کۆچی دوایـی کـردووە: (تـاج/٢٢/١، زنجیرە: ٢، ژمارە: ٦ + تاج/١٤٠/٥، زنجیرە: ٣١ = تاج-٣ ژ-٣٤١٦-٣٤١٩ چ-٤).

٣٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيِ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) قَالَ: «آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلَاثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ».[٣٨]

لە ئەبو هورەیرەوە (رەزای خودای لێ بـێ) لـە خۆشەویستەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نیشانەی مرۆڤی ناپاك (منـافق) سـێ شـتە: کـە قسەی کـرد بـە قەسـتی درۆ بکـا، کـە بەڵێنێـکی دابەکەسـێ بەڵێنەکـەی بـەجێ نەهێنێ، ئەگەر سپاردەیەکیان پێ سپارد، گزی تیا بکـاو ناپـاکی لـە سـپاردە بکـا) (تەجرید/٥٣/١، ژمارە: ٣٣/٣١).

---

[٣٨] مختـصر صـحیح مـسلم/١، ژمـارە: ٢٧ = شـیحا: ٢٠٨، تەجریـد/١، ژمـارە: ٣١ = بخـاری: ٣٣، ٢٦٨٢، ٢٧٤٩، ٦٠٩٥.

### (٢٦) بابُ: بَيَانِ حَالِ إيمَانِ مَنْ قَالَ لأخِيهِ المسلم: يَاكَافِرُ!

### ...سی کەسێ بەبرای ئایینی خۆی بڵێ: ئەی ناموسوڵمان! حاڵی باوەڕی خۆی چی لێ دێ؟

٣٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ – رضى الله عنهما – أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ – صلى الله ...ـه وسلم – قَالَ « أَيُّمَا رَجُلٍ قَالَ لأَخِيهِ يَا كَافِرُ . فَقَدْ بَاءَ بِهَا أَحَدُهُمَا ».(٣٩)

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ)فەرمووی: خۆشەویست ...ـڕوی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ بە موسوڵمانێ، پیاو بێ، یا ...ـ پێی بڵێ: ئەی ناموسوڵمان! یا پێی بڵێ: ئەی دوژمنی خودا! وە لەڕاستیدا ...ـت ئەو دەڵێ وانەبێ، ئەوە جنێوەکە دەگەڕێتەوە بۆ خۆی).

### (٢٧) باب: بيان حالِ إيمانِ مَنْ رَغِبَ عَنْ أبِيهِ وَهُوَ يَعْلَمُ

### کەسێ بەئارەزوو حاشا لەباوکی خۆی بکاو خۆی بکا بەمناڵی کەسێکی تر، حاڵی باوەڕو ئیمانی چۆنە؟

٤٠- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ ...سَلَّمَ) يَقُولُ: «لَيْسَ مِنْ رَجُلٍ ادَّعَى لِغَيْرِ أَبِيهِ وَهُوَ يَعْلَمُهُ إِلاَّ كَفَرَ، وَمَنِ ادَّعَى مَا لَيْسَ ...ـه فَلَيْسَ مِنَّا، وَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ، وَمَنْ دَعَا رَجُلاً بِالْكُفْرِ أَوْ قَالَ: عَدُوَّ اللَّهِ، وَلَيْسَ ...ـذَلِكَ. إِلاَّ حَارَ عَلَيْهِ». (٤٠)

ئەبو زەڕ (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گوێم لێ بوو، خۆشەویست ...ـرودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (هەر پیاوێ خۆی بکا بە کوڕی

---

...ـ مسلم.شيحا: ٢١٣، ٢١٤ = مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٥٠، تەجریدی بوخاری/٥/، ژمارە: ...ـ = بخاری/٦٠٤٥، ١٣٩٥، ٣٥٠٨ + ریاض/٤، ژمارە: ١٧٣٢ + ژمارە: ١٥٥٤.

...ـتەجریدی بوخاری/٤، ژمارە: ١٣٩٥ = بخاری: ٣٥٠٨، ٦٠٤٥. مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ...ـ = مسلم. شيحا/٢١٤.

غەیری باوکی خۆی، وە سوور بزانێ کە ئەوە باوکی ئەو نییە، ئەوە سپڵەو ناسوپاس‌و پێ نەزانە، دەرحەق بە پەروەردگاری‌و دەرهەق بە باوکی، وە هەرکەسێ شتێ بە ناڕەوا بکات بەهی خۆی کە هی ئەو نەبێت، ئەوە لە ئێمە نییە، وەبا جێگەی خۆی لەناو ئاگری دۆزەخدا خۆش بکات، وە هەرکەسێ بە موسوڵمانێ بڵێ ئەی ناموسوڵمان، یا پێی بڵێ: ئەی دوژمنی خودا!، وە وەك ئەو دەڵێ وانەبێ، ئەوە جنێوەکە دەگەڕێتەوە بۆ خۆی).

ئەبو زەڕی غەففاری یەکێکە لەناودارانی هاوڕێیانی پێغەمبەر، لە خۆی دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: من چوارەمین کەس بووم کە ئیسلام بووم، لەبەر زوهدو بێ هەوایی، لە حەدیثدا دەی شوبهێنن بە حەزرەتی عیسا (دروودی خودای لەسەر بێ) لە دوا جەنگی خەندەق لە مەدینە لە خزمەت حەزرەتدا مایەوە، هەتا حەزرەت وەفاتی کرد، بەپێی ڕێبازو بۆچوونی ئەبو زەڕ: (ناڕەوایە بۆ مرۆڤ پتر لە پێداویستی خۆی ماڵ‌و سامان پاشەکەوت بکاو کەڵەکەی بکا). بۆیە لەم سەردەمەدا پێی دەڵێن: (أبو الإشتراكيةِ في الإسْلاَمِ).

لە ئیسلامدا ماڵ بەهرەیەکە لە بەهرە گەورەکانی خودا، ماڵی ڕەحمەت هەتا زۆربێ کەمەو دەسمایەی دین‌و دونیایە، هەتا هەوڵی زیاتری بۆ بدەی جێگەی خۆیەتی، بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا، دەوڵەتی ئیسلام مافی هەیە سیستەمی ماڵداریی‌و بواری ئابووری چاودێری بکا، لەکاتی پێویستدا جڵەوی چڵێسی سەرمایەداری بگرێ. ئەبو زەڕ دوو سەدو هەشتاو یەك فەرموودەی هەیە، وە لە بوخاریدا چوارده فەرموودەی هەیە، لە موسلیمدا بیست‌و نۆ فەرموودەی هەیە، دوازدەیان پەسەندی هەردوو پیری بوخاری‌و موسلیمە، لە ڕەبەزە لە ساڵی (٣٢)ی کۆچی ئەمری هەقی بەجێ هێنا، ئیبنو مەسعوود نوێژی تەرمی لەسەر کرد. (بڕوانە: تاج/٢٠٤/٥، زنجیرە: ٥٩، ژمارە: ١ = ژ-٣٥٠٧ تاج-٣+

تەجرید/٩٢/٤، ژمارە: ١٤٠٣ — داستانی موسوڵمان بوونی ئەبو زەڕ + مسلم/ ١٥ — ١٦ ص-٢٤٥، رقم/٦٣٠٩، ط/١٢ — ٢٠٠٦ — دار المعرفة. بيروت-لبنان).

٤١- عن أبي هريرة (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) عن النبي (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قال: لا ترغبوا عن آبائكم، فمن رغب عن أبيه فهو كفرٌ.[٤١]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (حاشا لەباو باپیری خۆتان مەکەن، هەرکەسێ ئەتی وا نابەجا بکا، ئەوە سپڵەو پێنەزان‌و نامەردە!).

٤٢- عَنْ أَبِي عُثْمَانَ قَالَ: لَمَّا ادُّعِيَ زِيَادٌ لَقِيتُ أَبَا بَكْرَةَ، فَقُلْتُ لَهُ: مَا هَذَا الَّذِي صَنَعْتُمْ؟ إِنِّي سَمِعْتُ سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ يَقُولُ: سَمِعَ أُذُنَايَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ يَقُولُ: « مَنِ ادَّعَى أَبًا فِي الإِسْلاَمِ غَيْرَ أَبِيهِ يَعْلَمُ أَنَّهُ غَيْرُ أَبِيهِ فَالْجَنَّةُ عَلَيْهِ حَرَامٌ». وَقَالَ أَبُو بَكْرَةَ: أَنَا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).[٤٢]

ئەمە دەقی عەرەبی ژمارە (٤٩)ی مختصری صحیحی موسلیمە.

ئەبو عوسمانی نهدی فەرمووی: کاتێ موعاوییە زیادی کوڕی ئەبیهی کرد بە برای خۆی‌و، هەڵیگێڕایەوە لە عەلی کوڕی ئەبوتالیب، کاتێ بە ئەبوبەکرەی نەفیك برای گەیشتم، گلەییم لێ کردو پێم گوت: ئەمە چیبوو کردتان؟ من لەم گوێیەوە بە گوێی خۆم لە سەعدی کوڕی ئەبو وەقاسم بیست دەیفەرموو: بە گوێی خۆم لە زاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیست، دەیفەرموو: (هەر کەسێ

---

[٤١] مسلم ترقیم شیحا: ٢١٥. بخاری. فرائض: ٦٣٨٦. تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ٢٠٦٤ = بخاری: ٦٧٦٨.

[٤٢] مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٤٩ - مسلم.شیحا: ٢١٦، ٢١٧. تەجرید/٥، ژمارە: ٢٠٦٣ = بخاری/٦٧٦٦ + تجرید/٤، ژمارە: ١٥٩٣ = بخاری/٤٣٢٧.

لەسەردەمی ئیسلامەتیدا، خۆی بکا بە کوڕی غەیری باوکی خۆی، وە سوور بشزانێ کە کوڕی ئەم باوکە درۆینەیەی نییەو کوڕی کەسێکی ترە، ئەوە بەهەشتی لێ قەدەغەیە). ئەبوبەکرە فەرمووی: (گوناهی منی تێدا نییە، من بەشداریم لەمەدا نەکردووە، منیش ئەم فەرموودەیەم بە گوێی خۆم لە زاری پیرۆزی پێغەمبەر بیستووە). (بڕوانە: تەجرید/ ٩٣٥، ١٣٩٥، ١٥٩٣، ٢٠٦٣).

**ڕوونکردنەوە:**

ڕەحمەت لەوکەسە گوتوویەتی:

**ئەوەی نینکاری ئەصڵی خۆیی کرد**

**بە زۆڵی ژیاو، بەنامەردی مرد!**

**ڕوونکردنەوە:**

ئەبوبەکرە لە هاوڕێ هەرە مەزنەکانی پێغەمبەرە، بەردەوام سەر گەرمی خوا پەرستی جوان بوو، هەتا کۆتایی ژیانی. برای دایکی زیادی کوڕی باوکی بوو، سەدو سییو دوو فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، هەشتیان پەسەندی هەردوولایە، پێنج فەرموودەی لە ئەفرادی بوخارییە، یەك فەرموودەی لە ئەفرادی موسلیمە، کۆی فەرموودەکانی لە بوخاریدا (١٣) فەرموودەن، کۆی فەرموودەکانی لە موسلیمدا (٩) فەرموودەن، یەکێ لە فەقێکانی کە فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، حەسەنی بەصری بوو، یەکێ تریان ئەحنەف بوو، کۆمەڵەکە فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، منداڵو وەچەکانی هەموو خانە دانو داناو زانا بوون، لە ناودارانی شاری بەصرە بوون، ساڵی پەنجاو دووی کۆچی لە بەصرە، کۆچی دوایی کرد، لەسەر ڕاسپێری خۆی

ـەبو بـەرزەی ئەسلەمی، نوێـژی تـەرمی لەسـەر کـرد. (بڕوانـە: تەجریـد/٣١٩/٥، ژمارە: ٢٠٦٣). (بڕوانە: ژمارە: ٤٩ مخ = مختصر صحيح مسلم).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیە پێویستی بـە ڕوونکردنـەوەیـەکی تایبەتـە، پیـاوێ هـەبوو ـوی زیادی کوڕی باوکی بوو، یەکێ بـوو لـە سـەرکردەکانی ئیمـامی عـەلی، دایـك ـڕای ئەبو بەکرە بـوو، دایکـی کـەنیزەك بـوو، ئەبوسـوفیان لەسـەردەمی ئیمـامی عومەردا، گوتی: مـن دەزانم ئـەم زیادەکـێ سـکی دایکـی پـێی پڕکـردووە، ئەگـەر ـەموێ ناوی ئەوکەسە دەبەم، بـەڵام لەعومـەر دەترسـم. مەبەسـتی ئەبوسـوفیان ـەوەبوو، کـە زۆڵـە و لەخۆیـەتی، لـەوپیاوە نییـە کـە مێـردی دایکـی زیـادبووە، جاـەکاتی شەڕو هەراکانی نێوانی ئیمامی عەلیو معاویـەی کوڕی ئەبوسـوفیاندا، ـیاد سەرکردەیەکی ئازای بەناو بانگ بوو، عەلی کردبووی بەسەرکاری سەروڵاتی فـارس، موعاوییـە پەیوەنـدی پێیـەوە کـرد، وە هەڵیگێڕایـەوە لەعـەلی، وەکـردی ـەبرای خۆیو ناوی نا زیادی کوڕی ئەبو سوفیانو کـردی بـە فـەرمانڕەوای سـەر ـەصـرە، ئـەوجا کـردی بـەهی کووفـە و ڕێزێکـی زۆری گـرت، زیـاد پیـاوێکی زۆر ـەوانبێـژ بـوو. جـا بـەم بۆنەیـەوە ئـەبو عوسمـانی نهـدی ئـەم فەرموودەیـەی ـێغەمەری لەسەعدی کوڕی ئەبو وەقاصەوە گێڕایەوە بۆ ئەبو بەکرە و گلەیی لێ کرـو فەرمووی: ئەمە چی بوو کردتان؟ ئەبوبـەکرەش فـەرمووی: گونـاهی منـی ـێـدانییە، منـیش ئـەم فەرموودەیـەم بـەگوێێ خـۆم لـەزاری پـیرۆزی پێغەمـەر - ـروودی خوای لەسەر بێ- ژنەوتووە و بەدڵ تێی گەیـشتووم. (بـۆ ڕوونکردنـەوە ـڕ: ژمارە/٩٣٥ تەجرید = ب/٣ ل/١٠).

## (٢٨) بابُ: بَيَانِ قَوْلِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ وَقِتَالُهُ كُفْرٌ

## شەڕەجنێو لەگەڵ موسوڵمانا، فیسقو لەڕێگەی هەق دەرچوونە، شەڕ تێبەستنیشی کوفرە!

٤٣- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بنْ مسعود (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ: (سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ وَقِتَالُهُ كُفْرٌ).[٤٣]

لەعەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (شەڕە جنێو کردن لەگەڵ موسوڵمان دا فوسوقو لەڕێگەی هەق دەرچوونەو، شەڕتێبەستنیشی کوفرە!).

### ڕاڤەو شیکردنەوە:

١- مەبەست لەم فەرموودەیە: هەڕەشە کردنە لەکەسێ کەبەناڕەوا بەدەست یابەزبان ئازاری موسوڵمان بدا، چونکە شتی وا لەموسوڵمان ناوەشێتەوە، بەڵکوو پیشەی پیاوی خراپی لەڕێ دەرچووە، ڕەفتاری مرۆی بێ بڕوایە. (ریاض-٤ ل-١١٥٩ ف-١ ز-٢٢٦ ژ-١٥٥٩).

٢- عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) ناسراوە بە ئیبنو مەسعوود، یەکێکە لە گەورە هاوەڵانی پێغەمبەری ئازیزو خۆشەویست، لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکانە، دوو کۆچی کردووە، کۆچێ بۆ حەبەشەو کۆچێ بۆ مەدینەی نازدار، ئامادەی غەزای بەدرو شەڕگاکانی تری پاشی بووە، هەمیشە لە خزمەت پێغەمبەردا بوو، مەگەر چۆنها خزمەتی ئەوی چۆڵ بکردایە، خزمەتی پێڵاوەکانی پێغەمبەری دەکرد، لەکاتی هەستانا پێڵاوەکانی بۆی دادەنا،

---

[٤٣] مختصر صحيح البخاری/١، ژمارە: ٤٥ = بخاری: ٤٨، ٦٠٤٤، ٧٠٧٦. مسلم. شیحا: ٦٤-٢١٨.
مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٦٦ - مسلم/شیحا: ٢١٨.

وەك ترسۆلەكانی دەكردە قۆڵی خۆی، هەشت سەدو چلو هەشت فەرموودەی پێغەمبەری گێڕاوەتەوە، چلو چواریان پەسەندی هەردوو پیرن، واتە: شێخی بوخاریو شێخی موسلیم، كە لە زانستی فەرموودەدا ناسراون بە شەیخەین، ئەو چلو چوارەیان گێڕاوەتەوە، بیستو یەك فەرموودەی تری بێجگە لەو چلو چوارە لە بوخاریدا هەیە، لە موسلیمدا نین، سیو پێنج فەرموودەی تریشی بێجگە لەو چلو چوارە لە صەحیحی موسلیما هەیە، كەواتە: ٤٤ + ٢١ = ٦٥ كۆی فەرموودەكانی ئیبنو مەسعوود لە بوخاریدا، ٤٤ + ٣٥ = ٧٩ كۆی فەرموودەكانی ئیبنو مەسعوود لە صەحیحی موسلیمدا، ٦٥ + ٧٩ = ١٤٤ كۆی فەرموودەكانی ئیبنو مەسعوود لە صەحیحەینا، ٤٤ + ٢١ + ٣٥ = ١٠٠ لە صەحیحەینا بەبێ دووبارە.

دەفەرموێ: لە زاری پیرۆزی پێغەمبەری ئازیزو خۆشەویست خۆی، (درودو سڵاوی خودای لەسەر بێ)، حەفتا سوورەتی قورئانم لەبەركردووە، ئیبنو مەسعوود یەكەم كەس بوو كە لە مەككە بە ئاشكرا قورئانی دەخوێند، ھەمیشە بەردەوام لەگەڵ ماڵی پێغەمبەردا تێكەڵ بوو، لە خەڵكی وابوو كە یەكێكە لە خێزانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ناودار بوو بە صاحیبی سیواكی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) مۆژدەی بەهەشتی پێ داوە، بكوژی ئەبو جەهل بوو (بڕوانە: بەرگی/٤ تجرید/٢٥١، ژمارە: ٣٩٦٢/١٥٢٦) رووەو قیبلە تەین نوێژی كردووە، مامۆستایەكی قورئان زانو فەرموودەزان بوو، قوتابیو فەقێی زۆری هەیە لەم دوو بوارەدا، پێغەمبەر دەیفەرموو: (دوو لاقە لەڕەكانی ئیبنو مەسعوود لە قیامەتا، لە تەرازووی كێشانی خێرو شەڕدا، لە كێوی ئوحود قورسترن) لە ساڵی سیو دووی كۆچی لە شاری مەدینە، لە تەمەنی شەستو

هەنـد دا، بـە مردنـی خـودا مـردووەو کۆچـی دوایـی کـردووە، ئیمامی عوسمـان نوێژی تەرمی لەسـەر کـرد، لـە گۆڕسـتانی بـەقیع، بـەخاك سپێرراوە. بـۆ زیـاتر شارەزابوون لە ژینامەی ئەم هاوڕێ مەزنەی پێغەمبەر، بڕوانە: تـاج/ ٥، لاپـەڕە: ١٢٣، زنجیرە: ٢٨ = تاج-٣ ژ-٣٤٠١ هـەتا ٣٤١٠ چ-٤ باسـی گـەورەیی عەبـدوڵلای کـوڕی مەسعوود.

## (٢٩) باب: لا ترجعوا بعدی کفارا یضرب بعضکم رقاب بعض

## مەبنەوە بە کافرو ناموسوڵمانو بێباوەڕ، کەوەك جارانی سەردەمانی نەفامی پێشهاتنی ئیسلام لەگەردنی یەکتری بدەن

٤٤- عَنْ جَرِيرِ بنَ عَبْدَاللهِ (رَضي اللهُ عَنْهُ): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَهُ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ اسْتَنْصِتْ النَّاسَ فَقَالَ لَا تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا يَضرِبُ بَعْضكُمْ رِقَابَ بَعْض). (٤٤)

جـەریری کـوڕی عەبـدوڵلا (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: لەحـەجی ماڵئـاوایی دا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) پێـی فـەرمووم: (ئـادەی مەردومەکەم بۆ بێدەنگ بکە تاقسەیان بـۆ بکـەم) منـیش فەرمانەکـەیم بـەجێ هێنـا، ئـەویش وتـارێکی بـۆ دانو تیـا فـەرمووی: (نەکـەن لـەپاش خـۆم پاشـگەز ببنـەوەو وەکـی کۆمـەڵی کـافرانو میللـەتی خۆخـۆر بەرببنـە سـەرو گـوێلاکی یەکتریو لەسەر پڕوپاتاڵی جیهان لەگەردنی یەکتری بدەن).

٤٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عنهما) عَـنِ النَّبِـيِّ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ قَالَ فِي حَجَّةِ الْـوَدَاعِ: « وَيْحَكُـمْ - أَوْ قَـالَ وَيْلَـكُمْ، لاَ تَرْجِعُـوا بَعْـدِي

---

(٤٤) مختصر صحیح البخاری/١، ژمارە: ١٠٠ = بخاری: ١٢١، ٤٤٠٥. مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٤٨ = شیحا - مسلم تخریج شێخ خلیل مأمون شیحا: ٢٢٠.

كُفَّارًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ». (٤٥)

**عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودا لە خۆی و باوکی) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) لە حەجی ماڵاواییدا، فەرمووی: (هاوار لە ئێوە) یا فەرمووی: (خانە خراپینە! نەکەن لەپاش خۆم پاشگەز بینەوەو وەکی کۆمەڵی کافران و میللەتی خۆخۆر بەر ببنەوە سەرو گوێلاکی یەکتری و لەسەر پڕو پاتاڵی جیهان لەگەردنی یەکتری بدەن!).**

## (٣٢) باب: بيانِ كفرِ مَنْ قَالَ: مُطِرْنَا بالنَّوْءِ
## کەسێ بڵێ: بەهۆی بورجەوە، بارانمان بۆ باری

٤٦- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّى لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، صَلَاةَ الصُّبْحِ بِالْحُدَيْبِيَةِ فِي إِثْرِ سَمَاءٍ كَانَتْ مِنَ اللَّيْلِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ، أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ، فَقَالَ: « هَلْ تَدْرُونَ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟». قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: « أَصْبَحَ مِنْ عِبَادِي مُؤْمِنٌ بِي وَكَافِرٌ، فَأَمَّا مَنْ قَالَ مُطِرْنَا بِفَضْلِ اللَّهِ وَرَحْمَتِهِ، فَذَلِكَ مُؤْمِنٌ بِي، كَافِرٌ بِالْكَوْكَبِ، وَأَمَّا مَنْ قَالَ مُطِرْنَا بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا، فَذَلِكَ كَافِرٌ بِي وَمُؤْمِنٌ بِالْكَوْكَبِ». (٤٦)

**زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی، (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە حودەیبیە بووین، شەو باران باریبوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەر نوێژیی نوێژی بەیانی بۆ کردین، کە سڵاوی دایەوە رووی کردە خەڵکەکەو**

---

(٤٥) **مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٤٨ - شیحا: ٢٢٠. تەجرید/١، ژمارە: ١٠٠ = بخاری: ١٢١، ٤٤٠٥، ٦٨٦٩، ٧٠٨٠.**

(٤٦) **مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٥٦ = شیحا: ٢٢٨. تەجرید/١، ژمارە: ٤٥٦ - بخاری: ٨٤٦، ١٠٣٨، ٤١٤٧، ٧٥٠٣.**

فەرمووی: (ئایا دەزانن کە پەروەردگارتان، بەبۆنەی بارینی ئەم بارانەوە چی دەفەرموێ؟ گوتیان: خوداو پێغەمبەری خودا خۆیان باش دەزانن، فەرمووی: دەفەرموێ: ئەم بەیانیە بەهۆی بارینی ئەم بارانەوە، بەندەکانم بوون بە دوو تاقم، تاقمێکیان باوەڕیان بەمن هەبوو، وە تاقمێکیان باوەڕیان بەمن نەبوو، ئەوەی بڵێ لە سایەی خوداو رەحمەتی خوداوە، ئەم بارانەمان بۆ باری، ئەوە باوەڕی تەواوی بەمن هەیەو، باوەڕی بە بورجو ئەستێرەو شتی تری وا نییە، بەڵام ئەو کەسەی بڵێ: لە فیسارە بورجا بارانمان بۆ باریوە، ئەوە باوەڕی بەمن نییەو، بەڵکوو باوەڕی بە کاریگەریی بورجو ئەستێران هەیە، لە بارینیدا).
{تەجرید/١، لاپەڕە: ٤٣٢، ژمارە: ٤٥٦. ریاض/١٣٧/٤، زنجیرە: ٣٢٥، ژمارە: ١٧٣١} + {تەجرید/١/٥٠٠، ژمارە: ٥٢٨}.

**ڕوونکردنەوە:**

مەبەستی سەرەکی لەم فەرموودەیەو لە شێوەی ئەم فەرموودەیە ئەوەیە: دروست نییە موسوڵمان باوەڕی وابێ کە بورجو ئەستێرەو شتی وا کاریگەرییان هەیە لە بارینی بارانا، بەڵام هەورو بورجو ئەمانە ئەگەر دابنرێن بە نیشانەو کاتی بارینی باران ئەوە قەیدی نییە، گەرچی زۆر باشیش نییە).

زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی، لەرجالی صەحیحەینە، لە بوخاریو موسلیمدا فەرموودەی هەیە، هەشتاو یەك فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، لە بوخاریدا پێنج فەرموودەی هەیە، لە رۆژی ئازادکردنی شاری مەککەدا، ئاڵای لەشکری هۆزەکەی خۆی کە هۆزی جوهەینە بوون بەو بوو، گێڕانەوەی لە پێغەمبەرو لە عوسمانو لە ئەبو تەلحەو لە عائیشەوە ئەنجامداوە، کۆمەڵێ – کەدوانیان کوڕی خۆی بوون- فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، ئامادەی رۆژەکەی صوڵحی حودەیبیە بووە. را جیاییەکی زۆر، لە

سالی تەمەنیو مردنیو جێگەی مردنی هەیە، هەندێ دەڵێن: ساڵی حەفتاو هەشتی کۆچی لە تەمەنی هەشتاو پێنج ساڵیدا، لە مەدینە مردووە، هەندێ تر دەڵێن: لە میسر، لە ساڵی پەنجادا، لە تەمەنی حەفتاو هەشت ساڵیدا مردووە، لە کووفە نیشتەجێ بوو، دەڵێن: هەر لەوێش مردووە. لەناو هاوەڵانی پێغەمبەردا، هەر ئەم ناوی زەیدی کوڕی خالدە.

ئەم فەرموودەیەی زەیدی کوڕی خالید (مُتفقٌ عَلَیهِ)یە، واتە: پەسەندی هەردوو پیرە، کە شێخی بوخاریو شێخی موسلیمن، تەنانەت دەقی هەردوو فەرموودەکە، لە هەردوو کتێبەکەدا، زۆر زۆر لەیەکەوە نزیکن.

لەم سەردەمەی ئێمەدا ئامێرو پێوەری زۆر پێشکەوتوو پەیدابوون، کەبەهۆی بەکارهێنانیەوە، پێشبینی چۆنێتی ی کەشو هەوابەباشی دەکرێ، بگرە بەوجۆرە پێوەرانە دەتوانرێ کاتی بارینی بەفرو باران لەپێش بارینیاندابەچەند رۆژێ، دیاری بکرێ. هەندێ ئامێری ترهەن دەتوانن جۆری کۆرپەڵە لەناو سکی دایکیدا دیاری بکەن کەئایا کچە یا کوڕە. ئەمانە ئێستا حەقائیقی زانستین، حاشا هەڵ نەگرن. لێرەدا ئێمە دەپرسین: ئایا ئەم جۆرە زانستانە بەپێچەوانەی ئەم جۆرە فەرموودانەن یانا، وەئایا ئەمانە لەعیلمی غەیبن کەخودا نەبێ کەس نایزانێ؟! یالەو جۆرە زانستەن کەبەهۆی ئاسایی دەزانرێن؟! لەوەڵاما دەڵێین: ئەمڕۆ بەزانست چەسپاوە کەئەو لافو گەزافەی کە لەکۆندا حیسابگەرو ئەستێرە شوناسەکان لێیان دەدا، سەبارەت بەکەشو هەواو رۆڵی بورجو ئەستێرەو شتی وای ترلەبارینی باران داو، هەروا لافو گەزافی عیلمی غەیبو قیرائەتی موستەقبەلو پێشبینی کردنی رووداو لەئاییندەداو نیسبەتی ئەم جۆرەشتانە لەهەندێ شتی خەیاڵی، ئەمڕۆ دەرکەوتووە کەئەم جۆرە لافو گەزافە هەمووی درۆیەو چاوو راوەو قسەی نەفامو گێلەپیاوە،

لەڕاستیدا مەبەست لەم جۆرە فەرموودەیە ئەوەیە: کەموسوڵمان بڕوای بەپڕو پووچ نەبێ، لەهەمان کاتا هەق بزانێ کەهەمموو شتێ بەدەست خودا خۆیەتی، بارینی باران بەدەست خودایە، بەدەست ئەستێرەو بورج نییە، بەڵام هاوکات لەگەڵ ئەمەدا، موسوڵمان دەبێ ئەم دوو ڕاستەقینەیێ بەباشی بزانێ:

**یەکەم**: کاروباری جیهان بەزۆری هۆیەکی لەبەرچاوی هەیە، گەڵێ جار ئەو هۆیە ئاشکرایە، لەبەرئەوە هەموو کەس دەیزانێ، وەك نەخۆشی دەبێ بەهۆی مردن، یاوەك ئاگردەبێ بەهۆی سووتاندن، گەڵێ جاریش ئەوهۆیە پەنهانە، دۆزینەوەی زەحمەتە، پێویستی بە هەوڵو تێکۆشانو هۆکاری دۆزینەوە هەیە، زۆرشت لەم بابەتی دووهەمە لەکۆندا هۆکەی نەدەزاندرا، بەڵام ئێستا ئەوهۆیانە دۆزراونەتەوە، وەك مەددو جەزری دەریا، کەهۆکەی هێزی کێشەندەی مانگە.

**دووەم**: جیهانی نهێنی (عالەمی غەیب) بریێتی یە لەوشتانە کەهەرخودا خۆی دەیانزانێ، وەبەهیچ جۆرێ کەس ناتوانێ پەی یان پێ ببا، چونکە بریێتین لەوشتانەی کەوان لەودیو پەردەی سورشتەوە، بەهۆی هۆی ماددی یەوە هەستیان پێ ناکرێ، هۆشو هەستو هۆ لەئاستیان کۆڵن، واتە: هەرچی بەهۆی ئاسایی سروشتی بزانرێ ئەوە نهێنی (غەیب) نییە، ئەم جۆرەیش وەك: دەنگوباسی ناوگۆڕو باسی ژیانی دوایی‌و زیندوبوونەوەو چۆنێتی حەشرو باسی فریشتەودۆزەخو بەرزەخو بەهەشتو پەریو زۆرشتی تر. کەواتە: هەرشتێ بەهۆی ئاسایی سروشتی، زوو یادرەنگ بزانرێ، ئەوە پەیوەندی بەعیلمی غەیبەوە نییە، چونکە کورتو پوخت: زانستی نهێنی ئەوەیە کەهۆی سروشتی (ماددی) نەبێ. (وەرگێڕ).

## (٣٣) باب: الدَّلِيلِ عَلَى أنَّ حُبَّ الأنصَارِ مِنَ الإِيمانِ
## بەڵگە لەسەرئەوە کە خۆشەویستی یاریدەدەران (ئەنصار) نیشانەی باوەڕی ساغە

٤٧- عَنْ أَنَسٍ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (آيَةُ الْإِيمَانِ حُبُّ الْأَنْصَارِ وَآيَةُ النِّفَاقِ بُغْضُ الْأَنْصَارِ).[٤٧]

**لە ئەنەسەوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نیشانەی باوەڕی بتەو خۆشەویستی ئەنصارەکانی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر بێ) کەبەکوردی پێیان دەگوترێ: یارمەتیدەرانی پێغەمبەر، درورودو سڵاوی خوای گەورە لەخۆی و رەزای خوای گەورە لەیارانی بێ، نیشانەی دوو ڕوویی و ناپاکیش لەگەڵ کۆمەڵی ئیسلاما رق لێبوون و کینە کێشانە لەئەنصار). (تاج/١، لاپەڕە: ٢١، زنجیرە: ٢، ژمارە: ٦، ج/٤).**

### ڕاڤەو شیکردنەوە:

**نیشانەی باوەڕو عەلامەتی ئیمان زۆرن یەکێ لەوانە خۆشەویستی ئەنصارە، ئەنصار موسوڵمانەکانی مەدینەن کەیارمەتی ئایینی خوایان بەسەرو بەماڵ داوە، نیفاق و دوو ڕوویش لەئایینا ئەوەیە: کەسێ بەدەم موسوڵمان بێ و لەدڵەوە ناموسوڵمان و بێ بڕوابێ، یا بەدەم و دڵ موسوڵمان بێ بەڵام ڕەفتاری وەك بەناو موسوڵمان وابێ!**

٤٨- عنْ الْبَرَاء (رَضِيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (الانْصار لا يُحِبُّهُمْ الا مُؤْمِنٌ وَلا يُبْغِضهُمْ الا مُنَافِقٌ فَمَنْ احَبَّهُمْ احَبَّهُ اللَّهُ وَمَنْ ابْغَضهُمْ

---

[٤٧] مختصر صحيح البخاری/١، ژمارە: ١٧ = بخاری/١٧. مسلم/٧٤ = ٢٣٢ شیحا.

ابْغَضهُ اللّهُ). [٤٨]

بەراء (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (موسوڵمان یاریدەدەران (ئەنصار)ی خۆش دەوێ، ناپاك (دوو ڕوو=مونافیق)یش ڕقی لێیانە، ئیتر ئەوەی ئەنصاری خۆش دەوێ خودایش ئەوی خۆش دە وێ، وە ئەوەی ڕقی لەوانە خوداش ڕقی لەوەا). (تاج/٥ ل/١٦٧ ز/٤٤ ف/١- ش/ت).

## ڕوونکردنەوە:

کۆمەڵگای ئیسلام لەسەرتاوە لە مەدینە بە شێوەی سەرەکی برێتی بوو، لە دوو کۆمەڵەی گەورە:

**یەکەم:** کۆمەڵەی کۆچکاران کە ئەو موسوڵمانانە بوون، لەمەککەوە، لە تاو دەستدرێژیی ناموسوڵمانەکان لێیان، کۆچ و باریان کرد بۆ مەدینە، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) خۆشییەکێ بوو لەم کۆچبەرانە.

**دووەم:** کۆمەڵەی یاریدەدەران کە برێتی بوون لەوانەی کە خەڵکی مەدینە بوون و موسوڵمان بوو بوون، کۆمەڵەی یەکەم ناسراون بە موهاجیرین، واتە: کۆچکاران، کۆمەڵەی دووەم ناسراون بە ئەنصار، واتە: یاریدەدەران.

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بۆ ڕوونکردنەوەی بەرزیی پلەو پایەی ئەنصار ئەم فەرموودەیەی فەرموو، لەگەڵ چەند فەرموودەیەکی تری لەم بابەتە.

---

[٤٨] تەجرید/٤، ژمارە: ٣٧٨٣/١٤٨٣. مسلم شیحا: ٢٣٤ = مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٣٧ = شیحا: ٢٣٤.

## (٣٤) باب: بيان نقصان الإيمان بنقص الطاعات
## بەپێی زۆریی‌و کەمی بەندەیی کردن بۆ خودا، ئیمان‌و باوەڕیش کەم‌و زیاد دەکا

٤٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي أَضحَى أَوْ فِطرٍ إِلَى الْمُصَلَّى فَمَرَّ عَلَى النِّسَاءِ فَقَالَ يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ تَصَدَّقْنَ فَإِنِّي أُرِيتُكُنَّ أَكْثَرَ أَهْلِ النَّارِ فَقُلْنَ وَبِمَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ تُكْثِرْنَ اللَّعْنَ وَتَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ مَا رَأَيْتُ مِنْ نَاقِصَاتِ عَقْلٍ وَدِينٍ أَذهَبَ لِلُبِّ الرَّجُلِ الْحَازِمِ مِنْ إِحْدَاكُنَّ قُلْنَ وَمَا نُقْصَانُ دِينِنَا وَعَقْلِنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ أَلَيْسَ شَهَادَةُ الْمَرْأَةِ مِثْلَ نِصْفِ شَهَادَةِ الرَّجُلِ قُلْنَ بَلَى قَالَ فَذلِكِ مِنْ نُقْصَانِ عَقْلِهَا أَلَيْسَ إِذا حَاضتْ لَمْ تُصَلِّ وَلَمْ تَصُمْ قُلْنَ بَلَى قَالَ فَذلِكِ مِنْ نُقْصَانِ دِينِهَا).[٤٩]

ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جەژنی قوربان بوو، یارۆژی جەژنی رەمەزان بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەرچووە دەرەوە رۆیشت بۆ نوێژگاکە بۆئەوەدەشتە لەدەرەوەی شار، سەری لەژنان داو فەرمووی: (ئەی کۆمەڵی ژنان! خێرو خێرات زۆر بکەن‌و، زۆریش بپاڕێنەوەو داوای لێبووردن لەخودا بکەن، چونکە من لەشەوی میعراجدا خودا نیشانی دام کەئێوە زوربەی خەڵکی دۆزەخ بوون) ژنەکان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە بۆچی ئێمە زۆربەی خەڵکی ناو دۆزەخین؟ فەرمووی: (چوونکە زۆر نەفرەت لەخەڵك دەکەن‌و، سپڵەیی لەگەڵ مێر دەکەن‌و چاکەی ئەوتان لەبەرچاو نییە، کەسم نەدیوە کەوەك ئێوە ئاوا کەم هۆش‌و کەم ئایین بێ، کەچی لەگەڵ ئەوەیشا ئاوا زاڵ بێ‌و، پیاو بەو هەموو زیرەکی‌و زرنگی

---

[٤٩] تەجرید/١، ژمارە: ٢٠٣ = بخاری: ٢٠٤، ٩٥٦، ١٤٦٢، صحیح مسلم: ٧٩ — ٢٣٨ = مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥٢٤.

یەیەوە تەفرەی دەداو هۆشی لەکەللەدا ناهێڵێ!) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! کەم ئایینیو کەم هۆشییەکەمان کامەیە؟ فەرمووی: (کەم هۆشی یەکەتان بریتی یە لەوە کەشایەتی دووژن بەشایەتی تاقە پیاوێ حلێبە، ئەمە کەم هۆشییەکەتان، ئافرەتیش لەکاتی بێنوێژیدا چەن شەوێ دەمێنێتەوە نەنوێژ دەکاو، نەرۆژووی رەمەزان دەگرێ، ئەمەیش کەم ئایینی یەکەتان). (ت/ ١/٢٦/ ١+ل ـ ٤٥١ هەتا ٤٦٠ = ز-٣ ژ-١٨ + ز-١٥٨ هەتا ز-١٦٣).

**روونکردنەوە:**

ئەبو سەعیدی خودری ئەنصارییە، لە رۆژی غەزای ئوحوددا لەبەر منداڵی رێگەی پێ نەدرا کە بەشداری لەم غەزایەدا بکا، بەڵام لەوەدوا لە خزمەت حەزرەتدا ئامادەی دوازدە غەزا بووە، باوکی (کە ناوی مالیکی کوڕی سینان بوو) لە غەزای ئوحوددا شەهید کرا، ئەبو سەعید (کەناوی سەعیدی کوڕی مالیکی کوڕی سینانە) هەزارو سەدو حەفتا فەرموودەی هەیە، لە بوخاریدا شەستو دووی هەیە، لە موسلیمدا نەوەدو هەشتی هەیە، چلو شەشیان پەسەندی هەردوو لایانن.

## (٣٦) باب: بیان کون الإیمان بالله تعالی أفضل الأعمال
## باوەڕو ئیمان بەخودای گەورە باشترین کردەوەی چاکەیە

٥٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (سُئِلَ أَيُّ الْعَمَلِ أَفْضَلُ؟ فَقَالَ: إِيمَانٌ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ قِيلَ ثُمَّ مَاذا؟ قَالَ: الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ قِيلَ ثُمَّ مَاذا؟ قَالَ: حَجٌّ مَبْرُورٌ).[٥٠]

---

[٥٠] مختصر صحیح البخاری/١، ژمارە: ٢٥. بخاری/٢٦، ١٥١٩. مسلم: ٨٣ - شیحا: ٢٤٤.

ئـەبوهورەیره (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: لـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) پرسـیار کـرا: کـام کـارە زۆر پەسـەندە؟ فـەرمووی: بـاوەڕ بـەخوداو بەپێغەمبـەری خـودا، گوترا: ئـەی لـەدوا ئـەو چـی کـارێ زۆر خێـرە؟ فەرمووی: (غەزاو تێکۆشان لەڕێگەی خودادا، گوترا: ئـەنجا چـی تـر؟ فـەرمووی: حەجێکی دروست!) (ریاض/٣ ل/٩٤٢).

**راڤەو شیکردنەوە:**

لەهەندێ فەرموودەدا لەپاش باوەڕ باشترین کردەوە نوێژە، یاشـتێکی تـرە، وەك وەڵامێکی گشتی بۆئەم جۆرە باسو بابەتانە کەبەدیمەن بۆنی ناتەبایی یان ێ دێ، دەڵێین:

**یەکەم:** بەپێی حـاڵو بـەپێی کـەس وەڵام دەگـۆڕێ، بەوێنـە: کـاتێ جیهان بەئاسایش بـێ حـەج لەغـەزا باشـترە، بـەڵام کـاتێ دوژمـن شـاڵاوی هێنـابێ غـەزا لەحەج باشترە،

**دووەم:** بەزۆری ئـەم رسـتەو تەعبیرانـە هاندانـە لەسـەر کردنـی ئـەو کـارە باشانە، مەبەست بڕیاردانی پلەی باشترینی نێوانیان نییە،

**سێیەم:** وشەیێ لەزارا کرتاوە، بەڵام لەدڵەوە مەبەسـتە، وەك وشـەی (مِـنْ) ێرەدا مورادە، ئەوکاتە پرسیارەکە ئاوای لێ دێ: (سـئل أي العمـل= مـن= أفـضل لأعمال: کام کارە لەزۆر کارە پەسندەکانە؟).

**چوارەم:** ئیسمی تەفضیل لەم جۆرە شوێنانەدا بۆ تەفضیل نییە، وەك لـەم ئایەتانەدا بۆ تەفضیل نییـە: (وهو أهون علیـه) هـەروا: (وربکـم اعلـم بکـم) کـە (أهـون) بـەواتا (هـێنُ)بـێو (أعلـم) بـەواتا (عـالِم)بـێ، ئـەم جـۆرە تەئویلـە لـەم شوێنانەدا زۆر پەسندە، زاناکان دەفەرموون: (ئەگـەر دوو دەق بەدیمـەن پێکـەوە

نـەدەگونجان دەبـێ لایـەکیان بـەپێی زانـستی تـەئویل تـەئویل بکـرێ، ئەوکاتـە هـەردوو دەقەکـە پەسـەندنو کـار بەهـەردوو لایـان دەکـرێ، بـەلاّم ئەگـەر بەتـەئویلیش پێکـەوە نـەدەگونجان ئـەوا بەهێزەکـەیان پەسـەند دەکـرێو بـێ هێزەکەیان کەنار دەکرێ، تەنانەت هەندێ زانا دەفەرموون: تەئویل دووریش بێ لەڕەتکردنەوەی دەق باشترە. تأویـل لـە (آل الـشيء الى كـذا)یـە واتـە ئـەو شتە گەڕایەوە بۆ ئـەوەو ئـەوە)، لـەزاراوەی زانـستی فـەرموودەدا مەبەست لەتـەئویل ئەمەیە: گفتە (لفظ)ێ بەپێی دانانی بنچینەیی (وەضعی ئەصلی) خـۆی واتـایێ دەگەیەنێ، بـەلاّم لەبـەر بەلگەیـە لـەو واتایـەوە نـەقلّ دەکـرێ بـۆ واتایـەکی تـر، ئەگەر ئەو بەلگەیە نەبوایە ئەو واتایەی کەبەڕوالّەت گفتەکە دەیگەیەنێ کـەنار نەدەکرا.

٥١- عَنْ أَبِي ذَرّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ سَأَلْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ): أَيُّ الْعَمَلِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: (إِيمَانٌ بِاللّٰهِ وَجِهَادٌ فِي سَبِيلِهِ) قُلْتُ: فَأَيُّ الرِّقَابِ أَفْضَلُ؟ قَـالَ: (أَعْلاهَا ثَمَنًا وَأَنْفَسُهَا عِنْدَ أَهْلِهَا) قُلْتُ: فَإِنْ لَمْ أَفْعَـلْ، قَـالَ: (تُعِـينُ ضَـايِعًا أَوْ تَـصْنَعُ لأخْرَقَ) قَالَ: فَإِنْ لَمْ أَفْعَلْ، قَالَ: (تَدَعُ النَّاسَ مِنْ الشَّرِّ فَإِنَّهَا صَدَقَةٌ تَـصَدَّقُ بِهَـا عَلَـى نَفْسِكَ). [٥١]

ئەبوذەڕ (ڕەزای خوای لـێ بێ) فەرمووی: پرسـیم لەخۆشەویـست(دروودی خوای لەسەر بێ) : کام کارە زۆر پەسەندو زۆر باشە؟ فەرمووی: (ئیمـانو بـاوەڕ بەخوداو خەباتو تێـکۆشانو غەزاکردن لەڕێـگەی ئەودا) گوتم: ئـەی کـام جـۆرە بەندەیێ ئازاد بکرێ پاداشتو خێری گەورەترە؟ فەرمووی: (ئـەوەی کەبـە بـەها گرانەو لەلای خاوەنەکەی گەلّی چاكو نایابـە) عـەرزیم کـرد: ئەگـەر ئـەوەم بـۆ

[٥١] مختصر صحيح البخاری/٣، ژمارە: ١٠٨٤ = بخاری/٢٥١٨. مختصر صحيح مسلم/١، ژمـارە: ١٦ = مسلم: ٨٤. شیحا: ٣٤٦.

نەكرا؟ فەرمووی: (یاریدەی پیشەسازێ بدە، یادەستی ناشیی‌و كۆڵییەك بگرەو فێری كارێ، ئیشێ، پیشەیەكی بكە) عەرزیم كرد: ئەی ئەگەر ئەویشم بۆ نەكرا چۆن؟ فەرمووی: (شەڕی خۆت لەمەردوم لادەو شەڕ بەخەڵك مەفرۆشە ئەویش هەر خێرە كە بۆ خۆتی دەكەیت) (تاج/٢/٣٥/٣-ش).

## راڤەو شیكردنەوە:

ئەم فەرموودەیە رشتەكەی ئاوایە: ١- شێخی بوخاری: ٢- عوبەیدوڵلای كوڕیموسا. ٣- هیشامیكوڕی عوروە. ٤- عوروەی كوڕی زوبەیر٤- ئەبوذەڕ.

مامۆستاكەی بوخاری تابیعی تابیعییە، هیشام‌و عوروەی باوكی‌و ئەبوموراویح هەرسێكیان، تابیعین‌و لەیەك چینن، ئەبوذەڕیش صەحابییە.

ئەم جۆرە رشتەیە گەرچی بەدیمەن لەجۆری رشتەی پتر لەسیانییە، بەلاّم وا لەحوكمی (سندي ثلاثي = رشتەی سیانی) دا.چونكە دەرهێنەری فەرموودەكە، كەلێرەدا پێشەوا بوخارییە، بەسێ چین، یابڵێین: بەسێ پشت دەگاتەوە بەپێغەمبەر(درووودی خوای لەسەر بێ) كە بریتین لە: ١- پەیڕەوانی پەیڕەوان. ٢- پەیڕەوان. ٣-صەحابە.-( أتباع التابعين + تابعين + صحابة).

٥٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (سَأَلْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَيُّ الْعَمَلِ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ؟ قَالَ الصَّلَاةُ عَلَى وَقْتِهَا قَالَ ثُمَّ أَيٌّ قَالَ ثُمَّ بِرُّ الْوَالِدَيْنِ قَالَ ثُمَّ أَيٌّ قَالَ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ قَالَ حَدَّثَنِي بِهِنَّ رسول الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلَوْ اسْتَزَدْتُهُ لَزَادَنِي. [٥٢]

---

[٥٢] مختصر صحيح البخاری/١، ژمارە: ٣١٢ = بخاری/٥٢٧، ٢٧٨٢، ٥٩٧٠، ٧٥٣٤. مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٢٣٧ = مسلم: ٨٥. شیحا: ٢٣٧.

عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەپێغەمبەرم پرسی کام کارو کردەوەیە زۆر خۆشەویستە لەلای خوای گەورە؟ فەرمووی: (نوێژی فەرز لەکاتی خۆی دا)، گوتم: پاش ئەو چی تر؟ فەرمووی: (پاش ئەو باشبوون لەگەڵ باوك و دایك). گوتم: پاش ئەو چی تر؟ فەرمووی: (خەباتگێڕان و تێکۆشان لەڕێگەی خودا دا، ئیبنو مەسعود فەرمووی: (ئەمانەم لەدەمی پێغەمبەر خۆی بیستووە، وەئەگەر لەم بارەیەوە زیاتریشم لێ داوا بکردایە بۆی پتر دەکردم).

## (٣٧) باب: كون الشِّرْكِ أقبَحُ الذُّنوبِ وَبيانُ أعظمِهَا بَعْدَهُ
## هاوەڵدانان و هاوبەش دانان بۆ خودا دزێوترین تاوانە، لەدوا ئەو چی تر تاوانترە

٥٣ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ سَالْتُ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ايُّ الذنْبِ اعْظَمُ عِنْدَ اللَّهِ؟ قَالَ: انْ تَجْعَلَ لِلَّهِ نِدًّا وَهُوَ خَلَقَكَ قُلْتُ: انَّ ذلِكَ لَعَظِيمٌ قُلْتُ: ثمَّ ايُّ؟ قَالَ وَانْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ تَخَافُ انْ يَطعَمَ مَعَكَ قُلْتُ: ثمَّ ايُّ؟ قَالَ: انْ تُزَانِيَ حَلِيلَةَ جَارِكَ).[٥٣]

عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پرسیارم کردلەپێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ئەی پێغەمبەری خودا؛کام گوناهە لەلای خودا زۆر گەورەیەو بە تاوانێکی زۆرگەورە دەژمێردرێت؟ فەرمووی: (ئەوەیە کە مانەند بۆخودا بڕیار بدەیت، ئەوخودایەی کە تۆی دروست کردووە تۆ بڵێیت: هاوەڵی هەیە) گوتم: لەڕاستیدا ئەوە تاوانێکی زۆر گەورەیە، ئەی لەدوای ئەوە چی تاوانێکی تر فرە گەورەیە؟ فەرموی: (ئەوەیە کەلەترسی ئەوەی منالی خۆت نان و ئاوەکەت بخوات بیکوژیت !) عەرزیم کرد : ئەمجارە

---

[٥٣] مختصر صحيح البخاری/٤، ژمارە: ١٦٣١ = ٤٤٧٧، ١٨١١. مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٥١ - مسلم: ٦٤. شیحا: ٢٥٤.

**چی تاوانێك زۆرگەورەترە؟ فەرمووی: ( ئەوەیە كە داوێن پیسی بكەیت لەگەڵ حەلاڵ وهاوسەری دراوسێكەتدا).**

## (٣٨) بابُ: بيان الكبائر وأكبرها
## باسی گوناهە گەورەكانو گەورەترینیان

٥٤- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَقَالَ: « أَلاَ أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ ثلاثًا: الإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ، وَشَهَادَةُ الزّورِ، أو قَوْلُ الزُّورِ» وَكَانَ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) مُتَكِئاً فَجَلَسَ، فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهَا حَتَّى قُلْنَا: لَيْتَهُ سَكَتَ. [٥٤]

**ئەمە دەقی عەرەبی موختەصەری صەحیحی موسلیمە.**

**عەبدورەحمانی كوڕی ئەبوبەكرە (رەحمەتو رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: باوكم فەرمووی: لە خزمەتی خۆشەویستا بووین، (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەدی، ئاگاداربن، گوێبگرن با پێتان بڵێم كە گەورەترین گوناهی گەورە كامانەیە). سێ جار ئاوای فەرموو: گوتیان: بفەرموو، ئەی پێغەمبەری خودا! گوێمان لێتە. فەرمووی: (هاوەڵ بڕیاردان بۆ خودای تاكو تەنیاو، دڵ ڕەنجاندنی باوكو دایكو، شایەتی درۆ) یا فەرمووی: (قسەی ساختەو شایەتی ناهەق).**

**فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم كاتەدا شانی دادابوو، جا بۆ گرنگی دان بەمەیان، راست دانیشتو خۆش خۆش هەر دەیفەرموو: (وە شایەتی درۆ، وە شایەتی درۆ) ئیتر ئەم وشەیەی ئەوەندە**

---

**[٥٤] مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٤٦. مسلم: ٦٤. شيحا: ٢٥٥. مختصر صحيح البخاری/٣، ژمارە: ١١١٩ = بخاری/٢٦٥٤، ٥٩٧٦، ٦٢٧٣.**

دووباره كـردەوه هـەتا بـەزەييمان پيادا هاتـەوەو مەترسـى ئـەوەمان هـەبوو كـە ئەوەندەى دووباره بكاتەوه ماندووى بكا، لەبەرئەوه لەبەر خۆمانـەوه دەمـانگوت خۆزگە بىّ دەنگ دەبوو. (بڕوانە: تەجريد/٢٠٨/٣، ژمـارە: ١١١٩ + تـاج/٣١٠/٣ — ١، زنجيرە: ١١٧ = ژ-٢٤٧٤ ل-١٠٨ ج-٤ - ش/ت).

٥٥- عَنْ أنس (رضي الله عنه) قَالَ: سُئِلَ رَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَـنْ الْكَبَـائِرِ قَـالَ: «الإِشْـرَاكُ بِاللّـهِ، وَعُقُـوقُ الْوَالِـدَيْنِ، وَقَتْـلُ الـنَّفْسِ، وَشَـهَادَةُ الزّورِ».[٥٥]

عەبـدورەحمانى كـوڕى ئەبوبـەكرە (رەحمـەتو ڕەزاى خودايـان لىّ بـىّ) فەرمووى: باوكم فەرمووى: لە خزمەتى خۆشەويستا بـووين، (درووودى خـوداى لەسەر بىّ) فەرمووى: (ئەدى، ئاگاداربن، گوێبگرن با پێتان بڵێم كە گـەورەترين گونـاهى گـەورە كامانەيـە). سـىّ جـار ئـاواى فـەرموو: گوتيـان: بفـەرموو، ئـەى پێغەمبەرى خودا! گوێمان لێتـە. فـەرمووى: (هـاوەڵ بڕيـاردان بـۆ خـوداى تـاكو تـەنياو، دڵ ڕەنجانـدنى بـاوكو دايـكو، شـايەتى درۆ) يـا فـەرمووى: (قـسەى ساختەو شايەتى ناهەق).

فـەرمووى: پێغەمبـەر (درووودى خـوداى لەسـەر بـىّ) لـەم كاتـەدا شـانى دادابـوو، جـا بـۆ گرنگـى دان بەمـەيان، راسـت دانيـشتو خـۆش خـۆش هـەر دەيفـەرموو: (وە شـايەتى درۆ، وە شـايەتى درۆ) ئـيتر ئـەم وشـەيەى ئەوەنـدە دووباره كـردەوه هـەتا بـەزەييمان پيادا هاتـەوەو مەترسـى ئـەوەمان هـەبوو كـە ئەوەندەى دووباره بكاتەوه ماندووى بكا، لەبەرئەوه لەبەر خۆمانـەوه دەمـانگوت

---

[٥٥] مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٤٦ = مسلم/٦٤ = شيحا: ٢٥٥. مختـصر صحيـح البخـارى/٣، ژمارە: ١١١٩ = بخارى/٢٦٥٤، ٥٩٧٦.

خۆزگه بێ دەنگ دەبوو. (بڕوانه: تەجرید/٢٠٨/٣، ژمارە: ١١١٩ + تـاج/٣١٠/٣ — ١، زخیرە: ١١٧ = ژ-٢٤٧٤ ل-١٠٨ ج-٤ - ش/ت).

٥٦– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ». قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا هُنَّ؟ قَالَ: «الشِّرْكُ بِاللَّـهِ، وَالـسِّحْرُ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ، وَأَكْلُ الرِّبَا، وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ، وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ، وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ الْغَافِلاَتِ». [٥٦]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (درووودی خودای لەسەر بـێ) دەفـەرمویّ: (خۆتـان بپـارێزن لـە حـەوت تـاوانی کوشـندە). یـاران عەرزیان کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئـەو حەوتـە چـیو چـین؟ فەرمووی: (یەکەم: شیرکو هاوبەش پەیداکردن بـۆ خـودای تـاکو تـەنیا، دووەم: سـیحرو جـادوو بـازی، سـێیەم: کوشـتنی کەسـێ کـە خـودا ڕەزای لەسـەر نـەبێ، چوارەم: سوود خـۆری، پێنجـەم: خـواردنی مـاڵی هـەتیو، بـەبێ فـەرمانی شـەرع، شەشـەم: هـەڵهاتنو پـشت هەڵـکردن لـە دوژمنـی دیـن، لـەڕۆژی هێـرش هێنـانی دوژمنانا، بەبێ مەهانـەی ڕەوا، حەوتـەم: بوختـانی داوێـن پیـسی هەڵبەسـتن بـۆ ژنی داوێن پاکی بێئاگای موسوڵمان). (تـاج/٢٠٤/٣، ژمـارە: ٨ —تـاج-٣ ز-٨١ ژ-٢٢٩٤ ج-٤ - ش/د/ن). (ریاض/١٧٥/٤، ژمارە: ١٧٩٣).

٥٧– عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رضى الله عنهما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ (صـلى الله عليه وسلم): «إِنَّ مِنْ أَكْبَرِ الْكَبَائِرِ أَنْ يَلْعَنَ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ» . قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّـهِ وَكَيْفَ يَلْعَنُ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ؟ قَالَ «يَسُبُّ الرَّجُلُ أَبَـا الرَّجُـلِ ، فَيَـسُبُّ أَبَـاهُ ، وَيَـسُبُّ أُمَّهُ». [٥٧]

---

[٥٦] مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٤٧ = شیحا: ٢٥٨. مسلم/٦٤. بخاری/٢٧٦٦.

[٥٧] مسلم: ٩٠. شیحا: ٢٥٩. بخاری: ٥٦٢٨.

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (تاوانێکی گەلێ گەورەیە کە پیاو نەفرینو لەعنەت لە باوکو دایکی خۆی بکا، گوترا: جا شتی وا چۆن دەبێ؟! فەرمووی: (با دەبێ، هەیە دەچێ جنێو بە باوکو دایکی کەسێ دەداو ئەویش جنێو بە باوك، یا بەدایکی ئەو دەداتەوە).

## (٤٠) بابُ: مَنْ مَاتَ لا يُشْرِكُ بِاللّهِ شيئاً دَخَلَ الجَنَّةَ
## کەسێ لەسەر باوەڕی ساخ بەخودا بمرێو هاوبەشی بۆ دانەنێ، لەبەهەشت نائومێد نابێو سەرەنجام دەچێتە بەهەشت

٥٨- عَنْ عبداللّه رَضِيِ اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوُل اللّهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّٰمَ: (مَنْ ماتَ يَشرِكُ بِاللّهِ شَيئاً دَخَلَ النَّارَ). وَقُلْتُ أَنا: مَنْ مَاتَ لايُشْرِكُ بِاللّهِ شَيئاً دَخَلَ الجَنَّة.[٥٨]

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود -ڕەزای خوایان لێ بێ- فەرمووی: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرموویەتی: (هەرکەسێ لەسەر ئیمان و باوەڕی ساغ بە خودا نەمرێ، بەڵکو بە موشریکی بمرێ دەچێتە ناو دۆزەخەوەو ئەوجۆرە کەسە دۆزەخین).

منیش بەپێی موقتەزای ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەڵێم: (هەر کەسێ لەسەر ئیمان و باوەڕ بەخودا بمرێ و هیچ هاوبەش بۆ خودا بڕیار نەدا دەچێتە بەهەشت و ئەوە بەهەشتییە).

[٥٨] مختصر صحيح البخاری/٢، ژمارە: ٥٩٩ = بخاری: ١٢٣٨، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٥٢ = مسلم ترقيم شيحا: ١٦٥.

٥٩- عَنْ اَبي ذَرّ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أتاني آتٍ مِنْ رَبِّي فَأَخْبَرَنِي، أَو قَالَ: بَشَّرَنِي، أَنَهُ مَنْ ماتَ مِنْ أُمَّتِي لايُشْرِكُ بِاللهِ شيئاً دخَلَ الجَنَّةَ). قُلْتُ: وَ إِنْ زَنَى وَ إِنْ سَرَق؟ قَالَ (وَ إِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَق).[٥٩]

ئـەبوذەر (ڕەزای خـوای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر -دروودی خـوای لەسـەر بـێ- فـەرمووی: (لەتـەرەفی پەروەردگارمـەوە، لـە خـەودا، جوبرائيـل تەشريفی هات بۆلام، ئەم موژدە خۆشەی داپێم: هەرکەسێ لەگەڵی ئیسلامی مـن لەسەر ئیمان و باوەڕ بەخودا بمرێ و هـیچ هاوبـەش بـۆ خـودا دانـەنێ، دەچێتە بەهەشت).

ئـەبوذەر فەرمووی: عـەرزی حـەزرەتم کـرد: بـاحیزی و دزیـشی کردبـێ ؟ فەرمووی -دروودی خوای لەسەر بێ- : (باحیزی و دزیشی کردبێ).

٦٠- عَنْ أَبِي الأَسْوَدِ الدِّيلِيِّ أَنَّ أَبَا ذَرٍّ حَدَّثَهُ أَنَّهُ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِـيَّ (صَـلّى اللّٰـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَهُوَ نَائِمٌ، عَلَيْهِ ثَوْبٌ أَبْيَضُ، ثُمَّ أَتَيْتُهُ فَإِذَا هُوَ نَائِمٌ، ثُمَّ أَتَيْتُهُ وَقَدِ اسْتَيْقَظَ، فَجَلَسْتُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: « مَا مِنْ عَبْدٍ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ، ثُمَّ مَـاتَ عَلَـى ذَلِـكَ إِلاَّ دَخَـلَ الْجَنَّةَ، قُلْتُ: وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ؟ قَالَ: « وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ». قلت: وَإِنْ زَنـى وإِنْ سَرِق؟ ثلاثا، ثُمَّ قَالَ فِي الرَّابِعَةِ: « عَلَى رَغْمِ أَنْفِ أَبِي ذَرٍّ». قَالَ: فَخَرَجَ أَبُو ذَرٍ وَهُـوَ يَقُولُ: (وَإِنْ رَغِمَ أَنْفُ أَبِي ذَرٍّ).[٦٠]

ئەمە دەقی ئەم فەرموودەیە لە ژمارە (٥٣)ی مختصر صحيح مسلم دا.

---

[٥٩] مختـصر صـحيح البخـاری/٢، ژمـارە: ٥٩٨ = بخـاری/١٢٣٧، ١٤٠٨. مختـصر صـحيح مـسلم/١، ژمارە: ٥٣. مسلم: ٩٤. شيحا: ٢٦٩.

[٦٠] مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٥٣ = شيحا: ٢٦٩. تەجريـد/٢، ژمـارە: ٥٩٨ = بخـاری: ١٢٣٧، ١٤٠٨، ٢٣٨٨، ٣٢٢٢.

ئەبو ئەسوەدی دیلی دەفەرموێ: ئەبو زەڕ خۆی ئەم فەرموودەیەی بۆم گێڕایەوە، فەرمووی: چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نووستبوو، جلێکی سپی لەبەردا بوو، لە پاشان دیسانەوە چوومەوە بۆ خزمەتی، هەر خەوتبوو، پاشان کە چوومەوە بۆ خزمەتی لەخەو هەڵسا بوو، لە خزمەتیدا دانیشتم، فەرمووی: (هەرکەسێ بە دڵ باوەڕ بهێنێو بەزمان ئاشکرای بکاو بڵێ: (لاَ إِلهَ إِلاَّ اللّـه) وە بەردەوام بێ لەسەر ئەمەو لەسەر ئیمان بمرێ، لەبەهەشت نائومێد نابێو سەرەنجامی بەهەشتە). منیش عەرزیم کرد: قوربان! با حیزیو دزیش بکا؟ فەرمووی: (بەڵێ، باحیزیو دزیش بکا) تا سێجار ئاوا لێیم دووبارە کردەوە، ئەویش هەمان وەڵامی دووبارە کردەوە، پاشان لەسەری جاری چوارەما فەرمووی: (بەکوێرایی چاوی ئەبو زەڕەوە!). دەفەرموێ: ئەبو زەڕ خۆشی کە هاتە دەرەوە، بۆ پشتیوانی فەرمایشتەکەی پێغەمبەر دەیفەرموو: (بەڵێ: بەکوێرایی چاوی ئەبو زەڕەوە، ئەوەی لەسەر ئیمان بمرێ، با گوناهی گەورە گەورەشی کردبێ، لە بەهەشت نائومێد نابێ، من پێم خۆش بێ یا پێم ناخۆش بێ، هیچ لە بڕیاری خودا ناگۆڕێ).

### (٤١) باب: تحريم قتل الكافر بَعْدَ أنْ قَالَ: لا إله إلا الله
### بڕیاری کوشتنی ناموسوڵمان، لەپاش گوتنی (لا إله إلا الله)

٦١- عَنِ الْمِقْدَادِ بْنِ الأَسْوَدِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ لِرَسُولِ اللّٰهِ: أَرَأَيْتَ إِنْ لَقِيتُ رَجُلاً مِنَ الْكُفَّارِ، فَاقْتَتَلْنَا، فَضَرَبَ إِحْدَى يَدَيَّ بِالسَّيْفِ فَقَطَعَهَا، ثُمَّ لاَذَ مِنِّي بِشَجَرَةٍ، فَقَالَ: أَسْلَمْتُ لِلّٰهِ، أَفَأَقْتُلُهُ يَا رَسُولَ اللّٰهِ بَعْدَ أَنْ قَالَهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « لاَ تَقْتُلْهُ » . قَالَ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ! إِنَّهُ قَطَعَ يَدَيَّ، ثُمَّ قَالَ ذَلِكَ بَعْدَ مَا قَطَعَهَا، أَفَأَقْتُلُهُ؟ قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لاَ تَقْتُلْهُ،

...نْ قَتَلْتَهُ فَإِنَّهُ بِمَنْزِلَتِكَ قَبْلَ أَنْ تَقْتُلَهُ، وَإِنَّكَ بِمَنْزِلَتِهِ قَبْلَ أَنْ يَقُولَ كَلِمَتَهُ الَّتِي قَالَ»(٦١)

میقدادی کوڕی عەمری ئەل کیندی (ڕەزای خودای لێ بێ) کە سوێند خواردووی (حلیف)ی هۆزی بەنی زوهرە بوو، وە لە خزمەت پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) ئامادەی جەنگی بەدر بوو بوو، فەرمووی: عەرزی حوزوورم کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! پێم بفەرموو: ئەگەر تووشی کابرایەکی بێ باوەڕ (کافر) بووم و چووین بەگژ یەکدا، بە شمشێر دای لە دەستێکم، وە دەستی پەڕاندم، ئەنجا خۆی لێم دایە پاڵ قەدی درەختێك، یا شتێ واو، کەزانی وامن زۆرم بۆی هێناوە، گوتی: ئەوا موسوڵمان بووم و باوەڕم هێنا بە خودا، جا ئایا لەپاش گوتنی ئەم وشەیە، لە هەل و مەرجێکی واوایدا، بیکوژم یانا؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (مەیکوژە). گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو پاش ئەوەی کە دەستێکی منی پەڕاندووە ئەوسا وادەڵێ؟

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (مەیکوژە، خۆ ئەگەر بیکوژیت، ئەوە ئەو دەچێتە پایەی تۆ بەرلەوەی کە ئەو بکوژیت و وەك ئەوکاتەی تۆ، ڕشتنی خوێنی حەرام و ناڕەوا دەبێ، وە تۆیش دەچیتە پایەی ئەو. بەرلەوەی کە موسوڵمان ببێ و، وەك ئەوکاتەی ئەو ڕشتنی خوێنت حەلاڵ دەبێ. بەلام لەبەر شلۆقی هەڵوێست بەهانەت هەیەو تۆڵەت لێ ناسێنرێ).

بڕوانە: ژمارە: ١٥٨١ تەجرید + ریاض الصالحین بەکوردی، بەرگی یەکەم، لاپەرە/ ٣٠٥ – ٣٠٧ ژمارە: ٣٩٢، ٣٩٣، ٣٩٤. تاج/٨، ل – ١١٥، ژمارە: ٤، زنجیرە: ٤٣ –

---

(٦١) مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٦ = شیحا: ٢٧١. تەجرید/٤، ژمارە: ١٥٣٥. بخاری/٤٠١٩، ...، ٤٢٦٩، ٦٨٧٢.

= ژ/٤٤٥٥، ٤٤٥٦ تاج/٤ چ/٤ - خەباتو غەزا لە بنەڕەتدا دەبێ لەبەر رەزای خودا بێ).

## روونکردنەوەو هێنانەوەی تەرم لە دووره ولاتەوە:

١- لە پلەی یەکەمدا مەبەستی سەرەکی لەم فەرموودەیە ئەوەیە: (کوشتنی موسوڵمان بەناڕەوا، تاوانێکی گەلێ گەورەیە، لە موسوڵمان ناوەشێتەوە، تەنانەت ئەگەر کەسێ وشەی شایەتمان بڵێو بە رواڵەت موسوڵمان ببێ، دروست نییە ئیتر بکوژرێ، بگرە کەسێ تاوانی وا گەورە ئەنجام بدا خۆی لە کوفرو بێبڕوایی نزیك دەکاتەوە).

٢- میقدادی کوڕی عەمری کیندی، کە میقدادی کوڕی ئەسوەدیشی پێ دەگوترێ، یەکێکە لەناودارە فرە باشەکانی یارانی پێغەمبەر، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دایناوە بەیەکێ لە وەزیرە بەڕێزەکانی خۆی، میقداد ئامادەی ئازادکردنی ولاتی میصر بووە، وە لەوێش مردووە، بەلام لەوێوە موسوڵمانان تەرمەکەیان هێنایەوە بۆ مەدینە، لە مەدینە ناشتیان، حەزرەتی عوسمان نوێژی مردووی لەسەری کرد، ئەمە لە ساڵی سیو سێی کۆچیدا بوو، میقداد دوو کۆچی کردووە، کۆچێ بۆ حەبەشەو کۆچێ بۆ مەدینە، ئامادەی غەزای بەدرو شەڕگاکانی تری دوای بەدر بووە، بۆ نموونەیێ لەسەر بەرزیو دڵسۆزییەکانی میقداد، بفەرموو بڕوانە: فەرموودەی ژمارە: (١٥٢٤ تەجرید = ٣٩٥٢ فەتحولباری).

میقداد خۆی دەفەرموێ: کە هاتین بۆ مەدینە، پێغەمبەر دەکەس، دەکەس دابەشی کردین بەسەر ماڵەکانا، من لەو دەکەسە بووم کە لەگەڵ پێغەمبەردا بووین، تەنیا یەك سەر مەڕمان هەبوو، شیرەکەیمان دەدۆشیو لەناو خۆمانا وەك یەك دابەشمان دەکردو دەمانخواردەوە، بەوە دەژیاین!





میقداد یەك فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە، کە ئەم فەرموودەیە، کە پێشەوا بوخاری (رەحمەت لە گۆڕی نازداری) لەم دوو شوێنەدا دەریهێناوە لە (المغازي)و لە (الدِّیَات)دا. پێشەوا موسلیم لەم شوێنەدا بە سێ گێڕانەوەی کەمێ جیا دەری هێناوە. میقداد خولامێکی رۆمی هەبوو، دەستی پزیشکی هەبوو، میقدادیش ورگن بوو، ورگی زۆر گەورە بوو، خولامەکەی پێی گوت: ئەگەر حەزدەکەی سکت هەڵ دەدڕم‌و ئەم بەزو چەورییەی لێ دەردەهێنم‌و سووکی دەکەم بۆت، جا وایکردو شوێنەکەی دوورییەوە، بەڵام سکی هەوی کردو میقداد مرد، خولامەکەش هەڵهات‌و رای کرد، لە راستیدا ئەنجامدانی کاری واو هێنانەوەی تەرمی میقداد لە میصرەوە بۆ مەدینە، لەسەردەمی جێنشینی عوسماندا، بەبێ دەربڕینی رەخنەو پێشگیری‌و نارەزایی لەم کارانە، لەلایەنی هاوەڵانی پێغەمبەرو پەیڕەوانی ئەوانەوە، کە ناسراون بە سەحابەو تابیعین، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە کاری وا دروستە، کەواتە: دروستە تەرمی کوردە ئاوارەکانی خۆشمان لەم سەردەمەدا، لە هەندەرانی دوورەوە بهێنرێتەوە بۆ کوردستانی خۆمان، وەکاری وا بێ شەرعی نییە، گەرچی خاڵیش نییە لەگێرەو کێشەو سەراسێ. وە لەهەمان کاتدا ئەمە باشترین بەڵگەیە لەسەر دروستبوونی کرداری نەشتەرگەری، لەکاتی ناچاری‌و پێویستدا، با مەترسیداریش بێ. میقداد پیاوێکی باڵا بەرزی رەنگ سەوزەی مواوی برۆ پەیوەستی چاو قەوی بوو، ریشی خۆی بەبۆیەی زەرد، زەرد دەکرد، پێغەمبەر ئامۆزایەکی خۆی لێ مارەکرد، کە ضباعەی کچی زوبەیری کوڕی عبدالمطلیب بوو میقداد حەفتا ساڵێ ژیاوە، میقداد یەکێ بوو لەو حەوت کەسەی کە بۆ هەوەڵجار ئیسلام بوونی خۆیان ئاشکرا کرد.

٦٢- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي سَرِيَّةٍ فَصَبَّحْنَا الْحُرَقَاتِ مِنْ جُهَيْنَةَ، فَأَدْرَكْتُ رَجُلاً فَقَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، فَطَعَنْتُهُ. فَوَقَعَ فِي نَفْسِي مِنْ ذَلِكَ، فَذَكَرْتُهُ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « أَقَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَقَتَلْتَهُ؟!». قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّمَا قَالَهَا خَوْفًا مِنَ السِّلاَحِ! قَالَ: « أَفَلاَ شَقَقْتَ عَنْ قَلْبِهِ حَتَّى تَعْلَمَ أَقَالَهَا أَمْ لاَ؟! ». فَمَازَالَ يُكَرِّرُهَا عَلَيَّ حَتَّى تَمَنَّيْتُ أَنِّي أَسْلَمْتُ يَوْمَئِذٍ. قَالَ: فَقَالَ سَعْدٌ: وَأَنَا وَاللَّهِ لاَ أَقْتُلُ مُسْلِمًا حَتَّى يَقْتُلَهُ ذُو الْبُطَيْنِ، يَعْنِي أُسَامَةَ، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: أَلَمْ يَقُلِ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ – الأنفال/ ٣٩). فَقَالَ سَعْدٌ: قَدْ قَاتَلْنَا حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ، وَأَنْتَ وَأَصْحَابُكَ تُرِيدُونَ أَنْ تُقَاتِلُوا حَتَّى تَكُونَ فِتْنَةٌ. [٦٢]

**ئەمە دەقی ژمارە: (٧)ە لە مختصر صحيح مسلم دا.**

**ئوسامەی کوڕی زەید (ڕەزای خودا لە خۆی‌و باوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ لقێ پێشمەرگەدا، ناردینی بۆ غەزای خێڵی حورەقە، کە لە هۆزی جوهەینەن، وە لەگەڵ دەمە دەمی بەیانا دامان بەسەریانا، خۆیان بۆ ڕانەگیراو شکان، من‌و پیاوێکی ئەنصاری نیشتینە سەر پیاوێ لەوان، هەتا بەرە بەرە تەنگمان پێ هەڵچنی، ئەوجا گوتی: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّه، ئیتر ئەنصارییەکە، وازی لێ هێنا، بەڵام من بە ڕمەکەم دامگرت تا کوشتم، ئەمە بوو بە گرێ لەدڵما، ئەمەم باس کرد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: ئەی ئوسامە لەپاش ئەوەی کە گوتی: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّه، چۆن دەستت تێی چوو کە بیکوژیت؟!). منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! من وا دەزانم مەبەستی ئەوە بوو کە خۆی لە کوشتن قوتار بکا، لە ترسی تیغ وای گوت.**

---

[٦٢] **تەخریجەکەی لە ژمارە: ٦١دا ڕابورد.**

فەرمووی: (ئەدی! بۆ دڵت هەڵنەدڕی تا بزانی لەبەرئەوە وای گوتووە یانا؟).
ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەندە ئەم گوتەیەی دووبارە کردەوە، تەنانەت خۆزگەم خواست کە هەتا ئەو رۆژە موسوڵمان نەبوومایە، هەتا تووشی ئەم تاوانە گەورەیە نەبوومایە، لەکاتی ئیسلام بوونمداو لەوەدوا ئیسلام بوومایە.

فەرمووی: سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصیش فەرمووی: دەی سوێندم بەخودا منیش وەك ئەم ورگنە، واتە: وەك ئوسامەی کوڕی زەید، کە پیاوێکی ورگ زل بوو، شەڕی موسوڵمان کوژی ناکەم. فەرمووی: پیاوێکیش رەخنەی لە سەعد گرت لەسەر ئەم هەڵوێستە، کە ئەویش لەبەر ئەم فەرموودەیە، چاو لە ئوسامەی کوڕی زەید دەکاو، بەشداری لە جەنگی نێوانی عەلیو موعاوییەدا ناکات، پێی گوت: ئەی ئەوە نییە کە خودای گەورەو مەزن، بۆ ئەم بابەتە رێگەی جەنگی داوەو دەفەرموێ: {وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّه} واتە: ئەی گەلی ئیسلام! بجەنگێن لەگەڵ ناموسوڵمانانا، هەتا بەر لە کفرو فرە خودایی بگیرێ، وەدینی حەق هەر بۆ خودا بێ، وە ئاژاوە نەقەومێ).
سەعیدیش فەرمووی: بەڵێ ئێمە بەسەرینی پێغەمبەر، دەجەنگاین هەتا ئاژاوە دروست نەبێ، بەڵام تۆو تاقمەکەت دەتانەوێ کە جەنگ بکەن هەتا ئاژاوە بەرپاببێت). (بڕوانە: فتح الباري/ ١٢/ ١٩٦ رقم: ٦٨٧٢ – قول سعد: لا أقاتِلُ مسلماً حتى يقاتِلَهُ أسامةُ + فتح الباري/ ١٣/ ٦٧. قول أسامة: ما خلَفَ صَاحِبَكَ. مع اسماء المعتزلين عن القتال أثناء الفتنة).

**روونكردنەوە:**

**ئوسامەی كوڕی زەید (ڕەزای خودای لێ بێ) خۆیو باوكی هاوڕێو خۆشەویستی پێغەمبەر بوون، نازناوی (الحبّ بن الحبّ = خۆشەویستی كوڕی خۆشەویست) بوو، نەخشی نقێمی ئەنگوستیلەكەی (حِبُّ رسول الله)ی بوو، كوڕی ئوممو ئەیمەنە، كە دایەو لەلەو دایكی شیریی پێغەمبەر بووەو بە منالّی پەروەردەی كردووە، ئوسامە ئەوەندە هۆشیارو لێهاتوو بوو، لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) كردی بە سەركردەی لەشكر، كە پێغەمبەر مرد، تەمەنی بیست ساڵ بوو، سەدو بیستو هەشت فەرموودەی هەیە، پازدەیان پەسەندی هەردوو پیری بوخاریو موسلیمن، دوو فەرموودەیشی لە بوخاریدا هەیە، كە لە موسلیمدا نین، بەم جۆرە فەرموودەیێ، لە زاراوی فەرموودەدا دەگوترێ: لە ئەفرادی بوخارییە، دوو فەرموودەیشی لە صەحیحی موسلیمدا هەیە، كە لە بوخاریدا نین، بەم جۆرە فەرموودەیەیش دەگوترێ: لە ئەفرادی موسلمین. كەواتە: كۆی فەرموودەكانی لە صەحیحی بوخاریدا، دەكاتە: ١٥ + ٢ = ١٧. هەروا لە موسلیمدا دەكاتە: ١٥ + ٢ = ١٧. لە صەحیحیندا، كە صەحیحی بوخاریو صەحیحی موسلیمن دەكاتە: ١٥ + ٢ + ٢ = نۆزدە فەرموودە. لە وادیلقورا، لە ساڵی پەنجاو چواری كۆچیدا، لە تەمەنی پەنجاو پێنج ساڵیدا، گیانی پاكی سپاردووە (ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێ)، ئەم فەرموودەیەی پەسەندی هەردوو پیرە (متفق علیه).**

**ئوسامە هەتا مرد بەشداری لە ئاژاوەكانا نەكردو لە شەڕی موعاوییەو عەلیداو، لە جەنگی صفینو جەمەلیش دا بەشداری نەكرد، لەپاش شەهید بوونی ئیمامی عوسمان ئوسامە بەركەنار بوو لە ئاژاوە گەلەكان، هەتا لە سەردەمی جێنشینی موعاوییەدا مرد، زۆر لە هاوەڵانو لە پەیڕەوان**

فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، وەك ئەبو هورەیرەو ئیبنو عەباس. (بڕوانە: تەجریدی صەریحی بوخاری/ بەرگی/١، لاپەڕە: ١٣٨ + بەرگی/١٧/٥، ژمارە: ١٧٥٥ + کۆتایی ژمارە: ٦ کەوا لەپێش ئەم ژمارە حەوتەوە + رفع الخفا شرح ذات الشفا لابن الحاج الکردي ج/ ١ ص١١١ + تاج/ کوردی بەرگی/٥، لاپەڕە/ ١٢٥ – باسی چاکیی ئوسامە ز/٢٤ ژ/٣٣٩١، ٣٣٩٢، ٣٣٩٣، ٣٣٨٦ – ٣٣٩٠، ٢٤٤٥، ٣٤٤٦ + لاپەڕە: ١٢٣ زنجیرە: ٢٣، ژمارە: ١، ٢، ٣، ٤، ٥ + لاپەڕە: ١٦٣، زنجیرە: ٤٢، ژمارە: ١، ٢).

## (٤٢) باب: قول النبي (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَنْ حَمَلَ عَلَيْنَا فَلَيْسَ مِنَّا باسی فەرمایشتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ): (ئەوەی چەك لەئێمە هەڵبگرێ لە ئێمە نییە)

٦٣– عَنْ عبدالله بن عمر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَمَ) قَالَ: «مَنْ حَمَلَ عَلَيْنَا السِّلاَحَ فَلَيْسَ مِنَّا». [٦٣].

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوەی کە چەك لە ئێمە هەڵبگرێ لەئێمە نییە).

٦٤– عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ حَمَلَ عَلَيْنَا السِّلاَحَ فَلَيْسَ مِنَّا، وَمَنْ غَشَّنَا فَلَيْسَ مِنَّا». [٦٤].

ئەبو مووسای ئەشعەری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ چەك لەئێمە، واتە: لە گەلی ئیسلام هەڵبگرێ، لەئێمە نییە).

---

[٦٣] مسلم. شیحا: ٢٧٦. بخاری: ٧٠٧٠.

[٦٤] مسلم.شیحا: ٢٧٨. بخاری: ٦٦٦٠.

له فەرموودەیەكی تردا: ئەبو هورەیره (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەوەی چەك لەئێمە هەڵبگرێ لەئێمە نییە، وەئەوەی گزی لەئێمە بكا لەئێمە نییە). (مختصر صحیح مسلم/٣، ژمارە: ١٢٣٥. ریاض/٤، زنجیرە: ٢٧٦، ژمارە: ١٥٧٩).

## (٤٤) بابُ: تحريم ضربِ الخُدُودِ وَشَقِّ الجُيُوبِ والدُّعاءِ بِدَعْوَى الجاهِلِيَّةِ روو رنینەوەو یەخەدادڕینو هەڵدانی بانگەوازی سەردەمی نەفامی حەرامەو ناڕەواو نادروستە

٦٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رضی الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلی الله علیه وسلم): « لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الْخُدُودَ، أَوْ شَقَّ الْجُيُوبَ، أَوْ دَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ». [٦٥]

عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوەی روومەت بڕنێتەوەو یەخە دابدڕێو بانگەوازی سەردەمی پێش هاتنی ئیسلام هەڵ بدات لە ئێمە نییە). {تاج/١، زنجیرە: ١٩٥، ژمارە: ١٠٢٦ – ش/ت/ن}. لە بێژە (لفظ)ێكا: (یەخە دادڕێو نزای خراپ لەخۆی بكا، وەك بڵێ: قوڕ بەسەرم).

٦٦- عَنْ أَبِي مُوسَى (رضی الله عنه) قَالَ: وَجِعَ أَبُو مُوسَى وَجَعًا فَغُشِيَ عَلَيْهِ، وَرَأْسُهُ فِي حَجْرِ امْرَأَةٍ مِنْ أَهْلِهِ، فَلَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يَرُدَّ عَلَيْهَا شَيْئًا، فَلَمَّا أَفَاقَ قَالَ أَنَا بَرِيءٌ مِمَّنْ بَرِئَ مِنْهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلی الله علیه وسلم)، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلی الله علیه وسلم) بَرِئَ مِنَ الصَّالِقَةِ وَالْحَالِقَةِ وَالشَّاقَّةِ. [٦٦]

---

[٦٥] مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٤٤٤. شیحا: ٢٨١. تجرید/٢/٦٢١. بوخاری/١٢٩٤.

[٦٦] بخاری: ١٣٩١. مسلم: ٢٨٣ شیحا.




ئـەبو بـوردەی کـوڕی ئـەبو مووسـای ئەشـعەری (ڕەزای خـودا لـەخۆیو لەباوکی بـێ) فـەرمووی: بـاوکم زۆر نـەخۆش بـوو، لەبـەر شـەکەتیو کەشـەنگی بوورایەوە، لەوکاتەدا سـەری لەسـەر رانـی ژنەکـەی بـوو، جـا ژنەکـەی قیژانـدیو کردی بـەهاتو هاوار، ئـەبو مووسـا نـەیتوانی وەڵامـی بداتـەوە، بـەڵام لەپاشـا کـە هۆشی هاتەوە فەرمووی: من لەوکەسە بەریو بێزارم کە پێغەمبـەر لێـی بـەریو بێزار بووە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بـەریو بێـزار بـوو لـەو ژنـەی کە شینو شەپۆڕ دەکاو شیوەن دەگێـڕێو سـەری خـۆی دەتاشـێو یەخـەی خـۆی دادەدڕێ لەکاتی قەومانی کارەساتدا. (ریاض/٤، ژمارە: ١٦٥٩).

**ڕوونکردنەوە:**

جاران باوبوو، لەکاتی مردنـی عـەزیزێکا، وەك بـاوكو کـوڕو بـراو مێـرد، ژنی کەسوکاری شێوەنیان دەگێڕاو سەری خۆیـان دەگرتـە قـوڕو یەخـەی خۆیـان دادەدڕیو پەلكو پرچی خۆیان دەبڕیو جلی ڕەشیان دەپۆشی، تا ماوەیێ، بـەڵام ئێستا سوپاس بۆ خودا، ئەم جۆرە بـاوو نەریتـە کۆنـە دزێـوە ناشـیرینانە باویـان نەماوە.

**(٤٥) باب: بيان غِلَظِ تحريمِ النَّميمَةِ**

**دووزمانی تاوانێکی گەلێ گەورەیە**

٦٧- حديث حُذَيْفَةُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَتَّاتٌ». [٦٧]

---

[٦٧] تجريـد/٥، ژمـارە: ١٩٣٩ = ٦٠٥٦ بخـاری. مختـصر صـحيح مـسلم/٥، ژمـارە: ١٨٠٨ = مسلم/شيحا: ٢٨٧.




هەممامی کوڕی حاریث (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەلای حوزەیفە لە مزگەوت دانیشتبووین، پیاوێ لەولاوە هاتو ئەویش لەگەڵمانا دانیشت، عەرزی حوزەیفە کرا: کە ئەم پیاوە قسەو باس دەباتەوە بۆ دەستەڵاتداری وڵات، کە ئیمامی عوثمانە (ڕەزای خودای لێ بێ). حوزەیفەیش (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی بەکابرا: بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (مرۆی دوو زمان دوو پێی ناچێتە ناو بەهەشت!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٤٧٤٨. ریاض/٤، زنجیرە: ٢٥٧، ژمارە: ١٥٣٦ چاپی دووەم}.

حوزەیفەی کوڕی یەمانی عەبەسی، خۆیو باوکی ئوحودین، واتە: لە غەزای ئوحوددا بەشدارییان کردووە، باوکی لە غەزای ئوحوددا بەهەڵە بە دەستی هەندێ موسوڵمان شەهیدکرا، حوزەیفە یەکێکە لە هاوڕێ هەرە مەزنەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە غەزای خەندەقا ڕۆڵێکی جوانی هەبوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردی سووسەی هەواڵی سوپای دوژمنی بۆ بکا، موژدەی هێنایەوە کە سوپای دوژمن بە نائومێدی بەرەودوا کشاونەتەوە. فەرموودەی زۆری لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، بیست فەرموودەی لە بوخاری شەریفا هەیە، بیستو نۆی لە صەحیحی موسلیما هەیە، دوازدەیان پەسەندی هەردوو لایانن، کۆی فەرموودەکانی لە صەحیحەینا: ١٢ + ٨ + ١٧ = ٣٧. ناودارە بە ڕازگری پێغەمبەر (صاحب سِرِّ رَسُولُ اللهِ). کاتێ یەکێ دەمرد ئیمامی عومەر سەرنجی دەدا ئەگەر حوزەیفە ئامادەی سەر تەرمەکەی نەبوایە ئەویش ئامادەی نەدەبوو، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناوی گشت ناپاکەکانی (منافق)ەکانی پێ گوتبوو، یەك بەیەکیانی دەناسی، لە غەزای نەهاوەندا ئامادە بوو، کە سوپا سالاری موسوڵمانان: نوعمانی کوڕی

موفرین شەهید بوو، حوزەیفە ئالاَکەی هەلْگرتو هەمەدانو رەییو دینەوەر، لەسەر دەستی ئەودا ئازاد کران، لە بیستو دووی کۆچیدا، عومەر کردی بەسەرکاری سەرمەدائین، لە (٣٦)ی کۆچیدا لەپاش چل رۆژ لە جێنشینی عەلی لە مەدائین مرد، صەفوانو سەعیدی کوڕی لە یارانی عەلی بوون، لە صەفین شەهید بووون، لە حوززەیفە پرسیار کرا: چی ئاژاوەیەك زۆر کوشندەیە؟ فەرمووی: (ئەوەی کە ببێت بەسەر پشك لەنێوانی خێرو شەڕدا، وا سەرت لێ شێوابێ نەزانی کامەیان هەلْبژێری!) دەیشی فەرموو: (قیامەت هەلْناسێ هەتا گشت هۆزێ، ناپاکەکانیان دەبن بە ئاغاو سەرۆکیان!) وە دەیفەرمووو: (ئەوەی بوووەو ئەوەی دەبێ، هەتا قیامەت هەلْدەستێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەمووی پێ گووتووم!). حوززەیفە دەیفەرموو: (پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆمی کرد بەسەر پشك لە نێوانی کۆچکردنو یاریدەدانی پێغەمبەر، یاریدەدانم هەلْبژارد، حوزەیفە ئامادەی سەرکەوتنەکانی عێراق بوو، وە گەلێ شوێنەواری ناوداری لەوێ هەیە). (بڕوانە: تەجریدی بوخاری بەرگی/١، لاپەڕە: ١٨٤ + إصابە واستیعاب، ناوی حوزەیفەی کوڕی یەمان + تاج/٥، لاپەڕە: ١٨٨، ژمارە: ١ و ژمارە: ٢ =تاج-٣ ز-٥٥ ژ-٣٤٩٢ هەتا ٣٤٩٣ چ-٤).

### (٤٦) باب: بيان غلظ تحريم إسْبَالِ الإزار، وَالْمَنّ بالعَطِيَّة وتنفيق السلعة بالحلف، وبيان الثلاثة الّذين لا يكلّمُهُم اللّهُ يَوْمَ القِيَامَةِ وَلاَ يَنْظُرُ إلَيْهِمْ، وَلاَ يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ

٦٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « ثَلاَثٌ لاَ يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ، وَلاَ يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ، وَلاَ يُزَكِّيهِمْ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: رَجُلٌ عَلَى فَضْلِ مَاءٍ بِالْفَلاَةِ يَمْنَعُهُ مِنِ ابْنِ السَّبِيلِ، وَرَجُلٌ بَايَعَ رَجُلاً بِسِلْعَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ

فَحَلَفَ لَهُ بِاللَّهِ لأَخَذَهَا بِكَذَا وَكَذَا فَصَدَّقَهُ وَهُوَ عَلَى غَيْرِ ذَلِكَ، وَرَجُلٌ بَايَعَ إِمَامًا لاَ يُبَايِعُهُ إِلاَّ لِدُنْيَا فَإِنْ أَعْطَاهُ مِنْهَا وَفَى، وَإِنْ لَمْ يُعْطِهِ مِنْهَا لَمْ يَفِ ».(٦٨)

**ئەمە دەقی عەرەبی ئەم فەرموودەیە لە (مختصر صحیح مسلم/٢)دا، ژمارە (٩٥٩).**

**ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لەرۆژی قیامەتدا ئەم سێ کەسە خودا نەقسەی خۆشیان لەگەڵدا دەکاو نەڕوویان دەداتێو نەبەچاوی میهرەبانی تەماشایان دەکاو نەپاكو خاوێنیان دەکاتەوەو نەتاریفیان دەکا، واتە لەهیچ روویەکەوە روویان ناداتێ، سەرەڕای ئەوەیش سزایەکی سەختیان بۆهەیە:**

**یەکەم: پیاوێ کە لەچۆڵێ، زیادە ئاوی هەبێو لە رێبواری قەدەغە بکا.**

**دووەم: پیاوێ کە لەپاش عەصر کەکاتی بەرزبوونەوەی فریشتەکانە، لەگەڵ کردەوەی رۆژی بەندەدا، ئەو لەوکاتە ناسکەدا، لەسەر مامەڵەو سەودا سوێندی درۆبخواو، بەپیاوێ بڵێ بەخوا ئەم کالآیە ئەمەندەو ئەوەندەم پێداوە، کابرایش باوەڕی پێبکا، خۆشی درۆبکا.**

**سێیەم: پیاوێ پەیمان بدا بەپێشەوا مەبەستی دنیابێو سەیری بەرژەوەندی خۆی بکا، جا ئەگەر پێشەوا بەشیدا ئەویش بەگوێی دەکا، بەلآم ئەگەر ئەو بەشی نەدا، ئەویش بەگوێی نەکا).**

---

(٦٨) **تجرید/٣، ژمارە: ١٠٣٧. بخاری/٢٣٥٨. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٩٥٩ = شیحا: ٢٩٣ + مختصر صحیح مسلم/٤، ژمارە: ١٣٦٠ = شیحا: ٢٨٩.**

**(٤٧) باب: بيان غلظ تحريم قتل الإنسان نَفْسَهُ وَأَنَّ مَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِشَيءٍ عُذِّبَ بِهِ فِي النَّارِ، وَأَنَّهُ لا يَدْخُلُ الجَنَّةَ إِلاَّ نَفْسٌ مُسْلِمَةٌ**

**خۆکوژی تاوانێ گەلێ گەورەیە، کەسێ خۆی بکوژێ، بەچی خۆی بکوژێ، لەدۆزەخا بەوشتە نازارو ئەشکەنجەی خۆی دەدات، وەبێجگە لە موسوڵمان کەسی تر ناچێتە بەهەشت**

٦٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّه عَنْه عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ تَرَدَّى مِنْ جَبَلٍ فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَهُوَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ يَتَرَدَّى فِيهِ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا وَمَنْ تَحَسَّى سُمًّا فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَسُمُّهُ فِي يَدِهِ يَتَحَسَّاهُ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَدِيدَةٍ فَحَدِيدَتُهُ فِي يَدِهِ يَجَأُ بِهَا فِي بَطْنِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا.[٦٩]

ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە دەفەرموێ: (کەسێ لەکێوێکەوە، یاله بەرزاییەکەوە، بەنیازی خۆکوشتن، خۆی بەربداتەوەو خۆی بکوژێ، ئەوە کاتێ دەمرێ هەمیشە لەو کێوەوە خۆی هەڵ دەداتە خوارەوە بۆ ناو ئاگری دۆزەخ، هەتا هەتایە ئەمە کارو پیشەیەتی و بە ئێجگاری لەئاگری دۆزەخا دەمێنێتەوە لەسەر ئەم حاڵە، وە کەسێ زەهر بخوا، یا بخواتەوەو بەزەهر خۆی بکوژێ ئەوە لەئاگری دۆزەخیشا، زەهرەکەی کە لەدونیادا خۆی پێکوشتووە، هەروا لەناودەستیاو پەیتا پەیتا دەیخوا، یا دەیخواتەوە و هەتا هەتایە بەئێجگاری لەئاگری دۆزەخ دا، دەبێو هەمیشەیش ئەمە حاڵو کارو پیشەی دەبێ).

(وەکەسێ بەپارچە ئاسنێ خۆی بکوژێ، وەك ئەوە بەخەنجەرێ یا بەکێردێ، یا بەدەمانچەیێ، بەقەستی خۆی بکوژێ، ئەوە لەئاگری دۆزەخیشا

---

[٦٩] مختصر صحيح البخاري - تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٨٨٩ - بخاری: ٥٧٧٨. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ١٠٢٦ - شيحا: ٢٩٦.




ئەو پارچە ئاسنە دەگرێ بەدەستیەوە و خۆش خۆش، بەردەوام دەیکا بەورگی خۆیا، ئیتر هەتا هەتایە لەئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوەو، ئەوە حاڵیەتی). (تاج/٣ ز/٨١ ل/٢٠٣ ژ/٧).

**روونکردنەوە:**

مەبەست هەڕەشەکردنە لە خۆکوشتنن دەنا هەر کەسێ لەسەر باوەڕو ئیمان بمرێ، بەهیچ تاوانێ لەڕەحمەتی خوداو لەبەهەشت نائومێد نابێ. عەسقەلانی –ڕەحمەتی خوای لێ بێ- ئاوا تەئویلی ئەم فەرموودەیە دەکا: (ئەمە سزای ئەوکەسانەیە کەئەم تاوانە گەورەیە ئەنجام دەدەن، مەگەر خودا بەمیهرەبانی خۆی چاو پۆشی لێ بکاو، لە دۆزەخی هەمیشەیی ڕزگاری بکاو بیباتە بەهەشتی بەرینی نەبڕاوە).

٧٠- عَنْ ثَابِتِ بْنِ الضَّحَّاكِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) وَكَانَ مِنْ أصْحَابِ الشجرة عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَنْ حَلَفَ بِمِلَّةٍ غَيْرِ الْإِسْلَامِ، كَاذِبًا مُتَعَمِّدًا فَهُوَ كَمَا وليس ابْنِ آدَمَ نَذْرٌ فيما لاَ يَمْلِكُ، وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِشَيْءٍ فِي الدنيا عُذِّبَ بِهِ فِي يوم القيامَةِ وَمَنْ لَعَنَ مُؤْمِناً، فَهُوَ كقتلِهِ، ومَنْ قَذَفَ مُؤْمِناً بِكُفْرٍ فَهُوَ كَقَتْلِهِ):[٧٠]

ثابتی کوڕی ضحاك (ڕەزای خوای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: هەرکەسێ سوێند بخوا بەمیللەتی غەیری ئیسلام، وەك ئەوە بە قەستی دڵ بڵێ: ئەگەر ناپاکی لەگەڵ خۆم بکەم جوولەکە بم، وە لەپاشا درۆزن دەرچێ و ناپاکی لەگەڵ خۆی بکا، ئەوە وەك خۆی دەڵێ وایە، بەو قسەیەی کافر دەبێ، نەزرکردنی شتێ دانامەزرێ کە هی تۆ نەبێ، وە کەسێ بە شتێ خۆی بکوژێ لەناو ئاگری دۆزەخیشا، دیسانەوە بەو شتەیە سزا دەدرێتەوە،

---

[٧٠] مختصر صحیح البخاری/٢، ژمارە: ٦٤٧ = بخاری/١٣٦٣. شیحا: ٢٩٨.




لەعنـەت و نـەفرەت کـردنیش لـە موسـوڵمان بـە قـەد کوشـتنەکەی گوناهـەو، موسوڵمان چی لەعنەتی لێ بکەیت و چی بیکوژی چوون یەکە، وە ئـەو کەسـەی بەموسوڵمان بڵێ: ئەی بێ بـڕوا ! ئـەی کـافر ! ئـەوە وەك بیکـوژی وایـە) (تـاج/٣ ل/٣٢٥ ف/٣ - ش/د/ت/ن).

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

ثابیتی کوڕی ضحاك ئەنـصاریە، لەکۆمـەڵی اصحاب الـشجرەیە، کـە پێیـان دەوترێت: تاقمەی بەیعەتولڕیزوان، بـەڵام ئەوکاتـە منـاڵ بـووە، ئامـادەی غـەزای بـەدرو صـوڵحی حودەیبییـەو غـەزای خەنـدەق وحـەمرائول ئەسـەد بـووە. لـە اصابەدا دەفەرموێ: لەساڵی سێی بیعثەتدا لەدایك بووە، واقیـدی دەفـەرموێ: لـە سێی کۆچییدا لەدایك بووەو لە چل و پێنج دا مردووە.

**لێرەدا ئەم دووزیادەی هەیە :**

١. شت هەتا نـەبێ بـەماڵی مـرۆڤ نـەزرو بەخـشینی دانـا مـەزرێ، وەك تـۆ بڵێیت: ئەو مەلەبەحەواوە بۆ تۆ، کەمەلەکە هی تۆنـەبێ، یـا ئەگـەر ئـەم سـکەی ژنە کەم کچ بوو مارەم کرد لە کوڕەکەی تۆ، یا ئەگـەر لـەیلام مـارەکرد بـۆ خـۆم لەپاش شەوێ تەڵاقی کەوتبێ.

٢. لەعنـەت کـردن لەموسـوڵمان بەقـەد کوشـتنەکەی تـاوانێکی گەورەیـە و گوناهی بەقەد ئەو هەیە، بەڵام واتای وانییە: ئەگەر کەسێ لەعنەت لەکەسێ تـر بکـا لەسـەر ئـەوە دەکـوژرێ، هـەروەك چـۆن کەسـێ بەناهـەق کەسـێ بکـوژێ دەکوژرێتەوە.

٧١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ شَهِدْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) خيبر فَقَالَ لِرَجُلٍ مِمَّنْ يُدْعَى بِالإِسْلاَمِ « هَذَا مِنْ أَهْلِ النَّارِ » فَلَمَّا حَضَرْنَا الْقِتَالَ قَاتَلَ الرَّجُلُ قِتَالاً شَدِيدًا فَأَصَابَتْهُ جِرَاحَةٌ فَقِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ الرَّجُلُ الَّذِى قُلْتَ لَهُ آنِفًا « إِنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ » فَإِنَّهُ قَاتَلَ الْيَوْمَ قِتَالاً شَدِيدًا وَقَدْ مَاتَ. فَقَالَ النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم): « إِلَى النَّارِ » فَكَادَ بَعْضُ الْمُسْلِمِينَ أَنْ يَرْتَابَ فَبَيْنَمَا هُمْ عَلَى ذَلِكَ إِذْ قِيلَ إِنَّهُ لَمْ يَمُتْ وَلَكِنَّ بِهِ جِرَاحًا شَدِيدًا فَلَمَّا كَانَ مِنَ اللَّيْلِ لَمْ يَصْبِرْ عَلَى الْجِرَاحِ فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَأُخْبِرَ النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم) بِذَلِكَ فَقَالَ: « اللَّهُ أَكْبَرُ أَشْهَدُ أَنِّى عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ ». ثُمَّ أَمَرَ بِلاَلاً فَنَادَى فِي النَّاسِ « إِنَّهُ لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ إِلاَّ نَفْسٌ مُسْلِمَةٌ وَإِنَّ اللَّهَ يُؤَيِّدُ هَذَا الدِّينَ بِالرَّجُلِ الْفَاجِرِ ».[٧١]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) ئامادەی غەزای خەیبەر بووین، پیاوێ بەموسوڵمان ناوزەد دەکرا، پێی فەرموو: (ئەم کابرایە دۆزەخییە؟).

جا کاتێ ئامادەی شەڕکردن بووین، ئەو پیاوە جەنگێکی دلێرانەی ئەنجامدا، زامارێکی سەخت بوو، عەرزی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرا: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو پیاوەی کەتۆ فەرمووت: دۆزەخییە، ئەمڕۆ جەنگێکی دلێرانەی کردو سەرەنجام کوژراو مرد؟! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەڕوا بۆ ناو ئاگری دۆزەخ). بەهۆی ئەم داستانەوە خەریك بوو هەندێ کەس تووشی گومان و دڵەڕاوکێ ببێ.

جا ئەوەندەی پێ نەچوو، گوترا: پیاوەکە نەکوژراوە، بەڵام زامێکی کاریگەری سەختی لێکراوە، جا لەشەودا، ئوقرەی لێ هەڵ دەگیرێ و ئارام ناگرێ و خۆی دەکوژێ!!

---

[٧١] مسلم. شیحا: ٣٠١. تەجرید/٤، ژمارە: ١٥٧١م = ٤٢٠٤ بخاری.

**جا هەواڵ درا بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە کابرای ناوبراو خۆی کوشت. ئەویش (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەی فیسارە کەس! ئادەی هەڵسە بەفەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا، جاڕبدە بەناو خەڵکەکەداو بانگەواز هەڵبدە کە: بێجگە لە موسوڵمان، کەسی تر ناچێتە ناو بەهەشت، بەهەشت لەسەر کافری بێباوەڕ حەرامە، زۆرجاریش وادەبێ کە خودای گەورە بەهۆی پیاوی بەدکارەوە یاریدەی ئەم ئایینی پیرۆزی ئیسلامە دەدات).**

٧٢- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) الْتَقَى هُوَ وَالْمُشْرِكُونَ، فَاقْتَتَلُوا، فَلَمَّا مَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِلَى عَسْكَرِهِ، وَمَالَ الآخَرُونَ إِلَى عَسْكَرِهِمْ، وَفِي أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) رَجُلٌ لاَ يَدَعُ لَهُمْ شَاذَّةً ولا فاذَّة إِلاَّ اتَّبَعَهَا، يَضْرِبُهَا بِسَيْفِهِ، فَقَالُوا: مَا أَجْزَأَ مِنَّا الْيَوْمَ أَحَدٌ كَمَا أَجْزَأَ فُلاَنٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « أَمَا إِنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ »! فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: أَنَا صَاحِبُهُ أَبَدًا، قَالَ: فَخَرَجَ مَعَهُ، كُلَّمَا وَقَفَ، وَقَفَ مَعَهُ، وَإِذَا أَسْرَعَ، أَسْرَعَ مَعَهُ، قَالَ: فَجُرِحَ الرَّجُلُ جُرْحًا شَدِيدًا، فَاسْتَعْجَلَ الْمَوْتَ فَوَضَعَ نَصْلَ سَيْفِهِ بِالأَرْضِ، وَذُبَابَهُ بَيْنَ ثَدْيَيْهِ، ثُمَّ تَحَامَلَ عَلَى سَيْفِهِ، فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَخَرَجَ الرَّجُلُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ اللَّهِ، فَقَالَ: « وَمَا ذَاكَ »؟ قَالَ: الرَّجُلُ الَّذِي ذَكَرْتَ آنِفًا أَنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَأَعْظَمَ النَّاسُ ذَلِكَ، فَقُلْتُ: أَنَا لَكُمْ بِهِ، فَخَرَجْتُ فِي طَلَبِهِ حَتَّى جُرِحَ جُرْحًا شَدِيدًا، فَاسْتَعْجَلَ الْمَوْتَ، فَوَضَعَ نَصْلَ سَيْفِهِ بِالأَرْضِ وَذُبَابَهُ بَيْنَ ثَدْيَيْهِ، ثُمَّ تَحَامَلَ عَلَيْهِ فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عِنْدَ ذَلِكَ: « إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ

أَهْلِ الْجَنَّةِ، فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ، وَهُوَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ النَّارِ، فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ، وَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ». (٧٢)

سەهلی كوڕی سەعدی ئەل‌ساعیدی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەرو سوپاكەی لەگەڵ دوژمنی هاوبەشپەیداكارانا، ئاوقەدی یەكتری بوون‌و بوو بەجەنگ‌و كوشتار لەنێوانیاندا، جا كاتێ هەردوولا بەرەو بەرەی خۆیان كشانەوە، پیاوێ هەبوو لەناو یارانی پێغەمبەردا، لەكاتی شەڕەكەدا، بەرەنگاری هەریەكێ لە لەشكری دوژمن ببوایە بوارەی نەدەدا، بە شمشێر دایدەگرت. یارانی پێغەمبەر (دروودی خودا لە پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەیارانی بێ) فەرموویان: بەڕاستی ئەمڕۆ فیسارەكەس فریامان كەوت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەی ئەو زەلامە لە ئەهلی دۆزەخە). پیاوێ لە موسوڵمانان فەرمووی: دەبێ من دوای بكەوم‌و ئەم هۆ نهێنییەی كەدەبێ بەهۆی چوونە دۆزەخی بدۆزمەوە!

فەرمووی: جا شوێنی دەكەوێ لەكاتی شەڕكردن‌و هەڵمەتبردندا، پیاوە ئازاكە لەكوێ دەوێستێ، ئەویش لەوێ لەگەڵی دەوێستێ، لەكوێ خێرا دەڕوا ئەویش لەوێ خێرا دەڕوا، جا لەكاتی شەڕو هەراو پێكهەڵپڕژانا، پیاوە ئازاكە زامار دەكرێ‌و زامێكی سەختی لێ دەكرێ، جا پەلە لەمەرگی خۆی دەكا، مشتووی شمشێرەكەی لەسەر زەوییەكە دادەنێ‌و نووكەكەی لەنێوانی هەردوو مەمكیدا دادەنێ‌و ئەوجا بەهەموو هێزی خۆی بە حوججەت خۆی دەدا بەسەر شمشێرەكەیداو خۆی دەكوژێ!

---

(٧٢) مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ١٠٢٧ = شيحا: ٣٠٢. مختصر صحيح البخاري/٤، ژمارە: ١٥٧١ = بخاري: ٤٢٠٣، ٤٢٠٢، ٤٢٠٧، ٦٤٩٣، ٦٦٠٢.

جا پیاوەکەی کە شوێنی کەوتبوو هاتەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و عەرزیکرد: شایەتی بەهەق دەدەم کەتۆ پێغەمبەری رەانەکراوی خودای بۆ سەر بەرەی ئادەمیزاد، فەرمووی: (چۆن). گوتی: چونکە ئەوەی کە فەرمووت لەبارەی ئەو پیاوەوە هاتەدی، ئەوەبوو کەتۆ فەرمووت ئەو پیاوە لەخەڵکی دۆزەخە، خەڵکەکە ئەوەیان لەلا زەحمەتو ئەستەم بوو، چۆن چۆنی ئەو ئەوەندە ئازاو سوودمەندبێ بۆ سوپای ئیسلام کەچی دۆزەخی بێت؟!

منیش پێیانم گوت: لێی گەڕێن بۆ منو من ئەم مەتەڵەتان بۆ هەڵ دەهێنمو ئەم نهێنییەتان بۆ دەردەخەم، ئیتر شوێنی کەوتم، جا پیاوە چۆن چۆنی زامار بوو، وەچۆن چۆنی خۆی کوشت، ئاوا لەنووکەوە گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پاش بیستنی ئەم داستانە فەرمووی: (پیاوی واهەیە کردارو رەفتاری وەك کردارو رەفتاری بەهەشتیی وایە، لەخەڵك وایە بەهەشتییە، بەلام خۆی دۆزەخییە، پیاوی وایش هەیە بە پێچەوانەوە، لەخەڵك وایە کە دۆزەخییە، بەلام خۆی بەهەشتییە). خودا بمانپارێزێ لەشتی وا). {بڕوانە: تاج/١، لاپەڕە: ٤٠، زنجیرە: ٦ فەرموودەی چوارەم چاپی یەکەم - ژمارە: ٣٧، ٣٨، ٣٩، ٤٠، ٤١، تاج/١، چ/٤}.

## ڕاڤەو ڕوونکردنەوە:

ئەم جۆرە فەرموودەیە لە زۆر ڕووەوە پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە:

١- وەك: پیاو نموونەیە نەوەك مەرج و قەید، ژنیش هەروایە لە کاتی وادا، واتە: کەسەکە ژن بێ یان پیاو جیاوازی نییە.دووەم: مەبەست لەم جۆرە تەعبیرانە (ئەوە دۆزەخیە) یا (ئەوە لەئاگردایە) ئاگری هەتاهەتایی نییە،

بــــەڵكوو مەبەســـت ئەوەيـــە: كـــە بـــەهۆی هەنـــدێ كـــاری گوناهـــەوە، شـایانی ئەوەیـە كـە بـچێتە نـاو دۆزەخـەوە، وە بـەپێی تـاوان و گوناهەكـەی لەدۆزەخا بمێنێتـەوە، دوايـی لـە دۆزەخ دەرچێ و بـچێتە نـاو بەهەشت، مەگـەر لەهەندێ حالا كـە كابرا كـافر، يامونـافق، يامولحيـد بـێ. هـەتا ئەمڕۆكـەش زۆر جار خودا بەهۆی پياوی بەدكارەوە، ئيسلام سـەردەخا. دەڵێن: ئـەم پيـاوە نـاوی قزمان بووە، راڤەنووسان وايان لەقەڵەم داوە، كە قەزمان بـەكافری مردبـێ، يابـە فاسقی.

٢- زانايان دەفەرموون: خۆ كوژ بەدكارو فاسقە، بـەڵام بـە خۆكـوژين كـافر نابێ، كەواتە: ئەبەدی نابێ لەدۆەخا.

٣- ناونيشانی باش ئاشكرا بكرێ باشە، وەك: ئەوە بگـوترێ: مامۆسـتا مـەلا عەبدولكـەريمی بيـارە زانايـەكی گەورەيـە، كاكـە احمـد شـێخ وەلی خوابـووە، خـــەواريقی شـــەرعی لێ بينـــراوە بـــۆ ئـــەم بڕگەيـــە ئيمـــامی عەســـقەلانی لـــە فەتحولباريدا بەدەق دەفەرموێ: (وفي الحديث جواز اعلام الرجـل الـصالح بفـضيلة تكون فيه).

٤- بەبێ ڕاجيايی، بەپێی دەقی ئايەتی قورئان، هـەموو گونـاهێ بێجگـە لـە هاوڕێ بڕياردان بۆ خودای گەورە، ئەگەری لێ خۆشبوونی هەيە وە زۆربـەی ئـەم هەوالانەی كە پێغەمبەر (دروودی خودای لـێ بێ) لـەم بارەيـەوە ڕايگەيانـدوون لەم جۆرەن، لەبەر ئەوە بۆ ئێمە واباشە لەم كاتـا نـەداعيبرەت و پەنـدو دەرس و وانــە لەفەرموودەكـە و ناوەڕۆكەكـەی وەربگـرين، نـەوەك گومـانی بـە دوقـسەی خراپ بـەم جۆرەكەسـانەی لـەم جـۆرە فەرموودانـە دا نـاوبراون بكـەين، چـونكە زۆرينـەيان لەوە دوا ئيسلام بوون مرۆی باشيان لێ دەرچووە.

سەهل خۆی‌و سەعدی باوكی صەحابە بوون.

١. سەهل لە گەورە پیاوانی هاوڕێیانە، ناوی حەزن بووە، واتە: سەخت (سەهل) واتە: خۆش‌و ئاسان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناوەکەی گۆڕی‌و ناوی نا سەهل، ئەنصارییە، سەدو سیی‌و هەشت فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، سیی‌و نۆ فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە، یان چل‌و یەك فەرموودە، پتر لەسەد ساڵ ژیاوە، لە نەوەدو یەکی کۆچیدا لە مەدینە بە مەرگی خودا مردووە، کاتێ پێغەمبەر مردووە پازدە ساڵ بووە، ئیمامی زوهری فەقێی بووە، یەکێ بووە لەو هاوڕێ نازدارانەی پێغەمبەر، کە حەججاجی ثەقەفی گەڕی پێ کردوون‌و، ئازاری داون! {بڕوانە: تەجرید/١/١٩٢، ژمارە: ١٧٤}.

٢. سەعدی کوڕی مالیکی کوڕی خالید باوکی سەهلی کوڕی سەعدی ئەل‌ساعیدییە، خۆی ئامادە کرد، کە لە خزمەت پێغەمبەردا بچێ بۆ غەزای بەدر، لەڕێ نەخۆش دەکەوێ‌و دەمرێ، راسپێرینامەکەی لەپاشکۆی کۆپانی ولاخەکەی دەنووسێ، رادەسپێرێ: کە ولاخەکەی بە کۆپانەکەیەوە بۆ پێغەمبەر بێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە تالانی بەدر پشکی بۆ داناو هەواڵیشی دا کە پاداشی تەواوی هاوبەشکەرانی غەزای بەدری بۆ هەیە لەلای خودا.

٧٣- عن جُنْدَبِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (كَانَ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ رَجُلٌ بِهِ جُرْحٌ فَجَزِعَ فَاخَذ سِكِّينًا فَحَزَّ بِهَا يَدَهُ فَمَا رَقَا الدَّمُ حَتَّى مَاتَ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى بَادَرَنِي عَبْدِي بِنَفْسِهِ حَرَّمْتُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ).[٧٣]

جوندوبی کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (پیاوێ لەنەتەوەکانی پێش

---

[٧٣] تەجرید/٤، ژمارە: ١٣٨١. بخاری: ٣٤٦٣، ١٣٦٤. مسلم تخريج الشيخ خليل مأمون شيحا: ٣٠٢.

ئێوە بریندار دەبێ، ئۆقرەی لێ هەڵ دەگیرێ، چەقۆیێ دەهێنێ، دەستی خۆیی پێ لەت دەکا، ئیتر خوێنەکەی ناگیرسێتەوە، هەتا دەمرێ. خوای گەورە دەفەرموێ: (ئەم بەندەیەی من دەست پێشکەری لێ کردم و پەلەی لەمەرگی خۆی کرد، وا منیش لەسەر ئەوە بەهەشتم لێی قەدەغە کرد). (تاج/٥، زنجیرە: ١١، ژمارە: ٤٧٤٥).

جوندوبی کوڕی سوفیان ناوی تەواوی: جوندوبی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی سوفیانی بەجەلییە، بە دوو شێوە گێڕانەوەی لێوە دەکرێ: جوندوبی کوڕی عەبدوڵلا بەناوی باوکیەوە، جوندوبی کوڕی سوفیان بەناوی باپیریەوە، لە کۆفە دادەنیشت لەپاشا لە بەصرە، ناودار بوو بە جوندوبی خێر، لە بوخاریدا هەشت فەرموودەی هەیە، لە موسلیما دیسان فەرموودەی هەیە، لە هاوەڵە پاشینەکانی پێغەمبەرە، خۆی دەفەرموێ: بەسەرینیی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) من جەهێڵێکی تەواو بووم، هەوەڵی دەمم بوو). (بڕوانە: تەجرید. ژمارە: ١١٥٤ = بەرگی/٣/٢٨٥).

## (٤٨) بابُ: غِلَظِ تَحْرِيمِ الغُلُولِ وَ أَنَّهُ لا يَدْخُلُ الجَنَّةَ إلاَّ المُؤْمِنُونَ
## گزیو ناپاکی لەدەستکەوتی جەنگی تاوانێ زۆر گەورەیە، تەنیا باوەڕداریش دەچێتە بەهەشتو بەس

٧٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) إِلَى خَيْبَرَ، فَفَتَحَ اللَّهُ عَلَيْنَا، فَلَمْ نَغْنَمْ ذَهَبًا وَلاَ وَرِقًا، غَنِمْنَا الْمَتَاعَ وَالطَّعَامَ وَالثِّيَابَ، ثُمَّ انْطَلَقْنَا إِلَى الْوَادِي، وَمَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَبْدٌ لَهُ وَهَبَهُ لَهُ رَجُلٌ مِنْ جُذَامٍ يُدْعَى رِفَاعَةَ بْنَ زَيْدٍ مِنْ بَنِي الضُّبَيْبِ، فَلَمَّا نَزَلْنَا الْوَادِيَ، قَامَ عَبْدُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَحُلُّ رَحْلَهُ فَرُمِيَ بِسَهْمٍ، فَكَانَ فِيهِ حَتْفُهُ، فَقُلْنَا: هَنِيئًا لَهُ الشَّهَادَةُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « كَلاَّ

وَالَّذِى نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ إِنَّ الشَّمْلَةَ لَتَلْتَهِبُ عَلَيْهِ نَارًا، أَخَذَهَا مِنَ الْغَنَائِمِ يَوْمَ خَيْبَرَ لَمْ تُصِبْهَا الْمَقَاسِمُ »، قَالَ: فَفَزِعَ النَّاسُ، فَجَاءَ رَجُلٌ بِشِرَاكٍ أَوْ بِشِرَاكَيْنِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَصَبْتُ يَوْمَ خَيْبَرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « شِرَاكٌ مِنْ نَارٍ، أَوْ شِرَاكَانِ مِنْ نَارٍ».[٧٤]

ئەمە دەقی عەرەبی (مختصر صحيح مسلم) ژمارە (١١٨٠)یە. کەمێ لەگەڵ دەقەکەی (اللؤلؤ والمرجان)دا جیاوازی هەیە، بەڵام ئەم روونترە.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ساڵی غەزای خەیبەر لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەرچووین بۆ خەیبەر، خودا قەڵاکەی بۆ ئازادکردین، لەوێ جلو بەرگو شتومەكو خۆراكو ماڵاتمان بە تاڵانی گرت، بەڵام زێڕو زیومان دەست نەکەوت، جا پێغەمبەرو سوپاکەی بەرەو وادیلقورا کەوتنەڕێ، خوڵامێکی رەشی پێغەمبەر هەبوو ناوی میدعەم بوو، پیاوێ لەهۆزی جوزام کەناوی ریفاعەی کوڕی زەیدبوو، کە لەبەنی چوبەیب بوو، ئەو خوڵامەی بەخشیبوو بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ لە شیوەکەدا باروبنەمان خستو لاماندا بۆ حەوانەوەو وچان، ئەو خوڵامە خەریك بوو بارگەکەی پێغەمبەری دادەگرت، لەو حەلەدا تیرێ هات بەریکەوتو کوشتی، ئێمەیش گوتمان: شەهیدبوونی پیرۆزو نۆش بێ، ئەی پێغەمبەری خودا! یاخوا بەهەشت نۆشی گیانی بێ. کەچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نەخێر وانییە، بەوکەسە کە گیانی منی وا لەدەستا، کە خودای گەورەیە، میدعەم وا لەناو ئەو باڵا پێچەدا، کە لەتاڵانییەکەی رۆژی خەیبەر بردبووی بۆ خۆی، بەرلەوەی کە دابەش بکرێ، باڵا پۆشەکە لەبەریا گڕ گڕ دەسووتێ!).

---

[٧٤] مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١١٨٠ - شیحا: ٣٠٦. بخاری: ٢٩٧٣، ٦٣٢٩، ٤٢٣٤، ٦٧٠٧.

فەرمووی: خەڵکەکەیش کە گوێیان لەم هەڕەشەیەی پێغەمبەر بوو، کە کردی لەو کەسانەی کە دەستپیسی دەکەن لە تاڵانیو دەسکەوتی شەرعی غەزا، تۆقینو زۆر ترسانو زەندەقیان چوو، پیاوێ چوو قەیتانێ، یادوو قەیتانی پێڵاوی هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمەم لەڕۆژی خەیبەردا دەست کەوتووەو تەسلیمم نەکردووە، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (قەیتانێکە) یا فەرمووی: (دوو قەیتانن لەئاگر). {تاج/٤، زنجیرە: ٦٨، ژمارە: ٤٥٣١} .

## (٥٣) باب: هَلْ يُؤَاخَذُ بِأَعْمَالِ الجاهِلِيَّةِ
## ئایا بەهۆی کردەوەی کاتی سەردەمی نەفامییەوە مرۆڤ بەرپرسیار دەبێ، یانا؟

٧٥- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ أُنَاسٌ لِرَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَنُؤَاخَذُ بِمَا عَمِلْنَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ؟ قَالَ: « أَمَّا مَنْ أَحْسَنَ مِنْكُمْ فِي الإِسْلاَمِ فَلاَ يُؤَاخَذُ بِهَا، وَمَنْ أَسَاءَ أُخِذَ بِعَمَلِهِ فِي الْجَاهِلِيَّةِ وَالإِسْلاَمِ». [٧٥]

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود، کە ناودارو ناسراوە، بە ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خەڵکانێ لە پێغەمبەریان پرسی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا لەسەر ئەو کردەوە خراپانەی کە لەسەردەمی نەفامی پێش هاتنی ئایینی ئیسلاما کردوومانن سزاو ئەشکەنجە دەدرێین لە دوارۆژدا؟ فەرمووی: (هەرکەسێ لەپاش موسوڵمان بوون ڕەفتارو کرداری جوان بێ، لەسەر کارو کردەوەی سەردەمی کافریو بێباوەڕی پێش ئیسلامبوونی سزا نادرێو، ئەو جۆرە خراپانەی پرسینەوەی نییە، بەڵام هەرکەسێ لەسەردەمی

---

[٧٥] مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٦٥ - شيحا: ٣١٤. بخاری/٦٩٢١.

ئیسلامەتیدا کردارو رەفتاری ناشیرین بێو بەدکردارو بەد رەفتار بێ، تۆڵەی بەرودوای لێ دەسێنرێو لەسەر هەردوو سەردەمەکە موحاسەبە دەکرێ).

## (٥٤) بابُ: كَوْنِ الإسْلامِ يَهْدِمُ مَاقَبْلَهُ وَكَذا الهجرة وَالحَجّ
## ئیسلامو کۆچو حەج گوناهی پێش خۆیان پاك دەکەنەوە!

٧٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ نَاسًا مِنْ أَهْلِ الشِّرْكِ كَانُوا قَدْ قَتَلُوا وَأَكْثَرُوا وَزَنَوْا وَأَكْثَرُوا ، ثُمَّ أَتَوْا مُحَمَّدًا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالُوا: إنَّ الَّذِي تَقُولُ وَتَدْعُو إِلَيْهِ لَحَسَنٌ وَلَوْ تُخْبِرُنَا أَنَّ لِمَا عَمِلْنَا كَفَّارَةً . فَنَزَلَتْ: {وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا} وَنَزَلَ ( قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لاَ تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ).

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) فەرمووی: کۆمەڵێ لەبتپەرستەکان، خەڵکێکی زۆریان بەناهەق کوشتبوو، وەزیناو داوێنپیسی زۆریان کردبوو، جا بەپێی خۆیان هاتنە لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) گوتیان: ئەی موحەممەد! ئەمەی تۆ دەیڵێیتو خەڵك بانگ دەکەی بۆسەری، شتێکی زۆر جوانو شیرینەو لێی جوانترو باشتر نییە، بەڵام خۆت دەزانی کە ئێمە حاڵەکەمان ئاوایە: تاوانێکی زۆرمان تێ گوشیوە، پیاوی زۆرمان کوشتووە، داوێنپیسیمانکردووە، جا ئایا ئەم کردەوە خراپانەی کە ئێمە کردومانن، کەفارەتو برێتیو پاکبوونەوەیان بۆهەیە، ئەگەر ئێمە موسڵمان بووین یانا؟!

جا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە دابەزی: {وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا} (سورة الفرقان-٢٥/٦٨).

واتــە: بەنــدە باشــەکانی خــودای گــەورەو میهرەبــان، ڕەوشــێکی بــەرزی تریــشیان هەیــە، کەئەوەیــە، بــەس خــودای گــەورەو مــەزن دەپەرســتن‌و داوای هەمووشتێ هەر لەخودا دەکەن، وەکەسێ کەخودا کوشتنی ئەوی قەدەغە کردبێ نایکوژن، مەگەر لەبەرهۆیەکی ڕەوای هەق، بەپێی یاسانامەی خودا، وەلەهەمان کاتا داوێنپیسی‌و شەڕواڵپیسی ناکەن‌و داوێنپاك‌و ڕوو سوورن).

کاتێ کەئەم ئایەتە هات هاوبەشپەیداکەر (موشریك)ەکانی مەککە گوتیان: ئێمـە ئـەم تاوانانـەمان هـەموو کـردووە، کەواتـە ئیـسلامبوونمان چـی سـودێکی هەیە؟

جا خودا ئەم ئایەتەی نارد: {قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا} (سورة الزمر-٣٩/٥٣).

واتــە: ئــەی موحەممــەد! ئــەی پێغەمبــەری خۆشەویــست! بفــەرموو بەبەنـدەکانی مـن لەسـەر زمـانی مـن: ئـەی بەنـدەکانی مـن! ئـەی ئەوکەسـانەی کەسـتەمو تـاوانێکی زۆرتـان کـردووەو، بـاری دواڕۆژی خۆتـان قـورس‌و گـران‌و دیشوار کردووە، نائومێد مـەبن لەڕەحمـەتی خـودا، ئەگـەر ئێـوە بـە ڕاسـتی ڕوو لەخوداکەن‌و خۆتان فڕێ بدەنە بەرقاپی ئەو پادشا گەورەو میهرەبانە، دڵنیـابن، کە لێتان خۆش دەبێ، چونکە خودا ئەگەر ئارەزوو بکا لەهـەموو گوناهـێ خـۆش دەبێ، کەسێ نییـە کـەباڵا دەسـتی بێ‌و ڕێگـەی ئـەوەی لـێ بگـرێ. (تـاج/٤ ز/٢٢ ژ/٤٠٧١).

## (٥٥) باب: حُكْمِ عَمَلِ الْكَافِرِ إِذَا أَسْلَمَ بَعْدَهُ

## بڕیاری کردەوەی ناموسوڵمان چییە، ئەگەر لەپاش ئەو کردەوەیە موسوڵمان ببێ؟

٧٧- عَنْ عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ أَنَّ حَكِيمَ بْنَ حِزَامٍ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ قَالَ لِرَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى للَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (أَرَأَيْتَ أُمُورًا كُنْتُ أَتَحَنَّثُ بِهَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ مِنْ صَدَقَةٍ أَوْ عَتَاقَةٍ أَوْ صِلَةِ رَحِمٍ، أَفِيهَا أَجْرٌ؟ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « أَسْلَمْتَ عَلَى مَا سَلَفْتَ مِنْ خَيْرٍ». (٧٧)

عوروەی کوڕی زوبەیر فەرمووی: حەکیمی کوڕی حیزام (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی حەزرەتم کرد: قوربان! ئایا ئەو چاکانەی کە لەمەو پێش، لەسەردەمی نەزانی پێش هاتنی ئیسلامدا کردوومن، بە نیازی نزیکبوونەوە لە خودا، وەك خێرکردنو ماڵ بەخشینو کۆیلە ئازادکردنو بەسەرکردنەوەی خزمو خوێشو چاکە کردن لەگەڵ کەسوکار، ئایا پاداشیان هەیە، وە بەکردەوەی چاکە دەژمێررێن بۆم؟ خۆشەویست فەرمووی پێم: (بەڕاستی لەسەر بناغەو پێشینەیەکی باش موسوڵمان بوویت). (بڕوانە: ژمارە: ٦٥ + تەجرید/٢/١١٠، ژمارە: ٦٨٥).

### ڕوونکردنەوە:

١- ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە کردەوەی باشی کاتی بێباوەڕی، لەپاشس ئیسلامبوون، سوودی هەیە بۆ خاوەنەکەی، هەروەك کردەوەی باشی پێش ڕەسیدە بوون، سوودی هەیە بۆ خاوەنی لەپاش باڵق بوون.

(٧٧) مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٧٠ - شیحا: ٣١٩. تەجرید/٢، ژمارە: ٦٨٩. بخاری/١٤٣٦، ٢٢٢٠، ٢٥٣٨.




٢- حەكیم برازای حەزرەتی دایكە خەدیجەی هاوسەری پێغەمبەرە (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لە خەدیجەو حەكیم بێ)، یەكێ بوو لە بەگزادەكانی قورەیش، ریفادە لە دەستی ئەودا بوو، ریفادە ئەوە بوو: قورەیش لەناو خۆیاندا، هەركەسێ بەپێی توانای خۆی، بڕێ بەخششی دەدا، هەتا سامانێكی زۆریان كۆكردەوە، جا لەومالە خواردەمەنیو مێووژو خۆشاویان دەكڕی، وە لە رۆژانی حەجدا دەرخواردی خەڵكو حاجیانیان دەدا، حەكیم دەیفەرموو: (سیازدە ساڵ لەپێش ساڵی فیل (عامول فیل)دا، لەدایك بووم، لەبیرم دێ كە عەبدولموتتەلیبی باپیرەی پێغەمبەر، دەیویست بۆ جێبەجێ كردنی نەزرەكەی، عەبدوڵلای كوڕی سەرببڕێو بیكات بە قوربانی، چونكە عەبدولموتتەلیب نەزری كردبوو ئەگەر دە كوڕی ببێ، یەكێكیان بكات بە قوربانی، وە ویستی عەبدوڵلای كوڕی بكات بە قوربانی، دوایی فیدیەی دا، حەكیم لەناو ژووری كەعبەدا لە دایك بووە، لە جاهیلییەتدا سەد ساڵ ژیاوە، لە ئیسلامیشدا شەست ساڵ ژیاوە، شەست كۆیلەی لەسەردەمی نادانی پێش ئیسلامدا ئازاد كردووە، لەسەردەمی ئیسلامدا حەجی كردووە، لە حەجێكا سەد وشتری دیاری بەیتی پێ بوو، كاتێ لە چیای عەرەفە، لە رۆژی عەرەفەدا راوەستا، سەد كۆیلەی هێنا بوو، لەوێ لەگەڵیا راوەستا بوون، لەگەڵیا حەجیان دەكرد، هەر سەدیان یەكی سەرو تەوقی زیوینیان لە گەردندا بوو، بە نەخش لێیان نووسرابوو: ئەمانە ئازادكراوی خودان، لەبەر رەزای خودا، حەكیمی كوڕی حیزام ئازادی كردوون، هەزار سەرپەزیشی كرد بە دیاری (هەدی)ی بەیت).

حیزامی باوكی لە هەراكەی (فجار)دا كوژرا، حەكیم خۆشی ئامادەی ئەم هەرایە بووە، لەپێش بیعثەتدا دۆستی پێغەمبەر بوو، لەدوای بیعثەتیش هەر پێغەمبەری خۆش دەویست، بەڵام درەنگ ئیسلام بوو، یەكێ بوو لە (مسلمة)ی

فەتح، واتە: لەو موسوڵمانانەیە کە لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا، بۆ پاراستنی خوێنی خۆیان موسوڵمان بوون، وە زۆرینەی ئەمانە لەدواییدا موسوڵمانی جوانیان لێ دەرچوو، لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا بۆ ڕێزنان لە حەکیم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ بڕواتە ماڵی حەکیمی کوڕی حیزام، لەسەرو ماڵی خۆی دڵنیابێ).

حەکیم پیاوێکی زیری ڕێزداری لەخوا ترسی دەوڵەمەند بوو، زۆر بەخشندەو خێرکەر بوو، سەدو بیست ساڵ ژیاوە، ساڵی پەنجاو چوار، لەسەردەمی جێنشینی موعاوییەدا، لە مەدینە، لە ماڵی خۆیدا زایە بوو!!

## (٥٦) بابُ: صدقِ الإيمانِ وإخلاصه

## مەرجە کە باوەڕ باوەڕێکی ڕاستەو دروستەو ساخو پەتی بێو تێکەڵ بەشتی تر نەبێ

٧٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ لَمَّا نَزَلَتِ ( الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ ) شَقَّ ذَلِكَ عَلَى أَصْحَابِ رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّنَا لاَ يَظْلِمُ نَفْسَهُ فَقَالَ رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لَيْسَ كَمَا تَظُنُّونَ، إِنَّمَا هُوَ كَمَا قَالَ لُقْمَانُ لاِبْنِهِ (يَا بُنَيَّ لاَ تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ). [٧٨]

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کەئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: {الَّذِينَ آمَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُواْ إِيمَانَهُم بِظُلْمٍ} (الأنعام-٦/٨٢)

کەئەمە ڕاڤەو واتاکەیەتی: موسوڵمانی ڕاستو دروست بەپێی دەستوورەکانی ئایین، ئەو بڕوادارانەن کە باوەڕێکی ساخی ڕەسای بێ گەردو

[٧٨] مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ٢١٣٦. مسلم/شيحا: ٣٢٢. تجريد البخاری/١، ژمارە: ٣٠. بخاری: ٣٢، ٣٣٦٠، ٣٤٢٨، ٣٤٢٩، ٤٦٢٩، ٤٧٧٦، ٦٩١٨، ٦٩٣٧.

باشیان هەیە بەخودای خۆیانو بەهەموو پێغەمبەرانی پێش چەرخی خۆیانو بەپێغەمبەری سەردەمی خۆیان، باوەڕێکی پەتی وا کەتێکەڵی ستەمو زۆرو ستەم نەبێ، ئەوانە ئاسایشو ئارامیو هێمنیو دڵنیایی دادەبارێ بەسەریانا، خۆشیان شارەزای ڕێگەی ڕاستنو خواستو مرازو نیازیان هاتۆتە دی.

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود دەفەرموێ: کاتێ کەئەم ئایەتە، کەئەمە واتاکەی بوو، هات بۆ پێغەمبەر، بوو بەهۆی سەخڵەتیو نیگەرانی بوون بۆ یارانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ)و مەترسی ئەوەیان لێ نیشت کەبەر بەهرەی ئاسایشو ئارامیو دڵنیاییو شارەزا بوون لەڕێگەی ڕاست نەکەون، بۆیە گوتیان ئەی پێغەمبەری خودا! دەبێ کێ بێ لەئێمە کە زۆرو ستەمو ناهەقی لەخودی خۆی نەکردبێ؟ کەواتە: ئەم موژدەیە بەئێمە چی؟ بەڵکوو بەپێچەوانەوە ئەمە هەڕەشەیە لەئێمە، چونکە هەموو کەسێ لەئێمە، کەمو زۆر، بەشی خۆمان ستەممانکردووە؟

ئەویش (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: مەبەست ئەوەنییە کە ئێوە تێی گەیشتوون، بەڵکوو مەبەست لەو زوڵمو زۆرو ستەمەیە کەلەم ئایەتەدا باسکراوە، شیرکو هاوبەش دانانە بۆ خوداو، لەو چەشنە زوڵمو ستەمەیە کە لوقمان ئامۆژگاری کوڕەکەی خۆیی دەکرد کە توخنی نەکەوێ، کە قورئان دەیگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ (سورة لقمان-٣١/١٣).

واتە: ڕۆڵەی خۆشەویستم! ئەی کوڕی شیرینم! هەرگیز نەکەی هەڵەی وا گەورە بکەی، کە هاوبەشو هاوەڵو هاوڕێ بۆخودا بڕیار بدەی، چونکی زوڵمو زۆرو ستەمو ناهەقی پیشەی ملهووڕو خودا نەناسەکانە، هاوبەش دانانیش بۆ خودا گەورەترین زوڵمو زۆرو ستەمە.

## (٥٨) باب: تجاوز الله عن حديث النفس والخواطر بالقلب إذا لم تستقر
## چاوپۆشی دەكرێ لە خوتورات‌و ‌وتووێژی ناو دڵ بەمەرجێ جێبەجێ نەكرێ، نەبەكردن، نەبەگوتن

٧٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « إِنَّ اللَّهَ تَبارَكَ وَتَعَالى تَجَاوَزَ لأُمَّتِي مَا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا مَا لَمْ يَتَكَلَّمُوا أَوْ يَعْمَلُوا بِهِ». [٧٩]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خودای پاك‌و پیرۆزو گەورە، لەبەرخاتری من چاوپۆشی دەكا لەو خوتورات‌و وەسوەسەی كە دێت بە دڵی نەتەوەی ئیسلامی مندا، بەمەرجێ بە كردەوە پیادەی نەكەن، یا بەزمان نەیڵێن).

## (٥٩) باب: إذا همَّ العبدُ بحسنةٍ كُتبت وإذا همَّ بسيئةٍ لم تُكتب
## كەسێ نیازی هەبوو چاكەیێ بكاو نەیكرد، چاكەیەكی بۆ دەنووسرێ، ئەگەر ویستی خراپەیێ بكاو نەیكرد بە چاكەیێ بۆی دەنووسرێ

٨٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إذا أَسْلَمَ الْعَبْدُ فَحَسُنَ إِسْلَامُهُ يُكَفِّرُ اللَّهُ عَنْهُ كُلَّ سَيِّئَةٍ كَانَ زَلَفَهَا وَكَانَ بَعْدَ ذلِكَ الْقِصَاصُ الْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ وَالسَّيِّئَةُ بِمِثْلِهَا إِلَّا أَنْ يَتَجَاوَزَ اللَّهُ عَنْهَا). [٨٠]

ئەمە دەقی مختصر صحیح البخارییە، ژمارە (٣٩).

---

[٧٩] مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٦٨ = شیحا: ٣٣٢. تجرید البخاری/٢، ژمارە: ١٠٨٦. بخاری/٢٥٢٨، ٥٢٦٩، ٦٦٦٤.

[٨٠] تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٣٩. بخاری/٤٢ مسلم ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا - شیحا: ٣٣٤.

ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (کاتێ بەندەیێ موسوڵمان بوو، لەسەر شێوەیەکی جوان، ئیتر هەرچی گوناهێ لەوەپێش لەحاڵی بێ بڕوایی دا کردوویەتی، گەورەو بچووکی خوا لێی خۆش دەبێ، جا لەوەدوا هەرکارێ بکا بەپێی خۆی تۆڵەی هەیە، لەسەر ئەم شێوەیە:، چاکە لەیەك بەدەوە تا یەك بەحەوت سەد بۆی دەنووسرێ، خراپەیش یەك بەیەك بۆی دەنووسرێ، مەگەر خودا چاوپۆشی لێ بکاو لەسەری نەنووسێ).

## راڤەو شیکردنەوە:

ئەم فەرمودەیە موعەللەقە، لەبوخاری دا لەهیچ شوێنێکا بەموتتەصیلی ریوایەت نەکراوە، بۆیە بەموعەللەق دادەنرێ چونکە رشتە (سەنەد)ەکەی ئاوایە: مالیك فەرموویەتی: زەیدی کوڕی ئەسلەم هەواڵی پێم دا کە عەطای کوڕی یەسار هەواڵی پێ داوە، کەئەبو سەعیدی خودری هەواڵی پێداوە کەلە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو، جا لەبەرئەوەی بوخاری بەخزمەت مالیکی کوڕی ئەنەس نەگەیشتووە فەرموودەکە بەموعەللەق دادەنرێ، بەلام وەکوو دەبینین شێخی بوخاری (ڕەزای خوای لێ بێ) بەصیفەتی جەزم ڕێوایەتی کردوە لەبەر ئەوەی بوخاری بەخزمەت مالیکی کوڕی ئەنەس نەگەیشتووە فەرموودەکە بەموعەللەق دادەنرێ، بەلام نەسائیو حەسەنی کوڕی سوفیانو ئیسماعیلی بەمەوصولی گێڕاوویانەتەوە. کردەوەی چاکەی سەردەمی بێ بڕوایی کوێر نابێتەوە، دەخرێتە سەر کردەوەی چاکەی کاتی موسوڵمانەتی، لەبوخاریو موسلیم دا هەیە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەحەکیمی کوڕی حیزام دەفەرموێ: (لەسەر بناغەیەکی چاكو باش ئیسلام بوویت). تەماشای

بەرگی شەشەمی تاجول ئوصول، لاپەڕە ١٨٨ بکە، فەرموودەی (١١)و (١٢) = (ت/٦/ل/١٨٨ ف/١١ + ف/١٢ = تاج/٤ ز/٩ ژ/٣٨٨٥، ٣٨٨٦) لەهەموو شوێنێکی تریش ئەم هێمایانە بەم مەبەستەن.

٨١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّه عَنْهمَا عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّـه عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ فِيمَـا يَرْوِي عَنْ رَبِّهِ عَزَّ وَجَلَّ قَالَ قَالَ إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ ثُمَّ بَيَّنَ ذَلِكَ فَمَـنْ همَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللَّهُ لَهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً فَإِنْ هُوَ هَمَّ بِهَـا فَعَمِلَهَـا كَتَبَهَـا اللَّهُ لَهُ عِنْدَهُ عَشْرَ حَسَنَاتٍ إِلَى سَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ إِلَى أَضْعَافٍ كَثِيرَةٍ وَمَنْ هَمَّ بِسَيِّئَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللَّهُ لَهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً فَإِنْ هُوَ هَمَّ بِهَـا فَعَمِلَهَـا كَتَبَهَـا اللَّـهُ لَـهُ سَـيِّئَةً وَاحِدَةً. (٨١)

ئیبنو عەباس (ڕەزای خوا لەخۆیو بابی بێ) فەرمووی: لەفەرموودەیەکی قودسیدا، کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیگێڕێتەوە لەخودای گەورەو پیرۆزەوە، فەرمووی: خودای گەورە دەفەرموێ: خودا هەموو چاکەیەكو هەموو خراپەیەکی لە (لوح المحفوظ) نوسیوەو بەم شێوەیە روونی کردۆتەوە، بۆ هەموو کەسێ: ئەگەر کەسێ ویستی چاکەیێ بکاو بۆی نەکرا، ئەوە خودا لەلای خۆی چاکەیەکی تەواوی بۆ دەنوسێ، وەئەگەر کەسێ ویستی چاکەیێ بکاو لەهەمان کاتدا کردی ئەوە خودای سەردارو سەروەر لەلای خۆی لە دە چاکەوە تا حەوت سەد چاکە، تا ئەوەندەی خودا خۆی حەزدەکا چاکەی بۆ دەنوسێ، وەئەگەر کەسێ ویستی خراپەیێ بکات بەڵام نەیکرد ئەوە خودا لەلای خۆی چاکەیەکی تەواوی بۆ دەنووسێ، وەئەگەر کەسێ

---

(٨١) تەجرید/٥، ژمارە: ٢٠١٩. بخاری/٦٤٩١. مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٦٧ = شیحا: ٣٣٢، ٣٣٣، ٣٣٤، ٣٣٥.

ویستی خراپەیێ بکا، وەگردی، ئەوە خودا بەیەك خراپە دەینووسێ لەسەری.
(ریاض/١ ز/١ ژ/١١/١١ ل/١٦-ش. باسی: نیازو نیاز پاکی...).

(٦٠) باب: الوسوسة في الإيمان وما يقول من وجدها
دڵەڕاوکێ لەباوەڕە، کەسێ تووشی دڵەڕاوکێ بوو چی بڵێت

٨٢- عنْ أَبي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (يَأْتِي الشَّيْطَانُ أَحَدَكُمْ فَيَقُولُ مَنْ خَلَقَ كَذَا مَنْ خَلَقَ كَذَا حَتَّى يَقُولَ مَنْ خَلَقَ رَبَّكَ؟ فَإِذَا بَلَغَهُ فَلْيَسْتَعِذْ بِاللَّهِ وَلْيَنْتَهِ).[٨٢]

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (شەیتان دێ بەلای یەکێکتانەوە، دەچێتە بن کلێشەی و ختە ختەی دەداو دەڵێ: کێ ئەمەی دروست کردووە؟ کێ ئەوەی دروست کردووە؟ هەتا بەرەبەرە دەڵێ: ئەی کێ خودای تۆی دروست کردووە؟ کە کار گەیشت بەم رادەیە پەنا بگرن بەخوداو، واز بێنن لەم جۆرە ووتو ویرەیە) (ش/د-تاج/١ ل -٢٨ ز- ٣ف- ٣. باسی باوەڕ زیادو کەم دەکاو وەسوەسە زیانی پێناگەیەنێ).

لەپوختەی موسلیما/١، ژمارە: ١٧ب ئاوایە:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو خەڵکە هەر پرسیارتان لێ دەکەن سەبارەت بە زانست هەتا بەرە بەرە دەڵێن: دەی باشە ئەوا خودا ئێمەی دروست کردووە، ئەی کێ خودای دروست کردووە). گوتی: لەم کاتەدا ئەبو هورەیرە دەستی

---

[٨٢] مختصر . صحيح البخارى/٣، ژمارە: ١٣٢٢. بخارى: ٣٢٧٦. مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١٧ - آ. مسلم/شيحا: ٣٣٨، ٣٥٠ + مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١٧ - ب. شيحا: ٣٤٧.

پیاوێکی گرتبوو دەیفەرموو: خواو پێغەمبەر راستیان فەرموو، ئەوەتا هەتا ئێستا یەك كەس ئەم پرسیارەی لێ كردووم، ئەوا بەمەوە بوون بە دوان!.

لە مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١٧ — أ ئاوایە:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەردەوام خەڵك پرسیارتان لێ دەكەن، لەبارەی زانستەوە، تەنانەت كاردەگاتە ئەوە، شەیتان دەچێ بەلای كەسێكتانەوە، تا تەفرەی بدا، دەچێتە بن كلێشەیەوە، ختە ختەی دەداو دەڵێ: باشە ئەوا خودا ئەمەو ئەوەی دروست كردووە، ئەی كێ خودای دروست كردووە؟).

فەرمووی: جارێ لە مزگەوت بووم، لەودەمەدا، چەند عارەبێكی سارانشین هاتن بۆلام، گوتیان: ئەی ئەبو هورەیرە! باشە ئەوا خودا ئێمەو ئەم بوونەوەرەی دروست كردووە، ئەی كێ خودای دروست كردووە؟!

راوی دەفەرموێ: ئەبو هورەیرەیش مشتێ چەوی هەڵگرتو تێی گرتن، ئەوجا فەرمووی: هەڵسن هەڵسن، دەورم چۆڵكەن، ئێوە لەوانەن كە پێغەمبەر فەرموی پێمان: شەیتان دەچێتە بن كلێشەیان ... تاد. ئەوجا ئەبو هورەیرە فەرمووی: (دۆستی ئازیزی خۆشەویستم، پێغەمبەری خودا (سلاّوو دروودی خودای لەسەر بێ)، راستی فەرموو كە فەرمووی ئەم جۆرە پرسیارەتان لێ دەكەن، ئەوا لێیان كردین).

### روونكردنەوە:

پوختەی تەرجەمەو گێڕانەوەكە، لە هەموو ئەتراف و گێڕانەوەكانی موسلیم و بوخاری وەرگێڕاوە، لەبەرئەوە جێگەی بتمانەیە، مەبەستی سەرەكی بەندە تێگەیاندنی خوێنەری كوردە لە مەبەست و كورۆك و ناوەڕۆكی

فــەرموودەكان (بڕوانـــە: فـــتح البـــارى/٦/٣٣٦، رقـــم/ ٣٢٧٦. بــدء الخلــق = تەجريد/٣/٤٥٠، ژمارە: ١٣٢٢ + تەجريد/٥/٣٧٦، ژمارە: ٢١١٩).

٨٣- عَنْ أنس بن مالك (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لن يبرح النَّاسُ يَتَسَاءَلُونَ حَتَّى يقولوا: هَذَا خَلَقَ اللّٰهُ خَالِقُ كُلِّ شَيءٍ فَمَنْ خَلَقَ اللّٰهَ.

ئەنەسی كوڕی مالیك -ڕەزای خودای لێ بێ- فەرمووەی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو خەڵكە هەر بەرەبەرە پرسیار لەدوا پرسیار لەم شتو لەوشت دەكەن) تابەرەبەرە سەردەكێشێ بۆ ئەوە دەڵێن: باشە ئەوا خودا ئەم خەڵكو جیهانو بوونەوەرەی هەموو دروست كردووەو هەمووشتێ ئەو دروستكاریەتی، ئەی كێ خودای دروست كردووە؟) (تاج/١ ل/٢٨ ژ/٣+٤+٥ - ش).

## (٦١) باب: وَعِيد مَنْ اقْتَطَعَ حَقَّ مسلم بِيَمِينٍ فَاجِرَةٍ
## هەڕەشەی سەخت لەوكەسە كە بەسوێندی درۆ، مافی موسوڵمانێ، بەناڕەوا دەپچڕێ بۆ خۆی

٨٤- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ حَلَفَ يَمِينَ صَبْرٍ لِيَقْتَطِعَ بِهَا مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ ، لَقِيَ اللّٰهَ وَهْوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ » . فَأَنْزَلَ اللّٰهُ تَصْدِيقَ ذَلِكَ ( إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللّٰهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً أُولَئِكَ لاَ خَلاَقَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ ) إِلَى آخِرِ الآيَةِ. قَالَ فَدَخَلَ الأَشْعَثُ بْنُ قَيْسٍ وَقَالَ مَا يُحَدِّثُكُمْ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ قُلْنَا كَذَا وَكَذَا . قَالَ فِيَّ أُنْزِلَتْ كَانَتْ لِي بِئْرٌ فِي أَرْضِ ابْنِ عَمٍّ لِي قَالَ النَّبِيُّ – صلى الله عليه وسلم – « بَيِّنَتُكَ أَوْ يَمِينُهُ » فَقُلْتُ إِذًا يَحْلِفَ

ـ رَسُولَ اللَّهِ . فَقَالَ النَّبِيُّ – صلى الله عليه وسلم – « مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينِ صَبْرٍ يَقْتَطِعُ بِهَا مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ وَهُوَ فِيهَا فَاجِرٌ ، لَقِيَ اللَّهَ وَهُوَ عَلَيْهِ غَضْبَانٌ »: (٨٤)

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەسێ بەناهەق سوێند بخوا، هەتا بەو سوێنە نارەوایە ماڵی کەسێکی تر ببچڕێنێ بۆ خۆی، ئەوە کاتێ دەچێتە دیوانی خودا لەرۆژی ژینەوەدا، خودای گەورە زۆر توڕەیە لێی). جا خودا بۆ پشتیوانی ئەم فەرموودەیە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە:

﴿إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً أُوْلَئِكَ لاَ خَلاَقَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ وَلا يُكَلِّمُهُمْ اللَّهُ وَلاَ يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئالی عیمران -٧٧/٣}. واتە: (ئەو کەسانەی کەپەیمانی خوداو سوێندی خۆیان دەفرۆشن بەبەهایەکی کەمی دنیایی دەیانگۆڕنەوە، ئەوانە لەرۆژی پاشەڕۆژدا، بێ بەش‌و بارەن لەهەموو خۆشیەکی قیامەت، وەخودای گەورە قسەیان لەگەڵ ناکا، بەچاوی میهرو ڕەحمەتیشەوە تەماشایان ناکات، وەڕووی خۆشیان ناداتێ‌و پاکیان ناکاتەوەو تاریفیان ناکا، سەرەڕای ئەوەیش سزای سەختیان بۆ ئامادەکراوە).

جا ئەشعەثی کوڕی قەیس هات گوتی: (ئەوە باوکی عەبدوڕەحمان – واتە: ئیبنو مەسعود -چیان بۆ باس دەفەرموێ؟ ئەم ئایەتە پیرۆزە، هۆی هاتنی من بووم، داستانەکە ئاوابوو: بیرێکم هەبوو، لەزەوی ئامۆزایەکما بوو ئامۆزاکەم حاشای لێ کرد، بۆ دادگایی بردم بۆ خزمەتی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (کوا شایەتەکانت ئامادەیان بکە) گوتم: شایەتم نییە، فەرمووی: (دە سوێندی بدە) عەرزیم کرد: قوربان!

---

(٨٤) تەجرید/٣، ژمارە: ١٠٣٦. بخاری/٢٣٥٦. مختصر صحیح مسلم/٣، ژمارە: ١٠١٧ = شیحا: ٣٥٦.

سوێند دەخوات دەربەستی سوێند نایێ، ئیتر پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ئەم فەرموودەیەی فەرمووو. لەپاشاش خوای گەورە بۆ پشتیوانی فەرموودەکەی پێغەمبەر ئایەتەکەی نارد).

**راڤەو روونکردنەوە:**

١- بەپێی بنەمای (الحديثُ يفسِّرُ بعضُهُ بعضاً) بۆ وەرگێڕانەکە بەهرە لەگێڕانەوەو ئەطرافەکانی فەرموودەکان وەردەگیرێ. بۆ نموونە لەطەرەفی ژمارە (٢٥١٥) دا، ئەشعەث، سەبارەت بەمتمانە کردن بەسوێندو قسەی ئامۆزاکەی، سەبارەت بەم بابەتە عەرزی پێغەمبەر دەکا: (إذاً يحلِفُ ولايُبالي) بەلآم لەگێڕانەوەی ئێرەدا هۆی سوێنخواردنەکەی روون نەکراوەتەوە.

٢- ئەشعەثی کوڕی قەیس لەهۆزی کیندییە، کەسناوی: (باوکی موحەممەدە): (أبو محمد) ، لەساڵی دەی کۆچیدا لەگەڵ شاندێکی حەفتا کەسیدا، لەهۆزی کیندە هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) کە ئەو سەرۆکیان بوو، ئیسلام بوونی خۆیان راگەیاند، یەکێ بوو لەپادشاکانی کیندە، لەپاش دەرچوونی حەزرەت لەجیهان لەگەڵ زۆر کەس لەهۆزی کیندە لەئیسلام پاشگەزبوونەوە، بەدیلی هێنایان بۆلای ئەبوبەکر، داوای لێ کرد کەنەیکوژێ، وەسوودی لێ وەربگرێ لەشەڕەکانی ئایندەی دا، هەروەها داوای لەئەبوبەکر کرد کەخوشکێکی خۆی لێ مارەبکا، ئەبوبەکریش بەگوێی کردو فەروەی کچی ئەبوقوحافەشی لێ مارەکرد، جارێ جەریرو ئەشعەث ئامادەی سەرتەرمێ بوون، ئەشعەث جەریری پێش خۆی خست، وتی: چونکە من پاشگەزبوومەوە، بەلآم تۆ پاشگەز نەبوویتەوە.

لەپاش شەهید بوونی ئیمامی عەلی بەچل شەو مردوە، حەسەنی کوڕی عەلی نوێژی لەسەر تەرمەکەی کرد، لەبوخاری پیرۆزدا یەك فەرموودەی هەیە – رەزاو رەحمەتی خودای لەسەر بێ-.

**(٦٢) باب: الدَّلِيل عَلَى أنَّ مَنْ قَصَدَ أخْذَ مَال غَيْرِه بِغَيْرِ حَقٍّ كَانَ القَاصِدُ مُهْدَرَ الدَّمِ فِي حَقِّه، وَإنْ قُتِلَ كَانَ فِي النَّارِ، وَأنَّ مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِه فَهُوَ شَهِيدٌ**
**کەسێ بەناڕەوا بیەوێ ماڵی کەسێ تر ببا بۆ خۆی، ئەگەر بکوژرێ لەو پێناوەدا خوێنی نییەو جێگەی دۆزەخە، کەسێ لەسەر ماڵی خۆی بکوژرێ شەهیدە**

٨٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ).[٨٥]

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموومی: خۆشەویست فەرمووی: (هەر کەسێ لەسەر ماڵی خۆی بکوژرێ ئەوە شەهیدە). (ریاض/٣، زنجیره: ٢٣٥، ژماره: ١٣٥٤).

ئەمەیش روونکردنەوەیەکە بۆ ئەم فەرموودەیە:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! پێم بفەرموو ئەگەر زەلامێ هات ویستی بەزۆر ماڵی حەلاڵی خۆم ببات بۆ خۆی من چی بکەم؟ فەرمووی: (ماڵی خۆتی مەدەرێ!) گوتی: ئەی پێم بفەرموو ئەگەر ئەو کابرایە لەسەر ئەوە چوو بەگژما؟ فەرمووی: (تۆیش بچۆ بەگژیدا) گوتی: ئەی پێم بفەرموو ئەگەر لەم حاڵەدا ئەو منی کوشت، جێگەم کوێیەو پایەم

---

[٨٥] تەجرید/٣، ژمارە: ١٠٧٣. بخاری: ٢٤٨٠. مسلم: ١٤١. شیحا: ٣٥٨ = مختصر صحیح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٨٦ - مسلم تخریج و ترقیم محمد فؤاد عبدالباقی + تخریج شیخ خلیل مأمون شیحا.

چییه؟ فەرمووی: (تۆ شەهیدیتو جێگەت بەهەشته). گوتی: ئەی پێم بفەرموو ئەگەر لەحاڵی وادا من ئەوم کوشت، لەهەڵو مەرجی ئاوادا ئەو جێگەی کوێیە؟ فەرمووی: (ناو کلۆرەی دۆزەخە!). {ریاض/٣، زنجیره: ٢٣٥، ژماره: ١٣٥٧} + {تجرید/٣، ژماره: ١٠٧٣ = ٢٤٨٠}.

## (٦٣) باب: استحقاق الوالي الغاشّ لرَعيّته النّارَ
## سەرکردەیێ فێڵو گزی لە کۆمەڵەی خۆی بکا شایستەی دۆزەخە

٨٦- عَنِ الْحَسَنِ قَالَ: عَادَ عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ زِيَادٍ مَعْقِلَ بْنَ يَسَارٍ الْمُزَنِيَّ فِي مَرَضِهِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ، فَقَالَ مَعْقِلٌ: إِنِّي مُحَدِّثُكَ حَدِيثًا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، لَوْ عَلِمْتُ أَنَّ لِي حَيَاةً مَا حَدَّثْتُكَ بِهِ، إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: « مَا مِنْ عَبْدٍ يَسْتَرْعِيهِ اللَّهُ رَعِيَّةً يَمُوتُ يَوْمَ يَمُوتُ وَهُوَ غَاشٌّ لِرَعِيَّتِهِ، إِلاَّ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ ».[86]

ئەمە دەقی پوختەی موسلیمە، ژمارە (١٢١١) ئەمەیش وەرگەڕاوەکەیەتی:

حەسەنی بەصری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: مەعقیلی کوڕی یەساری ئەلموزەنی، کە هاوەڵی پێغەمبەر بوو، لەنەخۆشی سەرە مەرگا، عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد (کە ئەو سەردەمە فەرمانڕەوای بەصرە بوو) چوو بۆلای بۆ سەرخۆشی لێکردنی، مەعقیل پێی فەرموو: گوێ بگرە فەرموودەیەکی پێغەمبەرت بۆ بگێڕمەوە، کە خۆم لێیم بیستووە، ئەگەر بمزانیبایە دەژیم بۆم نەدەگێڕایتەوە، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (هەر بەندەیێ، لە بەندەکانی خودا، خودا بیکا بەکاربەدەستو بیکا بە گەورەی کۆمەڵێ لە

---

(٨٦) مختصر صحیح مسلم/٣، ژماره: ١٢١١ - شیحا: ٣٦١. تجرید/٥، ژماره: ٢١٠٦. بخاری: ٧١٥١ + ریاض/٢، زنجیره: ٧٨، ژماره: ٦٥٤.

موسوڵمانانو گزیو ناپاکییان لێ بکاو، لەسەر ئەو حاڵە بەردەوام بێ تادەمرێ، ئەوە بێگومان کە خودای گەورە لەسەر ئەو ناپاکییە بەهەشتی لێ قەدەغە دەکا). {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٦، ژمارە: ٢٤٣٢، چ/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

مەعقیلی کوڕی یەسار (ڕەزای خودای لێ بێ) لەپێش ڕۆژی حودەیبییەدا موسوڵمان بوو، ئامادەی پەیمانی خۆشنوودیی (بیعة الرضوان) بوو، فەرموودەی لە صەحیحەینو سونەنی ئەربەعەدا هەیە، لە بەصرە نیشتەجێ بوو، ئەم زاتانەو کەسانی تریش فەرموودەیان لەوەوە گێڕاوەتەوە: عەمری کوڕی مەیموونی ئەزدیو ئەبو عوسمانی نەهدیو حەسەنی بەصری، دوو فەرموودەی لە بوخاری پیرۆزدا هەیە، لەئاخرو ئۆخری جێنشینی موعاوییەدا مەرگ بوو بەمیوانی (ڕەزاو ڕەحمەتی خودایان لێ بێ).

### (٦٤) باب: رفع الأمانة والإيمان من بعض القلوب وعرض الفتن على القلوب
### نەمانی سپاردەو سڕینەوەی باوەڕو ئیمان لەهەندێ دڵ، ناشووبو ئاژاوەو سەرلێشێوان تووشی دڵ دەبن

٨٧- عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- حَدِيثَيْنِ قَدْ رَأَيْتُ أَحَدَهُمَا وَأَنَا أَنْتَظِرُ الآخَرَ حَدَّثَنَا « أَنَّ الأَمَانَةَ نَزَلَتْ فِى جِذْرِ قُلُوبِ الرِّجَالِ ثُمَّ نَزَلَ الْقُرْآنُ فَعَلِمُوا مِنَ الْقُرْآنِ وَعَلِمُوا مِنَ السُّنَّةِ ». ثُمَّ حَدَّثَنَا عَنْ رَفْعِ الأَمَانَةِ قَالَ « يَنَامُ الرَّجُلُ النَّوْمَةَ فَتُقْبَضُ الأَمَانَةُ مِنْ قَلْبِهِ فَيَظَلُّ أَثَرُهَا مِثْلَ الْوَكْتِ ثُمَّ يَنَامُ النَّوْمَةَ فَتُقْبَضُ الأَمَانَةُ مِنْ قَلْبِهِ فَيَظَلُّ أَثَرُهَا مِثْلَ الْمَجْلِ كَجَمْرٍ دَحْرَجْتَهُ عَلَى رِجْلِكَ فَنَفِطَ فَتَرَاهُ مُنْتَبِرًا وَلَيْسَ فِيهِ شَىْءٌ - ثُمَّ أَخَذَ حَصَاةً فَدَحْرَجَهَا عَلَى رِجْلِهِ - فَيُصْبِحُ النَّاسُ يَتَبَايَعُونَ لاَ يَكَادُ أَحَدٌ يُؤَدِّى الأَمَانَةَ حَتَّى يُقَالَ إِنَّ فِى بَنِى فُلاَنٍ رَجُلاً أَمِينًا. حَتَّى

يُقَالَ لِلرَّجُلِ مَا أَجْلَدَهُ مَا أَظْرَفَهُ مَا أَعْقَلَهُ وَمَا فِى قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ ». وَلَقَدْ أَتَى عَلَىَّ زَمَانٌ وَمَا أُبَالِى أَيَّكُمْ بَايَعْتُ لَـئِنْ كَـانَ مُـسْلِمًا لَيَرُدَّنَّـهُ عَلَـىَّ دِينُـهُ وَلَئِنْ كَانَ نَصْرَانِيًّا أَوْ يَهُودِيًّا لَيَرُدَّنَّهُ عَلَىَّ سَاعِيهِ وَأَمَّا الْيَوْمَ فَمَا كُنْتُ لأُبَايِعَ مِنْكُمْ إِلاَّ فُلاَنًا وَفُلاَنًا.(٨٧)

حوزەیفەی کوڕی یـەمان (ڕەزای خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو فەرمایشتی لەبارەی سپاردەوە پێمـان فـەرموو، یـەکێکیانم بەچـاوی خـۆم دی هاتـەدی، کـە برێتـی بـوو، لـە هـاتنی سـپاردە (ئەمانەت) وە چاوەڕوانی ئەوی تریـشیانم کەبێتـە دی، کـە برێتییـە لـە نـەمانی ئەمانەت. واتە: سپاردە. فەرمایشتی یەکەم ئەوەبوو فەرمووی پێمان: (ئەمانـەت — واتە: سـپاردە — کـە هاتـە خـوارەوە لـەناخی دڵـی پیـاو چاکانا، ڕەگـو ریـشەی داکوتـاو جێگـەی خـۆی گـرت، بـەرە بـەرە قورئـانیش دەهاتـە خـوارەوە، هـەروا سـوننەتی پێغەمبـەریش لـەدوا قورئـان دەهـات، ئـیتر ئـەوانیش بـە فێربـوونی قورئان‌و بەزانینی شەریعەت‌و یاسا نامەی خودا، سپاردەیان بە باشـی‌و بـەجوانی پەروەردە دەکرد).

فەرمایـشتی دووەم: ئـەوە بـوو کـە باسـی نـەمانی ئەمانـەتی بـۆ کـردین. فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ): (کاتێ ئەمانەت هەڵ دەگیرێ، بەرەبـەرە نامێنێ‌و شوێنەواری کوێر دەبێتەوە، پیاو دەبێ خەوی لێ دەکەوێ‌و لەو خەوەدا سپاردە لە دڵی وەردەگیرێتەوە، بەرە بەرە شوێنەکەشی لەناو دڵا کوێر دەبێتـەوە لەسەر ئەم شێوەیە:

(٨٧) مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٢٠٢٥ = شيحا: ٣٦٥. تجريـد البخـاری بـالکوردی/٥، ژمـارە: ٢٠٢٠. بخاری/٦٤٩٧.

ئەمجار شوێنەکەی وەك نیتکەیەکی رەش دەمێنێتەوە، دووەمجار کەخەوی لێ دەکەوێ ئەوەیشی ماوە لە دڵیا ئەویش دەڕواو هیچی نامێنێ. ئیتر شوێنەکەی وەك تلۆقی لێ دێ. نووری ئەمانەت (واتە: رووناکی سپاردە) کاتێ لە دڵ باردەکا، وەك ئەو پشکۆیە وایە بینێیت بە قاچی خۆتاو، شوێنەکەی هەڵتۆقێ، تەماشا دەکەیت قاچت بلۆق دەکاو بلۆقەکەو شوێن بلۆقەکە هەتا ماوەیێ دەمێنێ، بەڵام پشکۆکە نەماوەو سکڵەکە دیار نییە، ئەمانەتیش کە لەدڵ باری کرد ئاوایە!

ئەوجا بۆ پتر رونکردنەوەی مەبەستەکە، چەوێکی هەڵگرتو تلانیەوە بەسەر قاچی خۆیاو، نیشانیدا کە پشکۆکە ئاوا بنێ بە قاچی خۆیدا، فەرمووی: (ئیتر بەرەبەرە کەس متمانە بە کەس ناکا، تاوای لێ دێ خەڵك مامەڵەو سەودا لەگەڵ یەکتری دەکەن، بەڵام خەریك دەبێ کە کەس ئەمانەت بەجێ نەهێنێ، تاوای لێ دێ پیاوی ئەمیندارو دەست پاك واکەم دەبێ، دەڵێن: لەناو فیسارە خێڵدا پیاوێکی دەست پاکی ئەمیندار ماوە!

وای لێ دێ دەبێ بە پاشا گەردانییەکی وا، قسەو بەڵێنو گوتاریان بایەخی نامێنێ، پیاوی وا پەیدا دەبێ سەنگی دەنکە خەرتەلەیێ چییە، باوەڕو ئیمان لەدڵیدا نییە، کەچی پێی دەڵێن: ئای لەم شا پیاوە، چەندە زیرو تیژ بیرو هۆشیارە، یا چەندە سەلارو ناسكو نازدارە، یا چەندە بە جەرگو رەشیدو ئازایە! (بەڕاستی ئێستا رێك وایە: ٢٠١٠/١١/١٠)

حوذیفە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەو سەردەمە بەسەر چوو، کەمن دەربەست نەبووم کە لەگەڵ هەرکامێکتانا مامەڵەو سەودام بکردایە دەربەست نەبوومو مەترسیم نەبوو، چونکە مامەڵەکارەکە ئەگەر خۆی موسڵمان بوایە، ئەوا ئایینو دینەکەی نەیدەهێشت کە گزیو ناپاکیم لێ بکا، خۆ

ئەگەر گاورو جوولەکەیش بوایە، سەرکارەکەی سەری، بەرپرسە موسڵمانەکەی سەری، نەیدەهێشت کە گزیو ناپاکیم لێ بکا!.

بەڵام ئەمڕۆ مەگەر لەگەڵ فیسارە کەسو ئەو فیسارە کەسدا، بتوانم مامەڵەو سەودا بکەمو لێیان دڵنیابم، کە ناپاکیم لەگەڵدا ناکەن! {تاج/٥، زنجیرە: ١٨، ژمارە: ٥٢١٧ – باسی سپاردە هەڵ دەگیرێ = ریاض/١، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ٢٠٠} . {بڕوانە: ژمارە: (١٩٩٠) لە پوختەی موسلیم + ریاض/٤، زنجیرە: ٣٧٠، ژمارە: ١٨٦١} .

## (٦٥) بابُ: بيان أنَّ الإسْلاَمَ بَدأَ غَرِيباً وَسَيَعُودُ غَرِيباً وأَنَّهُ يأْزَرُ بَيْنَ المَسْجِدَيْنِ ئیسلام لەسەرەتاوە غەریب بوو، بەتاکو تەرا دەستی پێکرد، هاکا غەریب کەوتەوەو کشایەوە بۆ نێوانی دوو مزگەوتەکەی پێغەمبەر لە مەککەو لەمەدینە

٨٨ـ عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَقَالَ أَيُّكُمْ يَحْفَظ قَوْلَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْفِتْنَةِ قُلْتُ أَنَا كَمَا قَالَهُ قَالَ إِنَّكَ عَلَيْهِ أَوْ عَلَيْهَا لَجَرِيءٌ قُلْتُ فِتْنَةُ الرَّجُلِ فِي أَهْلِهِ وَمَالِهِ وَوَلَدِهِ وَجَارِهِ تُكَفِّرُهَا الصَّلَاةُ وَالصَّوْمُ وَالصَّدَقَةُ وَالْأَمْرُ وَالنَّهْيُ قَالَ لَيْسَ هَذا أُرِيدُ وَلَكِنْ الْفِتْنَةُ الَّتِي تَمُوجُ كَمَا يَمُوجُ الْبَحْرُ؟ قَالَ لَيْسَ عَلَيْكَ مِنْهَا بَأْسٌ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ إِنَّ بَيْنَكَ وَبَيْنَهَا بَابًا مُغْلَقًا قَالَ أَيُكْسَرُ أَمْ يُفْتَحُ؟ قَالَ يُكْسَرُ قَالَ إِذا لَا يُغْلَقَ أَبَدًا قُلْنَا أَكَانَ عُمَرُ يَعْلَمُ الْبَابَ قَالَ نَعَمْ كَمَا أَنَّ دُونَ الْغَدِ اللَّيْلَةَ إِنِّي حَدَّثْتُهُ بِحَدِيث لَيْسَ بِالْأَغَالِيط فَهِبْنَا أَنْ نَسْأَلَ حُذَيْفَةَ فَأَمَرْنَا مَسْرُوقًا فَسَأَلَهُ فَقَالَ الْبَابُ عُمَرُ). [٨٨]

---

[٨٨] تەجرید/١، ژمارە: ٣١٠. بخاری: ٥٢٥، ١٤٣٥، ١٨٩٥. مسلم: ١٤٤ – ٣٦٩ شیحا + مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٧٢. شیحا: ٣٧١. تجرید/٢، ژمارە: ٨٦١. بخاری: ١٨٧٦.

حـوذەیفـە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: لەخزمـەتی عومـەردا دانیـشتبووین، فـەرمووی: کێتـان فەرمایـشتەکەی پێغەمبـەری (دروودی خـودای لەسەر بێ) لەبارەی ئاژاوەو فەرتەنەکانەوە لەبەرە؟ منـیش گوتم: مـن لەبەرمـە دەق وەك خۆی فەرموویەتی، عومەر فەرمووی: بەراستی تۆ کۆی لێ ناکەیتـەوەو چاونەترسی دوورنییـە لەخۆتـەوە سـەبارەت بەفەرتەنـەکان شتێ بلێیی! منـیش عـەرزیم کـرد: حـەزرەت (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) دەیفـەرموو: ئـەو ئاشـووبەو ئاژاوەیـەی کەتووشـی پیـاو دەبـێ، بـەهۆی کـەس و کـارو مـاڵو منـاڵو هاوسـێو دراوسـێوە، نوێـژو ڕۆژوو خێرکـردنو فـەرمانکردن بەچـاکەو نـەی ی کـردن لەخراپە، دەبن بەکەفارەتیو پاکی دەکەنەوە.

عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: مەبەستم ئەمەنییە، بەڵکوو لـەو فیتنـەو ئاژاوەیـە دەپرسـم کـەوەك شـەپۆلی دەریـا شـەپۆل دەدا، گـوتم: قوربـان! ئەوەیان زیانی بۆتۆنابێ، ئەوە والەپـشتی دەرگایـەکی داخـراوەوە، ئەودەرگایـە وا لەنێوانی تۆو ئەودا، تائەودەرگایە داخرابێ ئەو ئاژاوەیە ڕوونادا.

عومـەر فـەرمووی: جائایـا ئـەو دەرگایـە دەشـکێنرێ یادەکرێتـەوە؟ گـوتم: دەشـکێنرێ. فـەرمووی: کەواتـە هـەتا هەتایـە داناخرێتـەوە. بێـژرا: ئایـا عومـەر دەیزانی مەبەست لەو دەرگایە چییە؟ حوزەیفە فەرمووی: بەڵێ زۆرباش ئەوەی دەزانـی، وەك سـوور دەیزانـی کـەڕۆژ ڕۆیـشت شـەو دادێ، ئـاوایش دەیزانـی کەمەبەست لەودەرگایە چییە، چوونکە من فەرموودەیـەکی دروستو قـسەیەکی دۆغـری وام بۆیگێڕایـەوە کەهەڵەشـەو پەڵەشـەوتێکەڵو پێکـەڵ نـەبێ! جـا لەحوذەیفە پرسیار کرا: ئەودەرگایە کێ بوو؟ فەرمووی: عومەر خۆی بوو، واتە: هەتا عومەر لەژیاندابێ ئاژاوە سەرهەڵ نادا. (ت/١/٧٢/ ٥).

ئەمەیش ژمارە (٨٦١)ی تەجریدی بوخارییە لەم بارەیەوە:

ئـەبو هورەیرە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) لەخۆشەویـستەوە (دروودی خـوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: وەکوو چۆن مار کە زۆری بۆ هات دەخزێتـەوە نـاو کونی خۆیو پەپکـەی تیـا دەخـوات، لەبـەر بـێ دەرەتـانی، ئیـسلامەتیش بـە تایبـەتی لـەئاخر زەمانـا ئاوەهـا تـەنگی پـێ هەڵدەچـنرێو ئاوەهـا دەکـشێتەوە بـۆ نـاو مەدینەو گرمۆڵەی تیا دەخوات!. (تاج/٢/٢٧٧/٤ ز/١٣٨ – ش/ت).

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

ئـەم فەرموودەیـە بەلگەیـە لەسـەر ئـەوە کـە دروسـتە شـتی بـاش تەشـبیە بکرێ بەشتی خراپەوە، مادەم تەشبیهەکە دەبێ بەهۆی ڕونکردنەوەی مەبەست، وە واتای وایە کە مەرج نییـە موشـەببەهو بیهـی، لـە هـەموو ڕوویەکـەوە وەکـوو یەك بن، بەلکوو ئەوەندە بەسە کە لەڕوویەکەوە لەیەك بچن.

ئەمەیش ژمارە (٧٢)ی پوختەی موسلیمە سەبارەت بە غەریبی موسوڵمان:

ئیبنـو عومـەر (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئیسلام لە سەرەتاوە غەریب بوو، بە تـاكو تـەرا دەستی پێـکرد، موسوڵمان لەناو کۆمەڵا وەك ئاوارەو نامۆ وابوو، هەتا بەرە بەرە پەرەی سەندو سەرکەوتو بوو بەزۆرینە، بەڵام هاکا غـەریب کەوتـەوەو بـووەوە بـەتاكو تـەرا لـەناو کۆمـەڵا، وەك یەکـەم جار. ڕۆژێ دێ وەکـوو چـۆن مـار لـە کونەکەی بۆ ملۆو مووش دەردەچێ، بەڵام کە مەترسییەکی بوو، دەخزێتەوە ناو کـونی خـۆیو پەپکـەی تیـا دەخـوات، لەبـەر بـێ دەرەتـانی، ئیـسلامەتیش (بەتایبەتی لە ئاخر زەمانا) ئاوەها تەنگی پێ هەڵدەچنرێو، ئاوەها دەکشێتەوە بۆناو مەدینەو بۆ نێوانی دوو مزگەوتەکەی پێغەمبـەر لـە مەدینـەو مزگـەوتی حەرام لە مەککەو، لەم نێوانەدا گرمۆڵەی تیا دەخوات!).

٨٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « إِنَّ الإيمَانَ لَيَأْرِزُ إِلَى الْمَدِينَةِ كَمَا تَأْرِزُ الْحَيَّةُ إِلَى جُحْرِهَا ».[٨٩]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) لە خۆشەویستەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (وەکوو چۆن مار کە زۆری بۆهات دەخزێتەوە ناو کونی خۆیو پەپکەی تیا دەخوات، لەبەر بێ دەرەتانی، ئیسلامەتیش ئاوەها –بە تایبەتی لە ئاخر زەمانا– تەنگی پێ هەڵدەچنرێو، ئاوەها دەکشێتەوە بۆ ناو مەدینەو، گرمۆڵەی تیا دەخواتو پەنای بۆ دەبات). (تەجرید/٨٦١/١٨٧٦، بەرگی/٢/٢٥٦ + تاج/٢/٢٧٧، زنجیرە: ١٣٨، ژمارە: ١٧٢٩ چ-٤).

**روونکردنەوە:**

**مەبەست دوو شتی سەرەکین:**

١- مەدینەی نازدار، شارە پاکو پیرۆزەکەی پێغەمبەری خۆشەویستو ئازیز، هەر لەسەردەمی پێغەمبەرەوە، هەتا رۆژی قیامەت کانگاو سەرچاوەی نوورو رەحمەتو پیتو بەرەکەتو زانستو نووری شەریعەت بووەو دەبێ، ئیتر ئەو پیتو فەڕو بەرەکەتە لە زۆر رووەوەیە، وەك ئەوە هەمیشە زانای گەورەو مەرجیعی دینی گەورەی، لە هەموو ساتو چاخێکا تیا بووە، وەك ئەوە گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەر والەوێ، هەروا (مَشَاهِدِي) پێغەمبەرو ئاسەوارو شوێنەواری ئەو زاتەو هاوەڵە نازدارو ئازیزەکانی وا لەوێ، کە هەمیشە سەرچاوەی پیتو فەڕن بۆ گەلی ئیسلام، بەتایبەتی بۆ زانایانو پیاو چاکانو خوا ناسان، جا بەم

---

[٨٩] مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٣٨. شیحا: ٣٧٢. تجرید/٢، ژمارە: ٨٦١ بڕوانە: ژمارە: (٨٨) کە لەپێشەوە رابورد.

هۆیانەوە، هەموو کاتێ لە هەموو لایەکی جیهانی ئیسلامییەوە، جێگەی نیازو مرازو هامو شۆو مەقصەدی زانایانو خوا ناسانو پیاو چاکان بووە!

٢- هەر وەك چۆن مار، بۆ بژێوی خۆی لە کون دەردەچێو بەملاو لادا بڵاودەبێتەوە، بەڵام کاتێ شتێ زۆری بۆ دەهێنێ، بەرەو کونەکەی خۆی دەگەڕێتەوەو لەوێدا پەپکە دەخوات، ئاوەهاش بەرە بەرە، بە تایبەتی لە پێش هاتنی قیامەتدا، ئیسلام وەك هەوەڵجاری غەریب دەبێتەوەو دەبێتەوە بە تاكو تەراو، لە هیچ کوێیەك نامێنێ لە مەدینە نەبێ!

## (٦٧) باب: الاستسرار بالإيمان للخائف
## ئەگەر مەترسی هەبوو، دروستە موسوڵمانەتی پەنهان بێ

٩٠- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (اكْتُبُوا لِي مَنْ تَلَفَّظَ بِالإِسْلَامِ مِنْ النَّاسِ) فَكَتَبْنَا لَهُ أَلْفًا وَخَمْسَ مِائَةِ رَجُلٍ فَقُلْنَا نَخَافُ وَنَحْنُ أَلْفٌ وَخَمْسُ مِائَةٍ فَلَقَدْ رَأَيْتُنَا ابْتُلِينَا حَتَّى إِنَّ الرَّجُلَ لَيُصَلِّي وَحْدَهُ وَهُوَ خَائِفٌ). [٩٠]

حوزەیفە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوانەی کە موسوڵمان بوون ناویانم بۆ بنووسن) کاتێ ناوەکانمان نووسی هەزارو پێنج سەد پیاو بوون لەناو خۆمانا دەمانگوت: تازە ئێمە لەدوژمن بترسین، وەلحاڵ هەزارو پێنج سەد کەس بین، بەڵام لەوەدوا خودا تووشی تاقیکردنەوەیەکی وای کردین تەنانەت پیاو بەتەنهایش نوێژی بکردایە هەر دەترسا، کەپێی بزانن‌و تووشی ئازاوەو فەرتەنەی بکەن.

ئەمەیش دەقی ژمارە (٧١)ی پوختەی موسلیمە:

---

[٩٠] تەجرید/٢، ژمارە: ١٢٤٧. بخاری/٣٠٦٠. مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٧١. شیحا: ٣٧٥.

حوزەیفە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوانەی کە موسوڵمان بوون، سەرژمێریان بکەن‌و ناویانم بۆ بنووسن، تا بزانین ژمارەی موسوڵمانان چەندە؟). فەرمووی: عەرزمان کرد: قوربان! بۆچی مەترسیت لێمان هەیە، کە دوژمن زاڵ بێت بەسەرمانا، وەلحاڵ ژمارەمان لە نێوانی شەش سەد کەس، هەتا حەوت سەد کەس دەبێت؟ واتە: ئێمە لەم لایەنەوە ترسمان لە دوژمن نەماوە. بەڵام فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئێوە نازانن، کێ دەڵێ کە تووشی فەرتەنەو ئاشووب نابن‌و تووشی تاقیکردنەوەی خوایی‌و ئەزموونی ڕۆژگار نابن!!). فەرمووی: (جاوا گیرۆدە بووین‌و وا تووش بووین، تەنانەت هەمان بوو بە دزییەوە نوێژی دەکرد!).

روونکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە سەرچاوەیەکی روونە بۆ سەرژمێری شارستانی‌و سەرژمێریی سوپایی‌و هەموو سەرژمێرییەکی تری ڕەوای سووود بەخش.

(٦٨) باب: تَألُّف قَلْبِ مَنْ يَخَافُ عَلَى إِيمَانِهِ لِضَعْفِهِ وَالنَّهْيُ عَنِ القَطْعِ بِالإِيمَانِ مِنْ غَيْرِ دَلِيلٍ قَاطِعٍ

نۆموسوڵمان‌و باوەڕ لاواز دەلاوێنرێن هەتا باوەڕیان تەواو دادەمەزرێ، شایەتی باوەڕی ساغ، یا بێباوەڕی تەواو، بەبێ بەڵگە، بۆ کەس نادرێ

٩١- عَنْ سَعْدِ بْنْ أَبِي وَقَاصٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (أَعْطَى رَهْطا وَسَعْدٌ جَالِسٌ فَتَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلًا هُوَ أَعْجَبُهُمْ إِلَيَّ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا لَكَ عَنْ فُلَانٍ فَوَاللَّهِ إِنِّي لَأَرَاهُ مُؤْمِنًا فَقَالَ أَوْ مُسْلِمًا فَسَكَتُّ قَلِيلًا ثُمَّ غَلَبَنِي مَا أَعْلَمُ مِنْهُ فَعُدْتُ لِمَقَالَتِي فَقُلْتُ مَا لَكَ عَنْ فُلَانٍ فَوَاللَّهِ إِنِّي لَأَرَاهُ مُؤْمِنًا فَقَالَ

أَوْ مُسْلِمًا فَسَكَتَ قَلِيلاً ثُمَّ غَلَبَنِي مَا أَعْلَمُ مِنْهُ فَعُدْتُ لِمَقَالَتِي وَعَادَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ قَالَ يَا سَعْدُ إِنِّي لَأُعْطِي الرَّجُلَ وَغَيْرُهُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْهُ خَشْيَةَ أَنْ يَكُبَّهُ اللَّهُ فِي النَّارِ).[٩١]

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص (ڕەزای خوای لـێ بـێ) فـەرمووی: مـن خـۆم دانیشتبووم لەوکاتەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەشی دەستـەیەکی دا، بـەڵام بەشـی پیـاوێکی نـەدا، بـەلای منـەوە ئـەو پیـاوە باشـترینیان بـوو، لەبەرئـەوە گـوتم: قوربـان! ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئـەوە بۆچـی فیـسارەکەست بوارد، خۆبەخودا من بـەبڕواداری دەزانم، فـەرمووی: بـەڵکوو بڵێ بەموسـوڵمانی دەزانم‌و لەحاڵی وادا شایەتی باوەڕ، کە شتێکە والەناو دڵ دا بۆئەم جۆرە کەسەی مـەدە) جـا منـیش کـەمێ بێـدەنگ بـووم، هـەتا ئـەوەی دەمزانـی لـەبارەی موسوڵمانەتی ئەو پیـاوەوە زۆری بـۆ هێنـام لەبـەر ئـەوە پرسیارەکەمم دووبـارە کـردەوە، پێغەمبـەریش هـەر فەرمایـشتەکەی پێشووی دووبـارە کـردەوە، لەبـەر ئـەوە کـەمێکی تـریش بـێ دەنـگ بوومـەوە، هـەتا لەبـەر هـەمان هـۆی پێـشوو پرسیارەکەمم بۆ جاری سێیەم دووبارە کردەوە، پێغەمبـەریش (دروودی خـودای لەسەر بێ) دیسانەوە هەر فەرمایشتەکەی پێشووی دووبـارە کـردەوە، لـەدوایی دا فەرمووی: (ئەی سەعد! گەلێ جار من بەش دەدەم بەهەندێ کەس، هەیشە لـەوم خۆشـتر دەوێ‌و بەشیـشی نـادەم، دەزانـی ئـەوەبۆ؟ چـونکە هەنـدێ کـەس نـۆ موسـوڵمانن، یاچاوچـنۆکن، دەمـەوێ بەبـەش پێـدان بیـان لاوێـنم‌و بیانکـەم بەدۆستی ئیسلام، نەبادا بچێتەوە ناو بێ بڕوایـی‌و خـودا لـەناو ئـاگری دۆزەخ دا

[٩١] تجریـد/١، ژمـارە: ٢٦. بخـاری: ٢٧، ١٤٧٨. مختـصر صـحیح مـسلم/١، ژمـارە: ٧١. شـیحا: ٣٧٥. مسلم/١٥٠.

سەرەنگرێی بکا، بەڵام هەیە خۆی موسوڵمانی ساغە، پێویستی بەلاواندنەوە نیە).

**راڤەو شیکردنەوە:**

سەعد لەعەشەرەی موبەششەرەیە، واتە: لەو دە کەسەیە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مژدەی بەهەشتی پێداون، لەموسوڵمانە هەرەپێشینەکانە، لەتەمەنی چواردە ساڵی دا ئیسلام بوو، ئامادەی غەزای بەدر بووە، هەروا هی غەزاکانی تری پاش بەدر بووە، نزای گیرابوو، یەکەم کەس بوو کەیەکەم تیری لەرێگەی خودا دا هاویشت، لەکۆچەرە هەرە پێشینەکان بوو، دووسەدو حەفتا فەرموودەی هەیە، لەبوخاری دا بیستی هەیە، لەموسلیم دا بیستو سێی هەیە، یازدەیان پەسەندی هەردوولایە، لەسەردەمی ئیمامی عومەردا لەسەر دەستی سەعددا مەدائین فەتح کرا، کووفەی دروست کرد، عومەر کردی بەفەرمانداری وڵاتی عێراق، لەپەنجاو حەوتی کۆچی دا مردووە، لەبەقیع بەخاك سپێردراوە، دواترین کەسە لەعەشەرەی موبەششەرە کە مردووە: (تاج/٥ ل/٨٦ = تاج/٣ ل/٦٠٩ ز/١٢ ژ/٣٣٢٦ هەتا ٣٣٣١ ج/٤) لەم شوێنەدا لەتاجول ئوصول دا مناقبی سەعد نووسراوە.

## (٦٩) بابُ: زِيَادَةِ طمأنينةِ القَلْبِ بتَظَاهُرِ الأدلة
## بەهۆی روونیو زۆری بەڵگەوە دڵ زیاتر نارامو دامەزراو دەبێ

٩٢- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عنهُ): انَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (نَحْنُ احَقُّ بالشَّكِّ مِنْ ابْرَاهِيمَ اذ قَالَ: ﴿رَبِّ ارِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَى قَالَ: اوْ لَمْ تُؤْمِنْ قَالَ: بَلَى وَلَكِنْ لِيَطْمَئِنَّ قَلْبِي﴾ وَيَرْحَمُ اللَّهُ لُوطا لَقَدْ كَانَ يَاوِي الَى رُكْنٍ شَدِيدٍ وَلَوْ لَبِثتُ فِي السِّجْنِ طولَ مَا لَبِث يُوسُفُ لاجَبْتُ الدَّاعِيَ).[٩٢]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (گریمان ئەگەر من لە فەرزی مەحاڵدا، گومان و دوودڵیم لە زیندوو بوونەوەدا هەبێ ئیبراهیم شتی وای نەبووە، بەلام ئەم گوفتوگۆی ئیبراهیمە، کە لەم ئایەتەدا، خوا باسی فەرمووە بۆمان، تەنیا بۆ ئەوە بووە کە بە هۆی دیتن بە چاوی سەرەوە، تەواو دڵ ئەستوورو دڵنیابێ، وەکوو چۆن ئێمە بەبیستن بۆمان دەرکەوتووە، کە دەریای گەورە گەورە هەیە، بەلام کاتێ بە چاوی سەر ئەو دەریایانە دەبینین، هەرچەند زانست و عیلمە کۆنە کەمان، کە لە ڕێگەی ژنەوتنەوە بووە، هیچ پترنابێ، بەلام پتەو ترو دامەزراوتر دەبێ، تەنانەت ئەگەر یەکێ لەوە دوا بڵێ دەریا ووجوودی نییە، ئێمە بڕوای پێ ناکەین.

ئایەتی گوفتوگۆکە ئەمەیە: ﴿رَبِّ ارِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَى قَالَ: اوَلَمْ تؤْمِنْ قَالَ: بَلَى وَلَكِنْ لِيَطمَئِنَّ قَلْبِي﴾ بەقەرە (٢/٢٦٠).

واتە: ئیبراهیم فەرمووی: پەروەردگاری من! ئەی خاوەنی هەردوو جیهان! نیشانم بدە ئەم خەڵکە کە دەمرن و ساڵەهای ساڵ دەبنە وە بەخاك و ئەندامەکانی لە شیان دەڕزێن و دەبن بە خۆڵ و خاشاك و بای ڕۆژگار، بە

---

[٩٢] تەجرید/٤، ژمارە: ١٣٥٥ = بخاری/٣٣٧٥، ٣٣٨٧. مسلم: ١٥١ = شیحا: ٣٨٠.




ئارەزووی خۆی شەن و کەویان دەکاو، پەخش و پرشیان دەکا لە وولاتا، چۆن چۆنی تۆ لە قیامەتا زیندوویان دەکەیتەوەو، بەچی شێوەێی ئەو پارچە پەرتو بلاوانە یەك دەخەیتەوە؟

خودا لەوەلامی ئیبراهیم دا فەرمووی: ئەی ئیبراهیم! ئایا تۆ هێشتا باوەڕت نەهێناوە بەوە کەمن دەتوانم مردوو زیندوو بکەمەوە؟ عەرزی کرد: با، بەخودا زۆر باش ئەوە دەزانم و باوەڕم بەوە هەیە، بەڵام دەمەوەێ کە دڵم ئاو بخواتەوەو وەها دابمەزرێ، کەئیتر دڵەڕاوکێ و ڕێگەی سووسەی سووسەبای وەسواس و ڕاڕایی و دوو دڵی نەفس و دەروون لە دڵ وناخی مندا نەمێنێ و، ئەوەی کە بەدڵ باوەڕم پێی کردووە، بە چاوی سەریش بیبینم!!

خودای مەزن بۆ خۆی دەیزانی کە ئیبراهیم ئەمە دەزانێ، وەلێ بۆیە ئەم پرسیارەی لێ کرد تا بیسەران وەلامەکەی ئیبراهیم ببیستن!). تاج/٦ ل/٤٨ ف/٥٦ ز/٣- تەفسیری سوورەتی بەقەرە).

پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووشی: ڕەحمەتی خودا لە لووط پێغەمبەربێ، لەسەرچی بیرو باوەڕێ فەرموویەتی: ﴿لَوْ انَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً اوْ اوِي الَى رُكْنٍ شَدِيدٍ﴾ واتە: حەزرەتی لووط پێغەمبەر، کاتێ هۆزەکەی پەلاماری میوانەکانیان داو، هەوڵی لەگەڵیاندا دا کەوازبێنن و رووزەردی بەسەر خۆی و میوانەکانی نەهێنن و هەوڵەکەی سوودی نەبوو، پاش ئەمە فەرمووی: کاشکی یاخوم هێزێکم ببوایە، هەتا چارەی ئەم بێ شەرمیو نامەردی و زیادەڕەوی ئێوە مەپێ بکردایە، یاخود لە پەنای زاتێکی تەواناو بەهێزدا دەبووم، تا ئەو چارەسەری ئەم بێ شەرمییەی ئێوەی بکردایە! پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: چۆن وادەفەرموێ، خۆ ئەو واتە: حەزرەتی لووط لە ڕاستیتدا لە پەنای زاتێکی تەواناو بەهێزدا بوو، کە خودای تەوانایە، ئیتر چۆن وا

دەفـەرموێ. لەلایـەکی تریـشەوە ئافـەریم بـۆ حـەزرەتی یووسـف، بـۆ خـۆی و بۆسەبری و بۆ خۆگرتنی، بەڕاستی مـەردو بەسـەبرو ئـازاو بەپـشوو بـوو، ئـەوە بوو، پاش ئەو هەمکە حەپس و زیندانییە، کاتێ پاشا ناردی بە شوێنی دا، کە بچێ بۆ لای، ئەو نەچوو، وە ویستی لە پێش دا بیسەلمێنێ کە ئەو بەناڕەوا بەند کراوە، بۆیە بەفروستادەکەی پاشای فەرمووی: بڕۆ عەرزی پاشا بکە، فـەرمان بـدا، ئـەو ژنانـە کـە دەسـتی خۆیـان لـەتو پـەت کـرد، لەگـەڵ ژنـی وەزیـردا، لـەکاتی دەعوەتە کەدا، کۆیان بکاتەوەو لێیـان بپرسـێ: حـاڵی ئـەوان چۆن بـووە و حـاڵی منیش چۆن بووە؟ تا پاك و پیس دەر بکەوێ بۆ هەمو لایێ، ئەوسا مـن دێـم بـۆ لای پاشا، وەلێ ئەگەر من لە جێگەی یووسف بوومایـە و ئەوەنـدەی ئـەو، وا زۆر لەبەندیخانەدا بمایەتەوە هەرکە دەهاتن بە دوامـدا، گورج بـەبێ چـەندو چـوون دەچـووم لەگــەڵیان بــۆ لای پاشــا. تــاج/٦ ل/٢٤٣ ز/١٢ ف/٥ - باســی تەفــسیری سوورەتی هوود.

(٧٠) **باب: وُجُوب الإيمان بِرسَالَةِ نَبِيِنَا مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إلى جميع النَّاسِ، وَنَسْخِ المِلَلِ بِمِلَّتِهِ**

**باوەڕ بەوە کە پەیامی پێغەمبەری ئیسلام بۆ سەرجەمی مرۆڤە، وە هەموو ئایینەکانی تر بەهاتنی ئایینی ئیسلام کوژاونەتەوەو کاریان پێ ناکرێ**

٩٣- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَا مِنَ الأَنْبِيَاءِ مِنْ نَبِىٍّ إِلاَّ قَدْ أُعْطِىَ مِنَ الآيَاتِ مَا مِثْلُهُ آمَنَ عَلَيْهِ الْبَشَرُ، وَإِنَّمَا كَانَ الَّذِى أُوتِيتُ وَحْيًا أَوْحَى اللَّهُ إِلَىَّ، فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكْثَرَهُمْ تَابِعًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ»:[٩٣]

---

[٩٣] مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١٩. مسلم: ١٥٢ - شيحا: ٣٨٣. تەجريد/٤، ژمارە: ١٧٢٢. بخاری/ ٤٩٨١، ٧٢٧٤.

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بـێ) فـەرمووی: (هـەموو پێغەمبـەرێ، لـەکاتی خۆیـدا، نیـشانەی گەورە گـەورەو موعجیزەیـەکی وەهـای پـێ دراوە، کـە ئادەمیزادەکـانی سـەردەمی خۆی بەهۆی ئەو نیشانە گەورانەو موعجیزانەوە، ئیمانو باوەڕیان پێی هێنـاوە، بەڵام ئەو موعجیزەیەی کە خەڵاتکراوە بەمن ئەم قورئانـە پیرۆزەیـە، کـە خـودا بەوەحیو سروش بـۆی نـاردووم، کـە لایـەنی ئیعجازەکـەی نەبڕاوەیـەو هەمیـشە بەردەوامـە، وەك موعجیزەکـانی پێغەمبـەرەکانی تـر نییـە، کـە تایبـەت بـن بـە خەڵکی سەردەمی خۆیانەوەو پاش خۆیان کاریگەری یان نەمێنێ، بۆیە ئومێـدم گەورەیە کە لە ڕۆژی قیامەتدا، من لە هەموو پێغەمبەرەکانی تر ئۆمـەتم زیـاتر بێ).

٩٤- عَنْ صَالِحِ بْنِ صَالِحٍ الْهَمْدَانِيِّ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، قَـالَ: رَأَيْـتُ رَجُـلاً مِـنْ أَهْـلِ خُرَاسَانَ سَأَلَ الشَّعْبِيَّ فَقَالَ: يَا أَبَا عَمْرٍو! إِنَّ مَنْ قِبَلَنَا مِنْ أَهْـلِ خُرَاسَـانَ يَقُولُـونَ فِـي الرَّجُلِ، إِذَا أَعْتَقَ أَمَتَهُ ثُمَّ تَزَوَّجَهَا فَهُوَ كَالرَّاكِبِ بَدَنَتَهُ. فَقَالَ الشَّعْبِيُّ: حَدَّثَنِي أَبُو بُـرْدَةَ بْنُ أَبِي مُوسَى، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: « ثَلاَثَـةٌ يُؤْتَـوْنَ أَجْرَهُمْ مَرَّتَيْنِ: رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ آمَنَ بِنَبِيِّهِ وَأَدْرَكَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَآمَنَ بِهِ وَاتَّبَعَهُ وَصَدَّقَهُ، فَلَهُ أَجْرَانِ، وَعَبْدٌ مَمْلُوكٌ أَدَّى حَقَّ اللَّهِ تَعَالَى وَحَقَّ سَيِّدِهِ، فَلَـهُ أَجْرَانِ، وَرَجُلٌ كَانَتْ لَهُ أَمَةٌ فَغَذَاهَا فَأَحْسَنَ غِذَاءَهَا، ثُمَّ أَدَّبَهَا فَأَحْسَنَ أَدَبَهَا، ثُمَّ أَعْتَقَهَا وَتَزَوَّجَهَا، فَلَهُ أَجْرَانِ ». ثُمَّ قَالَ الشَّعْبِيُّ لِلْخُرَاسَانِيِّ: خُذْ هَذَا الْحَدِيثَ بِغَيْرِ شَـيْءٍ، فَقَـدْ كَانَ الرَّجُلُ يَرْحَلُ فِيمَا دُونَ هَذَا إِلَى الْمَدِينَةِ.[٩٤]

---

[٩٤] مختـصر صـحيح مـسلم/١، ژمـارە: ٢٢ = شـيحا: ٣٨٥ - مـسلم/ ١٥٤. تەجريـد/١، ژمـارە: ٨٢. بخاری/٩٧، ٢٥٤٤، ٢٥٥١، ٣٠١١.

ئەمە دەقی عەرەبی ئەم فەرموودەیە، لە پوختەی موسلیما، لەبەرئەوەی سوودی پترە نووسیمان، ئەمەیش لەدواوە وەرگەڕاوەکەیەتی:

صالّحی کوڕی صالّحی هەمەدانی فەرمووی: پیاوێکی خۆراسانیم بینی، لە شەعبی پرسی، گوتی: ئەی باوکی عەمر! خەڵکی خۆراسانی لای ئێمە، بازێکیان دەڵێن: ئەو پیاوەی کەنیزەکەکەی خۆی ئازاد بکاو پاشان بۆخۆی مارەی بکا، ئەوە کارێکی باش ناکا، چونکە لەکەسێ دەچێ کە وشترێ بکا بە دیاری بەیتو دوایی لێی پەشیمان ببێتەوە، یا شتێ بکا بەخێرو دوایی بە بەهایەکی کەم بیکڕێتەوە لە هەژارەکە؟

شەعبیش فەرمووی: وانییە، چونکە من ئەبو بوردەی کوڕی ئەبو مووسای ئەشعەری، لە ئەبو مووسای باوکیەوە گێڕایەوە بۆم: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەم سێ کەسە دوو پاداشتی باشیان بۆ هەیەو، لە دوولاوە خێرێکی گەورەیان دەگات: یەکەم پیاوێ، یا ژنێ، کە لەسەر ئایینی جوولەکە یا گاور بێو، پاشان موسوڵمان ببێو شوێن پێغەمبەر بکەوێو باوەڕ بە پەیامەکەی بکات، ئەمە دوو پاداشتی باشی بۆ هەیە، دووەم: کۆیلەیێ کە هەم مافی خوداو هەم مافی ئاغاکانی بەجوانی بەجێ بهێنێ، ئەمیش دوو پاداشتی باشی بۆ هەیە، سێیەم: پیاوێ کەنیزەکێکی وای هەبێ، کە کۆیلەیبێ، واتە: موڵکی یەمینی بێو بۆی حەلاڵ بێ، بەجوانی بەخێوی بکاو، بەجوانی تەمێو پەروەردەی بکاو، فێری خوێندەواریو زانستی بکا، ئەوجا ئازادی بکاو مارەی بکا بۆ خۆی، وە مەبەستی لەم کارەیش ساخ رەزامەندی خودا بێ، ئەمیش دوو پاداشتی بۆ هەیە!).

ئەوجا شەعبی (رەحمەتی خودای لێ بێ) بە پیاوە خۆراسانیەکەی فەرموو: ئەم فەرموودەیە بە هاسانیو بەبێ هیچ ئەرکێ، وەربگرە بۆ خۆتو

لەبەری بکە، جاران زاناکان وا وێڵ بوون بەدوای فەرموودەدا، بۆ وەرگرتنی فەرموودەیێ، کە پلەو پایەی نەدەگەیشتە پلەو پایەی ئەم فەرموودەیەش لێرەوە بە سواری وڵاخ دەچوون بۆ مەدینەی نازدار بۆ فێر بوونی). (تاج/٣/٨٣ = تاج-٢ ز-٣٤ ژ-٢١٠١ ج-٤ = چاپی چوارەم).

**(٧١) باب: نزول عيسى ابن مريم حَاكِماً بِشَرِيعَةِ نَبِيِّنَا محمد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عیسای کوڕی مەریەم لە ئاسمان دێتە خوارێ، کارو حوکم بە یاسانامەی ئیسلام دەکات**

٩٥- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) أَنَّهُ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « وَاللَّهِ لَيَنْزِلَنَّ ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا عَادِلاً فَلَيَكْسِرَنَّ الصَّلِيبَ وَلَيَقْتُلَنَّ الْخِنْزِيرَ وَلَيَضَعَنَّ الْجِزْيَةَ وَلَتُتْرَكَنَّ الْقِلاَصُ فَلاَ يُسْعَى عَلَيْهَا وَلَتَذْهَبَنَّ الشَّحْنَاءُ وَالتَّبَاغُضُ وَالتَّحَاسُدُ وَلَيَدْعُوَنَّ إِلَى الْمَالِ فَلاَ يَقْبَلُهُ أَحَدٌ ».[٩٥]

ئەمە دەقی عەرەبی پوختەی موسلیمە، ژمارە: (٢٠٥٩):

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەخودا هیچ گومانی تیادا نییە، کە لەئاخر زەمانا، عیسای کوڕی مەریەم (سڵاوی خودا لە خۆیو لە دایکی) لە ئاسمان دێتە خوارەوە بۆ ناوتان، پێشەواکەتان لە خۆتانە کە موحەممەدی مەهدییە، عیسا لەناوتانا ئەی گەلی ئیسلام! دەبێ بەداد پرسێکی داد پەروەرو بە ناوبژیوانێکی هەقانی، بەپێی یاسا نامەی خودا، کە شەریعەتی ئیسلامە، لەنگەری حەقو عەداڵەتو داد رادەگرێ، بەڵام وەك فەرمانداری لە فەرماندارانی ئەم گەلی ئیسلامە، نەك وەك پێغەمبەرێ کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام بسڕێتەوەو ئایینێ

[٩٥] مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ٢٠٥٩ = مسلم: ١٥٥ = شیحا: ٣٨٩. تەجرید/٤، ژمارە: ١٣٧٤. بخاری/ ٣٤٤٩، ٢٤٧٦، ٣٤٤٨.

تـر لـه جێگـەی دابنـێ، بـەڵكوو ئـەویش ئـایینی پـیرۆزی ئیـسلام قـەبووڵ دەكـا، لەبەرئەوە خاچ (صەلیب) دەشكێنێ‌و خاچ پەرستی قەدەغە دەكاو بـەس ئـایینی ئیسلام له خەڵك قەبووڵ دەكاو، بەراز دەكوژێ‌و، سـەرانە هـەڵ دەگـرێ، چونكە بێباوەڕ یا دەبێ موسوڵمان ببێ یا دەیكوژێ!

وه لەبەر زۆری‌و لێشاوی سامان‌و لەبەرئەوە كه كـەس دڵـی بـەدنیا خـۆش نابـێ لەبـەر نزیكـەوە بـوونی قیامـەت، لەبـەر ئـەم هۆیانـە مـاڵ‌و سـامان وەهـا دەبێژرێ كەس لێی ناپرسێ، وشترى گەنج كه باشـترین سـامانه بـەرەڵڵا دەكـرێ‌و لەبـەر زۆری مـاڵ كـەس كـاری پێـی نییـە، لەلایـەكی تریـشەوە لـەو سـەردەمەدا، قینەبـەری‌و رقـە بـەری‌و بـەخیلی نامێنـێ‌و دوژمنایـەتی‌و حەسـوودی نامێنـێ، عیسا (دروودو سلاوی خودای لێ بێ) خەڵك گاز دەكا كه سامان‌و ماڵیـان پـێ بـدا، بـەلاَم كـەس نایـەوێ‌و وەری نـاگرێ!). {تـاج/٥، زنجـیرە: ١١٥، ژمـارە: ٣/٥٦٢٩ — پاشەكی...} .

٩٦- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « كَيْـفَ أَنْـتُمْ إِذَا نَزَلَ فِيكُمُ ابْنُ مَرْيَمَ فَأَمَّكُمْ مِنْكُمْ ». فَقُلْـتُ لاِبْـنِ أَبِـى ذِئْـبٍ إِنَّ الأَوْزَاعِـىَّ حَدَّثَنَا عَـنِ الزُّهْرِىِّ عَنْ نَافِعٍ عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ « وَإِمَامُكُمْ مِـنْكُمْ ». قَـالَ ابْـنُ أَبِـى ذِئْـبٍ تَـدْرِى مَـا أَمَّكُمْ مِنْكُمْ قُلْتُ تُخْبِرُنِى. قَالَ فَأَمَّكُمْ بِكِتَابِ رَبِّكُمْ وَسُنَّةِ نَبِيِّكُمْ.[٩٦]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (ئـەو كاتـەی كـه عیـسای كـوڕی مەریـەم، لـه ئاسمانەوە دێتە خـوارێ بـۆ ناوتـان‌و پێـشەواییتان بـۆ دەكـا، دەشـێ ئـەو ڕۆژگـارە ئێوە حاڵتان چۆن بێ؟؟).

[٩٦] مختصر صحیح مسلم/٥، ژمارە: ٢٠٦٠. شیحا: ٣٩٢. تەجرید/٤، ژمارە: ١٣٧٤.

وەلیدی کوڕی موسلیم کە مامۆستای مامۆستای شێخی موسلیمە فەرمووی: عەرزی مامۆستاکەی خۆمم کرد کە ئیبنو ئەبی ذیئبە: (تۆ ئەم رستەیە ئاوا دەگێڕیتەوە: (فَأَمَّكُمْ مِنْكُمْ) بەڵام ئیمامی ئەوزاعی لە ئیمامی زوهرییەوە، لە نافیعەوە لە ئەبو هورەیرەوە ئاوا گێڕایەوە بۆمان: (وَإِمَامُكُمْ مِنْكُمْ). واتە: (ئەو سەردەمە کە عیسا لە ئاسمانەوە دێتە خوارەوە بۆ ناوتان، پێشەواکەتان کە موحەممەدی مەهدییە لە خۆتانە کە گەلی ئیسلامن، دەبێ ئەو کاتە ئێوە حاڵتان چۆن بێ؟). وەلید فەرمووی: کە ئەم پرسیارەم لە ئیبنو ئەبی ذئیب کرد، فەرمووی: ئایا دەزانی کە (أَمَّكُمْ مِنْكُمْ) واتای چییە؟ گوتم بفەرموو پێم بڵێ واتای چییە، فەرمووی: واتە: بەپێی قورئانی نامەی خودای گەورەو بە پێی سوننەتی پێغەمبەر، پێشەواییتان بۆ دەکاو وڵات دەبا بەڕێوە). {تاج/٥، زنجیرە: ١١٥، ژمارە: ٥٦٢٨ - پاشەکی} + {تاج/٥، زنجیرە: ١١٥، ژمارە: ٥٦٢٧ — پاشەکی (پایانێ - خاتیمەیێ)}.

ئەمەیش گێڕانەوەیەکی تری موسلیمە بۆ ئەم فەرموودەیە:

عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ قال: سَمِعْتُ النَّبِيَّ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ: « لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ عَلَى الْحَقِّ ظَاهِرِينَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ – قَالَ: فَيَنْزِلُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ - عليه السلام- فَيَقُولُ أَمِيرُهُمْ: تَعَالَ صَلِّ لَنَا. فَيَقُولُ: لاَ. إِنَّ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ أُمَرَاءُ. تَكْرِمَةَ اللَّهِ هَذِهِ الأُمَّةَ ». {الحديث: ٣٩٣ = ٤٠٧ فم}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ژنەوتم لە خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (کۆمەڵێ لە ئۆمەتم هەر خەبات دەگێڕنو بە ئاشکراو بەبێ پەروا لە پێناوی هەقو ڕاستیدا، هەر جەنگ دەکەنو خودایش هەر سەریان دەخا بەسەر دوژمنی خۆیاندا، تا نزیکی ڕۆژی قیامەت).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جا کاتێ عیسای کوڕی مەریەم (دروودی خودا لە خۆیو لە دایکی) لە ئاسمان دێتە خوارێ، فەرمانڕەوای ئەو کاتەی موسوڵمانان، کە موحەممەدی مەهدییە عەرزی عیسا دەکا: وەرە تۆ پێش بکەوەو بەر نوێژییەکەمان بۆ بکە. عیسایش (سڵاوی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: نا من بەرنوێژیتان بۆ ناکەم، خۆت پێش نوێژیان بۆ بکە، چونکە ئێوە کە گەلی موحەممەدن، خۆتان لەناو خۆتاندا، فەرمانبەرو فەرمانڕەوای یەکترینو دەشێ ئیمامو بەرنوێژو پێشەواو ئەمانەتان لەخۆتان بێ، ئەمە بڕیاری خودایەو کردوویەتی بە دەستی ڕێزو قەدرو لەم ئۆمەتەی ناوە). {تاج/٥، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٥٦٠٢ – کۆمەڵێ لە موسوڵمانان....}.

**ڕوونکردنەوە:**

جابیری کوڕی عەبدوڵلا خۆیو عەبدوڵلای باوکی هاوڕێی پێغەمبەر بوون، ئەنصارین، جابیریش وەك عائیشە یەکێکە لەو شەش هاوەڵانە، کە فەرموودەی زۆرتریان گێڕاوەتەوە، هەزارو پێنج سەدو چل فەرموودەی گێڕاوەتەوە، دوو سەدو دەیان هی بوخاریو موسلیمن، پەنجاو هەشتیان پەسەندی هەردوو لایە، کە شێخی بوخاریو شێخی موسلیمن، بیستو شەشیان هی بوخارییە، لای موسلیم نییە، سەدو بیستو شەشیان بەتەنها هی موسلیمە، لە بوخاریدا نییە، کاتێ جابیر مرد کوێر بوو بوو، لە ڕۆژی ئوحوددا باوکی شەهید بوو، جابیر دوا هاوەڵی پێغەمبەر بووە، کە لە مەدینە مردووە، لەتەمەنی نەوەدو چوار ساڵیدا مردووە، إبانی کوڕی عوسمان نوێژی تەرمی لەسەر کرد. (بڕوانە: تاج/١٨١/٥، زنجیرە: ٥٠ تاج-٣ ژ-٣٤٧٩ چ-٤ + تەجرید/١٧/١، ژمارە: ٤).

## (٧٢) باب: بيان الزمن الذي لا يقبل فيه الإيمان
## باسی ئەو سەردەمەی کە باوەڕهێنان تیایدا سوودی نییە

٩٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا فَإِذَا طَلَعَتْ وَرَآهَا النَّاسُ آمَنُوا أَجْمَعُونَ ، وَذَلِكَ حِينَ لاَ يَنْفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا ثُمَّ قَرَأَ الآيَة».[٩٧]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ڕۆژی دواڕۆژ، کە ناسراوە بە قیامەت هەڵناسێ، هەتا ڕۆژ نەگەڕێتەوەو خۆر لە خۆرئاواوە هەڵنەیێت!!

جا کەخۆر لەخۆرئاواوە هەڵهاتو خەڵك بەچاوی خۆیان ئەومیان بینی، ئەوسا هەموو ئیمانو باوەڕ دەهێنن، بەڵام ئەوە ئەو کاتو سەردەمەیە، کە ئەو جۆرە ئیمانو باوەڕهێنانە، هیچ سوودێ نابەخشێ، وەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: {لاَ يَنفَعُ نَفْساً إِيمَانُهَا - الأنعام: ١٥٨} . واتە: لەو ڕۆژەدا کە ئەو بازە نیشانەی هەڵسانی ڕۆژی قیامەت دێت، باوەڕهێنانو موسوڵمان بوونی ئەو کەسانەی سوودی نییە، کە لەوەپێش ئیمانو باوەڕی نەهێنابێ، بەڵام لەوەپێش ئەگەر تەنیا باوەڕی ڕووتی هێنابێ، با هیچ کردەوەیەکی چاکەیشی نەبێ، ئەوە لەو ڕۆژەدا، سوودی دەبێ بۆی، بەڵام ئیمانو کردەوەی چاکە، کە لەپاش هاتنی ئەو ڕۆژە دیژوارە ڕوو بدەن، داد ناخۆنو سوودیان نییە، بۆ کەسێ کە لەپێشانا موسوڵمان بووبێ. (تاج/٤، ژمارە: ٣٨٦٤، ٣٨٦٣).

ئەمەیش فەرموودەیەکی ترە لەم بابەتە:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درووودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەم سێ شتانە کاتێ کەڕوویان دا ئیتر ئەو ڕۆژگارەیە

[٩٧] بخاری/٤٦٣٤ تەفسیری سورەتی ئەنعام. مسلم.شیحا: ٣٩٤.

کەخودای گەورەو سەروەر لەم ئایەتەدا ڕوونـی کردۆتـەوە کـە دەفـەرموێ: {يَـوْمَ يَأْتِي بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ لاَ يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَـا لَـمْ تَكُـنْ آمَنَـتْ مِـن قَبْـلُ أَوْ كَـسَبَتْ فِـي إِيمَانِهَا خَيْرًا قُلِ انتَظِرُواْ إِنَّا مُنتَظِرُونَ} (سورة الأنعام-٦/١٥٨).

واتـە: لـەو ڕۆژەدا کەئـەو بـازە نیـشانەی هەڵـسانی ڕۆژی قیامـەت دێـت، باوەڕهێنـانو موسـوڵمانبوونی ئەوکەسـانە سـوودی نییـە کـە لـەوەپێش ئیمـانو باوەڕیان نەهێنابێ، بەڵام لەوەپێش ئەگەر کەسێ تـەنیا بـاوەڕی ڕووتـی هێنابـێ، با هیچ کردەوەیەکی چاکەیشی نەبێ، ئەوە ئەو باوەڕهێنانەی لەو ڕۆژەدا سوودی دەبێ بۆی، وەلـێ ئیمانو کردەوەی چاکە کەلەپاش هاتنی ئەو ڕۆژە ڕووبدەن داد نـاخۆنو سـوودیان نییـە بـۆ کەسـێ کـە لـەپێش دا، ناموسـوڵمان بووبـێ. ئەمـە ئەوسێ شتەیە، کە پێغەمبەر فەرموویەتی هەرکاتێ ڕوویـان دا ئـیتر باوەڕهێنـان سوودی نییە:

١- هەڵهاتنی خۆر لەخۆرئاواوە.

٢- سەرهەڵدانی جەجاڵ. (بڕ: ژمارە/٢٠٤١ هەتا ٢٠٥٧).

٣- دەرچوونی داببەتولئەرض (بڕ: ٢٠٣٧). (تاج/٤ ز:٧ ژ:٣٨٦٥).

٩٨- عَنْ أَبِي ذَرّ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَـلَمَ) قَـالَ يَوْمًـا « أَتَـدْرُونَ أَيْـنَ تَذْهَبُ هَذِهِ الشَّمْسُ؟». قَالُوا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: « إِنَّ هَذِهِ تَجْـرِى حَتَّـى تَنْتَهِـىَ إِلَى مُسْتَقَرِّهَا تَحْتَ الْعَرْشِ فَتَخِرُّ سَاجِدَةً وَلاَ تَـزَالُ كَـذَلِكَ حَتَّـى يُقَـالَ لَهَـا: ارْتَفِعِـى ارْجِعِى مِنْ حَيْثُ جِئْتِ فَتَرْجِعُ فَتُصْبِحُ طَالِعَةً مِنْ مَطْلِعِهَا ثُمَّ تَجْـرِى حَتَّـى تَنْتَهِـىَ إِلَـى مُسْتَقَرِّهَا تَحْتَ الْعَرْشِ فَتَخِرُّ سَاجِدَةً وَلاَ تَزَالُ كَذَلِكَ حَتَّى يُقَالَ لَهَا ارْتَفِعِى ارْجِعِى مِنْ حَيْثُ جِئْتِ فَتَرْجِعُ فَتُصْبِحُ طَالِعَةً مِنْ مَطْلِعِهَا ثُمَّ تَجْرِى لاَ يَـسْتَنْكِرُ النَّـاسُ مِنْهَـا شَـيْئًا حَتَّى تَنْتَهِىَ إِلَى مُسْتَقَرِّهَا ذَاكَ تَحْتَ الْعَرْشِ فَيُقَـالُ لَهَـا: ارْتَفِعِـى أَصْـبِحِى طَالِعَـةً مِـنْ مَغْرِبِكِ تَحْتَ العَرْشِ فَتُصْبِحُ طَالِعَةً مِنْ مَغْرِبِهَا ». فَقَالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ

وَسَلَمَ) « أَتَدْرُونَ مَتَى ذَاكُمْ؟» ذَاكَ حِينَ «لاَ يَنْفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا ».(٩٨)

ئەمە دەقی عەرەبی پوختەی موسلیمە، ژمارە: (٢١٣٨).

ئەبو ذەڕ (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەکاتی ئاوابوونی خۆردا، ڕۆژێ لەمزگەوت لەخزمەتی خۆشەویست دا بووین، فەرمووی پێمان: ئایا دەزانن کەئەم خۆرە بۆکوێ دەچێ‌و لەکوێ ئاوا دەبێ؟ گوتیان: خوداو پێغەمبەری خودا خۆیان دەزانن. فەرمووی: ئەم خۆرە هەروا دەڕواتو هەموو ڕۆژێ ئەمە ئیشیەتی دەچێت لەژێر عەرشا کوڕنووش‌و نووچ دەباو، داوا لەخودا دەکاتەوە: کە دیسانەوە ڕێگای پێ بداتەوە تا لەشوێنی ئاسایی ڕۆژانەی خۆیەوە هەڵبێتەوە، هەر لەکوڕنووش دا دەبێ هەتا خودا ڕێگەی پێ دەداو پێی دەفەرموێ: بەرزەوە بە لەکوڕنووش‌و لەجێگەی ئاسایی خۆتەوە هەڵبێرەوە، ئیتر وەك جاری جاران لەشوێنی خۆیەوە هەڵدێتەوە، جا بەردەوام ڕۆژانە ئەمە ئیشیەتی، وە خەڵك شتێکی نائاسایی لێ نابینن، هەتا ڕۆژێ خۆر دەچێ وەك جاری جارانی لەژێر بارەگا (عەرش)دا، لەئارامگاکەی خۆی دا، کوڕنووش دەباو، داوای مۆڵەت دەکا کەوەك جاران لەشوێنی خۆیەوە هەڵبێتەوە، خودا ڕێگەی پێ ناداتو دەفەرموێ پێی: بەرزەوەبە لەژێر بارەگاوە بەسەر شوێپی خۆتا ڕێك بگەڕێرەوە دواوە، لەو شوێنەوە هەڵبێ کە لێی ئاوا بووی، ئیتر خۆر لەخۆرئاواوە هەڵدێ خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئایا دەزانن کەئەمە کەی دەبێ؟ هەرخۆی وەڵامی خۆی دایەوەو فەرمووی: ئەمە ئەو کاتەیە، کە خودا لەقورئانا، لەبارەیەوە دەفەرموێ: {لاَ يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِن

---

(٩٨) مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ٢١٣٨ = مسلم: ١٥٩، شيحا: ٣٩٧. تجريد البخاری/٣، ژمارە: ١٢٩١. بخاری/٣١٩٩، ٤٨٠٢، ٧٤٢٤.

قَبْـلُ أَوْ كَـسَبَتْ فِـي إِيمَانِهَـا خَيْـرًا﴾ (سـورة الأنعـام-٦/١٥٨). (تـاج/٤ زنجـيره/٧/ ژ/٣٨٦٤) + (تاج/٤ زنجيره/١٩ ژماره/٤٠٦٠ + ژماره: ٢١٦٠).

## (٧٣) باب: بَدْءِ الوَحْيِ إِلَى رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ)
## سەرەتای هاتنی سرووش (نیگا = وەحی)ی بۆ پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ)

٩٩- عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ أَنَّ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عنها) زَوْجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ أَوَّلُ مَا بُـدِئَ بِـهِ رَسُـولُ اللّٰـهِ (صَـلَّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) مِنَ الْوَحْيِ الرُّؤْيَا الصَّادِقَةُ فِي النَّوْمِ، فَكَانَ لاَ يَرَى رُؤْيَـا إِلاَّ جَـاءَتْ مِثْـلَ فَلَـقِ الصُّبْحِ، ثُمَّ حُبِّبَ إِلَيْهِ الْخَلاَءُ، فَكَانَ يَخْلُو بِغَارِ حِرَاءٍ يَتَحَنَّثُ فِيهِ (وَهُوَ التَّعَبُّدُ) اللَّيَـالِيَ أُلاَتِ الْعَدَدِ قَبْلَ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى أَهْلِهِ. وَيَتَـزَوَّدُ لِـذَلِكَ، ثُـمَّ يَرْجِـعُ إِلَـى خَدِيجَـةَ فَيَتَـزَوَّدُ لِمِثْلِهَا. حَتَّى فَجَئَهُ الْحَقُّ وَهُوَ فِي غَارِ حِرَاءٍ، فَجَاءَهُ الْمَلَـكُ فَقَالَ: اقْرَأْ، قَـالَ: مَـا أَنَـا بِقَارِئٍ، قَالَ: فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: اقْرَأْ، قُلْتُ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ، فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّانِيَةَ، حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي، فَقَالَ: اقْرَأْ، فَقُلْـتُ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ، قَالَ: فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّالِثَةَ، حَتَّى بَلَغَ مِنِّي، ثُـمَّ أَرْسَـلَنِي، فَقَـالَ: (اقْـرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ. خَلَقَ الإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ. اقْرَأْ وَرَبُّكَ الأَكْرَمُ. الَّذِي عَلَّمَ بِـالقَلَمِ. عَلَّمَ الإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ». فَرَجَعَ بِهَا رَسُولُ اللّٰـهِ (صَـلَّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) تَرْجُـفُ بَوَادِرُهُ، حَتَّى دَخَلَ عَلَى خَدِيجَةَ فَقَالَ « زَمِّلُونِي زَمِّلُـونِي». فَزَمَّلُـوهُ حَتَّـى ذَهَـبَ عَنْـهُ الرَّوْعُ، ثُمَّ قَالَ لِخَدِيجَةَ: (أَيْ خَدِيجَةُ مَالِي؟) وَأَخْبَرَهَا الْخَبَرَ، قَالَ: « لَقَدْ خَشِيتُ عَلَـى نَفْسِي». فَقَالَتْ لَهُ خَدِيجَةُ: كَلاَّ، أَبْشِرْ فَوَاللّٰهِ لاَ يُخْزِيكَ اللّٰهُ أَبَدًا، إِنَّكَ لَتَصِلُ الـرَّحِمَ، وَتَصْدُقُ الحَدِيثَ، وَتَحْمِلُ الْكَلَّ وَتَكْـسِبُ الْمَعْـدُومَ، وَتَقْـرِي الـضَّيْفَ، وَتُعِـينُ عَلَـى نَوَائِبِ الْحَقِّ، فَانْطَلَقَتْ بِهِ خَدِيجَةُ حَتَّى أَتَتْ بِهِ وَرَقَةَ بْنَ نَوْفَلِ بْنِ أَسَدِ بْنِ عَبْـدِ الْعُـزَّى وَهُوَ ابْنَ عَمِّ خَدِيجَةَ أَخِي أَبِيهَا وَكَانَ امْرَأً تَنَصَّرَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَكَـانَ يَـكْتُبُ الْكِتَـابَ

العَرَبِيَّ، وَيَكْتُبُ فِي الإِنْجِيلِ بِالعَرَبِيَّةِ مَا شَاءَ اللَّهُ تَعَالَى أَنْ يَكْتُبَ، وَكَانَ شَيْخًا كَبِيرًا قَدْ عَمِيَ، فَقَالَتْ لَهُ خَدِيجَةُ: أَيْ عَمِّ. اسْمَعْ مِنَ ابْنِ أَخِيكَ. قَالَ وَرَقَةُ: يَا ابْنَ أَخِي مَاذَا تَرَى؟ فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَبَرَ مَا رَأَى، فَقَالَ لَهُ: هَذَا النَّامُوسُ الَّذِي نَزَّلَ عَلَى مُوسَى بْنِ عِمْرَانَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَا لَيْتَنِي فِيهَا جَذَعًا، لَيْتَنِي أَكُونُ حَيًّا حِينَ يُخْرِجُكَ قَوْمُكَ. قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَوَمُخْرِجِيَّ هُمْ؟». قَالَ وَرَقَةُ: نَعَمْ، لَمْ يَأْتِ رَجُلٌ قَطُّ بِمَا جِئْتَ بِهِ إِلاَّ عُودِيَ، وَإِنْ يُدْرِكْنِي يَوْمُكَ أَنْصُرْكَ نَصْرًا مُؤَزَّرًا).[99]

عوروەی کوڕی زوبەیر (بڕوانە: تەجریدی بوخاری ب/٢، لاپەڕە: ٢٠٣ = ژمارە: ١٦٤٣/٧٨٤) فەرمووی: عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لە عائیشە بێ) کە پووری من بوو، فەرمووی: لە سەرەتاوە کە سرووش (وەحی - نیگا) دەستی پێکرد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خەونی باش بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەر خەونێکی دەدی، بە وێنەی شەبەقی بەیان دەهاتە دی، لەپاشا بەرە بەرە حەزی لە تەنهایی‌و گۆشە گیری‌و خەڵوەکێشان بوو، جا دەست دەکا بە خەڵوەکێشان لە ئەشکەوتی حیراءدا، وە لەوێ هەموو جارێ چەند شەوێ بە ژمارە دەمایەوەو لێ دەبڕا بۆ خوا (واتە: خوا پەرستی‌و پەرستشی دەکرد) وە لەو ماوەیەدا تاسەو ئەڵهای کەسوکاری نەدەکردو نەدەچووەوە بۆ لایان، وە بۆ ئەمەیش توێشەی لەگەڵ خۆیا دەبرد، ئەوجا دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە بۆ لای خەدیجەی هاوسەری‌و سەرلەنوێ توێشەی ئەوەندەی تریشی دەکردەوەو دەگەڕایەوە بۆ ئەشکەوتەکە، جا ئاوا هەتا ماوەیێ لەسەر ئەم حاڵە دەوامی کرد،

---

[99] مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٧٣ = مسلم: ١٦٠. شیحا: ٤٠١. تەجرید/١، ژمارە: ٣. بخاری/٣، ٣٣٩٢، ٤٩٥٣، ٤٩٥٥.

بەتایبەتی لە مانگی رەمەزانا، هەتا لەپڕ، لەناکاو، لە ئەشکەوتی حیراءدا، بەم شێوەیە سرووش (وەحی)ی بۆهات، فریشتەکە هاتە خزمەتیو پێی دەفەرموێ: بخوێنە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: گوتم: من خوێندەوار نیم، ئیتر چۆن بخوێنم، جا جوبرائیل گرتمیو گوشیمی بە سنگی خۆیەوە، هەتا هێزی لێ بڕیم، ئەوجا بەریدامو فەرمووی: بخوێنە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: گوتم: چی بخوێنم خۆ من خوێندەوار نیم، دیسانەوە گرتمیو گوشیمیەوە بە خۆیەوە هەتا وزەم لێ بڕاو تەواو شەکەت بووم، دیسان بەری دامەوەو فەرموویەوە: بخوێنە، گوتمەوە: من خوێنەوار نیم، دیسانەوە بۆ جاری سێیەم گرتمیو گوشیمی بە خۆیەوە تا تاقەتم لێ بڕا، ئەوجا بەری دامەوەو فەرمووی: {اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ، خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ، اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ} بخوێنە بە یارمەتیو پیرۆزی ناوی پەروەردگاری خۆتەوە، کە هەموو شتێ ئەو دروستی کردووە، مرۆڤی دروستکردووە لە تنۆکی خوێنو لە پارچەیێ خوێنپارە، کە لە تنۆکێ تۆمەوە پەیدا دەبێ، بخوێنەو بزانە کە خودای تۆ خودایەکی وایە کە لە هەموو کەسێ بەخشندە ترە).

ئەنجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم ئایەتانەوە ددەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوەو سام دای دەگرێو دڵی دەلەرزێو تەپیزەی دەلەرزێو دەڕواتەوە بۆلای خەدیجەی کچی خوومیلید، کە یەکەم ژنی بوو، دەفەرموێ: دامپۆشن، دامپۆشن، ئەوانیش دای دەپۆشن، تا ترسو سامەکەی دەنیشێتەوە، ئەوجا ئەم باسە دەگێڕێتەوە بۆ خەدیجەو دەفەرموێ: بەخودا مەترسیم لەخۆم کرد کە بمرم ئەوەندە سامێ گرانم لێ نیشت، خەدیجەیش (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: دووربا شتی وا مەفەرموو، بەڵکو بە پێچەوانەوە موژدەت لێ بێ، بەخودا هەرگیز خودا شتی وا ناکاو تۆ ریسوا ناکا، چونکە بەهرەوەری تۆ

بێ وێنەیە، تۆ پیاوێکی خزم دۆستیو، خزمەتی خزمو خوێش دەکەیتو راستگۆو قسە راستیت، پیاوی کۆڵیو دەسەوسان دەگریتە مل خۆتو باری ئازاری خەڵك دەخەیتە سەرشانی خۆتو داڵدەی بێ نەواو هەژارانیتو خاوەن نانو دیوەخانیتو شتی وا چاك دەبەخشیت، بە هەموو کەسێ نابەخشریو میوانداری بە میوان دەکەیتو یاریدەی لێقەوماوان دەدەی، یارمەتی مەردووم دەدەیو بە کورتیو پوختی: پیاوەتیو چاکەو کۆمەکیت کردووە بە پیشەو بە ئەرکی سەر شانی خۆت. ئەوجا خەدیجە لە خزمەتیدا دەچێ بۆلای وەرەقەی کوڕی نەوفەلی کوڕی ئەسەدی کوڕی عەبدول عوززا، کە ئامۆزای خەدیجەی کچی خوومیلیدی کوڕی ئەسەدی کوڕی عەبددولعوززا بوو، چونکە نەوفەلی باوکی وەرەقە برای خوومیلیدی باوکی خەدیجە بوو، وە ئەم وەرەقەیە لەسەردەمی نەزانیدا بوو بە مەسیحی، وە نووسینی عەرەبیو عیبرانی دەزانی، ئەوەندەی ویستی خودای لەسەربێ، ئینجیلی بە عەرەبیو بە عیبری دەنووسی، خۆی پیرە مێردێکی ئیختیار بوو کوێر بوو بوو، جا خەدیجە پێی دەڵێ: ئامۆزا! گوێ لە برازاکەت بگرە بزانە دەڵێ چی، وەرەقەش دەڵێ: ئەی کوڕی برام! ئادەی پێم بڵێ چی دەبینیت؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) چی دیبوو بۆیگێڕایەوە، وەرەقە پێی دەڵێ: ئەمە هەمان فریشتەیە کە ئەمیندارو پیرۆزە، کە لەکاتی خۆیا خوای گەورە ناردبووی بە پەیامی ئاسمانییەوە بۆلای موسای کوڕی عیمران (دروودو سڵاوی خوای لەسەر بێ)، هەروا بۆلای عیسای کوڕی مەریەم (دروودو سڵاوی خودای گەورەی لەسەر بێ) ئەوە جوبرائیلە ئەمینداری سرووشە (أمین الوحی) ناسراوە لەناو خاوەن نامەکانا بە ناموسی ئەکبەر، واتە: رازگری هەرە گەورە، لە بابەتی خێرو چاکەدا، خۆزگەم لەکاتی ئاشکرابوونی پێغەمبەرایەتی تۆدا من جەهێڵ دەبووموو هەرمتی لاویم دەبوو،

خۆزگەم ئەو سەردەمە من دەمام، بریا نەدەمردم، تا ئەو رۆژگارەی کە گەلەکەت لــە مەککــە دەتکەنــە دەرەوە، هــەتا باشــترین کۆمــەکیو یارمــەتیم بدایتایــە. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمویٚ: بۆچی خزمانی من شتی وا دەکەنو لە مەککەی زێدی خۆم دەمکەنــە دەرەوە؟ وەرەقــە دەڵـێ: بــەڵێ، چونکە هەر پیاوێـك داوایەکی وەکوو ئەم داوا رەوایەی تۆی هێنابێ، مـسۆگەر گێـچەڵیان پێ کردووەو دوژمنایەتیان تێ بەستووە، ئەگـەر مـن فریـای ئـەو رۆژە پـیرۆزەت دەکەوتم، کە بانگەوازەکەت ئاشکرا دەکەی، یارمەتییەکی زۆر باشم دەدای!

ئیتر وەرەقە (رەحمـەتی خـودای لێ بـێ) ئەوەنـدەی نـەبرد کـە مـردو بـە رەحمەتی خودا بوو، ئیتر لەدوا ئەمجارە هەتا ماوەی سێ ساڵ سرووش (وەحـی = نیگا) وەستاو کپ بوو، لەو ماوەیەدا جوبرائیل نەهاتەوە بۆ خزمـەت پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ)}. (تـاج/٤، لاپـەڕە: ٢٩١ = تـاج-٣ ل-٤٣٤ ز-٩٨ ژ-٣١٤٧ چ-٤).

### روونکردنەوە:

خەدیجـەی کـچی خوومەیلیـد (رەزای خـودای لێ بـێ) یەکـەم هاوسـەری پێغەمبەر بوو، لە پشتەوە بە چوار پشت دەگاتەوە بە پێغەمبەر، بە پێـی نـژادو رەگـەزو خزمایـەتی نـزیکترین ژنیـەتی لێیـەوە، لەسـەر رای جـەماوەر، تەمـەنی پێغەمبەر، بیستو پێنج ساڵ بووە، کە خەدیجەی هێناوە، خەدیجـەیش تەمـەنی چل ساڵ بـووە، خوومەیلیـدی بـاوکی لێـی مـارەکرد، لەپێـشدا ژنـی ئەبوهالـە بـوو، لـەپاش ئـەو شـووی کـرد بـە عـەتیقی کوڕی عـائیز، پـاش ئـەو شـووی کـرد بـە پێغەمبــەر، وە لــەلای پێغەمبــەر مــا هــەتا مــرد، بــەر لــە پــازدە ســاڵ لــە پێغەمبەرایەتی شووی کرد بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) ژنێـکی دارای دەوڵەمەندی جوانی خانەدان بوو، یەکەم کەس بووە کە ئیسلام بـووە، زۆر



زۆر دڵنەوایی پێغەمبەری دەکرد، دڵی دەدایەوە، هانی دەدا لەسەر خۆگری و تێکۆشان و بەخشی داواکەی، هەمیشە پشتیوانێکی جوان بوو بۆ پێغەمبەر، لەم لایەنەوە ئەو سەردەمەی پێغەمبەر لە ئەشکەوتی حیراء، لەپێش سەردەمی پێغەمبەرایەتی، خەڵوەی دەکێشاو خوا پەرستی لەسەر ئایینی ئیبراهیم دەکرد، خەدیجە نان و ئاوی بۆ دەبرد.

دەڵێن: پازدە ساڵ لە پێغەمبەر گەورەتر بووە، لە تەمەنی چل ساڵیدا، شووی پێکردووە، هەموو منداڵەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەبێ راجیانی لە خەدیجەن، بێجگە لە دوا منالی، کە ئیبراهیمە، کە لە ماریەی قیبطییە بوو، کە کەنیزی پێغەمبەر بوو، کە مقوقس پادشای ئەسکەندەرییە، لە ساڵی حەوتی کۆچیدا بە دیاری ناردی بۆ پێغەمبەر، لەگەڵ خوشکێکیا کە ناوی شیرین بوو، لەگەڵ برایەکیانا کە کۆیلە بوو، ئیختیارێ بوو، ناوی مەئبوور بوو، ماریەو خوشکەکەی هەر لەسەرەتاوە ئیسلام بوون، بەلام براکەی پاش ماوەیێ لە مەدینە لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیا موسوڵمان بوو، ماریە ما هەتا سەردەمی جێنشینی عومەر، ئەبوبەکرو عومەر ژێوار (نەفەق)یان بۆ بڕیبۆوە، لەمانگی موحەڕرەمی ساڵی شازدەی کۆچی، ماریە فەرمانی هەقی بەجێهێنا، لە مەدینە مرد، عومەر خۆی خەڵکی کۆدەکردەوە کە ئامادەی سەر تەرمەکەی بن، وە خۆی نوێژی مردووی لەسەر کرد، وە لە گۆڕستانی بەقیع کەوا لە پاڵ مزگەوتەکەی پێغەمبەردا لە مەدینە، بەخاك سپێردرا، ئیبنو مەندە دەڵێ: ماریە بە پێنج ساڵ پاش پێغەمبەر وەفاتی کردووە.

خەدیجە بیست و چوار ساڵ لەگەڵ پێغەمبەردا ژیاوە، بەکۆی دەنگ پێغەمبەر لە خەدیجە چوار کچی بووە، کە هەر چواریان ئیسلام بوون و کۆچیان کردووە لەگەڵیا، لە مەککەوە بۆ مەدینە، کە فاطیمەو زەینەب و روقیەو ئوم

کەلثووم بوون، بە کۆی دەنگ کوڕێکیشی لێی بووە ناوی قاسم بووە، لەبەرئەوە بە پێغەمبەریان دەگوت: ئەبولقاسم، واتە: باوکی قاسم.

هەتا خەدیجە لە ژیانا بوو، پێغەمبەر ژنی تری نەهێناوە، لەپێش کۆچدا بە سێ ساڵ کۆچی دوایی کردووە، لە مانگی ڕەمەزانا، لە مەککە وەفاتی کردووە، لەپێش فەرزبوونی نوێژدا، بەر لەپەیدابوونی کردنی نوێژی مردوو، لەسەر تەرم، تەمەنی شەستو پێنج ساڵ بوو، لە مەککە لە حەجوون نێژراوە، دەڵێن: مەرگی خەدیجە لەپاش مەرگی ئەبو طالیب بەسێ ڕۆژ بووە، پێغەمبەر خۆی چووە ناو گۆڕەکەیی‌و دایهێڵایە ناو گۆڕەکەیەوە، گۆڕەکەی هەتا ئێستا لە مەککە ماوە، بە خزمەت گۆڕی پیرۆزی گەیشتووم، وا بەقەد لاپاڵێکەوە، گۆڕستانەکە ناوی گۆڕستانی خەدیجەی کوبرایە، گۆڕەکەی تائێستا دەناسرێ.

فەرموودەیەکی زۆر سەبارەت بە فەزل‌و بەهرەمەندیی خاتوو خەدیجە هەیە. (بڕوانە: تەجریدی بوخاری ژمارە: ١٥٠٠، ١٤٩٩، ١٤٩٨، ١٤٦٢، ٦١٦. هەروا بڕوانە: تاج/٥، لاپەڕە: ١٤٩، زنجیرە: ٣٦، ژمارە: ١، ٢، ٣، ٤، ٥ —تاج-٣ ژ-٣٤٢٥ هەتا ٣٤٢٩ + تاج/٤، لاپەڕە: ٢٩١).

١٠٠- عَنَ جابِرَ بْنَ عَبْدِ اللّهِ الْأَنْصَارِيَّ (رَضي اللّٰهُ عَنْهُمَا) وَهُوَ يُحَدِّث عَنْ فَتْرَةِ الْوَحْيْ فَقَالَ: فِي حَدِيثِهِ: فَبَيْنَا أَنَا أَمْشِي إِذ سَمِعْتُ صَوْتًا مِنْ السَّمَاءِ فَرَفَعْتُ بصري، فَإِذا الْمَلَكُ الَّذي جَاءَنِي بِحِرَاءٍ جَالِسٌ عَلَى كُرْسِيٍّ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْض فرعبتُ منهُ فَرَجَعْتُ فَقُلْتُ: زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي، فَأَنْزَلَ اللّٰهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: (يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِرُ قُمْ فَأَنْذرْ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ وَثِيَابَكَ فَطهِّرْ وَالرُّجْزَ فَاهْجُر). فحمى الوحي وتتابع).[١٠٠]

جابیری کوڕی عەبدوڵلای ئەنصاری (ڕەزای خوای لێ بێ) باسی ئەو ماوەیەی دەگێڕایەوە کە سروش بڕان بوو، سروش نەدەهات بۆ پێغەمبەر

---

[١٠٠] تەجرید/١، ژمارە: ٤. بخاری/٤، ٣٢٣٨، ٤٩٢٢، ٤٩٢٣. مسلم: ١٦١ - شیحا: ٤٠٤.

(دروودی خودای لەسەر بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوا بەڕێوەم دەڕۆم، لەپڕ دەنگێکم بەر گوێ کەوت لەئاسمانەوە دەهات، کەسەرم هەڵبڕی ڕوانیم وا ئەو فریشتەی کەلەئەشکەوتی حیراء هات بۆلام، لەسەر کورسییەك لەبەینی ئاسمانو زەوی دا دانیشتووە، جوبرائیل بوو بەحەواوە دانیشتبوو بانگی کردمو فەرمووی: ئەی موحەممەد! ئیتر منیش لەوە تۆقیمو گەڕامەوە بۆ ماڵەوەو گوتم: دامپۆشن، دامپۆشن! ئەوانیش دایان پۆشیم هەتا ترسەکەم ڕەوییەوە، ئەوجا خوای گەورە ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە فەرمووی: (يا أيها المدثر، قم فأنذر، وثيابك فطهر، والرجز فأهجر) (٧٤/١-٥) واتە: ئەی ڕەهبەرێ کەخۆت بەنوێنی ناوماڵ پێچاوەتەوە، هەڵسە تێکۆشە، کەی کاتی نووستنو پاڵکەوتنە، ڕاپەڕە ئەو خەڵکە بێ ئاگایە بێدار کەرەوە، لەسزای خوا بیانترسێنە، تەنیا خودای خۆت بەگەورە بگرە، هەر ئەو بەخودای خۆت بزانە، وەجلو بەرگی خۆت پاكو تەمیز ڕابگرە، وە وەك هەمیشەو تاسەر واز لەبتو بتکاری بێنە، یا دەست لەگوناه هەڵگرە. ئیتر لەوە بەدوا سرووش بەگەرمی دەهاتو پەیتا پەیتا بەردوا دەهاتە خوارێ.

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

جابیر خۆیو عەبدوڵڵای باوکی هاوڕێی پێغەمبەر بوون، ئەمیش وەك عائیشە یەکێکە لەو شەش هاوڕێیەی کەفەرمووەی زۆرتریان گێڕاوەتەوە، هەزارو پێنج سەدو چل فەرموودەی گێڕاوەتەوە، دووسەدو دەیان هی بوخاریو موسلیمن، پەنجاو هەشتیان پەسندی هەردوولایە، بیستو شەشیان هی بوخاری یە، سەدو بیستو شەشیشیان بەتەنها هی موسلیمە، کاتێ مرد کوێر بوو بوو، تەمەنی نەوەدو چوار ساڵ بوو، دوا هاوڕێی پێغەمبەر بووە کەلەمەدینە

مردووه، ئەم فەرموودەیە پێ ی دەگوترێ موعەللەق، واتە: بەتەعلیق ڕیوایەت کراوە، تەعلیق ئەوەیە سەرەتای ڕشتەی فەرموودەکە کرتێنرابێ، تەعلیقی صەحیحی بوخاری هەمووی موسنەدە، واتە: بەڕشتەی ساخ و بەئیسنادی صەحیح ریوایەت کراوە، یا لەلایەن بوخاری خۆیەوە یا لەلایەن فەرمووده زانێکی تری متمانە پێکراوەوە، بوخاری ڕشتەی ئەم فەرموودەیەی لەئەدەب و لەتەفسیردا لەم زاتانەوە دەیگێڕێتەوە تادەگاتەوە سەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): لەیەحیاوە، لە لەیثەوە، لەعوقەیلەوە، لەئیبنو شەهابەوە، لەئەبوسەلەمەوە، لەجابیرەوە، لەپێغەمبەرەوە: (تاج/٤ ل/٢٩٤ ز/٩٨ ژ/٣١٤٨، ٣١٤٧ تاج/٣ چاپی/٤) + (ت/٥ ل/١٨١).

١٠١- عَنْ يَحْيَى قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا سَلَمَةَ: أَيُّ الْقُرْآنِ أُنْزِلَ قَبْلُ؟ قَالَ: (يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ) فَقُلْتُ: أَوِ (اقْرَأْ)؟ فَقَالَ: سَأَلْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ: أَيُّ الْقُرْآنِ أُنْزِلَ قَبْلُ؟ قَالَ: (يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ)، فَقُلْتُ: أَوِ (اقْرَأْ). قَالَ: جَابِرٌ: أُحَدِّثُكُمْ مَا حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « جَاوَرْتُ بِحِرَاءٍ شَهْرًا، فَلَمَّا قَضَيْتُ جِوَارِي نَزَلْتُ فَاسْتَبْطَنْتُ بَطْنَ الْوَادِي فَنُودِيتُ، فَنَظَرْتُ أَمَامِي وَخَلْفِي وَعَنْ يَمِينِي وَعَنْ شِمَالِي فَلَمْ أَرَ أَحَدًا، ثُمَّ نُودِيتُ، فَلَمْ أَرَ أَحَدًا، ثُمَّ نُودِيتُ، فَرَفَعْتُ رَأْسِي فَإِذَا هُوَ عَلَى الْعَرْشِ فِي الْهَوَاءِ، يَعْنِي جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ، فَأَخَذَتْنِي مِنْهُ رَجْفَةٌ شَدِيدَةٌ، فَأَتَيْتُ خَدِيجَةَ فَقُلْتُ: دَثِّرُونِي، فَدَثَّرُونِي، فَصَبُّوا عَلَيَّ مَاءً، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ( يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ. قُمْ فَأَنْذِرْ. وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ. وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ. وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ».[١٠١]

ئەمە دەقی عەرەبی پوختەی موسلیمە، ژمارە (٧٤):

یەحیا فەرمووی: لە ئەبو سەلەمەم پرسی: (کامەی قورئان یەکەمجار دابەزی و هاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر؟). فەرمووی: سوورەتی {یَا أَیُّهَا الْمُدَّثِّرُ}.

[١٠١] مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٧٤ = شيحا: ٤٠٧. بخاری: ٤، ٣٢٣٨.

گوتم: ئەی وا مەشهووره کە سەرەتای سوورەتی عەلەق یەکەمجار هاتۆتە خوارەوە، کەبە (اقرأ) دەست پێ دەکا؟ فەرمووی: من لەم بارەیەوە پرسیارم لە جابیری کوڕی عەبدوڵلا کرد: کامەی قورئان یەکەمجار دابەزیو هاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر؟ فەرمووی: {يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ} منیش گوتم: ئەی وا بەناوبانگە کە (اقرأ) یەکەم قورئانی دابەزیوە؟ جابیر فەرمووی: من ئەوەتان بۆ دەڵێم کە پێغەمبەر باسی کردووە بۆ ئێمە، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ماوەی مانگێ لە ئەشکەوتی حیرادا خەڵوەم دەکێشا بە تاقی تەنیاو خوا پەرستیم دەکرد، کاتێ خەڵوەکەمم تەواو کرد لە چیاکە دابەزیم، تا گەیشتمە ناو شیوەکە، ئەوەندەم زانی یەکێ بانگم دەکا، منیش سەیری ئەملاو لاو بەردەم و پشت و راست و چەپی خۆمم کرد کەچی کەسم نەدی، دیسان یەکێ بانگی لێ کردمەوە، کە تەماشام کردەوە دیسان کەسم نەدی، هەمدیسانەوە یەکێ بانگی لێ کردمەوە، ئەمجارە کە سەرم بەرزکردەوە تەماشام کرد وا جوبرائیل لەسەر بارەگاو تەختێکە وا بە حەواوە! ئیتر لەرزێکی واگران دایگرتم نەبێتەوە، بەدەم ئەو لەرزەوە چوومەوە بۆلای خەدیجەو گوتم: دامپۆشن، ئەوانیش دایان پۆشیم و هەندێ ئاویان پیادا کردم، ئینجا خودای گەورەو سەروەر ئەمەی نارده خوارەوە: {يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ، قُمْ فَأَنذِرْ، وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ، وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ}. (تاج/٤، لاپەڕە: ٢٩٥، زنجیرە: ٩٨، ژمارە: ٣ = تاج-٣ ژ-٣١٤٩ ل-٤٣٨ ج-٤).

## (٧٤) باب: الإسْرَاءِ بِرَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) إلى السَّموَاتِ وَفَرْضِ الصَّلَوَاتِ

## بردنی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئیسراو شەورەوی بۆ ئاسمانەکانو فەرزکردنی پێنج نوێژەکان

١٠٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَانَ أَبُو ذرّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) يُحَدِّث أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ فُرِجَ عَنْ سَقْفِ بَيْتِي وَأَنَا بِمَكَّةَ فَنَزَلَ جِبْرِيلُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَفَرَجَ صَدْرِي ثمَّ غَسَلَهُ بِمَاءِ زَمْزَمَ ثمَّ جَاءَ بِطَسْتٍ مِنْ ذهَبٍ مُمْتَلِئٍ حِكْمَةً وَإِيمَانًا فَأَفْرَغَهُ فِي صَدْرِي ثمَّ أَطبَقَهُ ثمَّ أَخَذ بِيَدِي فَعَرَجَ بِي إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا فَلَمَّا جِئْتُ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا قَالَ جِبْرِيلُ لِخَازِنِ السَّمَاءِ افْتَحْ قَالَ مَنْ هَذا قَالَ هَذا جِبْرِيلُ قَالَ هَلْ مَعَكَ أَحَدٌ قَالَ نَعَمْ مَعِي مُحَمَّدٌ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ أَوَ أُرْسِلَ إِلَيْهِ قَالَ نَعَمْ فَلَمَّا فتحَ عَلَوْنَا السَّمَاءَ الدُّنْيَا فَإِذا رَجُلٌ قَاعِدٌ عَلَى يَمِينِهِ أَسْوِدَةٌ وَعَلَى يَسَارِهِ أَسْوِدَةٌ إِذا نَظرَ قِبَلَ يَمِينِهِ ضحِكَ وَإِذا نَظرَ قِبَلَ يَسَارِهِ بَكَى فَقَالَ مَرْحَبًا بِالنَّبِيِّ الصَّالِحِ وَالِابْنِ الصَّالِحِ قُلْتُ لِجِبْرِيلَ مَنْ هَذا قَال هَذا آدَمُ وَهَذِهِ الْأَسْوِدَةُ عَنْ يَمِينِهِ وَشِمَالِهِ نَسَمُ بَنِيهِ فَأَهْلُ الْيَمِينِ مِنْهُمْ أَهْلُ الْجَنَّةِ وَالْأَسْوِدَةُ الَّتِي عَنْ شِمَالِهِ أَهْلُ النَّارِ فَإِذا نَظرَ عَنْ يَمِينِهِ ضحِكَ وَإِذا نَظرَ قِبَلَ شِمَالِهِ بَكَى حَتَّى عَرَجَ بِي إِلَى السَّمَاءِ الثانِيَةِ فَقَالَ لِخَازِنِهَا افْتَحْ فَقَالَ لَهُ خَازِنِهَا مِثلَ مَا قَالَ الْأَوَّلُ فَفتَحَ قَالَ أَنَسٌ فَذكَرَ أَنَّهُ وَجَدَ فِي السَّمَوَاتِ آدَمَ وَإِدْرِيسَ وَمُوسَى وَعِيسَى وَإِبْرَاهِيمَ صَلَوَاتُ اللَّهِ عَلَيْهِمْ وَلَمْ يُثبِتْ كَيْفَ مَنَازِلُهُمْ غَيْرَ أَنَّهُ ذكَرَ أَنَّهُ وَجَدَ آدَمَ فِي السَّمَاءِ الدُّنْيَا وَإِبْرَاهِيمَ فِي السَّمَاءِ السَّادِسَةِ قَالَ أَنَسٌ فَلَمَّا مَرَّ جِبْرِيلُ بِالنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِإِدْرِيسَ قَالَ مَرْحَبًا بِالنَّبِيِّ الصَّالِحِ وَالْأَخِ الصَّالِحِ فَقُلْتُ مَنْ هَذا قَالَ هَذا إِدْرِيسُ ثمَّ مَرَرْتُ بِمُوسَى فَقَالَ مَرْحَبًا بِالنَّبِيِّ الصَّالِحِ وَالْأَخِ الصَّالِحِ قُلْتُ مَنْ هَذا قَالَ هَذا مُوسَى ثمَّ مَرَرْتُ بِعِيسَى فَقَالَ مَرْحَبًا بِالْأَخِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ قُلْتُ مَنْ هَذا قَالَ هَذا عِيسَى ثمَّ مَرَرْتُ بِإِبْرَاهِيمَ فَقَالَ مَرْحَبًا بِالنَّبِيِّ الصَّالِحِ وَالِابْنِ الصَّالِحِ قُلْتُ مَنْ هَذا قَالَ هَذا إِبْرَاهِيمُ صَلَّى

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ ابْنُ شِهَابٍ فَأَخْبَرَنِي ابْنُ حَزْمٍ أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ وَأَبَا حَبَّةَ الْأَنْصَارِيَّ كَانَا يَقُولَانِ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ عُرِجَ بِي حَتَّى ظَهَرْتُ لِمُسْتَوَى أَسْمَعُ فِيهِ صَرِيفَ الْأَقْلَامِ قَالَ ابْنُ حَزْمٍ وَأَنَسُ بْنُ مَالِكٍ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَفَرَضَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى أُمَّتِي خَمْسِينَ صَلَاةً فَرَجَعْتُ بِذَلِكَ حَتَّى مَرَرْتُ عَلَى مُوسَى فَقَالَ مَا فَرَضَ اللَّهُ لَكَ عَلَى أُمَّتِكَ قُلْتُ فَرَضَ خَمْسِينَ صَلَاةً قَالَ فَارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ فَإِنَّ أُمَّتَكَ لَا تُطِيقُ ذَلِكَ فَرَاجَعْتُ فَوَضَعَ شَطْرَهَا فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسَى قُلْتُ وَضَعَ شَطْرَهَا فَقَالَ رَاجِعْ رَبَّكَ فَإِنَّ أُمَّتَكَ لَا تُطِيقُ فَرَاجَعْتُ فَوَضَعَ شَطْرَهَا فَرَجَعْتُ إِلَيْهِ فَقَالَ ارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ فَإِنَّ أُمَّتَكَ لَا تُطِيقُ ذَلِكَ فَرَاجَعْتُهُ فَقَالَ هِيَ خَمْسٌ وَهِيَ خَمْسُونَ لَا يُبَدَّلُ الْقَوْلُ لَدَيَّ فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسَى فَقَالَ رَاجِعْ رَبَّكَ فَقُلْتُ اسْتَحْيَيْتُ مِنْ رَبِّي ثُمَّ انْطَلَقَ بِي حَتَّى انْتَهَى بِي إِلَى سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى وَغَشِيَهَا أَلْوَانٌ لَا أَدْرِي مَا هِيَ ثُمَّ أُدْخِلْتُ الْجَنَّةَ فَإِذَا فِيهَا حَبَايِلُ اللُّؤْلُؤِ وَإِذَا تُرَابُهَا الْمِسْكُ).[١٠٢]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران ئەبوذەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەیگێڕایەوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (هێشتا لەمەککە بووم بنمیچیماڵەکە شەق بوو، جوبرەئیل لەشەقەکەوە دابەزی، سلاوی خودای لێ بێ، سینگی لەت کردمو بەئاوی زەم زەم شۆردیەوە، ئەوسا تەشتێکی زێڕینی هێنا، پڕ بوو لەداناییو باوەڕ، واتە: لەحیکمەتو ئیمان، تەشتە پڕەکەی خاڵی کردە ناو سینگمەوە، ئەوجا قەپاتی کردەوە. ئنجا دەستی گرتمو سەری خستم بۆ ئاسمانی یەکەم.

کاتێ کەیشتینە ئاسمانی یەکەم، جوبرائیل بەدەرکەوانی ئاسمانی فەرموو: دەرگاکەمان بۆ بکەرەوە، ئەویش فەرمووی: ئەوەکێ یە؟ فەرمووی: منم جوبرائیلم، فەرمووی کەسی ترت لەگەڵە؟ فەرمووی: بەڵێ: موحەممەدم

---

[١٠٢] تەجرید/١، ژمارە: ٢٢١. بخاری/٣٤٩. مسلم: ١٦٣ - شیحا: ٤٠٩.

لەگەڵدایە، فەرمووی: دیارە نێردراوە بەشوێنیدا؟ فەرمووی: بەڵێ، جا دەرگاکەی بۆمان کردەوەو سەرکەوتینە سەرئاسمانی یەکەم، سەرنجم دا واپیاوێ دانیشتووە، لەڕاستو لەچەپیەوە، پۆل پۆل تارمایی ی عەشامات دیارن، پیاوەکە کەسەیری لای ڕاستی خۆی دەکرد، لەخۆشیدا پێ دەکەنی، بەڵام کەسەیری لای چەپی خۆی دەکرد، لەخەفەتانا، دەگریا، فەرمووی مەرحەبا لە پێغەمبەری باشو لەکوڕی باشم، گوتم: ئەی جوبرائیل! ئەمە کێیە؟ فەرمووی: ئەمە باوە ئادەمە، ئەوتارمایی عەشاماتانەش کەوان لەڕاستو چەپیەوە، گیانگەلو ڕەوانگەل (ئەرواح) ی وەچەو نەوەکانیەتی، ئەوانەیان کەوان لەلای ڕاستیەوە ئەوانە بەهەشتین، بەڵام ئەوانەیان کەوان لەلای چەپیەوە ئەوانە دۆزەخین، جابۆیە کەتەماشای لای ڕاستی دەکا پێ دەکەنیو کەتەماشای لای چەپی دەکا دەگری.

ئەوجا سەری خستم بۆ ئاسمانی دووەم، بەدەرکەوانەکەی ی فەرموو: دەرگاکە بکەرەوە، ئەو پرسیارو وەڵامەی کەلەنێوانی جوبرائیلو دەرکەوانی یەکەم دا رووی دا، لەنێوانی جوبرائیلو دەرکەوانی ئاسمانی دوەمیش دا رووی دا، ئەوجا دەرگاکەی کردەوە).

ئەنەس فەرمووی: ئەبوزەڕ باسی ئەوەی فەرموو کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەئاسمانەکان ئەم پێغەمبەرانەی دیوە: ئادەمو ئیدریسو مووساو عیساو ئیبراهیم - دروودی خودای گەورەیان لێ بێ - بەڵام جێگەو شوێنی هەموویانی دیاری نەکرد، تەنیا باسی ئەوەندەی کرد کەلەئاسمانی یەکەم بەئادەم دەگاو، لەئاسمانی شەشەم بەئیبراهیم.

ئەنەس خۆی دەیفەرموو: کاتێ جوبرائیل پێغەمبەر دەبا بۆلای ئیدریس، پێغەمبەر ڕۆژباشی لێ دەکاو سلاوی لێ دەکا، ئیدریسیش پێی دەفەرموێ: مەرحەبا لە پێغەمبەری باشو لەبرای باش، (جا بەجوبرائیلم گوت: ئەمە کێ

یە؟ فەرمووی: ئەمە ئیدریس پێغەمبەرە، ئینجا گەیشتم بەمووسا، فەرمووی: مەرحەبا لە پێغەمبەری باش‌و لەبرای باش، گوتم: ئەمەکێیە؟ فەرمووی: ئەمە مووسایە، ئەوجا گەیشتم بەعیسا، فەرمووی: خۆشهاتن پێشکەش دەکەم بە برای باش‌و بە پێغەمبەری باش، گوتم: ئەمە کێیە؟ فەرمووی: ئەمە عیسایە، ئەوجا گەیشتم بەئیبراهیم، فەرمووی: مەرحەبا لە پێغەمبەری باش‌و لەکوڕی باشم، گوتم: ئەمە کێیە؟ فەرمووی: ئەمە ئیبراهیم بوو (سەلامی خوای لێ بێ).

ئیبنو شیهاب (کەناوداره بەزوهری) دەفەرموێ: ئەبوبەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزم هەواڵی پێم دا: کەئیبنوعەباس‌و ئەبوحەببەی ئەنصاری فەرموویانە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پاشتر بەرەو ژوورتریش برام تاگەیشتمە سەرئاستێ لەوێوە گوێم لەجیڕەی قەڵەمی فریشتەکان بوو). ئیبنوشیهاب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەبوبەکری نەوەی ئیبنوحەزم لەپیر (شێخ) ی خۆیەوەو، ئەنەسی کوڕی مالیك لەئەبوذەڕەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموون: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوجاا خودا شەوو ڕۆژی پەنجا نوێژی لەسەر گەلی ئیسلامم دانا، منیش بەم فەرمانەوە گەڕامەوە، هەتا چوومەوە لای مووسای کوڕی عیمران، فەرمووی: خودا چی بۆدانای لەسەر نەتەوەکەت؟ گوتم: لەهەموو شەوو ڕۆژێکا پەنجا نوێژی داناوە لەسەر هەموو موسوڵمانێ، فەرمووی: من لەتۆ زیاتر شارەزاییم هەیە لەڕەفتاری ئەو خەڵکە، چونکە من لەپێش تۆدا ئەرکی زۆرم لەم بارەیەوە لەگەڵ گەلی خۆم دا، کەنەوەی ئیسرائیلن، کێشاوەو، بەراووردم کردوون‌و ئەزموونی باشم هەیە لەم بوارەدا، جابۆیە دەزانم کە ئۆمەت (نەتەوە) ی تۆ تەوانای ئەوەیان نییە، کەواتە بگەڕێرەوە بۆلای خودای پەروەردگارت، داوای لێ بکە کەئەم نوێژانەلەسەر نەتەوەکەت سووك بکا، منیش




گەڕامەوە بۆ خزمەتی پەروەردگارم، بۆئەو شوێنەی کەیەکەمجار گوفتوگۆم لەخزمەتیدا کردو، داوای ئەوەم لێ ی کردو، ئەویش ژمارەیەکی لێ لابردن، دیسان گەڕامەوە بۆلای مووساو، حاڵەکەم پێ گوت، ئەویش فەرمووی بگەڕێرەوە بۆلای پەروەردگارت، چونکە نەتەوەکەت توانای ئەم ژمارە داشکاوەشیان نییە، جا چوومەوە بۆ خزمەتیو دیسان ژمارەیەکی تری لێ داشکاند، ئەویش دیسانەوە فەرموویەوە: بچۆرەوە بۆ خزمەتی پەروەردگارت چونکە نەتەوەکەت توانای ئەم ژمارە تازەیشیان نییە، ئەم ژمارەیش کەماوە هێشتا هەر زۆرە، ئەمجارەیان کەچوومەوە خزمەتی فەرمووی: خۆیان بەکردن ژمارەیان پێنج نوێژە، بەڵام خێرو پاداشی پەنجا نوێژیان هەیە، ئەی موحەممەد! ئەمەدوا فەرمایشتەو گۆڕانی بۆ نییە، وەئیتر لەمەزیاتر ژمارەی نوێژەکان کەم ناکەمەوە، بەڵام بۆتۆو بۆهەموو نوێژکەرێکی ئۆمەتی تۆ هەیە لەجیاتی کردنی ئەم پێنج نوێژمیە، خێرو پاداشی پەنجا نوێژەکەی پێشوو. دیسانەوە گەڕامەوە بۆلای موسا، هەمدیسانەوە فەرموویەوە: بچۆرەوە بۆ خزمەتی پەروەردگارت، بەڵام گوتم: ئەم خێرەم قەبووڵەو کاری خۆم دایە دەست خوداو، ئیتر شەرم دەکەم لە پەروەردگارم کەبڕۆمەوە بۆلایو داوای کەم کردنەوەی ژمارەی پێنج نوێژەی لێ بکەم ).

هەروا بردمیان هەتا گەیاندمیانە لای سیدرەتولمونتەها (واتە: دارمۆردی هەرە ئەوپەڕ، بۆیە وای پێ دەبێژرێ چونکە زانیاری فریشتەکان هەتا ئەوێ بڕ دەکا، جگە لەیەزدانی پاك کەس نازانێ لەولاتر چی هەیە) سەرنجم دا چەندەها ڕەنگی سەیری زۆری جۆراو جۆر دایپۆشیبوو، مەگەر خودا بۆخۆی بزانێ کەچی بوونو چۆن بوونو چەند بوون!

پاشتر برامـه نـاو بەهەشـتەوە، کەتەماشـام کـرد پـڕە لەگومـەزی مـرواریو خاکەکەیشی مسکە). (ت/ ٤/ ٢٩٩/ ١، ت/١/ ١٨٠/ ١ = تاج-٣ ز-١٠٠ ژ-٣١٥٥ + تاج-١ ز-٤٣ ژ-٣٢٢).

**ڕوونکردنەوە: ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:**

١- ئیسراو میعراج دوو ڕووداوی جیان.

٢- پێغەمبەر لەنەوەی حەزرەتی ئیبراهیمە (سەلامی خوای لێ بێ).

٣- بەهەشتو دۆزەخ ئێستا دروست کراونو هەن.

٤- گیانی چاکان دەبرێن بۆ ئاسمان.

٥- پێغەمبەران بەڕاستی زیندوون، بەکاری باشی نەوەو نەتەوەیان دڵخۆش دەبن، بەکاری خراپیان دڵگران دەبن.

٦- مەرحـــەباو چاکوچـــۆنیو بـــەخێرهاتن لـــەکاتی بەیـــەك گەیـــشتن دا سوننەتە. (ت/ ٤/ ٢٩٩/ ١+ ت/ ١/ ١٨٠/ ١).

ئەنەســـی کـــوڕی مالیـــك (ڕەزای خـــودای گـــەورەی لێ بـــێ) فـــەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: شـەوی ئیـسرا، وڵاخێـکی سپییان هێنا بۆم، لە هێستر بچکۆلە ترو لە گوێدرێژ گەورەتر بـوو، نـاوی بـوراق بـوو، چـونکە دەچریـسکایەوەو لەبـەر خێرایـی دەتگـوت بەرقـە، واتـە: بروسـکە، چەندە چاوی بڕی دەکرد دەیکرد بەیەك هەنگاو، جا سواری ئـەو وڵاخـە بـووم لەگـەڵ جوبرائیلـدا ڕۆیـشتم هـەتا گەیـشتینە بەیتولمەقـدیس، واتـە: خانـەی خاوێنو پاكو پیرۆز. فەرمووی: جا لەوێ بوراقم بەسـتەوە بـەو ئەڵقەیـەوە، کـە پێغەمبـــەران (دروودی خودایـــان لێ بـــێ) لـــەکاتی ســـەردانی بەیتولمەقدیـــسدا، وڵاخەکانیان دەبەستنەوە بەو ئەڵقەیـەوە. فـەرمووی: جـا چـوومە نـاو حـەرەمی

مزگەوتەکەوەو دوو رکات نوێژی سوننەتم تیادا کرد، ئەوجا هاتمە دەرەوە، جا جوبرائیل (سڵاوی خودای لەسەر بێ) قاپێ مەیو قاپێ شیری بۆم هێنا، منیش جامە شیرەکەم لێ وەرگرتو خواردمەوە، جوبرائیل فەرمووی: ئەم شیرە کە تۆ هەڵت بژارد، ئەو سرووشتە پاكو پیرۆزەیە، کە خۆتو ئومەتت وان لەسەری).

ئەوجا بەرزی کردینەوە بۆ ئاسمان، لەگەڵ جوبرائیلدا رۆیشتم هەتا گەیشتینە ئاسمانی یەکەم، لەوێ جوبرائیل داوای کردنەوەی دەرگای کرد، لەناوەوە گوترا: ئەوە کێیە لەدەرگا دەدا؟ فەرمووی: جوبرائیل، گوترا: کێت لەگەڵ دایە؟ فەرمووی: موحەممەد، گوترا: نێردراوە بەشوێنیا کەبێت بۆ ئیسراو میعراج؟ فەرمووی: بەڵێ، بانگ کراوە کەبێت بۆ گەشتی ئاسمانەکان، گوترا: بەخێربێو هاتنەکەی خێری پێوەیە، جا دەرگا کرایەوە بۆمانو رۆیشتینە ژوورەوە، کاتێ گەیشتمە جێ لەئاسمانی یەکەم، دەڕوانم وا ئادەم تەشریفی وا لەوێ، جوبرائیل (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەمە حەزرەتی ئادەمی باوکتە، بفەرموو سڵاوو چاكو چۆنی لەگەڵا بکە، منیش سڵاوو رۆژ باشیم لێکرد، ئەویش وەڵامی سڵاوەکەی دامەوە، لەپاشا فەرمووی: خۆش هاتی ئەی کوڕی شیرینم! مەرحەبات لێ بێ، ئەی کوڕی باشمو ئەی پێغەمبەری باشو خاس! وە نزای باشی بۆکردم، ئەوجا سەرکەوتین بۆ ئاسمانی دووەم، جوبرائیل لە دەرگای دا، گوتیان: ئەوە کێیە لە دەرگا دەدا؟ جوبرائیل فەرمووی: جوبرائیل. گوترا: کێت لەگەڵە؟ فەرمووی: موحەممەد، گوتیان: نێردراوە بە شوێنیا؟ فەرمووی: بەڵێ. فەرمووی: جا دەرگا کرایەوە بۆمان، روانیم واعیسای کوڕی مەریەمو یەحیای کوڕی زەکەریا، کە دوو پێغەمبەرنو پورزای یەکترین، وان لەوێ، جا ئەوانیش بەخێرهاتنیان لێ کردمو نزای باشیان بۆم کرد.

ئەوجا سەرکەوتین بۆ ئاسمانی سێیەم، جوبرائیل داوای کردنەوەی دەرگای کرد، گوترا: تۆ کێیت؟ فەرمووی: جوبرائیلم، گوتیان: کێت وا لەگەڵا؟ فەرمووی: موحەممەد، گوترا: نێردراوە بەشوێنیا؟ فەرمووی: بەڵێ، دەرگایان بۆ کردینەوە، دەڕوانم وا یووسف پێغەمبەر والەوێ، کە نیوەی جوانی دراوە بەو، ئەویش بەخێرهاتنی کردمو نزای باشی بۆم کرد، ئەوجا بەرزەوە بووین بۆ ئاسمانی چوارەم، جوبرائیل لە دەرگای دا، گوترا: ئەوە کێیە؟ فەرمووی: جوبرائیل، گوترا: کێت وا لەگەڵدا؟ فەرمووی: موحەممەد، گوترا: نێردراوە بەشوێنیا؟ فەرمووی: بەڵێ، دەرگایان بۆ کردینەوە، لەوێش پێغەمبەر ئیدریسم بینی، بەخێرهاتنێکی گەرمی لێکردمو نزای باشی بۆ کردم، خوا لە قورئانا دەفەرموێ، سەبارەت بە بەرزەوە بوونی ئیدریس بۆ ئاسمان دەفەرموێ: {وَرَفَعْنَاهُ مَكَانًا عَلِيًّا} واتە: ئێمە پێغەمبەر ئیدریسمان بەرزەوە کرد بۆ شوێنو پایەیەکی زۆر بەرزو بڵند).

ئەوجا سەرکەوتین بۆ ئاسمانی پێنجەم، جوبرائیل، لە دەرگایدا، گوتیان: کێیە؟ فەرمووی: منم جوبرائیلم، گوترا: کێت وا لەگەڵدا؟ فەرمووی: موحەممەد، گوترا: نێردراوە بەشوێنیا؟ فەرمووی: بەڵێ، دەرگامان بۆ کرایەوە، هاروون پێغەمبەر لەوێ بوو، بەخێرهاتنی کردمو نزای خێری بۆ کردم، ئەوجا بەرزەوە کراین بۆ ئاسمانی شەشەم، جوبرائیل لە دەرگای دا، گوترا: کێیە؟ فەرمووی: جوبرائیل، گوترا: کێت وا لەگەڵدا؟ فەرمووی: موحەممەد، گوترا: نێردراوە بەشوێنیدا؟ فەرمووی: بەڵێ، دەرگامان بۆ کرایەوە، پێغەمبەر مووسا تەشریفی لەوێ بوو، چاكو چۆنیو بەخێرهاتنی لەگەڵما کردو نزای باشی بۆ کردم، ئەوجا بەرەو ژوور بردینی بۆ ئاسمانی حەوتەم، جوبرائیل لە دەرگای دا، گوترا: ئەوە کێیە؟ فەرمووی: جوبرائیل، گوترا: کێت لەگەڵە؟ فەرمووی:

موحەممەد، گوترا: نێردراوە بەشوێنیدا؟ فەرمووی: بەڵێ، لەوێ بە خزمەتی ئیبراهیم گەیشتم، پشتی دابوو بە بەیتولمەعموور (خانەی ئاوەدان)ەوە، کە لە جوبرائیلم پرسی، فەرمووی: ئەمە بەیتولمەعموورە کە لە قورئاندا، لەسەرەتای سوورەتی طوورەوە، خودا سوێندی پێ دەخواو دەفەرموێ: {وَالْبَيْتِ الْمَعْمُورِ}. هەموو رۆژێ حەفتا هەزار فریشتە دەچنە ناوی بۆ خوا پەرستیو نوێژی تیا دەکەن، کە چوونە دەرەوە لێی، ئیتر جارێکی تر ناگەڕێنەوە بۆی، سەردانو دێنیی ئەم ماڵی ئاوەدانە، دوائەرکی ئایینی سەر شانیانە.

ئەوجا بردمی بۆ سیدرەتولمونتەها، واتە: دار مۆردی هەرە ئەوپەڕ، کە ئەو درەختەیە، زانستی فریشتەکان هەتا ئەوێ بڕدەکاو لەوێ کۆتایی دێ، وە کەس ئەوپەڕی نەکەوتووەو لێی رەت نەبوووە، بێجگە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە تەماشایم کرد وا گەڵاکانی وەك گوێچکەی فیل وابوون، وە دەنکە مۆردەکانی واتە: بەرەکەی، بەقەد کوپەڵەی گوندی هەجەر گەورە بوون، کە ئەم جۆرە کوپەیە ناسراو بوون لای گوێگران، فەرمووی: (جا کاتێ درەختەکە ئەو حاڵەتە دایپۆشی، کە خودا لە سووورەتی (والنجم)دا، ئاوا باسی دەکات: {إِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ مَا يَغْشَى} گۆڕانێکی واهات بەسەریدا، کە هیچ کەس لە دروستکراوانی خودا نەتوانێ وەسفی جوانییەکەی بکات، ئەوسا ئەو سرووشەی کە خودا لە سوورەتی (وَالنجم)دا ئاوا باسی دەکا: {فَأَوْحَى إِلَى عَبْدِهِ مَا أَوْحَى} ئەو سرووشەی بۆ ناردم. ئەنجا لەلایەنی خوداوە پەنجا نوێژ لەسەر خۆمو یەکە یەکەی گەلی ئیسلام دانرا، لەماوەی هەموو شەوو رۆژێکا، جا بەرەودوا گەڕامەوە بۆ خوارەوە هەتا گەیشتمەوە لای مووسا، فەرمووی: چی ئەرکێ لەسەر خۆتو گەلەکەت دانرا؟ گوتم: پەروەردگارم پەنجا نوێژی رۆژانە لەسەرمان دانا، فەرمووی: من لەتۆ باشتر شارەزاییم هەیە لە رەفتاری ئەو خەڵکە، چونکە من لەپێش تۆدا

زۆر بە زەحمەت خەریکی نەوەی ئیسرائیل بووم‌و بەراووردم کردوون، جا بۆیە دەزانم کە ئۆمەتی تۆ تەوانایی ئەوەیان نییە، کەواتە: بگەڕێرەوە بۆلای خودا، داوای لێ بکە کەئەم نوێژانە لەسەر ئۆمەتت سووك بکا).

منیش گەڕامەوەو داوای ئەوەم لێکردو ئەویش پێنجی لێ داشکانن، جا گەڕامەوە بۆلای مووساو پێم گوت: کە پێنج نوێژی لێ داشکاندن، بەڵام دووبارە وەك جاری پێشووی پێ فەرمووم، فەرمووی: ئیتر هەروا لە نێوانی پەروەردگاری پیرۆزو گەورەماو لەنێوانی مووسادا دەهاتم‌و دەچووم‌و بەرە بەرە خودای گەورە ژمارەی نوێژەکانی لە پەنجاوە کرد بە پێنج، ئەوجا فەرمووی: ئەی موحەممەد! خۆیان پێنج نوێژن، لە هەموو شەوو رۆژێکا، بەڵام هەر نوێژەی خێری دەنوێژی هەیە، جا کەوابوو دەکاتەوە پەنجا نوێژەکە!!). وە هەروەها خوای گەورە فەرمووی پێم: (وەهەر لەم بابەتەیە، کە چاکەیەك بەدەیە، کە هەرکەسێ نیازی هەبوو کە چاکەیێ بکا، بەڵام نەیکرد، ئەوە لەسەر نیازە پاکەکەی چاکەیەکی بۆ دەنووسرێ، بەڵام ئەگەر کردی ئەوە بە دەقات بۆی دەنووسرێ ئەگەر کەسێکیش ویستی خراپەیێ بکا، وەنەیکرد ئەوە هیچی لەسەر نانووسرێ، بەڵام ئەگەر خراپەکەی کرد، ئەوە وەك خۆی بەیەك خراپە بۆی دەنووسرێ).

فەرمووی: ئەوجا دابەزیمەوە بۆلای مووساو هەواڵەکەم پێ گووت، دیسان فەرموویەوە بچۆرەوە بۆلای پەروەردگارت‌و داوای بار سووکی لێبکە).

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: عەرزیم کرد: (بەڕاستی ئەوەندە دووبارەو سێبارە لەم بارەیەوە چوومەتەوە خزمەتی پەروەردگارم‌و سەبارەت بەم کارە داوای بارسوکیم لێکردووە، ئیتر شەرم دەکەم

كه رووى لىٚ بنيٚمو لەرووم نايىٚو شەرم دەكەم بچمەوە خزمەتى). (بڕوانە: تەجريد/٤، لاپەڕە: ٢٠٣، ژمارە: ١٥١٣).

١٠٣- عَنْ مَالِكِ بْنِ صَعْصَعَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) انَّ نَبِيَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَدَّثهُمْ عَنْ لَيْلَةِ اسْرِيَ بِهِ بَيْنَمَا انَا فِي الْحَطِيمِ وَرُبَّمَا قَالَ: فِي الْحِجْرِ مُضطجِعًا اذ اتَانِي اتٍ فَقَدَّ قَالَ: وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ فَشَقَّ مَا بَيْنَ هَذهِ الَى هَذهِ قَالَ الراوي: مِنْ ثغْرَةِ نَحْرِهِ الَى شِعْرَتِهِ فَاسْتَخْرَجَ قَلْبِي ثمَّ اتِيتُ بِطسْتٍ مِنْ ذهَبٍ مَمْلُوءةٍ ايمَانًا فَغُسِلَ قَلْبِي ثمَّ حُشِيَ ثمَّ اعِيدَ ثمَّ اتِيتُ بِدَابَّةٍ دُونَ الْبَغْلِ وَفَوْقَ الْحِمَارِ ابْيَض فَقَالَ الراوي: هُوَ الْبُرَاقُ يَضعُ خَطوَهُ عِنْدَ اقْصَى طرْفِهِ فَحُمِلْتُ عَلَيْهِ .

فَانْطلَقَ بِي جِبْرِيلُ حَتَّى اتَى السَّمَاء الدُّنْيَا فَاسْتَفْتَحَ فَقِيلَ: مَنْ هَذا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ قِيلَ: وَقَدْ ارْسِلَ الَيْهِ ، قَالَ: نَعَمْ ، قِيلَ: مَرْحَبا بِهِ فَنِعْمَ الْمَجِيء جَاء فَفَتَحَ فَلَمَّا خَلَصْتُ فَاذا فِيهَا ادَمُ فَقَالَ: هَذا ابُوكَ ادَمُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَرَدَّ السَّلامَ ثمَّ قَالَ: مَرْحَبا بالابْنِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ ثمَّ صَعِدَ بِي حَتَّى اتَى السَّمَاء الثانِيَةَ فَاسْتَفْتَحَ قِيلَ: مَنْ هَذا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ قِيلَ: وَقَدْ ارْسِلَ الَيْهِ قَالَ: نَعَمْ قِيلَ: مَرْحَبا بِهِ فَنِعْمَ الْمَجِيء جَاء فَفَتَحَ فَلَمَّا خَلَصْتُ اذا يَحْيَى وَعِيسَى وَهُمَا ابْنَا الْخَالَةِ قَالَ: هَذا يَحْيَى وَعِيسَى فَسَلِّمْ عَلَيْهِمَا فَسَلَّمْتُ فَرَدَّا ثمَّ قَالا مَرْحَبا بالاخِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ .

ثمَّ صَعِدَ بِي الَى السَّمَاء الثالِثةِ فَاسْتَفْتَحَ قِيلَ: مَنْ هَذا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ قِيلَ: وَقَدْ ارْسِلَ الَيْهِ قَالَ: نَعَمْ قِيلَ: مَرْحَبا بِهِ فَنِعْمَ الْمَجِيء جَاء فَفُتِحَ فَلَمَّا خَلَصْتُ اذا يُوسُفُ قَالَ: هَذا يُوسُفُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَرَدَّ ثمَّ قَالَ: مَرْحَبا بالاخِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ ثمَّ صَعِدَ بِي حَتَّى اتَى السَّمَاء الرَّابِعَةَ فَاسْتَفْتَحَ قِيلَ: مَنْ هَذا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ قِيلَ: اوَ قَدْ ارْسِلَ الَيْهِ قَالَ: نَعَمْ قِيلَ: مَرْحَبا بِهِ فَنِعْمَ الْمَجِيء جَاء فَفُتِحَ فَلَمَّا خَلَصْتُ الَى ادْرِيسَ قَالَ:

هَذا ادْرِيسُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَرَدَّ ثمَّ قَالَ: مَرْحَبا بالاخِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِح .

ثمَّ صَعِدَ بِي حَتَّى اتَى السَّمَاء الْخَامِسَةَ فَاسْتَفْتَحَ قِيلَ: مَنْ هَذا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ ، قِيلَ: وَقَدْ ارْسِلَ الَيْهِ؟ ، قَالَ: نَعَمْ قِيلَ: مَرْحَبا بِهِ فَنِعْمَ الْمَجِيء جَاء فَلَمَّا خَلَصْتُ فاذا هَارُونُ قَالَ: هَذا هَارُونُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَرَدَّ ثمَّ قَالَ: مَرْحَبا بالاخِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ ثمَّ صَعِدَ بِي حَتَّى اتَى السَّمَاء السَّادِسَةَ فَاسْتَفْتَحَ قِيلَ: مَنْ هَذا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ قِيلَ: مَنْ مَعَكَ قَالَ: مُحَمَّدٌ قِيلَ: وَقَدْ ارْسِلَ الَيْهِ قَالَ: نَعَمْ قَالَ: مَرْحَبا بِهِ فَنِعْمَ الْمَجِيء جَاء فَلَمَّا خَلَصْتُ فاذا مُوسَى قَالَ: هَذا مُوسَى فَسَلِّمْ عَلَيْهِ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَرَدَّ ثمَّ قَالَ: مَرْحَبا بالاخِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ فَلَمَّا تَجَاوَزْتُ بَكَى قِيلَ لَهُ: مَا يُبْكِيكَ قَالَ: ابْكِي لانَّ غُلامًا بُعِث بَعْدِي يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْ امَّتِهِ اكْثرُ مِمَّنْ يَدْخُلُهَا مِنْ امَّتِي .

ثمَّ صَعِدَ بِي الَى السَّمَاء السَّابِعَةِ فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ قِيلَ: مَنْ هَذا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ قِيلَ: وَقَدْ بُعِث الَيْهِ قَالَ: نَعَمْ قَالَ: مَرْحَبا بِهِ فَنِعْمَ الْمَجِيء جَاء فَلَمَّا خَلَصْتُ فَاذا ابْرَاهِيمُ قَالَ: هَذا ابُوكَ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ قَالَ: فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَرَدَّ السَّلامَ قَالَ: مَرْحَبا بالابْنِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ ثمَّ رُفِعَتْ الَيَ سِدْرَةُ الْمُنْتَهَى فَاذا نَبْقُهَا مِثلُ قِلالِ هَجَرَ وَاذا وَرَقُهَا مِثلُ اذان الْفِيَلَةِ قَالَ: هَذهِ سِدْرَةُ الْمُنْتَهَى وَاذا ارْبَعَةُ انْهَارٍ نَهْرَان باطنَان وَنَهْرَان ظاهِرَان فَقُلْتُ مَا هَذان يَا جِبْرِيلُ قَالَ: امَّا الْباطنَان فَنَهْرَان فِي الْجَنَّةِ وَامَّا الظاهِرَان فَالنِّيلُ وَالْفُرَاتُ ثمَّ رُفِعَ لِي الْبَيْتُ الْمَعْمُورُ يدخُلُه كلّ يومٍ سبعونَ الفَ ملكٍ ثمَّ اتِيتُ باناء مِنْ خَمْرٍ وَاناء مِنْ لَبَنٍ وَاناء مِنْ عَسَلٍ فَاخَذتُ اللَّبَنَ فَقَالَ: هِيَ الْفِطرَةُ الَّتِي انْتَ عَلَيْهَا وَامَّتُكَ .

ثمَّ فُرِضتْ عَلَيَ الصَّلَوَاتُ خَمْسِينَ صَلاةً كُلَّ يَوْمٍ فَرَجَعْتُ فَمَرَرْتُ عَلَى مُوسَى فَقَالَ: بِمَا امِرْتَ قَالَ: امِرْتُ بِخَمْسِينَ صَلاةً كُلَّ يَوْمٍ قَالَ: انَّ امَّتَكَ لا تَسْتَطِيعُ

خَمْسِينَ صَلاةً كُلَّ يَوْمٍ وَانِّي وَاللّٰهِ قَدْ جَرَّبْتُ النَّاسَ قَبْلَكَ وَعَالَجْتُ بَنِي اسْرَائِيلَ اشَدَّ الْمُعَالَجَةِ فَارْجِعْ الَى رَبِّكَ فَاسْالْهُ التَّخْفِيفَ لامَّتِكَ فَرَجَعْتُ فَوَضعَ عَنِّي عَشْرًا فَرَجَعْتُ الَى مُوسَى فَقَالَ: مِثلَهُ فَرَجَعْتُ فَوَضعَ عَنِّي عَشْرًا فَرَجَعْتُ الَى مُوسَى فَقَالَ: مِثلَهُ فَرَجَعْتُ فَوَضعَ عَنِّي عَشْرًا فَرَجَعْتُ الَى مُوسَى فَقَالَ: مِثلَهُ فَرَجَعْتُ فَامِرْتُ بِعَشْرِ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَوْمٍ فَرَجَعْتُ فَقَالَ: مِثلَهُ فَرَجَعْتُ فَامِرْتُ بِخَمْسِ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَوْمٍ فَرَجَعْتُ الَى مُوسَى فَقَالَ: بِمَ امِرْتَ قُلْتُ: امِرْتُ بِخَمْسِ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَوْمٍ قَالَ: انَّ امَّتَكَ لا تَسْتَطِيعُ خَمْسَ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَوْمٍ وَانِّي قَدْ جَرَّبْتُ النَّاسَ قَبْلَكَ وَعَالَجْتُ بَنِي اسْرَائِيلَ اشَدَّ الْمُعَالَجَةِ فَارْجِعْ الَى رَبِّكَ فَاسْالْهُ التَّخْفِيفَ لامَّتِكَ قَالَ: سَالْتُ رَبِّي حَتَّى اسْتَحْيَيْتُ وَلَكِنِّي ارْضى وَاسَلِّمُ قَالَ: فَلَمَّا جَاوَزْتُ نَادَى مُنَادٍ امْضَيْتُ فَرِيضتِي وَخَفَّفْتُ عَنْ عِبَادِي). (الحديث: ٣٨٨٧، اطرافه في:٣٢٠٧، ٣٣٩٣، ٣٤٣٠).[١٠٣]

عەرەبییەکەی هی تجریدی بوخاری بەرگی/٤، ژمارە: (١٥١٣ = ٣٨٨٧) کەمێ جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەصڵەکە بەڵام سوودی پتری واتیادا:

مالیکی کوڕی صەعەصەعە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) باسی ئەو شەوەی بۆ کردین، کەبرد بوویان بۆ ئیسراو میعراج، فەرمووی: (لەلای بەیت، لە حەطیم، یا لە حیجردا، لە نێوانی حەمزەی مامم و جەعفەری ئامۆزاما ڕاکشا بووم، لەبەینی خەوتوو و بیداردا بووم، لەو کاتەدا تەشتێکی زێڕینیان هێنا، پڕبوو لەدانایی (حیکمەت)و باوەڕ (ئیمان) ئینجا جوبرائیل ومیکائیل و ئیسرافیل،لەدانەی سەرسینگمەوە لەتیان کرد هەتا

---

[١٠٣] تەجرید/٤، ژمارە: ١٥١٣. بخاری: ٣٨٨٧، ٣٢٠٧، ٣٣٩٣، ٣٤٣٠. مسلم. ایمان/ ١٦٢. مسلم. شیحا: ٤١٥.

بەرمووسڵدانم، وەدڵیان دەرهێنام و بە ئاوی زەمزەم شۆردیانەوەو ئەنجا پڕ پڕیان کرد لە حیکمەتو لە ئیمان و زانست، ئەوجا نایانەوە شوێنی خۆی.

جا وڵاخێکی سپییان هێنا بۆم، لەهێستر بچکۆلەترو لەگوێدرێژ گەورەتر بوو، ناوی بۆراق بوو، چونکە دەچریسکایەوەو لەبەر خێرایی دەتگوت بەرقە، واتە: بروسکە، چەندە چاوی بڕی دەکرد دەیکرد بەیەك هەنگاو،جاسواری ئەو ولاخە بووم و لەگەڵ جوبرائیل دا ڕۆیشتم هەتا گەیشتینە ئاسمانییەکەم، جا جوبرائیل داوای کردنەوەی دەرگای کرد، لەناوەوە گوترا: ئەوەکێیە؟ گوترا: جوبرائیل گوترا: کێت لەگەڵ دایە؟ فەرمووی: موحەممەد، گوترا: نێردراوە بە شوێنیدا؟ فەرمووی: بەڵێ: گوترا: بەخێر بێ و هاتنەکەی خێری پێوەبێ، جا دەرگا کرایەوەو ڕۆیشتینە ژوورەوە. کاتێ گەیشتمە جێ لەئاسمانی یەکەم، دەروانم وا ئادەم تەشریفی والەوێ، جوبرائیل فەرمووی: ئەمە حەزرەتی ئادەمی باوکتە، بفەرموو سلاوو چاكو چۆنی لەگەلا بکە، منیش سلاو و ڕۆژ باشیم لێ کرد، ئەویش وەلامی سەلاوەکەی دامەوە، لەپاشا فەرمووی: خۆش هاتی ئەی کوڕی شیرینم! مەرحەبات لێ بێ ئەی کوڕی باشمو ئەی پێغەمبەری باش و خاس! (لەگێڕانەوەیەکی تاج دا دەفەرموێ: کاتێ سەرکەوتینە سەر ئاسمانی یەکەم، تەماشام کرد واپیاوێکی نوورانی والەوێ، لە ڕاست و لەچەپیەوە پۆل پۆل تارمایی عەشامات دیارن، پیاوەکە کەسەیری لای ڕاستی خۆی دەکرد پێدەکەنی، بەلام کەسەیری لای چەپی خۆی دەکرد دەگریا، فەرمووی بەمن: مەرحەبا لە پێغەمبەری باش و لە کوڕی باشم، گوتم: ئەی جوبرائیل! ئەمە کێیە؟ فەرمووی: ئەمە باوە ئادەمەو ئەو تارمایی و عەشاماتەیش کەوان لە ڕاست و لە چەپیەوە، گینانگەلی وە چەکانیەتی، ئەوانەیان کەوان لەلای ڕاستیەوە ئەوانە بەهەشتین، بەلام ئەوانەیان کەوان لەلای چەپیەوە ئەوانە

دۆزەخـین، جـا بۆیـە کـە تەماشـای لای ڕاسـتی دەکـا، لـە خۆشـیانا پێدەکـەنێ، کەتەماشای لای چەپی دەکا، لە خەم و خەفەتا دەگری).

ئەوجا سەرکەوتین بـۆ ئاسمـانی دووەم، لـەدەرگای دا، گوتیـان: ئەوەکێیـە؟ فەرمووی: جوبرائیل، گوتیان: کێت لەگەڵ دایە؟ فەرمووی موحەممـەد، گوتیـان: نێـردراوە بـە شـوێنیاکە تەشـریف بهێنـێ بـۆ میعـراج و بـۆ گەشـت کـردن بـەناو ئاسمانەکانـدا؟ فـەرمووی: بـەڵێ، گوتیـان: بـەخێربێ و خێـر و خۆشـی هێنـابێ، دەرگایـان کـردەوە، لـەوێش چـوومە لای عیـساو یـەحیا، کـە دوو پێغەمبـەرن و پوورزای یەکترین، فەرمووی: ئەمـە یـەحیا و عیـسایە، سڵاو و ڕۆژ باشـی یـان لێ بکـە، منـیش سـڵاوم لێ کـردن و ئـەوانش وەڵامـی سـڵاوەکەیان دامـەوە ئـەوجا فـەرموویان: مەرحـەبا لـە بـرای چـاك و لـە پێغەمبـەری چـاك. ئـەوجا بـەرزەوە بـووین بـۆ ئاسمـانی سـێیەم، داوای کردنـەوەی دەرگـای کـرد، گـوترا: کێیـە؟ فەرمووی: جوبرائیل: گوترا: کێت وا لەگەڵ دا؟ فەرمووی: موحەممـەد، گوتیـان: نێردراوە بـە شـوێنی دا..؟ فـەرمووی: بـەڵێ، گوتیـان: بـەخێربێ، لـەوێ ڕۆیـشتم بۆلای یوسف و سـڵاوم لێ کـرد وەڵامـی سڵاوەکەی دامـەوە، فـەرمووی: مەرحـەبا لەبرای باش و لە پێغەمبەری باش. ئەوجا بەرزەوە بووین بـۆ ئاسمـانی چـوارەم، داوای کردنەوەی دەرگای کرد، گوترا: کێیە؟ فەرمووی: جوبرائیل، گوترا: کێت وا لەگەلا؟ فەرمووی: موحەممەد؟ گوترا: نێردراوە بە شوێنیدا؟ فـەرمووی: بـەڵێ، گوترا: بەخێربێ، هاتنەکەی خێـری پێـوەبێ، دەرگـا کرایـەوە لـەوێ گەیـشتم بـە ئیـدریس، فـەرمووی: ئەمـە ئیدریـسە، سـڵاوی لێبکـە، سـڵاوم لێ کـرد، وەڵامـی دایەوەو فەرموی: مەرحەبا لە برای باش و لە پێغەمبەری باش .

ئـەوجا سـەرکەوتین بـۆ ئاسمـانی پێنجـەم داوای کردنـەوەی کـرد گوتیـان: ئـەوە کێیـە؟ فـەرمووی جوبرائیـل. گوتیـان: کێـت وا لەگـەڵ دا؟ فـەرمووی:

موحەممەد، گوتیان: نێردراوە بەشوێنی دا؟ فەرمووی: بەڵێ گوتیان: بەخێربێ، لەوێ چووین بۆ لای پێغەمبەر هاروونی برای پێغەمبەر مووسا (سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەمە هاروونە، سلاوی لێ بکە، سلاوم لێ کرد، وەلامی دامەوە . ئەوجا فەرمووی: مەرحەبا لەبرای باش و لە پێغەمبەری باش .

ئەوجا سەرکەوتین بۆ ئاسمانی شەشەم، داوای کردنەەی دەرگای کرد، گوترا: کێیە؟ فەرمووی: جوبرائیل. گوترا: کێ وا لەگەڵ تا؟ فەرمووی: موحەممەد، گوترا: نێردراوە بە شوینی دا؟ فەرمووی: بەڵێ، گوترا: بەخێربێ و خێرو خۆشی هێنابی، لەوێ گەیشتم بە مووسا فەرمووی: ئەوە مووسایە، سلاوی لێ بکە، سلاوم لێ کرد، وەلامی سلاوی دامەوە ئەوجا فەرمووی: مەرحەبا لە برای باش و لە پێغەمبەری باش، کاتێ لەمووسا تێ پەڕ بووم دەستی کرد بەگریان، گوترا: ئەوە بۆدەگریت؟ فەرمووی: بۆ ئەوە دەگریم، کە ئەم کوڕە جەهێڵەی کە لە پاش من ڕەوانە کراوەو کراوە بە پێغەمبەر، لە ئۆمەتی ئەو زیاتر دەچنە بەهەشت هەتا لە ئۆمەتی من.

ئەنجا چووین بۆ ئاسمانی حەوتەم گوترا: ئەوەکێیە؟ فەرمووی: جوبرائیل، گوتیان: کێت وا لەگەڵ دا؟ فەرمووی:موحەممەد، گوتیان: نێردراوە بەشوێنی دا؟ فەرموی: بەڵێ. گوترا: بەخێربێ، لەوێ چوومە خزمەتی بابە ئیبراهیم، فەرمووی: ئەمە ئیراهیمی باوکتە سلاوی لێ بکە، فەرمووی: سلاوم لێ کرد، وەلامی سلاوەکەی دامەوەو فەرمووی: مەرحەبا لە کوڕی باش و لە پێغەمبەری باش ئینجا بەیتولمەعموور (خانەی ئاوەدان)یان پێ نیشان دام، کە لە جوبرائیلم پرسی، فەرمووی: ئەمە بەیتولمەعموورەکە لە قورئان دا، لەسەرەتای سوورەتی طوورەوە خودا سوێندی پێ دەخواو دەفەرمێ: ﴿والبيت المعمور﴾ هەموو ڕۆژێ حەفتا هەزار فریشتە نوێژی تیادا دەکەن، کە لێی چوونە

دەرەوە ئیتر جارێکی تر ناگەڕێنەوە بۆی، وسەردان و دێنیی ئەم ماڵی ئاوەدانە دوا ئەرکی سەرشانیانە.

هەروا سیدرەتول مونتەهام بۆ دەرخرا، واتە: دارمۆردی هەرە ئەوپەڕ، کە ئەو درەختەیە، زانستی فریشتەکان هەتا ئەوی بڕدەکاو لەویَ کۆتایی دێ، وەکەس ئەو پەڕی نەکەوتووە و لێی ڕەت نەبووە بێجگە لە پێغەمبەر (درووودی خودای لێ بێ) کە تەماشام کرد وا دەنکە مۆردەکانی واتە: بەرەکەی بە قەد کوو پەڵەی گوندی هەجەر گەورە بوون، کە ئەم جۆرە کووپەیە ناسراو بوون لای گوێگران، وەگەلاکەی وەك گوێچکەی فیل وابوو، وە چوار ڕوبار لەبنیەوە هەڵ دەقولان، دوانیان دەچوونەوە بەناوداو دەرنەدەکەوتن، وە دوانیان بەدەرەوە بوون، لە جوبرائیلم پرسی: ئەمانە چین؟ فەرمووی: ئەو دوو جۆگەیەیان کە دەڕۆنە ناوەوە ئەوە دوو جۆگەن وان لە بەهشتا، وە ئەم دوو جۆگەیەیان کەوان بەدەرەوە دوو ڕووباری نیلو فوراتن، نیل وا لە ناوخاکی میسراو فورات والە ناو خاکی عێراقدا .

(لە گێڕانەوەیەکا، کەوا لە (التاج الجامع للاصول في احاديث الرسول) دا دەفەرموێ: ئەنجا بەرزکرامەوە بۆ شوێنێ کەوا لەسەرووی حەوت ئاسمانەکانەوە، هەروا وا لەسەرووی سیدرە تولونتەهاشەوە، گوێم لەجیڕەی قەڵەمەکان بوو، کە چارەنووسی هەموو شتێکیان دەنووسی، کە ڕوودەدەن لە لەوحول مەحفوظ، لەلای کورسی، لە نزیك تەخت و بارەگا (عەرش)ی خودای گەورەو میهرەبان، ئەنجا لە لایە نی خوداوە، فریشتەکان قاپێ شیرو قاپێ مەی و قاپێ هەنگوێنیان بۆم هێنا منیش قاپە شیرەکەم وەرگرت و خواردمەوە، جوبرائیل فەرمووی: (ئەم شیرە ئەو سروشتە پاك و پیرۆزەیە، کە خۆت و ئۆمەتت وان لەسەری).

(ئەنجا لە لایەنی خوداوە پەنجا نوێـژ لـە سـەر خـۆم و یەکـە یەکـەی گـەلی ئیـسلام دانـرا، لـەماوەی هـەموو شـەو و ڕۆژێکـا، جـا بـەرەو دوا گـەڕامـەوە هـەتا گەیشتمەوە لای مووسا، فەرمووی: چ ئەرکێکت لەسەر دانرا؟ گوتم: پەنجا نوێـژم لەسەر فەرزکراوە، لەماوەی هەموو شـەو و ڕۆژێکـا. فـەرمووی: مـن لـە تـۆ باشـتر شـارەزاییم هەیـە لـە ڕەفتـاری ئـەو خەڵکـە، چـونکە مـن لـە پـێش تـۆدا زۆربـە زەحمەت خەریکی نەوەی ئیسرائیل بووم و، بەراووردم کردوون، جا بۆیە دەزانم کە ئۆمەتی تۆ تەوانایی ئەوەیان نیە، کەواتە: بگەڕێرەوە بـۆ لای خـودا، داوای لێ بکە کە ئەم نوێژانە لەسەر ئۆمەتت سووك بکا.

منیش گەڕامەوە و داوای ئەوەم لێ کردو ئەویش لەپەنجاوە کردنـی بەچـل نوێژ ، جا گەڕامەوە بۆ لای مووسا و دووبارە وەك جاری پێشووی پـێ فـەرمووم، جا چۆومەوە بـۆلای پـەروەردگارم، جـا دەنوێـژی تـری لێ داشـکانن و کردنـی بـە سـی نوێـژ، دیـسان گەرامـەوە بـۆلای مووسـا دیـسان هـەمان شـتی فـەرموو، جـا هەمدیسان گەرامەوە بۆلای پەوەردگار، دیسان دەی تری لێ داشکانن و کردنی بـە بیست نوێـژ، دیـسان گەڕامـەوە بـۆ لای مووسـا و چـوار بـار وەك جـاری پێـشووی فەرموو، ئینجا خودا کردنی بە دەنوێژ.

دیـسانەوە گەڕامـەوە بـۆلای مووسـا و هـەم دیـسان وەك جـاری پێـشووی فەرموو: ئـەنجا خـودا کردنـی بـەپێنج نوێـژ، دیـسان کەچوومەوە بـۆلای مووسـا فەرمووی: هاچیت کرد؟ گوتم: کردنی بـە پێـنج نوێـژ دیـسان مووسـا فـەرمووی: نەتەوەی تۆ توانای ئەوەیشی نییە، چونکە من لەم بارەیـەوە خـاون ئـەزموونم و بەتایبەتی لەگەڵ گەلی خۆمـا کەنەتـەوەی جوولەکەیـە، کـە ناسـراون بـە نـەوەی ئیـسرائیل، واتـە: ڕۆڵـەکانی یـەعقووب پێغەمبـەر بـەراودی زۆرم هەیـە، کەواتـە دیسانەوە بڕۆرەوە بۆ لای پەروەردگارت و داوای بار سووکی و کار ئاسانی لێبکە،

بۆ نەتەوەکەت منیش گوتم: بەڕاستی ئەوەندە دووبارەو سێبارە لەم بارەیەوە لە پەروەردگارم داوام کردووە ئیتر شەرم دەکەم کەرووی لێ نێم و لەڕووم نایەت، بەڵام رازیم بەمەو کاری خۆم دەسپێرم بەخوا فەرمووی: جاکاتێ لەوێ تێ پەڕبووم، بانگکەرێ بانگی کرد: وافەرزی خۆمم بڕیار دا، وەباری بەندەکانی خۆمم سووك کردو ئەرکی سەرشانم سووك کردن). (تاج/٤ ز/١٠٠ ل/٢٩٨ ف/١- باسی : شەوڕەوی پێغەمبەر (درووودی خودای لێ بێ) ).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیە بەهرەی زۆری واتیادا، لێکۆڵینەوەیەکی وردی دوورو درێژی دەوێ مامۆستای عەینیو مامۆستای عەسقەلانی لەم بارەیەوە درێغی یان نەکردووە، خودا پاداشی باشیان بداتەوە، بەرووونی ئەم بەهرەو سوودانە لەم فەرموودەیەداو لە فەرموودەکانی صەحیحەین و پەڕاوە گەورەکانی تری صەحیحی سوننەتدا ڕەنگ دەدەنەوە:

١- پێغەمبەران و پیاوچاکان لەژیانی بەرزەخدا زیندوون، وە پەیوەندی بەیەکتری یەوە دەکەن، هاموشۆی ئاسمانەکان و شوێنانی تردەکەن، هەروەك پەیوەندیان بەگۆڕەکانیانەوە دەمێنێ، وە هەروەها بەشداری لە بۆنەو ڕووداوە گرنگەکانی جیهاندا دەکەن، لەجیهانی دوو هەمیشا هەست بەخۆشی و ناخۆشی خۆیان و گەلەکانیان دەکەن، بەخۆشیو باشی نەتەوەکانیان شادمان دەبن، بەکزی و بێ نازی و کەساسی و لاوازی یان دڵگران دەبن، کەیفخۆش دەبن، تووڕە دەبن، پێدەکەنن، دەگرین، ئاگایان لە حاڵی ئوممەتیان هەیە.

لە ژیانی بەرزەخا، خواپەرستی و پەرستش و عیبادەتی جۆراو جۆر دەکەن، وەك نوێژو جەماعەت و حەج و تەوافی بەیت و زیکری خوداو نزای

باش و ئامۆژگاری خێرو سلاوو ڕۆژ باشی و چاکۆ چۆنی لە یەکتری و وەلام دانەوەی سلاو. وەزۆر لە ڕەفتارو خوو وعادەت و باوی کۆمەلایەتی جوانی دنیایی لەناو یان دەمێنێ و پەیڕەوی دەکەن، وەك ئەوە ئادەم و ئیبراهیم شانازی بەوەوە دەکەن کە کوڕی خانەدان و نەجیبزادەو پایە بەرزی وەك موحەممەدیان هەیە، وەك دەستووری بەیەکتری ناسین، وەك گریان و خەم خواردن بۆ جێماوی و کەساسی گەلی خۆت، وەك پێشوازی و چوون بەپیری مێوان و چاك و چۆنی، هەروا مردوو دەتوانێ پەیوەندی و قسەو گفتوگۆو چاك و چۆنی و تەفاهوم لەگەلْ زیندوو بکا، وەجیاوازیی زمان و ڕەگەزو نیشتمان و نەتەوە، نابێ بەرێگر لە تێگەیشتن لە یەکتری، وەمردوو لە ژیانی بەرزەخیدا جۆرە پەیوەندییەکی دەمێنێ بە گۆڕەکەیەوە.

لە فەرموودەیەکی ئیمامی موسلیما: پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (ئەو شەوە کە چووم بۆ ئیسرا، لەلای مووساوە ڕەت بووم، لەشام لە لای تەپۆلکە لە سوورەکەدا بوو، لەناو گۆڕەکەیدا ڕاوەستابوو، بەپێوە نوێژی دەکرد). (بڕوانە: تاج/٤ ل/٣٨٢ ف/٢).

لەهەمان کاتدا زۆر بە ئاسانی دەتوانن گۆڕەکەیان بەجێ بهێلْن و بۆکاری شیاو خۆیان بۆ ئەم لاو لا بڕۆن، وەك ئەوەحەزرەتی مووسا لە هەمان شەو لە مەسجیدو لئەقصا نوێژی بەجەماعەت لەگەلْ پێغەمبەردا کرد، وە لەهەمان شەویشالە ئاسمانی شەشم چوو بەپیریی پێغەمبەرەوە، وە ڕاوێژو ئامۆژگاری و گفتۆگۆیەکی بە سوودی لەگەلْ پێغەمبەردا، سەبارەت بە ژمارەی نوێژە فەرزەکان، ئەنجامدا، کە پێغەمبەرو نەتەوەی ئیسلام سوودیان لەو فەرمایشتا نەی حەزرەتی مووسا (سەلامی خوای لێ بێ) وەرگرت، وە زۆر شتی تری لەم بابەتە لە سوننەتی ساخی پێغەمبەردا هەیە، کە بەلگە و نیشانەی ئەوەن کە

پێغەمبەران و شەهیدان و ئەولیاکانی خودا لە هەردوو جیهانا جێگەی قەدرو ڕێزی خودان و شیاوی ئەوەن کە خودابیان کات بەمایەی خێرو خۆشیو ڕەحمەت بۆ خەڵکی سەرزەوی ﴿وَمَا ذلك على الله بعزيز﴾. (بڕوانە: بەرگی یەکەم، لاپەڕە: ١٧٨، فەرموودەی ژمارە: ١٥٩ تەجرید=٢١٦ فەتحولباری + تاج/٤ ل/٣٧٨ ف/٤ + ل/٣٨١ ف/٢ + ل/٣٨٣ ف/١ + ٢+ ل/٣٨٧ ف/١).

٢- مالیکی کوڕی صەعصەعە ئەنصارییە، لەمەدینە نیشتەجێ بوو، داستانی ئیسراو میعراجی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، کە ئەم فەرموودەیە لە بورخاری دا، ئیمامی موسلیمیش گێڕاویەتەوە، عەسقەلانی لە فەتح دا دەفەرموێ: (لە بوخاری و لە غەیری بوخاریدا هەر ئەم فەرموودەیەی هەیە و بەس، جگە لە ئەنەسی کوڕی مالیکیش، نەزانراوە کە کەسێتر ریوایەتی لێوەبکات) بەغەویش لەسەر فەرمایشی ئیصابە دەفەرموێ لەمەدینە نیشتە جێ بوو، تەنیا دوو فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە هەیە). خەتیبیش لە موبهەماتا دەفەرموێ: (ئەم مالیکی کوڕی صەعصەعەیە، ئەو پیاوەیە کە پێغەمبەر کردبووی بەسەرکاری سەرخەیبەرو دوایی پێی فەرموو: (اكل تمر خيبر هكذا؟).

٣- **کورتو پوخت:** (زۆرشت لە جیهانی دووهەمەدا بە پێوەری ئەم جیهانی یەکەمە ناپیورێ، بگرە زۆر شت لەو جیهان ڕێك بە پێچەوانەی پێوەرەکانی ئەم دنیایە !). (بڕوانە: ژمارە: ٩٨٨ تەجرید=٢٢٠١ فەتح = بەرگی/٣ ل/٥٤).

٤- زۆر لەم وشانەو وێنەی ئەم وشانە کەلەم فەرموودەیە و لەوێنەی ئەم فەرموودەیەدا هەیە، کەقسە لە باسوخواسی جیهانی بالا و جیهانی بەرزەخ و ئەو جیهانی ترو جیهانی غەیب دەکا، وەك وشەی تەشت و دەرگاکردنەوەو شۆردنی دڵ و..تاد، زۆر لەم وشانە و لە وێنەیان لەبازنەی ئەم فەرمایشتەی

مامۆستای عەسقەلانی دا دەبێ لێیان تێ بگەین و واتایان بکەین، کە دەفەرموێ لەم جیگەیەدا: (وجميعُ ماوردَ من شقِّ الصدر واستخراج القلبِ وغيرِ ذلك منْ الامور الخارقةِ للعادةِ، ممّا يجبُ التسليمُ لهُ دونَ التعرّض لصرفه عنْ حقيقته، لصلاحيَة القدرة، فلايستحيلُ شيء منْ ذلك). واته: هەموو ئەو وشەو بێژەو دەربڕینانەی کەلەم فەرموودەیەدا هاتوون، وەك:لەتکردنی سینگ و دەرهێنانی دڵ وشتی تری لەم بابەتە، لەوشتانەن کەسنووری باری ئاسایی دەبەزێنن و، لەبارودۆخی ئاسایی‌دا شتی وا ستەمەو کاری نەکردنی‌یە، ئەمانە هەموو پێویستە بەبێ چەندوچوون قەبووڵیان بکەین وباوەڕیان پێ بکەین، نابێ لە واتای ڕاستەقینەی خۆیان، لایان بدەین، بە تەئویل و شتی وا، چونکە ئەم جۆرە شتانە لەسەر ڕووی ڕاستی‌و لەسەر وەجهی حەقیقەت لە توانای خوادا هەن، وە هیچ شتێ لەمانە بۆ توانایی خودا نەستەمن و نەموستەحیل) .

بەندە لەم لایەنەوە گوتوومە:

بەبێ شیاوی تەواو
لە دەریای بێ پەی قەت مەنێ هەنگاو
جیهانی غەیب و جیهانی بەزەخ
جیهانی بالاو بەهەشت و دۆزەخ
دەریای بێ پەین، فیکرو هۆش تیایا
کۆڵ و داماون، ناچن بەلایا!!
ڕازی خودایی لە ژمارە نایە
زیاتر لەکەفی ناوی دەریایە
چەندی و چۆنی یان، یاساکەی جیایە
بەپێچەوانەی کاری دنیایە

رازو نهێنـــیو تەلیـــسمی نـــاو ژیـــن
هـــەروا هـــەواڵی هـــەردوو دنـــیا و دیـــن
مـــەر لەژێرخـــاكا پەیـــی پـــێ بـــەریـــن
نێمـــە تـــا نـــەمرین زۆر بـــێ خەبەریـــن!
لەپـــەڕەی دڵـــت لـــەجێگەی دەفتـــەر
بنـووســـــە بـڵـــێ ( الله اكـبـــــر! )
فارمایـــشتی خـــوا، قـــسەی پێغەمبـــەر
بـــەبێ چـــەن وچـــوون، وەك تـــاجی گەوهـــەر
دەنێمـــە بـــان چـــاو، دەنێمـــە ســـەرسەر
قـــسەێی دەكـــەم بـیكـــە بـــە پێـــوەر
لەبـــەری بكـــە وەك شـــیعری زێـــوەر
بەقـــەد نیـــسكێكە دیـــسكی كۆمپیـــتەر
بەقـــەد ســـەد مـــەلا عیلمـــی وا لەبـــەر!

١٠٤- عن ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (رَأَيْتُ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِي مُوسَى رَجُلاً آدَمَ طُوَالاً جَعْدًا كَأَنَّهُ مِنْ رِجَالِ شَنُوءَةَ وَرَأَيْتُ عِيسَى رَجُلاً مَرْبُوعًا مَرْبُوعَ الْخَلْقِ إِلَى الْحُمْرَةِ وَالْبَيَاضِ سَبِطَ الرَّأْسِ وَرَأَيْتُ مَالِكًا خَازِنَ النَّارِ وَالدَّجَّالَ فِي آيَاتٍ أَرَاهُنَّ اللَّهُ إِيَّاهُ فَلا تَكُنْ فِي مِرْيَةٍ مِنْ لِقَائِهِ).[١٠٤]

ئیبنـو عـەبباس(ڕەزای خوایـان لـێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو شەوەی كەبردمیان بۆ شـەو ڕەوی كەناسـراوە بەشەوی ئیسراو، پێغەمبـەر مووسـام بینـی، پیاوێـكی گەنم ڕەنگی درێژی قژ

[١٠٤] مختصر صحیح البخاری/٣، ژمارە: ١٣٠٨. بخاری: ٣٢٣٩، ٣٣٩٦. مسلم: ١٦٥ = شیحا: ٤١٨.

لوولـه، لەگـەنم رەنگـیو درێـژی دا دەق لـەپیاوانی هـۆزی شـەنووئە دەکـات، وەپێغەمبـەر عیـساشم بینـی پیاوێـکی مامناوەندییـە نـە زۆر کـورت وە نـەزۆر درێژە، نە زۆر کراوەو پانو پۆڕ، رەنگـی سوورو سپی دەینواند قژی خـاو بـوو، مالیکی سەرۆکی وەردیانەکانی دۆزەخم بینی، هەروەها جەجاڵم بینی، هـەروەها چـەندین نیـشانەی گـەورە گـەورەم بینـی، کـە خـودا ئەوانـەی بـەمن پیـشان دا. پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) پاش ئەم فەرمایـشتانەی فەرمووشـی: ئـەی موسوڵمان! لەهاتنو بینینی جەجاڵ گومانت نەبێ) (تاج/٤، لاپـەڕە: ٣٨٤ زنجـیرە: ١١٧، ف —٢ باسـی گـەورەیی عیـسا + تـاج/٤، لاپـەڕە: ٣٧٨، زنجـیرە: ١١٥ - گـەورەیی هەنـدێ لـە پێغەمبـەران. ف-٤ + تـاج/٤، لاپـەڕە: ٣٠٦، زنجـیرە: ١٠٠، ف — ٣ باسـی ئیسراء).

١٠٥- عَنِ مجاهد قال: كُنَّا عِنْدَ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما، فَذَكَرُوا الدَّجَّالَ أنه قال: (مكتوب بَيْنَ عينيه كافِرٌ) فقال ابن عباس: لم أَسْمَعْهُ ولكنه قَـالَ الـنبيُّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَمَّا مُوسى: كَأَني أَنْظُرُ إِلَيْهِ، إِذِ انْحَدرَ في الوَادِي يُلَبِّي).[١٠٥]

موجاهیـد (رەحمـەتی خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: لەخزمـەتی ئیبنـو عەبباسدا بووین، باسی جەجاڵیان کرد، کـە پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) فەرموویـەتی: (لەناوچـاوانی جـەجاڵ نووسـراوە: کـافر) ئیبنـو عـەبباس فـەرمووی: (ئـەوەم لـە پێغەمبـەر نەبیـستووە، بـەڵام لێـیم بیـست دەیفـەرموو: (دەڵێی ئێستایش لەبەرچاومە کە مووسا سـەلامی خودای لێ بێ، کـە لەشـەوی ئیـسرادا دیـم، لـە ددانـەی یاڵەکـەوە دادەبـەڕی، دوو پەنجـەی دانـابوو لـەناو دوو

---

[١٠٥] تەجرید/٢، ژمارە: ٧٤٧. بخاری/١٥٥٥. مسلم/١٦٦ = شیحا: ٤٢٠ = مختـصر صحیح مـسلم/١، ژمارە: ٧٧.

کونه گوێچکەی خۆیدا، لەناو ئەم شیوەوە رادەبوردو، هاواری دەکرد لەخوداو دەنگی لەببەیکەکردنی بەبەرزی دەهات.......).

ئەمەیش گێڕانەوەی ژمارە (٧٧)ی پوختەی موسلیمە بۆ ئەم فەرموودەیە:

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) قَالَ: سِرْنَا مَعَ رَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْنَ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةِ، فَمَرَرْنَا بِوَادٍ فَقَالَ: أَيُّ وَادٍ هَذَا؟ فَقَالُوا: وَادِي الأَزْرَقِ، فَقَالَ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى مُوسَى (عَلَيْهِ السَّلَامُ)، (فَذَكَرَ مِنْ لَوْنِهِ وَشَعْرِهِ شَيْئًا لَمْ يَحْفَظْهُ دَاوُدُ) وَاضِعًا إِصْبَعَيْهِ فِي أُذُنَيْهِ لَهُ جُؤَارٌ إِلَى اللّهِ تَعَالَى بِالتَّلْبِيَةِ مَارًّا بِهَذَا الْوَادِي، قَالَ: ثُمَّ سِرْنَا حَتَّى أَتَيْنَا عَلَى ثَنِيَّةٍ، فَقَالَ: أَيُّ ثَنِيَّةٍ هَذِهِ؟ قَالُوا: هَرْشَى، أَوْ لِفْتٌ. فَقَالَ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى يُونُسَ عَلَى نَاقَةٍ حَمْرَاءَ عَلَيْهِ جُبَّةُ صُوفٍ، خِطَامُ نَاقَتِهِ لِيفٌ خُلْبَةٌ، مَارًّا بِهَذَا الْوَادِي مُلَبِّيًا». (م/١/٩٩ - ١٠١). {الحديث/٤٢٠. إيمان. بخاري. حج: ١٥٥٥، ٣٣٥٥، ٥٩١٣. مسلم. إيمان: ٤٢١}.

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیو بابی) دەفەرموێ: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە مەدینەوە دەڕۆیی بۆ مەککە، من خۆم لە خزمەتیاندا بووم، گەیشتینە شیوێ، فەرمووی: (ئەم شیوە کوێیە؟) گوتیان: ئەمە وادیلئەزرەقە، واتە: شیوە شینە. فەرمووی: دەڵێی ئێستاش وا لەبەرچاوم کە مووسام (دروودی خودای لەسەر بێ) کە لەشەوی ئیسرادا دیم، لە دانەکەوە دادەپەڕیو دوو پەنجەی خۆی دانابوو لە هەردوو کونە گوێیداو بە هەموو دەنگی هاواری دەکرد لە خوداو دەنگی لەببەیکە کردنی بە بەرزی دەهاتو لەم شیوەوە تێپەڕ بوو. گوتی: ئیتر لە خزمەت خۆشەویستا (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆیشتین، هەتا گەیشتینە ملەیێ، فەرمووی: (ئەم ملەیە کوێیە؟) عەرزیان کرد: ئێرە دانەی هەر شایە، ملەی هەر شایە، هەر شاکێوێکە دەکەوێتە

سەر ڕێگەی شام کە بچیت بۆ مەدینە، لە جەحفەوە نزیکە. یا عەرزیان کرد: ئەمە ملەی لیفتە. فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (دەڵێی ئێستاش وا لەبەرچاوم کە یوونسی کوڕی مەتتا (دروودی خودای لەسەر بێ)، کە لەشەوی ئیسرادا بینیم، بە سواری وشترە مێیەکی سووری قەڵەوی پڕ گۆشت بوو، جبەیەکی خووری لەبەردا بوو، هەوساری وشترەکەی گورزمیێ گوش بوو، سەرگەرمی لەببەیکە کردن بوو، لەم شیوەوە بە لەببەیکە کردن تێپەڕ بوو!). {تاج/٤، لاپەڕە: ٣٨٧، ژمارە: ١، زنجیرە: ١١٨ = تاج-٣ ژ-٣٢١٤ چ-٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

١- بۆ تێگەیشتنی تەواو لە ژیانی پێغەمبەران لە قەبردا، واتە: لەبەرزەخا.

٢- بڕوانە: (تەجریدی بوخاری/١، لاپەڕە: ١٧٢، ژمارە: ١٥٩ + تەجریدی بوخاری/٢، لاپەڕە: ١٤٣ هەتا ١٥١، ژمارە: ٧٢١).

٣- ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ: (پێغەمبەران لە ژیانی بەرزەخدا وەك شەهیدان زیندوون، لەبەرئەوە لەماوەی مانەوەی جیهانا، هەتا جیهان تەواو دەبێ، دەتوانن حەج و نوێژو پەرستش و خوا پەرستی بکەن، وە فەرموودەی ساخ لەم بارەیەوە هەیە).

١٠٦ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « حِينَ أُسْرِيَ بِي لَقِيتُ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ، فَنَعَتَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، « فَإِذَا رَجُلٌ حَسِبْتُهُ قَالَ: مُضْطَرِبٌ، رَجِلُ الرَّأْسِ، كَأَنَّهُ مِنْ رِجَالِ شَنُوءَةَ، قَالَ: وَلَقِيتُ عِيسَى، فَنَعَتَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، « فَإِذَا هُوَ رَبْعَةٌ أَحْمَرُ كَأَنَّمَا خَرَجَ مِنْ دِيمَاسٍ »، يَعْنِي حَمَّامًا، قَالَ: وَرَأَيْتُ إِبْرَاهِيمَ عليهِ السَّلاَمُ، وَأَنَا أَشْبَهُ وَلَدِهِ بِهِ، قَالَ: فَأُتِيتُ بِإِنَاءَيْنِ فِي أَحَدِهِمَا لَبَنٌ وَفِي الآخَرِ خَمْرٌ، فَقِيلَ لِي: خُذْ أَيَّهُمَا شِئْتَ، فَأَخَذْتُ اللَّبَنَ

فَشَرِبْتُهُ، فَقَالَ: هُدِيتَ الْفِطْرَةَ، أَوْ أَصَبْتَ الْفِطْرَةَ، أَمَا إِنَّكَ لَوْ أَخَذْتَ الْخَمْرَ غَوَتْ أُمَّتُكَ». (١٠٦)

ئەمە دەقی عەرەبی پوختەی موسلیم، ژمارە (٧٨) بوو ئەمەیش کوردییەکەیەتی:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لە حیجری ئیسماعیل بووم لەپەنا کابەدا، قورەیش هەندێ پرسیاریان لێ کردم، لەبارەی شەورەوی کردنی منەوە، لە مەککەوە بۆ شاری قودسو لەوێشەوە بۆ گەشتی ئاسمانەکان، جا بازێ شتیان لێ پرسیم، رەوانم نەبوون، ئیتر زۆر زۆر خەمو خەفەتو پەژارەیەکی وا دایگرتم، کە هەرگیزاو هەرگیز خەمو پەژارەی وا داینەگرتووم، چونکە ئەوان شارەزایی تەواویان هەبوو، لە قودسو لە بەیتولەقدیس، بەهۆی سەفەرو هاموشۆوە، جا خودای گەورە بەیتولەقدیسی بۆم دەرخست، بەچاوی خۆم بەبێ پەردە تەماشاییم دەکردو هەر ناونیشانو هەر شتێکیان لەبارەیەوە لێ دەپرسیم، زۆر بەجوانی وەك خۆی وەڵامم دەدانەوە، وەك باسی دەرگاکانیو نیشانەکانی، هەتا بەناچاری تەسلیم بوونو گوتیان: ناونیشانەکانی راستە. لەوێ لە بەیتولەقدیس تەماشام کرد واوام لەناو کۆمەڵێ لە پێغەمبەرەکاندا، کە سەرنجمدا، وا مووسا لەوێیە، بە راوەستانەوە نوێژ دەکا، مووسا پیاوێکی داڵ گۆشتی موو تەنکی موو کرژە، دەڵێی لە پیاوانی هۆزی شەنووئەیە، کە ناسراون بە داڵ گۆشتیو قەدو باڵا ناوەنجیەوە).

---

(١٠٦) پوختەی موسلیم/١، ژمارە: ٧٨ = مسلم. شیحا: ٤٢٣. تەجرید/٤، ژمارە: ١٣٦٩. بوخاری/ ٣٤٢٨ + بخاری/٣٣٩٤.

فەرمووی: (گەیشتم بە عیسای کوڕی مەریەمیش، ئەویش لەوێ بوو (دروودی خودای لەسەر بێ)، راوەستابوو نوێژی دەکرد، پیاوێکی دەستەی ناوەندی بوو، نە زۆر کورتو نەزۆر درێژ بوو، رەنگی سوورو سپی بوو، وەك لە گەرماو دەرچووبێ وابوو، لەهەموو کەسێ شێوەی زیاتر لە عوروەی کوڕی مەسعوودی ئەل-ئەقەفی دەچوو، کە شێوەی عوروە زۆر رێكو پێكو جوان بوو، وە لەناو گوێگرانا ناسراو بوو، لەسەردەمی پێغەمبەردا بە شەهیدی کوژرا).

هەروا فەرمووی: (حەزرەتی ئیبراهیمیشم دی، ئەویش لەوێ بوو (دروودی خودای لەسەر بێ)، راوەستابوو نوێژی دەکرد، زیاتر لە هەموو کەسێکی تر شێوەی لەمن دەچێ، لەناو نەوەو وەچەکەیدا، کەسیان وەك من لەو ناچێ).

کاتێ کەنوێژ بوو من بەرنوێژیم بۆکردن، جا کە لەنوێژەکە بوومەوە یەکێ گوتی: ئەی موحەممەد! ئەمە مالیکە، کە کلیل بەدەستی دۆزەخە سلاّوی لێ بکە، کە ئاوڕم دایەوە، ئەو دەستپێشکەری کردو لەپێش مندا سلاّوی لێ کردم.

جوبرائیل (دروودی خودای لەسەر بێ) قاپێ شیرو قاپێ بادەی بۆم هێنا، گوترا پێم: کامیان وەردەگریت کەیفی خۆتە، منیش قاپە شیرەکەم وەرگرتو خواردمەوە. جوبرائیل فەرمووی: ئەم شیرە پاكو خاوێنو حەلاّڵو خۆش نۆشە ئەو سرووشتە خوا کردە پاكو پیرۆزمیە، کە خودا خۆتو گەلەکەتی رێنمایی کردووە لەسەری، ئەوە بزانە خوا نەخواست ئەگەر مەیەکەت وەربگرتایە گەلی ئیسلامی تۆ سەر لێ شێواوو گومڕا دەبوون). (تاج/٤، لاپەڕە: ٣٠٦، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ٣ + زنجیرە: ١١٥، لاپەڕە: ٣٧٨، ژمارە: ٤ = تاج-٣ ژ-٣١٥٥-٣١٥٧ ج-٤ + ز-١١٥ ژ-٣٢٠٥).

## (٧٥) بابٌ: فِي ذِكْرِ المَسِيحِ ابْنِ مَرْيَمَ وَالمَسِيحِ الدَّجَّالِ
## باسی مەسیحی ناسراو بە عیسای کوڕی مەریەمو باسی جەجاڵ، کە ناسراوە بە مەسیحی دەججال

١٠٧- ٣٤٣٩ - حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ حَدَّثَنَا أَبُو ضَمْرَةَ حَدَّثَنَا مُوسَى عَنْ نَافِعٍ قَالَ عَبْدُ اللَّهِ ذَكَرَ النَّبِيُّ - صلى الله عليه وسلم - يَوْمًا بَيْنَ ظَهْرَيِ النَّاسِ الْمَسِيحَ الدَّجَّالَ ، فَقَالَ « إِنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِأَعْوَرَ ، أَلاَ إِنَّ الْمَسِيحَ الدَّجَّالَ أَعْوَرُ الْعَيْنِ الْيُمْنَى ، كَأَنَّ عَيْنَهُ عِنَبَةٌ طَافِيَةٌ».(١٠٧)

لە ژمارە (١٠٨)دا واتاو شەرحەکەی بەتەواوی دێت.

١٠٨- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عنهما) قَالَ: ذَكَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمًا بَيْنَ ظَهْرَانَي النَّاسِ، الْمَسِيحَ الدَّجَّالَ، فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى لَيْسَ بِأَعْوَرَ، أَلاَ إِنَّ الْمَسِيحَ الدَّجَّالَ، أَعْوَرُ عَيْنِ الْيُمْنَى، كَأَنَّ عَيْنَهُ عِنَبَةٌ طَافِيَةٌ، قَالَ: وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « أَرَانِي اللَّيْلَةَ فِي الْمَنَامِ عِنْدَ الْكَعْبَةِ فَإِذَا رَجُلٌ آدَمُ، كَأَحْسَنِ مَا تَرَى مِنْ أُدْمِ الرِّجَالِ، تَضْرِبُ لِمَّتُهُ بَيْنَ مَنْكِبَيْهِ، رَجِلُ الشَّعَرِ، يَقْطُرُ رَأْسُهُ مَاءً، وَاضِعًا يَدَيْهِ عَلَى مَنْكِبَيْ رَجُلَيْنِ، وَهُوَ بَيْنَهُمَا يَطُوفُ بِالْبَيْتِ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالُوا: الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ، وَرَأَيْتُ وَرَاءَهُ رَجُلاً جَعْدًا قَطَطًا أَعْوَرَ العَيْنِ الْيُمْنَى، كَأَشْبَهِ مَنْ رَأَيْتُ مِنَ النَّاسِ بِابْنِ قَطَنٍ، وَاضِعًا يَدَيْهِ عَلَى مَنْكِبَيْ رَجُلَيْنِ، يَطُوفُ بِالْبَيْتِ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: هَذَا الْمَسِيحُ الدَّجَّالُ».(١٠٨)

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو مەردومەکەدا، بە ئاشکرایی

---

(١٠٧) بڕوانە ژمارە (١٠٨) لەدوا ئەم ژمارەیەوە.

(١٠٨) مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٧٩ = مسلم/شيحا: ٤٢٥. تەجریدی بوخاری/٤، ژمارە: ١٣٧٠ = بخاری/٣٤٤٠، ٣٤٤١.

دانیشتبوو، باسی جەجاڵی بۆیان کرد، فەرمووی: (جەجاڵ کەداوای خوایەتی دەکا، یەکڵە چاوە، چاوی راستی کوێرە، دیارە کە شتی وا عەیبو نەنگەو عەیبو نەنگیش نیشانەی کەمیو ناتەواوییە، شتی وایش لەگەڵ داوای خوایەتیدا ناگونجێ، بێگومان کە خودای گەورە پاكو بێ گەردەو دوورە لەرەوشو سیفەتی ناشیرنی وەکوو کوێریو کەموکووڕی! ئەو چاوەی جەجاڵ کە کوێرە وەك دەنکە ترێی زەقی قۆقزی لەبۆڵ دەرپەڕیو وایە.).

فەرمووی: (ئەمشەویش لەخەوما لەلای کەعبەدا بووم، کە تەماشام کرد: وا پیاوێکی سەوزەی گەنم رەنگ، لەلاما بوو، تابلێی سەوزەیەکی زۆر زۆر جوان بوو، لە پیاواندا گەنم رەنگی واجوان نەبینراوە، پرچێکی زۆر جوانی هەبوو، دەیدا لەناو شانی، بەجوانی پرچەکەی داهێنابوو، سەری ئاوی لێ دەتکا، وەك لەگەرماو دەرچووبێ، ئاواپاكو خاوێن بوو، هەردوو دەستی لەسەر شانی دوو پیاو دانابوو، تەوافی بەیتی دەکرد، پرسیم: ئەمە کێیە؟ گوتیان: ئەمە عیسای مەسیحی کوڕی مەریەمە.

لەپاشا پیاوێکم دی، سەری لوول بوو، قژی کرژبوو، چاوی راستی کوێربوو، لەهەموو کەسێ زیاتر شێوەی لە ئیبنو قەطەن دەچێ، کە پیاوێکی ناسراو بوو لە هۆزی خوزاعە، جەجاڵ هەردوو دەستی لەسەر هەردوو شانی پیاوێ دانابوو، تەوافی بەیتی دەکرد، گوتم: ئەمە کێیە؟ گوتیان: جەجاڵی هەلاتبازە). {تەجرید/٤، لاپەڕە: ٥٧، ژمارە: ١٣٧٠}.

دیسان ئەو، لەگێڕانەوەیەکی تردا فەرمووی: نەبە خوا، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بەعیسای نەفەرموو سوورو سپییە، بەڵام فەرمووی: (جارێ نووستبووم لەخەو ماتەماشام کرد وا تەوافی کابەتۆڵلا دەکەم، تەماشام کرد وا پیاوێکی سەوزەی گەنم ڕەنگ، والەوێ، لەنێوانی دوو پیاودا، بەلارە

سەنگی دەڕۆیی، قژێکی خاوی هەبوو، سەری ئاوی لێ دەتکا، یافەرمووی: سەری ئاوی لێ ئەچۆڕایەوە. گوتم: ئەمەکێیە؟ گوتیان: ئەمە عیسای کوڕی مەریەمە لەپاشا کە ئاوڕم دایەوە وا پیاوێکی سوورفلی فیلەتەنی زەبەللاحی کەتەی قژلوولی قژ کرژی، یەکلە چاوی، چاوی ڕاست کوێر والەوێ. گوتم: ئەی ئەمە کێیە؟ وتیان: ئەمە جەجاڵە، لەهەموو کەسێ زیاتر شێوەی لە ئیبنو قەطەن دەچێ!) (تاج/١٠ ل/٣١٦ ز/١١٢ ف/٣ = تاج/٥، زنجیرە: ١١٢ — ج/٤ = باسی نیشانەکانی جەجاڵ..).

**ڕوونکردنەوە:**

باسی جەجاڵ بەدوورو درێژی لە تاجولئصولا وا لە بەرگی پێنجەمدا، لەعەرەبی‌یەکەی دا، لەوەرگەڕاوە کوردییەکەشیدا، وا لەبەرگی دەیەم دا، لاپەڕە ٣٠٥هەتا لاپەڕە/٣٣٣ = تاج/٥ ص/٢٣٥-٣٥٧ پێشەوا زوهری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئیبنو قەطەن پیاوێ بوو، لەسەردەمی جاهیلییەتدا مردووە.

١٠٩- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللّهِ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) انَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (لَمَّا كَذبَتْنِي قُرَيْشٌ قُمْتُ فِي الْحِجْرِ فَجَلا اللّهُ لِي بَيْتَ الْمَقْدِسِ فَطَفِقْتُ اخْبِرُهُمْ عَنْ ايَاتِهِ وَانَا انْظُرُ الَيْهِ).(١٠٩)

جابیری کوڕی عەبدوللا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ژنەوتم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەیفەرموو: (کاتێ کە قوڕەیش بۆ مەسەلەی ئیسراء (واتە: شەوڕەوی) باوەڕیان پێ نەکردم، لە حیجری ئیسماعیلا ڕاوەستام، کە شوێنێکە دەکەوێتە ئاستی پلووسکی ڕەحمەت، لەڕووی شامەوە لە حەوشەی کەعبەدا، ئیتر خودا بەیتولەقدیس (خانەی پیرۆزی)ی بەتەواوی و بەبێ

---

(١٠٩) تەجرید/٤، ژمارە: ١٥١٢. بخاری/٣٨٨٩. مسلم: ١٧٠ = شیحا: ٤٢٧.

پەردەهێنایە بەرچاوم، ئیتر نیشانە بە نیشانەی و شوێن بە شوێنی، وەك بەموجەسسەمی لەبەر چاوم بێ، ئاوا بەچاوی خۆم تەماشام دەكرد و باس و وەصفیم دەكرد بۆیان) (تاج/٤ ز/١٠٠ ل/٣٠٥ ف/٢- باسی: ئیسرا) .

## ڕوونكردنەوە:

كاتێ پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ)تەشریفی چوو بۆ ئیسراو هاتەوەو باسی ئەوەی بۆ خەڵكی مەككە كرد، خەڵكەكە بوون بەسێ بەشەوە: بەشی یەكەم باوەڕیان پێ كردو گوتیان: محمد پێغەمبەری خودایە، پێغەمبەرو درۆیان نەگوتوە، یەكێ لەم زاتانە ئەبو بەكری صەدیق بوو، بەشی دووەم: یەكسەر ئەمەیان بەدرۆیەكی پەتی زانی و گوتیان: شتی وا جێگەی باوەڕنییە، بەشی سێیەم: گوتیان ئێمە شارەزای بەیتولەقدیسین، موحەمەد لەم بابەتەدا نەشارەزایی هەیە، نەچووە بۆ قودس، كەواتە: ئێمە داوای ناونیشان و شتی وای لێدەكەین، ئەگەر زانی ئەوە دیارە ڕاست دەكاو شتی وایش واتای وایە كەموحەممەد پێغەمبەرە .

جا چەند پرسیارێكیان لە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) كرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەسەرتاوە نەیزانین، زۆر بۆ ئەمە پەرۆش و خەمبار بوو، بەڵام دوایی خودا پەردەی لەنێوانی پێغەمبەرو بەیتول مەقدیس دا هەلگرت، باسی هەرچییان لێ دەپرسی ڕێك وەك خۆی پێی دەگوتن، وەك بەچاوی سەر تەماشای بەیتولەقدیس و كون‌و قوژبنی بكا. جا ئەم فەرموودە پیرۆزەیە ئەم هەڵویستە ڕوون دەكاتەوە!

## (٧٦) بابٌ: في ذِكْرِ سِدْرَةِ المُنتَهى
## باسی سیدرەتوولمونتەها

١١٠- عَنْ الشَّيْبَانِيُّ قَالَ: سَأَلْتُ زِرَّ بْنَ حُبَيْشٍ عَنْ قَوْلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ: ( فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى)فَقَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ مَسْعُودٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَأَى جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ لَهُ سِتُّمِائَةِ جَنَاحٍ.(١١٠)

شەيبانی دەفەرموێ پرسیارم لە زیڕ کرد، لە فەرموودەی خودای گەورە {فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى، فَأَوْحَى إِلَى عَبْدِهِ مَا أَوْحَى، مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَى – ٥٣/٩ – ١١} واتە: وەها لە پێغەمبەر نزیك بوویەوە، كە نێوانیان بەقەد دوو كەوان دەبوو یا كەمتریش، جا لەو شوێنەدا وەحیو سرووشی كرد بۆلای بەندەی خۆشەویستی خودا، كە موحەممەدە، ئەو سرووشو وەحیە، حەقائیقو تەفاصیلو رازو نهێنییەكەی، هەر خوداو پێغەمبەر خۆیان زۆر بەجوانی دەزانن كە چییەو چی نییە، ئەوەی كە موحەممەد بەچاوی سەر بینی بەچاوی دڵیش بینیو هەستو هۆش لەبۆنی رەحمەتو لە رەفعی زەحمەت مەست بوونو چاوو دڵ بۆیەكتری بوون بە شایەتی داوای یەكتری!).

شەیبان فەرمووی: كە بۆ مەبەست لەم ئایەتە لە زیڕەم پرسی، لەوەلاما فەرمووی: لەم بارەیەوە عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود هەواڵی بمنێمە داوە: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم جێگەیەدا جوبرائیلی دیوە، (دروودی خودا لەسەر هەردووكیان بێ)، شەش سەد باڵی بووە! (تاج/٧، لاپەڕە: ١٦٣، زنجیرە: ٣٦ تاج-٤ ش/ت).

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عنهما) قَالَ: (مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَى). (وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى)، قَالَ: رَآهُ بِفُؤَادِهِ مَرَّتَيْنِ). (م/١ - ١٠٩). {الحديث/ ٤٣٦. إيمان}.

---

(١١٠) مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٨٢ - شیحا: ٤٣١. بخاری: ٤٨٥٦.

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لە خۆی‌و باوکی) فەرمووی: (لەم دوو ئایەتەدا ئەوەی واتیادا: کە پێغەمبەر بەچاوی دڵ نەوەك بەچاوی سەر دووجار خودای خۆی دیوە).

روونکردنەوە:

ئـەم بابەتــە زۆر گــرنگ‌و پێــچیدەیە، وە ڕای جیــا جیــای واتیــادا. لــە فەتحولباریدا دەفەرموێ: (ئەو زانایانەی کە دەفەـرموون پێغەمبـەر بەچاوی دڵ پەروەردگاری خۆی دیوە، مەبەستیان ئەوەیە: هەروەك چۆن شت بەچاوی سـەر دەبینرێ، بەچاوی دڵیش شت بەهەمان شێوە، بەبێ زیادو کەم دەبینرێ، چـونکە خـودا دەتوانــێ هێـزی بیـنین لـە هـەموو ئەندامێــکا دروسـت بکـات، ئـیتر ئـەو ئەندامە چاوبێ، دڵ بێ، دەست بێ دەبێ).

(٧٧) باب: معنى قَوْلِ اللّه عزَّ وَجلَّ: {وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى} وَهَلْ رَأى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) رَبَّهُ لَيْلَةَ الإِسْرَاءِ

واتای فەرمایشتی یەزدانی پاك‌و پیرۆز: {وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى} وە ئایا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) شەوی ئیسراو شەوڕەوی، خودای خۆی بینیوە یانا؟؟

١١١- عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: كُنْتُ مُتَّكِئًا عِنْدَ عَائِشَةَ فَقَالَتْ: يَا أَبَا عَائِشَةَ: ثَلاَثٌ مَنْ تَكَلَّمَ بِوَاحِدَةٍ مِنْهُنَّ، فَقَدْ أَعْظَمَ عَلَى اللَّهِ الْفِرْيَةَ، قُلْتُ مَا هُنَّ؟ قَالَتْ: مَـنْ زَعَـمَ أَنَّ مُحَمَّدًا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَأَى رَبَّهُ فَقَدْ أَعْظَمَ عَلَى اللَّهِ الْفِرْيَةَ، قَالَ: وَقَـدْ كُنْـتُ مُتَّكِئًا فَجَلَسْتُ، فَقُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ أَنْظِرِينِـى وَلاَ تَعْجَلِينِـى، أَلَـمْ يَقُـلِ اللَّـهُ تَعَـالَى: (وَلَقَدْ رَآهُ بِالأُفُقِ الْمُبِينِ) (وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى)؟ فَقَالَتْ عَائِشَةُ: أَنَـا أَوَّلُ هَـذِهِ الأُمَّـةِ سَأَلَ عَنْ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ)، فَقَـالَ: إِنَّمَـا هُـوَ جِبْرِيـلُ عليـه

السَّلاَم، لَمْ أَرَهُ عَلَى صُورَتِهِ الَّتِي خُلِقَ عَلَيْهَا غَيْرَ هَاتَيْنِ الْمَرَّتَيْنِ، رَأَيْتُهُ مُنْهَبِطًا مِنَ السَّمَاءِ سَادًّا عِظَمُ خَلْقِهِ مَا بَيْنَ السَّمَاءِ إِلَى الأَرْضِ، فَقَالَتْ: أَوَلَمْ تَسْمَعْ أَنَّ اللَّهَ تَعَالَى يَقُولُ: (لاَ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ) أَوَلَمْ تَسْمَعْ أَنَّ اللَّهَ يَقُولُ: (وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَنْ يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلاَّ وَحْيًا أَوْ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولاً) إِلَى قَوْلِهِ: (عَلِيٌّ حَكِيمٌ)؟ قَالَتْ: وَمَنْ زَعَمَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَتَمَ شَيْئًا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ فَقَدْ أَعْظَمَ الْفِرْيَةَ، وَاللَّهُ يَقُولُ: (يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ وَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ). قَالَتْ: وَمَنْ زَعَمَ أَنَّهُ يُخْبِرُ بِمَا يَكُونُ فِي غَدٍ فَقَدْ أَعْظَمَ الْفِرْيَةَ، وَاللَّهُ يَقُولُ: (قُلْ لاَ يَعْلَمُ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ الْغَيْبَ إِلاَّ اللَّهُ). وَزَادَ دَاوُدُ قَالَتْ: وَلَوْ كَانَ مُحَمَّدٌ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَاتِمًا شَيْئًا مِمَّا أُنْزِلَ عَلَيْهِ لَكَتَمَ هَذِهِ الآيَةَ (وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَخْشَاهُ). [(١١١)]

**ئەمە دەقی عەرەبی ژمارە (٨٤)ی پوختەی موسلیمە:**

**مەسرووق (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەلای عائیشە دانیشتبووم کە هاوسەری پێغەمبەرە، شانم دادابوو، فەرمووی پێم: ئەی ئەبو عائیشە! هەرکەسێ یەکێ لەم سێ قسەیە بکا، ئەوە بەڕاستی هەلاتێکی گەلێ گەورەو زل هەڵ دەبەستێ بەدەم خوداوە، گوتم: ئەوانە چیو چین؟ فەرمووی:**

**یەکەم: ئەوەی بڵێ: موحەممەد (سەرو ماڵو منداڵ هەمووی بە قوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێ) ئەوەی بڵێ: موحەممەد خودای خۆی بەچاوی سەر دیوە، ئەوە بە ڕاستی درۆیەکی گەلێ زلی هەڵبەستووە بەدەم خوداوە،**

---

(١١١) مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٨٤. شیحا: ٤٣٨. مسلم: ١٧٧. بخاری: ٤٨٥٥. تەجرید/٤، ژمارە: ١٦٥٥، ١٣٠٦.

مەسرووق فەرمووی: کە عائیشە وای گوت منیش پاڵ کەوتبووم، ڕێك دانیشتم‌و گوتم: ئەی دایکی موسوڵمانان! مۆڵەتم بدەو پەلەم لێ مەکە، ئەی ئەوە نییە خودای گەورە دەفەرموێ: {وَلَقَدْ رَآهُ بِالْأُفُقِ الْمُبِينِ – ٨١/٢١}. واتە: موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) بەچاوی سەر لەکەناری ئاسماندا بەروونی ئەوی بینی‌و چاوی پێی کەوت).

ئەی ئەوە نییە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: {وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى – ٥٣/١٣}. واتە: لەگەڵ ئەوەدا کە جارێکی تریش، لە داپەڕینێکی دیکەدا، لەلای درەختی سیدرەتولمونتەهادا، حەزرەت ئەوی بینی، لە ژووری ئاسمانی حەوتەمەوە.

کەواتە تۆ چۆن وا دەڵێیت‌و دەڵێیت موحەممەد خودای نەدیوە، ئەی چی دەکەیت لەم دوو ئایەتە؟ جا عائیشە فەرمووی: من خۆم یەکەم کەس بووم لەم گەلی ئیسلامە، کە ئەم پرسیارەی تۆم لە حەزرەت کرد، فەرمووی: (ئەوەی کە لەم دوو ئایەتەدا، ئاماژەی بۆ کراوە، کەمن دیومە، ئەوە جوبرائیل بوو، تەنیا ئەم دوو جارە لەسەر شێوەی خۆی دیومە. واتە: لەسەر ئەو صورەت‌و شێوەیەی کە خودا لەسەرەتاوە لەسەری دروستی کردووە! بەڵام لەسەر شێوەی تر زۆری دیوە، وەك ئەوەی گەلێ جار لەسەر شێوەو شکڵی دیحیەی ئەل‌کەلبی دەیبینی، کە دەهات بۆلای سرووشی بۆ دەهێنا، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: جوبرائیلم بینی لە ئاسمانەوە داپەڕی، قەڵافەتی ئەوەندە گەورە بوو، وە لەش‌و لاری ئەوەندە زل بوو، ناوەندی ئاسمان‌و زەوی داگرتبوو!).

عائیشە فەرمووی: ئەدی نابینی کە خودای گەورە دەفەرموێ: {لاَّ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ – ٦/١٠٣}. واتە: لەبەر ناسکی‌و نازداری‌و ورشە ورشی ڕووی نازداری چاوی سەر، وە هەروەها چاوی تری دنیایی




که بەس مادده دەبینێ، ئەو نابینێو نایگاتێ، بەڵام خودا خۆی دەرکی چاوانو خاوەن چاوان دەکا، چونکە خۆی ناسكو نازدارەو بەئاگاو ئاگادارە).

لەلایەکی تریشەوە ئەوەتا دەبینی خودای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێ: {وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَاء حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاء إِنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ - سورة الشورى/٤٢/٥١} :

نەبووە بۆ ئادەمیزاد کە خودا قسەی لەگەڵا بفەرموێ، مەگەر بەیەکێ لەم سێ شێوەیە:

**یەکەم:** لەسەر شێوەی وەحیو سرووشی راستەوخۆ لە خوداوە بۆ بەندەی خۆی، بەبێ ئەوەی کەسێ لە نێواندا بێت.

**دووەم:** لەسەر شێوەی دوو بەدوو بەبێ میانگەریی کەسێکی تر بەڵام لەپشتی پەردەوە نەوەك روو بەروو.

**سێیەم:** خودا فریشتەیێ، وەك جوبرائیل دەکا بە فرووستادەو دەینێرێ، ئەو فروستادەیە قسەو گوفتوگۆ بە فەرمانی خودا، لەگەڵ کەسی مەبەست دەکاو، لەهەندێ کاروبار ئاگاداری دەکا، لەسەر شێوەی سرووشو نیگای خوایی).

عائیشە فەرمووی: دووەم: هەرکەسێ بڵێ گوایە پێغەمبەری خودا شتێکی حەشارداوە لەو قورئانو سوننەتەی کە بە سرووش بۆی هاتووە، ئەوە بێگومان درۆیەكو هەلاتێکی گەورەی هەڵبەستووە بەدەم خوداوە، چونکە ئەوەتا خودای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا، فەرمان دەکا بە پێغەمبەر، کە ئەو قورئانو وەحیەی کە بۆی هاتووە بەتەواوی رابگەیەنێو هەرِشەی ئەوەی لێ دەکا، ئەگەر بە ئەرکی سەرشانی خۆی هەڵ نەستێ لەم لایەنەوە بەرپرسیارە، کە دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ - ٥/٦٧} . واتە: ئەی پێغەمبەری نازدارو خۆشەویست! هەرچی بە سرووشو




وەحی، من ناردوومە بۆ تۆ، لە قورئان‌و سوننەت، دەبیٚ رایبگەیەنی بەو خەڵکەو تەبلیغیان بکەی، ئەگینا بزانە کەتۆ پەیامی پیرۆزی خودای خۆتت پێیان رانەگەیاندووە).

عائیشە فەرمووی: سێیەم: هەرکەسیٚ باوەڕی وابیٚ کە موحەممەد عیلمی غەیبی بووەو لەخۆیەوە بەبیٚ سرووش‌و نیگای خودایی دەیزانیٚ کە سبەینیٚ چی دەبیٚ، ئەوە دیارە کە درۆیەکی زلی بەدەم خوداوە هەڵ بەستووە، چونکە خودا دەفەرمویٚ: {قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ – ٢٧/٦٥} . واتە: ئەی خۆشەویست، ئەی موحەممەد، ئەی پێغەمبەری خۆشەویستی من! بفەرموو: ئەوەی کەلە ئاسمانەکان‌و لە زەویدا عیلمی غەیبی هەبیٚ بەس خودا خۆیەتی‌و کەسی تر غەیبزان نییە).

ئیمامی موسلیم ئەم فەرموودەیە بە دوو رشتە –واتە: بە دوو سەنەد- لە داوودی کوڕی ئەبوهیندەوە دەردەهێنیٚ: جاری یەکەم: لە زوهەیری کوڕی حەربەوە، لە ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمەوە، کە ناسراوە بە ئیبنو عولەییە، لەداوودی کوڕی ئەبو هیندەوە، فەرموودەکە لێرەدا کۆتایی دیٚ، جاری دووهەم دەری دەهێنیٚ: لە موحەممەدی کوڕی موسەنناوە، لە عەبدولوەهابەوە، لە داوودی کوڕی ئەبو هیندەوە، لەم گێڕانەوەی دووەمدا، داوود ئەمەی لیٚ پتر کردووە:

عائیشە فەرمووشی: گریمان ئەگەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) شتێکی لەو سرووشەی کە بۆی هاتبوو بشاردایەتەوە، ئەم ئایەتەی دەشاردەوە:

{وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ } . (تاج/٦، لاپەڕە: ١٥٨، ژمارە: ٨ = تاج-٤ ژ-٣٨٥٩ ز-٧٤).

**ڕوونكردنەوە:**

١- ئەم باسی بینینی خودایە بەچاوی سەر لەم جیهانەدا، پرسێکە لەناو زانایاندا ڕاجیایی واتیادا، هەردوو ڕایەکەیش زۆر بەهێزن، مرۆڤ باوەڕی بە هەرکام لەو دوو ڕایە هەبێ دروستەو قەیدی نییە.

٢- ئەوەی کە لەتاجدا، لەبەرگی شەشی کوردییەکەدا، لە لاپەڕە/١٥٩دا نووسراوە کە مەسرووق خوشکەزای حەزرەتی عائیشەیە ئەوە هەڵەیە، نە عائیشە پووری مەسرووقەو نە مەسرووق خوشکەزای عائیشەیە یا لەهەر شوێنێکی تردا شتی وا نووسرابووە لەچاپی چوارەم دا چاك کراوە (تاج-٤ ز-٧ ژ-٣٨٥٩).

مەسرووقی کوڕی ئەجدەع پیاوێکی خوا ناسی گەورە بوو، فەرموودە زانێکی گەورە بوو، نازناوی ئەبو عائیشە بوو، بەخزمەت زۆر لە هاوڕێیانی پێغەمبەر، لە ژنانو لە پیاوان گەیشتووە، وەك ئەبوبەکرو عومەرو عەلیو عائیشەو کەسانی تریش، خەڵکێکی زۆر فەرموودەیان لەو وەرگرتووە، هەمیشە سەرگەرمی وەرگرتنی زانست بوو، لەو زاتانە بوو کە سوننەتیان فێری مەردوم دەکرد، جارێ تەشریفی چوو بۆ حەج هەتا ئەو حەجەی تەواو کرد، ئەوەندە سەرگەرمی پەرستشو شەو نوێژ بوو، هەر لەناو سەجدەدا دەخەوتو بەس هەتا حەجەکەی تەواوکرد، ئەوەندەی شەو نوێژ کردبوو، قاچەکانی پەنەما بوون، جارێ شیعرێکیان لێ پرسی، فەرمووی: (حەزناکەم شیعر لەنامەی کردارما هەبێ). یەکێ بوو لە فەقێکانی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود، مەردومی

فێری قورئان دەکردو فەتوای بۆ دەدان. کەلبی دەفەرموێ: لە شەڕی قادسیەدا دەستێکی مەسرووق گۆد بوو بوو، پێکانێکی هەتا سەرمۆخ لەسەری کرابوو، خۆی دەیفەرموو: (حەزناکەم کە ئەم زامەی سەرم نەبوایە، چونکە بووە بەهۆی دوورکەوتنەوەم لە شەڕی ئاژاوەی نێوان هاوڕێیان، وەك عەلی‌و موعاویەو عائیشە...). یەکێ بوو لە عابیدو خوا ناسە ناسراوەکانی خەڵکی کووفە، لە تەمەنی شەست‌و سێ ساڵیدا، لەساڵی شەست‌و سێی کۆچیدا، لە (السلسلة) مەرگ بوو بەمیوانی (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ).

دەقی فەرموودەکە لە موسلیمدا بەم شێوەیەی سەرەوە بوو، لە بوخاریدا، لەژمارە/٤٨٥٥ بوخاریدا ئاوایە:

مەسرووق (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: گوتم بە عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو هاوسەرو هاوەڵانی) ئەی دایکی ئازیزم! ئایا موحەممەد کە پێغەمبەری خودایە، خودای خۆی دیوە یانا؟ عائیشە فەرمووی: مووی سەرم کرژبوو لەسامی ئەم پرسیارەی تۆ، خودا چۆن دەبینرێ!؟ چۆن ئەم سێ پرسە نازانی، دەبوو شتی وا لەتۆ پەنهان نەبێ:

**یەکەم:** ئەوەی کە بڵێ: موحەممەد خودای خۆی بەچاوی سەر بینیوە، ئەوە بەڕاستی درۆدەکا. ئەوجا عائیشە بۆ پشتیوانی دروستی ئەم بۆچوونەی خۆی، ئەم ئایەتەی خوێندەوە، کە دەفەرموێ: {لاَّ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ – ١٠٣/٦} . وە عائیشە ئەم ئایەتەی تریشی بەهەمان مەبەست خوێندەوە، کە دەفەرموێ: {وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَاء حِجَابٍ - سورة الشورى/٤٢/٥١} :

**دووەم:** هەرکەسێ باوەڕی وابێ کە موحەممەد عیلمی غەیبی بووەو لەخۆیەوە بەبێ سرووش‌و نیگای خودایی دەیزانی کە سبەینێ چی دەبێ، ئەوە دیارە کە درۆیەکی زلی بەدەم خوداوە هەڵ بەستووە، ئەوجا عائیشە بۆ پشتیوانی دروستی ئەم خاڵی دووەمە ئەم ئایەتەی تری خوێندەوە: {وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَداً – لقمان : ٣٤} واتە: هیچ کەسێ، بێجگە لەخودا، نازانێ کە سبەینێ چی روو دەدا، یا چی دەکا.

**سێیەم:** هەرکەسێ بڵێ گوایە پێغەمبەری خودا، شتێکی حەشارداوە لەو قورئان‌و سوننەت‌و یاسانامەی خودایە، کە بەسرووش بۆی هاتووە، ئەوە بێگومان کە درۆیەك‌و هەلاتێکی گەورەی هەڵبەستووە بەدەم خوداوە، ئەوجا عائیشە بۆ پشتیوانی راستی‌و دروستی قسەکەی خۆی ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ إِنَّ اللّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ – المائدة : ٦٧}. ئەوجا عائیشە، پاش روونکردنەوەی ئەم سێ پرسە، گەڕایەوە بۆ سەر پرسیارەکەی مەسرووق‌و فەرمووی: بەلام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دووجار جوبرائیلی لەسەر شێوەی راستەقینەی خۆی دیوە، کە ئایەتی {مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَى ﴿النجم : ١١} و ئایەتی {وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى – ١٣/٥٣}. باسی ئەو دووجارە دەکەن.

١١٢– عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْها) قَالَتْ مَنْ زَعَمَ أَنَّ مُحَمَّدًا رَأَى رَبَّهُ فَقَدْ أَعْظَمَ وَلَـكِنْ قَدْ رَأَى جِبْرِيلَ فِي صُورَتِهِ وَخَلْقِهِ سَادٌّ مَا بَيْنَ الأُفُقِ.[١١٢]

---

[١١٢] تەجرید/٣، ژمارە: ١٣٠٦. بخاری: ٣٢٣٤. مسلم: ١٧٧ = مسلم/شیحا: ٤٤١.

مەسروق (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لای عائیشەی دایکی ئیمانداران بووم، پاڵم دادا بوو، فەرمووی: هەرکەسێ یەکێ لەم سێ قسەیە بکا ئەوەبەڕاستی هەڵاتێکی گەلێ گەورە هەڵدەبەستێ بۆ خوا:

ئەوەی بڵێ موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) خودای خۆی بەچاوی سەر دیوە، ئەوە بەراستی درۆیەکی گەلێ زلی هەڵبەستووە، بەدەم خوداوە، چونکە خودا بۆ خۆی دەفەرموێ: ﴿لاَ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ﴾ چاوانی سەر خودا نابینن و دەرکی کونهی و چییەتی ئەو ناکەن، بەلام خودا زۆر باش دەرکی چاوان و خاوەن چاوان دەکا، تا ئەوێ کە مەسروق دەفەرموێ: کە عائیشە وای فەرموو منیش ڕێك دانیشتم و گوتم: ئەی دایکی موسوڵمانان مۆڵەتم بدەو پەلەم لێ مەکە، ئەی ئەوە نییە کە خودا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى﴾ -١٣/٥٣- واتە: لەگەڵ ئەوەدا کەجارێکی دیکەش لەداپەڕینێکی دیکەدا، لەلای درەختی سیدرەتولمونتەهادا، حەزرەت ئەوی بینی، لەژووورووی ئاسمانی حەوتەمەوە، ئەی ئەوە نییە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ رَآهُ بِالأُفُقِ الْمُبِينِ﴾ -٢٣/٨١- واتە: موحەممەد(دروودی خوای لەسەر بێ) بەچاوی سەر لەکەناری ئاسماندا بەروونی ئەوی بینی و چاوی پێی کەوت. کەواتە ئەی دایکە عائیشە! تۆ چۆن وادەڵێیت؟ عائیشەش فەرمووی: من خۆم یەکەم کەس بووم کە ئەم پرسیارەی تۆم لەحەزرەت کرد، فەرمووی(دروودی خوای لەسەر بێ) : (ئەوەی کە من چاوم پێکەوتووە جوبرائیل بوو، تەنیا ئەم دوو جارە لەسەر شێوەی خۆی جوبرائیلم دیوە، واتە: لەسەر ئەو صورەت وشێوەیەی کە خودا لەسەرەتاوە لەسەری دروستی کردووە!).

پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: جوبرەئیلم دی لەئاسمانەوە داپەڕی، قەلافەتی ئەوەندە گەورە بوو وەلەش و لاری ئەوەندە زل

بـوو، ناوەنــدی ئاسمــانو زەوی داگرتبــوو) (بڕوانــە: تــاج/٦ل- ١٥٨ فـ ٨ ز —٧ - سوورەتی ئەنعام).

## (٨٠) باب: إثبات رؤية المؤمنينَ فِي الآخِرَةِ رَبهم سبحانه وتعالى
## بە بەڵگە چەسپاوە کە باوەڕداران لەدوا ڕۆژدا خودای خۆیان دەبینن

١١٣- عنْ عَبْدُ اللّٰهِ بْن قَيْس (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قَالَ جَنَّتَان مِنْ فِضةٍ انِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا وَجَنَّتَان مِنْ ذهَبٍ انِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا وَمَـا بَيْنَ الْقَوْمِ وَبَيْنَ انْ يَنْظرُوا الَى رَبِّهِمْ الا رِدَاء الْكِبْرِ عَلَى وَجْهِهِ فِي جَنَّةِ عَدْن.[113]

عەبدوڵلای کوڕی قـەیس (ڕەزای خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لـێ بێ) فەرمووی: (هەموو خوا پێداوێ لەناو بەهەشت دا دوو بەهەشـتی هەیـە، کـە قـاپو قاچـاخ وتفـاقی ناویـان هـەمووی لـە زیـون وە دوو بەهەشتیـشی هەیـە، کـە قـاپو قاچـاخ وتفـاقی ناویـان هـەمووی لـە زێـڕن، بەهەشتییەکان وان لەناو بەهەشتی عەدن دا، کـە بەڕاسـتی جێگـای حەوانـە وەو نیشتەجێ بوونە، هەموو ئاواتێکیان هاتووەتە دی، تەنیا ئەو تاقە ئاواتەیان ماوە کە تەماشای زاتی خودا بکەن، ئەگەر لەبەر تارای مەزناهی وپـەردەی گـەورەییو شکۆمەندی نەبێ، کە بەسەر زاتی پـاکی خوداوەیـە، ئـەو ئاواتەشـیان دەهاتـە دی وبەچاوی سەر چاویان دەکەوت بە زاتی خودای پـەروەردگاری خۆیـان ). (تـاج/٧ ز/٣٨ ل/١٧٤ ژ/٢- سوورەتی ڕەحمان ).

[113] تەجرید/٤، ژمارە: ١٧٠٢ = بخاری/٤٨٧٨. مسلم: ١٨٠ = مسلم/شیحا: ٤٤٧.

## (٨١) باب: معرفة طريق الرُؤيَة
## باسی چۆنێتی ڕێگەی زانینی بینینی خودای گەورە

١١٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ أُنَاساً قَالُوا لِرَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): هَلْ نَرَى رَبَّنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «هَلْ تُمَارُونَ فِي الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ؟ قَالُوا: لاَ يَا رَسُولَ اللّهِ، قَالَ: «هَلْ تُمَارُونَ فِي الشَّمْسِ لَيْسَ دُونَهَا سَحَابٌ؟ قَالُوا: لاَ، قَالَ: «إِنَّكُمْ تَرَوْنَهُ كَذَلِكَ، يَجْمَعُ اللّهُ النَّاسَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيَقُولُ: مَنْ كَانَ يَعْبُدُ شَيْئًا فَلْيَتَّبِعْه، فَيَتَّبِعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الشَّمْسَ الشَّمْسَ، وَيَتَّبِعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الْقَمَرَ الْقَمَرَ، وَيَتَّبِعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الطَّوَاغِيتَ الطَّوَاغِيتَ، وَتَبْقَى هَذِهِ الأُمَّةُ فِيهَا مُنَافِقُوهَا، فَيَأْتِيهِمُ اللّهُ تَعَالى فِي صُورَةِ غَيْرِ صُورَتِهِ الَّتِي يَعْرِفُونَ. فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ، فَيَقُولُونَ: نَعُوذُ بِاللّهِ مِنْكَ، هَذَا مَكَانُنَا حَتَّى يَأْتِيَنَا رَبُّنَا فَإِذَا جَاءَ رَبُّنَا عَرَفْنَاهُ. فَيَأْتِيهِمُ اللّهُ فِي صُورَتِهِ الَّتِي يَعْرِفُونَ، فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ، فَيَقُولُونَ: أَنْتَ رَبُّنَا فَيَتَّبِعُونَهُ، وَيُضْرَبُ الصِّرَاطُ بَيْنَ ظَهْرَى جَهَنَّمَ، فَأَكُونُ أَنَا وَأُمَّتِي أَوَّلَ مَنْ يُجِيزُ، وَلاَ يَتَكَلَّمُ يَوْمَئِذٍ إِلاَّ الرُّسُلُ، وَدَعْوى الرُّسُلِ يَوْمَئِذٍ: اللَّهُمَّ سَلِّمْ سَلِّمْ، وَفِي جَهَنَّمَ كَلاَلِيبُ مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ، هَلْ رَأَيْتُمْ السَّعْدَانَ؟ قَالُوا: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: فَإِنَّهَا مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ غَيْرَ أَنَّهُ لاَ يَعْلَمُ مَا قَدْرَ عِظَمِهَا إِلاَّ اللّهُ، تَخْطَفُ النَّاسَ بِأَعْمَالِهِمْ، فَمِنْهُمْ الْمُؤْمِنُ بَقِيَ بِعَمَلِهِ، وَمِنْهُمْ الْمُجَازِي حَتَّى يُنَجَّي. حَتَّى إِذَا فَرَغَ اللّهُ مِنَ الْقَضَاءِ بَيْنَ الْعِبَادِ، وَ أَرَادَ أَنْ يُخْرِجَ بِرَحْمَتِهِ مَنْ أَرَادَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ أَمَرَ الْمَلاَئِكَةَ أَنْ يُخْرِجُوا مِنْ النَّارِ مَنْ كَانَ لاَ يُشْرِكُ بِاللّهِ شَيْئاً مِمَّنْ أَرَادَ أَنْ يَرْحَمَهُ، مِمَّنْ يَقُولُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ فَيَعْرِفُونَهُمْ فِي النَّارِ، يَعْرِفُونَهُمْ بِآثَرِ السُّجُودِ، تَأْكُلُ النَّارُ مِنَ ابْنِ آدَمَ إِلاَّ أَثَرَ السُّجُودِ، حَرَّمَ اللّهُ عَلَى النَّارِ أَنْ تَأْكُلَ أَثَرَ السُّجُودِ، فَيَخْرُجُونَ مِنَ النَّارِ وَقَدِ امْتَحَشُوا فَيُصَبُّ عَلَيْهِمْ مَاءُ الْحَيَاةِ فَيَنْبُتُونَ مِنْهُ كَمَا تَنْبُتُ الْحِبَّةُ فِي حَمِيلِ السَّيْلِ، ثُمَّ يَفْرُغُ اللّهُ مِنَ الْقَضَاءِ بَيْنَ الْعِبَادِ، وَيَبْقَى رَجُلٌ مُقْبِلٌ بِوَجْهِهِ عَلَى النَّارِ، وَهُوَ آخِرُ أَهْلِ لبجنَّةِ دُخُولاً الجَنَّةَ، فَيَقُولُ: أَيْ

رَبِّ اصْرِفْ وَجْهِي عَنِ النَّارِ فَإِنَّهُ قَدْ قَشَبَنِي رِيحُهَا وَأَحْرَقَنِي ذَكَاؤُهَا، فَيَدْعُو اللّهَ مَاشَاءَ اللّهُ أَنْ يَدْعُوهُ ثُمَّ يَقُولُ الله تَبَارَكَ وَتَعَالى: هَلْ عَسَيْتَ إِنْ فَعَلْتُ ذَلِكَ بِكَ أَنْ تَسْأَلَ غَيْرَهُ؟ فَيَقُولُ: لاَ أَسْأَلُكَ غَيْرَهُ، وَيُعْطِي رَبَّهُ مِنْ عُهُودٍ وَمَوَاثِيقَ مَاشَاءَ اللّهُ فَيَصْرِفُ اللّهُ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ، فَإِذَا أَقْبَلَ عَلَى الْجَنَّةِ وَرَآهَا، سَكَتَ مَا شَاءَ اللّهُ أَنْ يَسْكُتَ، ثُمَّ يَقُولُ: أَيْ رَبِّ قَدِّمْنِي إِلَى بَابِ الْجَنَّةِ، فَيَقُولُ اللّهُ لَهُ: أَلَيْسَ قَدْ أَعْطَيْتَ عُهُودَكَ وَمَوَاثِيقَكَ لاَ تَسْأَلُنِي غَيْرَ الَّذِى أَعْطَيْتُكَ، وَيْلَكَ يَا ابْنَ آدَمَ مَا أَغْدَرَكَ! فَيَقُولُ: أَيْ رَبِّ! وَيَدْعُو اللهَ، حَتَّى يَقُولَ له: فَهَلْ عَسَيْتَ إِنْ أُعْطَيْتُكَ ذَلِكَ أَنْ تَسْأَلَ غَيْرَهُ؟ فَيَقُولُ: لاَ وَعِزَّتِكَ، فَيُعْطِي رَبَّهُ مَا شَاءَ اللّهُ مِنْ عُهُودٍ وَمَوَاثِيقَ فَيُقَدِّمُهُ إِلَى بَابِ الْجَنَّةِ، فَإِذَا قَامَ عَلَى بَابِ الْجَنَّةِ إِنْفَهَقَتْ لَهُ الجَنَّةُ فَرَأَى مَا فِيهَا مِنَ الخَيْرِ وَالسُّرُورِ، فَيَسْكُتُ مَا شَاءَ اللّهُ أَنْ يَسْكُتَ، ثُمَّ يَقُولُ: أَيْ رَبِّ أَدْخِلْنِي الْجَنَّةَ، فَيَقُولُ اللّهُ لَهُ: أَلَسْتَ قَدْ أَعْطَيْتَ عُهُودَكَ وَمَوَاثِيقَكَ أَنْ لاَ تَسْأَلَ غَيْرَ مَا أُعْطِيتَ؟ وَيْلَكَ يَا ابْنَ آدَمَ مَا أَغْدَرَكَ! فَيَقُولُ: أَيْ رَبِّ لاَ أَكُونُ أَشْقَى خَلْقِكَ، فَلاَ يَزَالُ يَدْعُو اللّهَ حَتَّى يَضْحَكَ اللّهُ عَزَّ وَجَلَّ مِنْهُ، فَإِذَا ضَحِكَ اللّهُ تَعَالى مِنْهُ، قَالَ: ادْخُلِ الْجَنَّةِ، فَإِذَا دَخَلَهَا قَالَ اللّهُ لَهُ: تَمَنَّهْ، فَيَسْأَلُ رَبَّهُ وَ يَتَمَنَّى، حَتَّى إِنَّ اللهَ لَيُذَكِّرُهُ مِنْ كَذَا وَكَذَا، حَتَّى إِذَا إِنْقَطَعَتْ بِهِ الأَمَانِيُّ قَالَ اللّهُ تَعَالَى: ذلِكَ لَكَ وَمِثْلُهُ مَعَهُ. قَالَ عَطَاءُ ابْنُ يَزِيدَ وَأَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ مَعَ أَبِى هُرَيْرَةَ لاَ يَرُدُّ عَلَيْهِ مِنْ حَدِيثِهِ شَيْئاً، حَتَّى إِذَا حَدَّثَ أَبُو هُرَيْرَةَ أَنَّ اللّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَالَ لِذالِكَ الرَّجُلِ: (وَمِثْلُهُ مَعَهُ) قَالَ أبو سَعِيدٍ: وَعَشَرَةُ أَمْثَالِهِ مَعَهُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ. قَالَ أَبُو هُرَيرَةَ: مَا حَفِظْتُ إِلاَّ قَوْلَهُ: (ذالِكَ لَكَ). (وَمِثْلُهُ مَعَهُ). قَالَ أبو سَعِيدٍ: أَشْهَدُ أَنِّي حَفِظْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَوْلَهُ: «ذَلِكَ لَكَ وَعَشْرَةُ أَمْثَالِهِ» قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ (وَذَلِكَ الرَّجُلُ آخِرُ أَهْلِ الْجَنَّةِ دُخُولاً الْجَنَّةَ.[١١٤]

---

[١١٤] تەجريد/١، ژمارە: ٤٣٧ = بخارى: ٨٠٦، ٦٥٧٣، ٧٤٣٧. مسلم: ٦٧٥ = شيحا: ٤٥٠ = مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٨٦.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای گەورەی لێ بێ) فەرمووی: یاران عەرزی خۆشەویستیان کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا لە ڕۆژی قیامەتا، ئێمە خودای خۆمان بەچاوی سەر دەبینین؟!

خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (شەوی چواردەی مانگ، کە سایەقەی سامالْ بێو ئاسمان ساف بێو هەورو هەلای نەبێ، بۆ دیتنی مانگ هیچ زەحمەت دەکێشن، وەك لەسەری مانگا، بۆ دیتنی مانگی یەکشەوە زەحمەت دەکێشنو بە وردی بۆی دەگەڕێن؟!) فەرموویان: نەء، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (ئەی بە ڕۆژی نیوەڕۆ، ئاسمان ساف بێ، بۆ بینینی خۆر بە ئاسمانەوە هیچ ئەرکێ، یا زەحمەتێ دەبینن؟!). فەرموویان: نەخەیر، بۆ ئەمە تووشی هیچ ئەرکێ نابین. فەرمووی: (دەی ئێوە بەوچەشنە، ئاوا بەبێ شەكو گومان بە ئاسانی خودای خۆتان بەچاوی سەرتان دەبینن. لەڕۆژی دوارۆژدا، خودای گەورە ئەو خەڵکە هەموو کۆدەکاتەوە، سەرجەم مەردوم حەشر دەکرێن، بە فەرمانی خودا بانگەواز دەکرێ: هەرکەسێ لە جیهانا بۆ کێ بەندەییو پەرستشی کردووەو چی پەرستووە، با ئێستا شوێنی ئەوە بکەوێ، ئیتر ئەوەی خۆری پەرستووە شوێن خۆر دەکەوێ، ئەوەی مانگی پەرستووە شوێن مانگ دەکەوێ، ئەوەی بتی پەرستووە شوێن بت دەکەوێ، ئەوەی هەرشتێکی پەرستبێ لە دنیادا، بێجگە لە خودا، شوێن ئەو شتە دەکەوێ، ئەوانیش بەرەو ئاگری دۆزەخ دەیان بەن!! دەمێننەوە ئەم گەلی ئیسلامە بە پاكو ناپاکیانەوە، ئەو ناپاکانەی کە بەدەم موسوڵمانن‌و بە دڵ بێباوەڕن ئەوانەشیان لەناودایە، ئەوحەلە خودا لەسەر شێوەیێ دێت بۆلایان، کە ئەوان لەسەر ئەو شێوەیە نایناسنەوە، چونکە لەشەریعەتی پیرۆزدا شتی وایان نەبیستووە، جا خودا پێیان دەفەرموێ: من خودای ئێوەم. دەڵێن: نەء، تۆ خودای ئێمە نیت، پەنا دەگرین




بـەخودا لـەتۆ، کـە لـەم دوا تاقیکردنەمانـدا زەفـەرمان پـێ نـەبینیت! ئەمـە جێـگەمانە هەتا خـودای خۆمـان دێـت بۆلامـان، هەرکاتێ خـودای خۆمـان هـات دەیناسین، ئیتر خودای گەورەو بێچوون لەسەر ئەو شێوەیەی کە لـە یاسانامەی خودادا بۆیان روونکراوەتەوە دێ بۆلایانو دەیناسـنەوە، دەفـەرموێ: مـن خـودای ئێوەم، دەڵێن: بـەڵێ تـۆ خـودای ئێمـەی، ئـەوجا شـوێنی دەکـەون، ئـەوجا پـردی سـیرات -کـە لـەموو بـاریکترو لـە شمـشێر تیـژترە- بەسـەر پـشتی دۆزەخـدا رادەکێشرێ، منو ئۆمەتم یەکـەم کـەس دەبـین کـە بەسـەریا دەپەڕینـەوە، وەمـن یەکەم کەس دەبم لە پێغەمبەران کە ئۆمەتم لـەو پـردەوە دەپەڕێنمـەوە. لەبـەر سامو تـرسو بـیم، ئـەو خەڵـکە وەك زمانیـان بەسـترابێ وایـە، زمانیـان گۆناکـا، بـەس پێغەمبـەرەکان (درووددو رەحمـەتو سـەلامو صـەلاتو بەرەکـەتی خـودای گەورەو مەزنیان لێ بێ) بەس ئەوان زات دەکەن کە قـسە بکـەن، داوای ئـەو رۆژە سـەختو دژوارەی پێغەمبـەرانیش هـەر ئەومیـە: خـۆش خـۆش دەفـەرموون: خودایە! بەخۆشی، خودایە! بەبێوەی، خودایە! بەسەلامەتی، خودایە! نەگلێن).

لە دۆزەخدا جۆرە قولاپو قەڵەنگێ هەیـە، قەڵبـەدارن، قەڵبـەکانیان وەك دڕکە کەڵەوێ وایە، خۆ بەچاوی خۆتان دڕکـە کەڵـەوێتان دیـوە، فـەرموویان: ئـا، ئـەی پێغەمبـەری خـودا! دیومانـە. فـەرمووی: دەڕێـك وەك دڕکـی کەڵـەوێ وان، بەڵام خودا بۆخۆی نەبێ کەسی تر نازانێ کە ئەو قەڵبانـە چـەندە گـەورەو زلو قەبەو زۆرن، جا ئـەو قەڵبانـە خەڵـك دەرفێـنن بـەپێی خراپـی کردەوەیـان، جا کاتێ خەڵکەکە دەیانەوێ بەسـەر پـردی سـیراتا بپەڕنـەوەو بـڕۆن بـۆ بەهەشـت، ئەو قولاپانە لەمبـەرو ئەوبـەری پـردی سـیراتەوە پڕیـان پیادەکـەنو پـەلاماریان دەدەنو بـەهۆی کـردەوەی خراپـی خۆیانـەوە دەیـان فـڕێنن بـۆ نـاو دۆزەخ، جـا هەیانـە بـەهۆی کـردەوەی نالەباریانـەوە بـە فـەتارەت دەچـن، هەیـشیانە لەبـەر

کـردەوەی بـەدی خۆیـان قولاپـەکان ئـەنجن ئـەنجنیان دەکـەن، لەپاشا رزگاریـان دەبـێ، بازێـکیش بەچـنگە کـرێو پەلـە پـڕووزە هەرچۆنێ بـێ خۆیـان دەربـاز دەکـەنو خـودا لـەو مەینەتـە قوتاریـان دەکـا، هـەتا کاتـێ خـودا دادگـاییو مەحکەمەی بەندەکان تەواو دەکا، بەهەشتی بۆ جێی خۆیو دۆزەخـی بـۆ جێـی خـۆی، وەکـاتی ئـەوە دێ کـە یـەزدانی پـاك دەیـەوێ بـە میهرەبـانیی خـۆی زۆر کەسان، لـە بـڕواداران، لـە دۆزەخ دەربهێنـێ، فـەرمان بـە فریـشتە گـەل دەدا: کـە ئەوانەی هیچ هاوبەشییان بۆ خودا دانەناوەو لەو دەسـتەیەن کـە دەڵێن: (لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّهُ)و خودا بە مەرحەمەتی خۆی ویستی خێری پێیان هەبێت، فـەرمان دەدا بـە فریـشتەکان کـە ئەوانـە لـە ئـاگر دەربێـنن، فریـشتەکان بەشـوێنەواری کوڕنووشـدا، لـەناو ئـاگردا، دەیـان ناسـنەوە، چـونکە هـەموو ئەندامێـکی مـرۆڤ ئاگری دۆزەخ دەیخوات بێجگـە لـەو ئەندامانـەی کـە لـەکاتی سـەجدەدا دەکەونـە سەر زەوی، ئەو حەوت ئەندامە خودا قەدەغـەی کـردوون لەسـەر ئـاگری دۆزەخ، کاتێ لە دۆزەخ دەردەچن بوون بە سووتەمەڕۆ، ئەوجا ئـاوی ژیانیـان پیـادەکرێ، جا بەو ئاوە وەکتۆمەی نـاو لیـوەی لافـاو سـەوز دەبنـەوە، ئـیتر خـودا بەتـەواوی لـەداد پرسـیی بەنـدەکان لێ دەبێتـەوە، تـەنها پیـاوێ دەمێنێتـەوە کـە دواهـەمین بەهەشتییە کە دەچێتە ناو بەهەشت، رووی لە ئاگری دۆزەخـە، دەڵـێ: خودایـە! بـە میهرەبـانیی خـۆت رووم لـەم ئـاگرە وەرگێـڕە، بەڕاسـتی هـەوا بۆگەنەکـەی پڕووکاندوومیو تینەکەی سووتاندوومیو شـەراو بڵێسەکەی برژانـدوومی، ئـیتر چـەندە خـودا حـەزدەکا ئەوەنـدە لـەخودا دەپاڕێتـەوە. ئـەوجا خـودای گـەورەو پیرۆز دەفەرموێ: خۆ ئەگەر ئەمەت لەگەڵ بکەم بەتەمانیت داوای شـتی تـرم لێ بکەی؟ دەڵێ: بێجگـە لـەوە داوای هیـچی تـرت لێناکـەم، ئەوەنـدەی خـودا مـەیلی لەسەری بێ، بـەڵێنو پـەیمان بـەخودا دەدا، کەلـەوە زیـاتر داوای شـتی تـر نـەکا،

ئەوکاتە خودا رووی لە ئاگرەکە دوور دەخاتەوەو روودەکاتە بەهەشتو خۆشیو گەشیو ناسكو نازداری ناو بەهەشت لەدوورەوە دەبینێ، چەندەی کە خودا مەیلی لەسەر بێ ئەوەندە بێ دەنگ دەبێ، لەپاشدا دەڵێ: خودایە! ئەی پەروەردگارم! توخوا بمبەرە بەردەرگای بەهەشت، خودایش پێی دەفەرموێ: خانەخراپ! ئەی تۆ بەڵێنو پەیمانت بەمن نەدا کە لەوەزیاتر داوای هیچی ترم لێ نەکەی، ئەی ئادەمیزاد! چەندە بێ پەیمانی، دەڵێ: ئەی خودایە! ئەمە واو ئەی خودایە! ئەوە وا، وە زۆر دەپاڕێتەوە، تا خودا دەفەرموێ پێی: خۆ بەتەما نیت کە ئەمەم پێ بەخشیت داوای شتی ترم لێ بکەی؟ دەڵێ: خەیر! بە گەورەیی تۆ، ئەوەندەی خودا ویستی لەسەربێ بەڵێنو پەیمانی تر بەخودا دەدا، کە لەمەزیاتر داوای هیچی تر نەکا. جا خودا دەیباتە بەردەم دەرگای بەهەشت، جا کاتێ لەبەر دەرگای بەهەشت رادەوێستێ، بەتەواوی نازداریو خۆشیو باشیو گەشی بەهەشتی بۆ دەردەکەوێ، دیسان ئەوەندەی خودا مەیلی لێ بێ ئەوەندە بێ دەنگ دەبێ، پاشان دەڵێ: ئەی خودایە! بمبەرە ناو بەهەشت، خودای گەورەو پیرۆزیش پێی دەفەرموێ: ئەرێ تۆ ئەو هەمکە بەڵێنو پەیمانەت بەمن نەدا، کە لەوەزیاتر داوای هیچی تر نەکەی!؟ خانە خراپ! مرۆڤێکی چەندە پەیمان شکێنی!

دەڵێ: ئەی خودای من! ئومێد دەکەم کە نەبم بە بەدبەختترین دروستکراوانی تۆ کە لەدۆزەخ دەرچوون، ئیتر ئەوەندە لە خودا دەپاڕێتەوە هەتا خودای پیرۆزو گەورە پێی پێدەکەنێو رەقەکەی دەنیشێتەوەو بەزەیی پیادا دەێتەوەو پێی دەفەرموێ: بچۆرە بەهەشتەوە. کاتێ بەندەکە دەچێتە ناو بەهەشتەوە، خودا پێی دەفەرموێ: حەزت لەچییە، بەبێ قەیدو شەرت داوای بکە، داوایەکی زۆر لەخودا دەکاو دڵی بۆهەرچی بچێ ئاواتی بۆ دەخوازێ، خودا

خۆشی ڕێنمایی دەکاو مامۆستایی دەکاو دەیخاتە سەردەمی کە داوای ئەوەو ئەوەبکە لەو بەهرەو نازو نیعمەتانەی کە بەندەکە خۆی نەیبیستوون، هەتا هیچ تەمەنناو خۆزگەو ئاواتێکی نامێنێ، ئەو حەلە خودای گەورە پێی دەفەرموێ: هەموو ئەوانەی کە داوایانت کردووەو ئەوەندەی تریش بۆ تۆ!!

عەطای کوڕی یەزیدی لەیثی (کە تابیعییە، کە ئەم فەرموودەیە لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕێتەوە) دەفەرموێ: لەم کاتەدا کە ئەبو هورەیرە ئەم فەرموودەیەی گێڕایەوە، ئەبو سەعیدی خودری لەوێ دانیشتبوو، هەتا ئێرە هیچ ڕەخنەو قسەیەکی نەبوو، بەڵام لێرەدا فەرمووی: شایەتی دەدەمو خودا دەکەم بەشایەت کەمن ئەم وتەیەی دواوەم لەدەمی پێغەمبەر خۆی ئاوا لەبەرکردووە: (ئەوەو دە ئەوەندەی تریش بۆ تۆ).

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: من هەر ئەوەم لەبەرکردووە، کە ئێستا گوتم، کە حەزرەت دەفەرموێ: (ئەوەی داوات کردووەو ئەوەندەی تریش بۆ تۆ).

ئەبو هورەیرە فەرمووی: (ئەو پیاوە دوا کەسە کەدەچێتە ناو بەهەشت).
{تاج/١٠، لاپەڕە: ٤٢٠، زنجیرە: ١٣٢، ژمارە: ١+٢+٣+٤ - تاج-٥ ژ-٥٧٠٤-٥٧٠٧ چ-٤} + {تەجریدی بوخاری/١، لاپەڕە: ٤١٥، ژمارە: ٨٠٦/٤٣٧، ٦٥٧٣، ٧٤٣٧}.

١١٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلْ نَرَى رَبَّنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ قَالَ « هَلْ تُضَارُونَ فِي رُؤْيَةِ الشَّمْسِ وَالْقَمَرِ إِذَا كَانَتْ صَحْوًا » . قُلْنَا لاَ . قَالَ « فَإِنَّكُمْ لاَ تُضَارُونَ فِي رُؤْيَةِ رَبِّكُمْ يَوْمَئِذٍ ، إِلاَّ كَمَا تُضَارُونَ فِي رُؤْيَتِهِمَا - ثُمَّ قَالَ - يُنَادِي مُنَادٍ لِيَذْهَبْ كُلُّ قَوْمٍ إِلَى مَا كَانُوا يَعْبُدُونَ . فَيَذْهَبُ أَصْحَابُ الصَّلِيبِ مَعَ صَلِيبِهِمْ ، وَأَصْحَابُ الأَوْثَانِ مَعَ أَوْثَانِهِمْ ، وَأَصْحَابُ كُلِّ آلِهَةٍ مَعَ آلِهَتِهِمْ حَتَّى يَبْقَى مَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ مِنْ بَرٍّ أَوْ فَاجِرٍ ، وَغُبَّرَاتٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ ، ثُمَّ يُؤْتَى بِجَهَنَّمَ

تُعْرَضُ كَأَنَّهَا سَرَابٌ فَيُقَالُ لِلْيَهُودِ مَا كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ قَالُوا كُنَّا نَعْبُدُ عُزَيْرَ ابْنَ اللَّهِ . فَيُقَالُ كَذَبْتُمْ لَمْ يَكُنْ لِلَّهِ صَاحِبَةٌ وَلاَ وَلَدٌ فَمَا تُرِيدُونَ قَالُوا نُرِيدُ أَنْ تَسْقِيَنَا ، فَيُقَالُ اشْرَبُوا فَيَتَسَاقَطُونَ فِي جَهَنَّمَ ثُمَّ يُقَالُ لِلنَّصَارَى مَا كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ فَيَقُولُونَ كُنَّا نَعْبُدُ الْمَسِيحَ ابْنَ اللَّهِ . فَيُقَالُ كَذَبْتُمْ لَمْ يَكُنْ لِلَّهِ صَاحِبَةٌ وَلاَ وَلَدٌ ، فَمَا تُرِيدُونَ فَيَقُولُونَ نُرِيدُ أَنْ تَسْقِيَنَا . فَيُقَالُ اشْرَبُوا . فَيَتَسَاقَطُونَ حَتَّى يَبْقَى مَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ مِنْ بَرٍّ أَوْ فَاجِرٍ فَيُقَالُ لَهُمْ مَا يَحْبِسُكُمْ وَقَدْ ذَهَبَ النَّاسُ فَيَقُولُونَ فَارَقْنَاهُمْ وَنَحْنُ أَحْوَجُ مِنَّا إِلَيْهِ الْيَوْمَ وَإِنَّا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِيَلْحَقْ كُلُّ قَوْمٍ بِمَا كَانُوا يَعْبُدُونَ . وَإِنَّمَا نَنْتَظِرُ رَبَّنَا – قَالَ – فَيَأْتِيهِمُ الْجَبَّارُ . فَيَقُولُ أَنَا رَبُّكُمْ . فَيَقُولُونَ أَنْتَ رَبُّنَا . فَلاَ يُكَلِّمُهُ إِلاَّ الأَنْبِيَاءُ فَيَقُولُ هَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ آيَةٌ تَعْرِفُونَهُ فَيَقُولُونَ السَّاقُ . فَيَكْشِفُ عَنْ سَاقِهِ فَيَسْجُدُ لَهُ كُلُّ مُؤْمِنٍ ، وَيَبْقَى مَنْ كَانَ يَسْجُدُ لِلَّهِ رِيَاءً وَسُمْعَةً ، فَيَذْهَبُ كَيْمَا يَسْجُدَ فَيَعُودُ ظَهْرُهُ طَبَقًا وَاحِدًا ، ثُمَّ يُؤْتَى بِالْجَسْرِ فَيُجْعَلُ بَيْنَ ظَهْرَيْ جَهَنَّمَ » . قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا الْجَسْرُ قَالَ « مَدْحَضَةٌ مَزِلَّةٌ ، عَلَيْهِ خَطَاطِيفُ وَكَلاَلِيبُ وَحَسَكَةٌ مُفَلْطَحَةٌ ، لَهَا شَوْكَةٌ عُقَيْفَاءُ تَكُونُ بِنَجْدٍ يُقَالُ لَهَا السَّعْدَانُ ، الْمُؤْمِنُ عَلَيْهَا كَالطَّرْفِ وَكَالْبَرْقِ وَكَالرِّيحِ وَكَأَجَاوِيدِ الْخَيْلِ وَالرِّكَابِ ، فَنَاجٍ مُسَلَّمٌ وَنَاجٍ مَخْدُوشٌ وَمَكْدُوسٌ فِي نَارِ جَهَنَّمَ ، حَتَّى يَمُرَّ آخِرُهُمْ يُسْحَبُ سَحْبًا ، فَمَا أَنْتُمْ بِأَشَدَّ لِي مُنَاشَدَةً فِي الْحَقِّ ، قَدْ تَبَيَّنَ لَكُمْ مِنَ الْمُؤْمِنِ يَوْمَئِذٍ لِلْجَبَّارِ ، وَإِذَا رَأَوْا أَنَّهُمْ قَدْ نَجَوْا فِي إِخْوَانِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا إِخْوَانُنَا كَانُوا يُصَلُّونَ مَعَنَا وَيَصُومُونَ مَعَنَا وَيَعْمَلُونَ مَعَنَا . فَيَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى اذْهَبُوا فَمَنْ وَجَدْتُمْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ دِينَارٍ مِنْ إِيمَانٍ فَأَخْرِجُوهُ . وَيُحَرِّمُ اللَّهُ صُوَرَهُمْ عَلَى النَّارِ ، فَيَأْتُونَهُمْ وَبَعْضُهُمْ قَدْ غَابَ فِي النَّارِ إِلَى قَدَمِهِ وَإِلَى أَنْصَافِ سَاقَيْهِ ، فَيُخْرِجُونَ مَنْ عَرَفُوا ، ثُمَّ يَعُودُونَ فَيَقُولُ اذْهَبُوا فَمَنْ وَجَدْتُمْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ نِصْفِ دِينَارٍ فَأَخْرِجُوهُ . فَيُخْرِجُونَ مَنْ عَرَفُوا ، ثُمَّ يَعُودُونَ فَيَقُولُ اذْهَبُوا فَمَنْ وَجَدْتُمْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ مِنْ إِيمَانٍ فَأَخْرِجُوهُ . فَيُخْرِجُونَ مَنْ عَرَفُوا » . قَالَ أَبُو سَعِيدٍ فَإِنْ لَمْ تُصَدِّقُونِي فَاقْرَءُوا (

إِنَّ اللَّهَ لاَ يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِنْ تَكُ حَسَنَةً يُضَاعِفْهَا ) « فَيَشْفَعُ النَّبِيُّونَ وَالْمَلاَئِكَةُ وَالْمُؤْمِنُونَ فَيَقُولُ الْجَبَّارُ بَقِيَتْ شَفَاعَتِي . فَيَقْبِضُ قَبْضَةً مِنَ النَّارِ فَيُخْرِجُ أَقْوَامًا قَدِ امْتُحِشُوا ، فَيُلْقَوْنَ فِي نَهَرٍ بِأَفْوَاهِ الْجَنَّةِ يُقَالُ لَهُ مَاءُ الْحَيَاةِ ، فَيَنْبُتُونَ فِي حَافَتَيْهِ كَمَا تَنْبُتُ الْحِبَّةُ فِي حَمِيلِ السَّيْلِ ، قَدْ رَأَيْتُمُوهَا إِلَى جَانِبِ الصَّخْرَةِ إِلَى جَانِبِ الشَّجَرَةِ ، فَمَا كَانَ إِلَى الشَّمْسِ مِنْهَا كَانَ أَخْضَرَ ، وَمَا كَانَ مِنْهَا إِلَى الظِّلِّ كَانَ أَبْيَضَ ، فَيَخْرُجُونَ كَأَنَّهُمُ اللُّؤْلُؤُ ، فَيُجْعَلُ فِي رِقَابِهِمُ الْخَوَاتِيمُ فَيَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ فَيَقُولُ أَهْلُ الْجَنَّةِ هَؤُلاَءِ عُتَقَاءُ الرَّحْمَنِ أَدْخَلَهُمُ الْجَنَّةَ بِغَيْرِ عَمَلٍ عَمِلُوهُ وَلاَ خَيْرٍ قَدَّمُوهُ . فَيُقَالُ لَهُمْ لَكُمْ مَا رَأَيْتُمْ وَمِثْلُهُ مَعَهُ».(١١٥)

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا لەرۆژی دوا رۆژدا، کە ناسراوە بەرۆژی ژینەوەو قیامەت، خودای خۆمان دەبینین، یانا؟ فەرمووی: (بەلیٚ دەیبینن) لەپاشدا فەرمووی: (ئایا بەرۆژی نیوەڕۆ ئاسمان سایەقەی سامالّ بیٚو دەنك هەوری پێوە نەبیٚ، لەبینینی خۆردا هیچ ئەرکیٚ، زەحمەتیٚ دەبینن، یاخود ئایا شەوی چواردەی مانگ کە ئاسمان سایەقەی ساف بیٚ، هیچ هەورو تەمو مژی نەبیٚ، بۆ چاوپێکەوتنی مانگ هیچ ئەرکیٚ دەکێشن؟ گوتیان: نەخەیر، ئەی پێغەمبەری خودا! بەلّکوو لەبارودۆخی وادا، خۆر یا مانگ بە ئاسانی دەبینین.

فەرمووی: دەی بەبیٚ ئەرك‌و کێشەو بەرە، وەك چۆن لەجیهانا ئەم دوانە، لەم کاتانەدا بە ئاسانی دەبینن، لەرۆژی دوا رۆژیشدا، بەچاوی سەر بەخۆشی‌و بە ئاسانی خودای خۆتان دەبینن، کە خودایەکی پاك‌و پیرۆزو گەورەیە، جا کە رۆژی دوا رۆژ هات، بانگکەری بانگەواز هەلّ دەداو جاڕ دەدا: هەموو گەلیٚ لەجیهاندا چی پەرستووە با شوێنی ئەوە بکەویٚ، ئیتر ئەوانەی کە

(١١٥) التاج الجامع للأصول بالكوردى. المجلد الخامس رقم/٥٧٠٣. تسلسل/١٣١.

بتو ئەم جۆرە شتانەیان پەرستووەو جگە لەخودا شتێکی تریان پەرستووەو پەیکەری بەردو داریان کردووە بەخوداو پەرستوویانن، هەموو دەکەونە ناو دۆزەخەوە، هەتا دەمێنێتەوە ئەوانەی کە خودایان پەرستووە: لە چاكو لەخراپو لە پاشماوەی خاوەن نامەکان، کە ناسراون بە ئەهلی کیتاب، ئەوجا بانگی جوولەکەکان دەکەنو پێیان دەڵێن: ئێوە کێتان دەپەرست؟ دەڵێن: عوزەیری کوڕی خودامان دەپەرست. پێیان دەڵێن: درۆدەکەن، خودا نە هاوسەرو نە منداڵی بوووەو نە هاوسەرو منالی دەبێ، دەی چیتان دەوێ؟ دەڵێن: ئەی خودایە! توونیمانە، ئاومان پێ بدە بیخۆینەوە، پێیان دەڵێن: بچن هۆ بۆ ئەوێوە ئاو بخۆنەوە، جا بەرەو ئاگرر خڕیان دەکەنەوەو دەیانتەپێننە ناوی، ئاگرەکە لەدوورەوە دەڵێی بەردە خوێیەو لەدوورەوە لەوان وایە کە ئەوە ئاوە، بەڵام ئاو نییە، بەڵکوو ئاگرە، بڵێسەو نێڵە نێڵو کڵپە کڵپی لەگەڵ خۆیدا شەڕدەکا، ئیتر هەموویان دەکەونە ناوی، ئەمجا بانگی فەلەودیانەکان دەکەنو پێیان دەڵێن: ئەی ئێوە چیتان دەپەرست؟ دەڵێن: عیسای کوڕی خودامان دەپەرست، پێیان دەفەرموون: درۆدەکەن خودا نە هاوسەری هەیەو نە منداڵ، وەك لە قورئاندا فەرموویەتی: {وَأَنَّهُ تَعَالَى جَدُّ رَبِّنَا مَا اتَّخَذَ صَاحِبَةً وَلَا وَلَداً – الجن : ٣/٧٢}.

دەی چیتان دەوێ؟ دەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە! تینومانە ئاومان بدەرێ بیخۆینەوە، پێیان دەڵێن: بڕۆن بۆ ئەوێوە لەوێ ئاو بخۆنەوە، ئەوجا مۆڵیان دەدەن بەرەو دۆزەخ، ئاگرەکە لەلای ئەوانەوە دەڵێی بەردە تراویلکەیە لەبەرئەوە لەوان وایە ئاوە، بڵێسەکەی لەگەڵ خۆیدا کۆڵەکە دەدا! دەتەپێنە ناو ئاگرەکەوە، تا دواکەسیان، هەتا بەس ئەوانە دەمێننەوە کە هەر خودای گەورەیان پەرستووە بە چاكو بەخراپیانەوە، ئەوجا پەروەردگاری هەردوو جیهان کە پاكو پیرۆزو بێ خەوشو بێگەردو گەورەیە، لەسەر شێوەیێ دێ بۆ

لایان، کە لەو شێوەیەدا نایناسنەوە دەفەرموێ: ئەوە چاوەڕوانی چی دەکەن؟ ئەوەتانێ هەموو میللەتێ چی پەرستووە شوێنی ئەوە کەوتووە، جا دەڵێن: ئەی خودایە! خۆت ئاگات لێیە کە ئێمە لەجیهاندا لەبەر خاتری تۆ دەستمان لە کەسوکارو ئازیزانی خۆمانو لە خەڵکانی تریش هەڵگرتو هاوڕێتیمان نەدەکردن، لە کاتێکدا کە زۆر کارمان پێیان هەبوو، کەوابوو فریامان بکەوە، لەم سەخڵەتییە رزگارمان بکە، خودایش دەفەرموێ: من خودای ئێوەم، دەڵێن: پەنا دەگرین بەخودا لەتۆ، ئێمە هیچ هاوبەشو هاوەڵ دانانێین بۆ یەزدانی پاك، تا دووجار، یا سێجار، ئەم گفتوگۆیە دووبارە دەکەنەوە، تەنانەت هەندێکیان خەریك دەبێ، لەئایین وەربگەڕێن، چونکە هەڵوێست ئەوەندە ئاڵۆزو شلۆق دەبێ، جا خودا دەفەرموێ: ئایا لەنێوانی ئێوەو ئەوا هیچ نیشانەیەك هەیە کە بەو نیشانەیە بیناسنەوە؟ دەڵێن: بەڵێ: هەیە، ئەوکاتە خودا دەرووییان لێ دەکاتەوە، ئەنجا هەموو موسوڵمانێ کوڕنووشی بۆ دەبا، وەلێ ئەوانەی کە لەجیهاندا بۆ خۆقوتارکردنو بۆ چاوەو رووپامایی‌و ناوبانگ کوڕنووشیان بردووە دەمێننەوەو لەپاش ئەوان دەچن کە کوڕنووش ببەن بۆ خودا، بەلام لەخوداوە پشتیان رەق دەبێو دەبێ بەیەك پارچە تەختەو هەرچی هەوڵ دەدەن ناتوانن کوڕنووش ببەن، لەپاشا موسوڵمانەکان سەر لەکوڕنووش هەڵدەبڕن دەبینن خودا چووەتەوە سەر شێوە راستەقینەکەی خۆی‌و دەفەرموێ: من خودای ئێوەم، دەڵێن: بەڵێ تۆ خودای ئێمەیت، جا شوێنی دەکەون، ئەوجا پردی سیرات بەسەر پشتی دۆزەخدا هەڵ دەدرێ، ئەمجا کاتی تکاکردن دادێ، ئەوانەیشی کە تکا دەکەن ئەوکاتە خۆش خۆش هەردەڵێن: خودایە! بەخۆشی، خودایە! بە بێوەی، خودایە! بە سەلامەتی، گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! دەبێ ئەو پردە چۆن پردێ بێ؟ فەرمووی: پردێکی خزو خلیسکانە، چنگاڵو قولاپو

دڕکـە ئاسـنینەی زۆری پێوەیـە، ئـەو جـۆرە دڕکـە لەنەجـد زۆرە پێـی دەڵـێن: حوشـتر خـوار (ئـەبو سـەعید دەفـەرموێ: ژنەوتوومـە کـە ئـەو پـردە لـەموو بـاریکترە، لـە شمـشێر تیـژترە). خۆشەویـست (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: جـا دەسـت دەکـرێ بـە رابـواردنو گـوزەرکردن بەسـەر پردەکـەدا، موسوڵمانی وا هەیە تیژ تێ دەپەڕێ بـە چاو تترووکانـێ بەسەریدا دەپەڕێتـەوە، هەیە وەك برووسکەو چەخماخە، هەیە وەك بـای تیـژو خێـرا، هەیـە وەك مـەل فڕکەی لێ دەکا، هەیە وەك ماینی رەسەنی چاك بەسەریدا تێی دەتەقێنێ، هەیـە وەك سواری وشتری باش تـێ دەپـەڕێ، جا هەیـە بەساخو بەسـەلامەتی قوتـاری دەبـێ، هەیـە بـە زامـاریو رووشـاوی بـەرەڵای دەکـەنو رزگـاری دەبـێ، هەیـشە دەتەپێتـە نـاو دۆزەخـەوە، موسـوڵمانان ئـەم سـێ چەشـنەیان هەیـە، جـا جـۆری یەکـەمو جـۆری دووەمیـان، کـە خۆیـان لـە ئـاگری دۆزەخ رزگـاردەبنو لـە دەربـازبوونی خۆیـان دڵنیـادەبن، ئەوجەلـە بـیری بـرادەرە موسـوڵمانەکانیان دەکەنەوە، کەوان لەناو دۆزەخدا، بەوکەسە کە گیانی منـی بەدەسـە، کـە خـودای تاقو تـەنیای بـێ کەسـە، وەك چۆن ئێـوە لەجیهانـدا ئەگـەر کارێکی ئاڵۆزاوتـان هەبێ، سەری لێ دەرنەکەن، بەکوڵو بەدڵ لەخودا دەپاڕێنەوە کە رووی راستیتان لەو کارەدا بۆ دەربخات، ئەوانیش لەو رۆژەدا ئاوا پڕبەدڵ لـەخودا داوادەکـەن کـە رەحم بەحاڵی پەرێشانی ئەو برادەرانەیان بکا، کەوان لەناو دۆزەخدا، تکایان بـۆ دەکەن، باسی چاکەکانیان دەکەن، تـا خـودا بـەهۆی ئـەو چاکانەیانەوە رەحمیـان پێ بکا، دەفەرموون: ئەی پەروەردگاری ئێمە! خۆت ئاگاداری کـە ئـەوانیش وەك ئێمە رۆژوویان دەگرت، نوێژیان دەکرد، حەجیان دەکـرد، ئـەم چـاکەیان دەکـردو ئەو چاکەیان دەکـرد، هـەتا خـودا تکاکـەیان گـیرا دەکـاو پێیـان دەفـەرموون: کـێ دەناسن بڕۆن لـەدۆزەخ دەریـان بهێـنن، جا لەبەرئـەوەی ئـەوان یـەزدان پەرسـت

بوونو شێوەی یەزدان پەرستیش خودا بۆخۆی قەدەغەی کردووە لە ئاگری دۆزەخ کە بیخوات‌و شێوەیان تێك بدا، کە دەچن بۆ لایان بەشێوەیاندا باش دەیانناسنەوەو خەڵکێکی زۆر لەدۆزەخ دەردەهێنن، هی وایان هەیە تا نیوەی پووزی ئاگر گرتوویەتیەوە، هەیانە تا هەردوو ئەژنۆی دەگرێ، ئەوجا دەچنەوە خزمەتی خودا عەرزی دەکەن: ئەی خودایە! ئەوانەی کەتۆ فەرمووت پێمان دەرمان هێنان لەئاگر، دەفەرموێ: بڕۆنەوە لەدڵی هەرکەسێکا بەقەد سەنگی دینارێ چاکەتان بینی دەری بهێنن، دەچنەوە خەڵکێکی گەلێ زۆری تر دەردەهێننو دیسان دەچنەوە خزمەتی‌و عەرزی دەکەنەوە: ئەوانەی تریشمان لەسەر فەرمانی تۆ لەئاگر دەرهێنا، دەفەرموێ: دیسانەوە بگەڕێنەوە ئەوەی کە سەنگی نیو دینار خێرتان لەناو دڵیدا بینی دەری بهێنن، هەمدیسان خەڵکێکی زۆری تر دەردەهێننو دەڵێن: خودایە! وەك تۆ فەرمووت پێمان ئەوانەی تریشمان هێنایە دەرەوە، دەفەرموێ: هەمدیسانەوە بگەڕێنەوە ئەوەی بەقەد تۆزقاڵێ، بەقەد ئەو تۆزو گەردەی کە لەناو تیشکی خۆری ناو دەلاقەدا هەیە، خێرتان لەناو دڵیدا دۆزییەوە زیاد لەئیمان دەری بهێنن، هەمدیس دەچنەوە خەڵکێکی زۆری تر دەردەهێننو دەڵێن: خودایە! هیچمان تیادا نەهێشت، دۆزەخمان لەوانە پاك کردەوە بەقەد تۆزقاڵێ چاکە لەناو دڵیدابێ.

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەگەر بۆ راست‌و دروستی ئەم فەرموودەیە، دەتانەوێ لەمن دڵنیابن، حەز دەکەن فەرموون، ئەم ئایەتە بخوێننەوە کە دەفەرموێ: {إِنَّ اللَّهَ لاَ يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَاعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْراً عَظِيماً - النساء : ٤/٤٠}:

واتە: لەڕاستیدا خودا بەقەد مسقاڵە زەڕەیێ زۆرو ستەم لەکەس ناکا، سەنگی گەردێ، بەقەد باڵی مێشوولەیێ ناهەقی، ناڕەوایی، بێ دادی، لەهیچ شتێ




ناکا، گریمان کەسێ بەقەد سەنگی گەردو کێشی گەردیلەیێ چاکەی هەبێ، لەلای خودا ون نابێ، وە خودا بۆی دەکا بەچەند قاتو، بە میهرەبانی خۆی پاداشی باشی گەورەی خاوەنەکەی دەداتەوە!).

ئەوجا کوووورەی رەحمەتو سۆزی خودای میهرەبان، بەجارێ دەجۆشێ، ئەو زاتە بالاّ دەستو شکۆمەندە دەفەرموێ: فریشتەکان تکای خۆیان کرد، موسوڵمانو بڕواداران‌و خاترداران – هەرکەسەیان بەپێی پایەو پلەی خۆیان – تکای خۆیان کرد، مایەوە سەرخۆم، مایەوە سەر خەلاّتی هەرە مەزنی خودا خۆی، کە لەهەمووو بەڕەحمێ بەڕەحمترە، دیارە کە خەلاّتەکەشی لەهی هەموان گەورەترو زۆرترە!

جا خودای گەورەو میهرەبان چنگێ لە دانیشتوانی ناو دۆزەخ دەگرێ، بەو چنگە کۆمەڵێکی زۆر زۆری لێ دەردەهێنێ، کە جگە لەباوەڕ بەخودا، ئەوەی پێی بگوترێ ئەو کۆمەڵە، قەت چاکەیان نەکردووە، لەناو دۆزەخا بوون بە کڵۆی خەڵووز، ئەوجا هەڵیان دەداتە ناو رووباری ژیانەوە، کەوا لەناو دەرووی بەهەشتا، ئیتر وەك چۆن تۆمەی ناو لیوەی باران، کە لافاو هەڵی دەگرێو دەیهێنێ، تا لەکوێی ئاوەکەدا، لەپاڵ بەردێکا، یا لەپاڵ دارێکا، دەگیرسێتەوە، ئەوسا خێرا سەوز دەبێ، ئەوانیش ئاوا بەو رەنگە زوو بەزوو لەمبەرو ئەوبەری روباری ژیانەوە دەڕوێنەوەو گورج سەر دەردەهێنن! دەق ئاوا بەبێ کەم‌و زیاد، خۆ دەبینن لەکاتی شینایی وادا، هی بەر سێبەر، رەنگی سپیواشە، بەلاّم هی بەر خۆر زەرد باوو سەوزکەلەو بەشەوقە!

یاران (رەزای خودایان لێ بێ) عەرزیانکرد: قوربان! دیارە لەدەشتو دەر، شوانیت کردووە، بۆیە وا شارەزای لەم جۆرە بوارو دیاردەیانە! خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوجا وەك چۆن مرواری لە سەدەف

دێته دەرەوە، ئەوانیش ئاوا پاك‌و بێگەرد لە چۆمەكە دێنە دەرێ، پارچە خشڵێ، وەك نیشانە، وا لەگەردنیاندا، نیشانەو مۆری یەكتایی خودایە، خەڵكی ناو بەهەشت بەو ناونیشانەیە دەیان ناسنەوەو پێیان دەڵێن: ئەمانە ئازادكراوەكانی خودای گەورەن، ئەمانە ئەوانەن كەخودا بەخواستی خۆی خستوونیەتە بەهەشتەوە، بەبێ ئەوەی كە كردەوەیەكی باشیان كردبێ، یا چاكەیەكیان لەپێش خۆیانەوە رەوانەكردبێ، لەدواییدا، خودا دەفەرموێ: بچنە ناو بەهەشت، هەرچیتان بەرچاوكەوت بۆ خۆتان، دەڵێن: ئەی خودایە! ئای لەم بەشە باشە، شتی وا نایابت بە كەسی تر نەداوە، دەفەرموێ: لەمەیش باشترم لەلایە بۆ ئێوە، دەڵێن: ئەی خودایە! دەبێ لەمە باشتر چی بێ! دەفەرموێ: رەزامەندی خۆمە. ئیتر هەتا هەتایە لێتان عاجز نابم).

## (٨٢) بَابُ: إِثْبَاتُ الشَّفَاعَةِ وَ إِخْرَاجُ الْمُوَاحِّدِينَ مِنَ النَّارِ
## تكاكردن راستەو بەبەڵگە چەسپاوە، تاكپەرستانیش كەهەر خودایان بەخودا زانیوە، لەئەنجاما لەدۆزەخ دەردەكرێن

١١٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (يَدْخُلُ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ وَأَهْلُ النَّارِ النَّارَ ثُمَّ يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى أَخْرِجُوا (مِنْ النَّارِ) مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ فَيُخْرَجُونَ مِنْهَا قَدْ اسْوَدُّوا فَيُلْقَوْنَ فِي نَهَرِ الْحَيَاةِ فَيَنْبُتُونَ كَمَا تَنْبُتُ الْحِبَّةُ فِي جَانِبِ السَّيْلِ أَلَمْ تَرَ أَنَّهَا تَخْرُجُ صَفْرَاءَ مُلْتَوِيَةً). [١١٦]

لەئەبوسەعیدی خودریەوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەهەشتی یەكان دەچنە بەهەشت‌و دۆزەخییەكانیش دەچنە ناو

---

[١١٦] تەجرید/١، ژمارە: ٢١. بخاری: ٢٢، ٤٥٨١. مسلم: ١٨٤ = شیحا: ٤٥٦، ٤٥٨.

دۆزەخ، لەپاشا خوای گەورە بەفریشتەکان دەفەرموێ: هەرکەسێ بەقەد سەنگی دەنکە خەرتەلەیێ ئیمانو باوەڕ لەناو دڵی دا بووبێ لەدۆزەخ دەریکەن، جاکاتێ دۆزەخییەکان لەدۆزەخ دێنە دەرەوە بوون بەسووتە مەرۆو رەش رەش بوون، ئەوسا هەڵیان دەدەنە ناو رووباری ژیانەوە، جا وەك تۆمەی قەراخ سێڵاو خێرا سەوز دەبنەوەو ئەژێنەوە، دیارە دیوتانە کەکاتێ تۆمەدەتەقێو چەکەرە دەکا چەندە گەشو زەرد باوو ناسكو نازدارەو بەرە بەرە بەدەم سروەی باوە شنەشن دەکاو کەروێشکە دەکا، ئەوانیش کەلەرووبارەکە دێنە دەرەوە ئاوا ناسكو نازدارو بە کەیفن!). : (تاج/٥ ل/٤٠٠ ز/٢٣١) + (ب/١٠ ز/١٣٢ ل/٤٢٦ ف/٢ = تاج/٥ ز/١٣٢ ژ/٥٧٠٥ ل/٧٢١ چ/٤).

## راڤەو شیکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوەیە کەباوەڕ بەهێزو بێ هێزی هەیە، وەئەوەی لەسەر موسوڵمانەتی بمرێ زوو یادرەنگ دەچێتە بەهەشت، هەروەك ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کەمەعنەویات وەك باوەڕو کردار سەنگو کێشیان هەیە، لەم سەردەمەدا تەرازوو و پێوەر چەشنی زۆرو سەیری هەیە، مەرج نییە کەهەر شتی تەندار بکێشرێ، شتی بێ تەنیش (وەك کارەبا، موقناتیسی، پلەی سەرماو گەرما، رادەی شێ، خاسییەتو تایبەتمەندیی شت، ئەمانە هەموو گەرچی ماددەو جەوهەر نینو عەرەضو رووکەشن، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا هەریەکێ لەمانە) پێوەری خۆی هەیە، ئیتر تەعبیر لەو حەقیقەتە بەهەر وشەیێ بێ دەبێ، ناوی دەنێ ی تەرازوو، یان مەتر، ئەوە لەجەوهەری بابەتەکە هیچ ناگۆڕێ!

نابینی لەرەی دەنگ، تێریو کاڵی رەنگ، خۆشیو ناخۆشیو چۆنێتیو چەندێتی ی تامو بۆ، ئەمانە هەموو شەپۆلو مەوجەی خۆیان هەیە، ئێستا

بەپێوەری تایبەتی، ئەو شەپۆڵو لەرانە لەیەك جیا دەكرێنەوە، لەسەر شەریتو نەوار تۆمار دەكرێنو هەركاتێ ویستیان ئەو دەنگو رەنگە وەك خۆیان دووبارە دەكەنەوە.

حەز دەكەم ئەم راستییە تۆمار بكەم: ئێمە كەموسوڵمانین باوەڕمان وایە كەئیسلام تاقە ئایینی راستو دروستی خوایە، وەئەوەی پێویست بێ بۆ پیادە كردنو گەشە پێكردنو بەردەوام بوونی ئەم ئایینە خودای گەورە فەراهەمی هێناوە، جا لەسەر ئەم بنیاتە خودای گەورە لەژێر چاودێری خۆیدا، لەپێش پیادە كردنی ئیسلام دا، ئەم زمانی عەرەبییەی كەقورئانو حەدیثی پێ تۆمار كراوە، پەروەردە كردووە، ئەوەتا بەرێكو پێكی تەعبیری لەمەبەستەكانی خودا پێ دراوەتەوە، ئەمەش بەباوەڕی من بەشێكە لەئیرهاص، ئیرهاصیش: كارێكی نائاسایی یە لەپێش هاتنی لەدایكبوونی پێغەمبەرێك دا روو دەدا، هەتا ببێ بەنیشانەی دروستی ی پەیامەكەی، یەكێ لەو بنەمایانەی كەبوون بەهۆی سەرەكی پاراستنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بنەمای تەوفیقو پشتگیریی خودایی یە، راستە كەپێویستە لەسەر موسوڵمان لەهەوڵو كۆششو كارو كردەوە سارد نەبنەوەو ئەوەی هۆی سەربەرزیی دینو دنیایە هەوڵی بۆ بدەن، بەڵام تەوفیقی خوایی سەرو هەموو ئەمانەیە، دەنا كارەساتی گەورەی وا بەسەر میللەتی ئیسلام دا هاتووە ئەگەر پشتگیریی خوایی نەبوایە ئێستا ناوی ئیسلام سڕابۆوە.

ئەمەیش دەقی ژمارە (٨٧)ی پوختەی موسلیمە، كە لایەنێكی تری ئەم فەرموودەیە روون دەكاتەوە:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودو سڵاوی خودای گەورەی لەسەر بێ) فەرمووی: ئەو دۆزەخییانەی كە بە

ئێجگاری دۆزەخین، ئەوانە هەتایە لەسەر ئەوحاڵە شڕە کە باسکراوە دەمێننەوە، نە ئەوەتە بۆخۆیان بمرنو بەمردن لە ئێشو ئازاری دۆزەخ رزگاریان ببێ، نە ئەوەتە بەخۆشیو ئاسوودەیی بۆخۆیان بژین. بەڵام ئەو دۆزەخییانەی کە خاوەن باوەڕنو بەهۆی تاوانەوە. یا فەرمووی: بەهۆی گوناهەوە، دووچاری ئاگری دۆزەخ بوون، ئەوانە لەپاش ماوەیێ لەسەر فەرمانی خودا، ئاگرەکە بەمراندن دەیانمرێنێ، هەتا دەبن بەخەڵووز، تا ماوەی ناو دۆزەخیان تەواودەبێ، بۆیە خودا خەویان لێ دەخا هەتا هەست بە ئێشو ئازاری زۆرو دوورو درێژ نەکەن، ئەوکاتە رێگای تکاو تکاکاری دەدرێ، لاشەکانیان لەناو دۆزەخا، لێرەو لەوێ، وەك پارچە گەمرە سەپاون بەسەریەکاو کۆمەڵ کۆمەڵ بوون بە سرەو پەستراون بەسەریەکا، لەسەر ئەوحاڵە تەختە تەختەو کۆمەڵ کۆمەڵ دەیانهێننو، لەگوێ جۆگاو قەراخ رووبارەکانی بەهەشت وەك شمەك هەڵیان دەرێژنو دەڵێن: ئادەی ئەی بەهەشتییەکان! ئاو بکەن بەسەریاندا، ئیتر بەوئاوە وەك تۆمەی ناو لیوەو ئاوماڵك دەژێنەوەو بەرە بەرە شین دەبنەوەو زیندوو زیت دەبنەوە).

هەندێ لە ئامادەبووانی ناو کۆڕەکە فەرمووی: دەڵێی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆر لە دەشتو دەر ژیاوە، بۆیە وا بەم شێوەیە شارەزایی چاکی لە چۆنێتیی حاڵی کەژو کێو هەیە! (تاج/١٠، لاپەڕە: ١٢٧، زنجیرە: ١٣٢، ژمارەی فەرمووده: ٤. چاپی یەکەم = تاج-٥ ژ-٥٧٠٦ ج-٤).

## (٨٣) باب: آخر أهل النار خُرُجاً
## ئاخر كەس كە لەدۆزەخ دەردەچێ

١١٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- «إِنِّى لأَعْلَمُ آخِرَ أَهْلِ النَّارِ خُرُوجًا مِنْهَا وَآخِرَ أَهْلِ الْجَنَّةِ دُخُولاً الْجَنَّةَ رَجُلٌ يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ حَبْوًا فَيَقُولُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى لَهُ اذْهَبْ فَادْخُلِ الْجَنَّةَ فَيَأْتِيهَا فَيُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهَا مَلأَى فَيَرْجِعُ فَيَقُولُ يَا رَبِّ وَجَدْتُهَا مَلأَى. فَيَقُولُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى لَهُ اذْهَبْ فَادْخُلِ الْجَنَّةَ - قَالَ - فَيَأْتِيهَا فَيُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهَا مَلأَى فَيَرْجِعُ فَيَقُولُ يَا رَبِّ وَجَدْتُهَا مَلأَى فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ اذْهَبْ فَادْخُلِ الْجَنَّةَ فَإِنَّ لَكَ مِثْلَ الدُّنْيَا وَعَشَرَةَ أَمْثَالِهَا أَوْ إِنَّ لَكَ عَشَرَةَ أَمْثَالِ الدُّنْيَا - قَالَ - فَيَقُولُ أَتَسْخَرُ بِى - أَوْ أَتَضْحَكُ بِى - وَأَنْتَ الْمَلِكُ » قَالَ لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- ضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ. قَالَ فَكَانَ يُقَالُ ذَاكَ أَدْنَى أَهْلِ الْجَنَّةِ مَنْزِلَةً.[١١٧]

ئەمە دەقى ئەم فەرموودەيەيە، لە موختەصەرى صەحيحى موسليما، لە ژمارە: ٨٨ لەبەرگى يەكەم، گەرچى ئەمەى وا لەم كتێبەدا دەقى ژمارە: (٦٥٧١)ى صەحيحى بوخارييە.

ئەنەسى كوڕى ماليك (ڕەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: ئيبنو مەسعوود (ڕەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: خۆشەويست (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (دواترين كەس كەدەچێتە بەهەشت، پياوێكە بە سكە خشكێ‌و چنگە كرێ‌و گاگۆڵكەو هەڵسوكەوت‌و پەلە پرووسكێ دەكەوێتە ڕێ هەتا خۆى لە دۆزەخ ڕزگار بكا، بەدەم ڕێگەوە ئاگرەكە شاڵاو دەبا بۆ دەموچاوى‌و دەموچاوى هەڵ دەكوڕووزێنێ، ڕووى دەبێ بە سووتەمەڕۆ، كە لەئاگرى دۆزەخ ڕزگارى دەبێ خێسەيەكى لێ دەكاو دەڵێ: پيرۆزو بەفەڕە ئەو خودايەى كەمنى لەچنگى

[١١٧] بخارى: ٦٥٧١. مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٨٨. مسلم/شيحا: ٤٦٢.

تۆ قوتار کرد، ئای لەم بەشە باشەی کە خودا بەمنی داوە، لە پێشینان‌و پاشینان بەکەسی تری نەداوە، ئەوجا دەڕوانێ وا شێخەڵێ لەدوورەوە دیارە، دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! لەو درەختە نزیکم بکەرەوە، هەتا لەبن سێبەرەکەیدا وچانێ بگرم‌و لەئاوی کانیاوەکەی بنی نۆش بکەم! خودای باڵا دەست‌و شکۆمەندیش دەفەرموێ: ئەی نەوەی ئادەم! رەنگە ئەگەر ئەوەت پێ بدەم داوای شتی تریشم لێ بکەی؟ دەڵێ: خەیر، ئەی پەروەردگارم! بەڵێن‌و پەیمانی دەداتێ کە داوای هیچی تری لێ نەکا، خودایش بەزەیی پیادا دێتەوە، چونکە دەیبینێ ئۆقرەی لێ هەڵگیراوە بۆ سێبەرو بەهرەی ئەو شێخەڵە. ئەوجا دەیباتە بنی‌و لە سێبەرەکەیدا دادەنیشێ‌و لەئاوی کانیاوەکەی بنی دەخواتەوە، ئەوجا درەختێکی جوانتر لە درەختی پێشوو دەبینێ، لەپاش هەمان گوفتوگۆو بەڵێن‌و پەیمان، ئەویشی دەداتێ، دیسان درەختێکی جوانتر لە دوو درەختەکەی پێشوو لەبەردەم دەرگای بەهەشتا دەبینێ‌و داوای دەکاو، لەدوا هەمان رازو گلەیی‌و پەیمانی پێشوو ئەویشی دەداتێ، کە دەچێتە ئەوێ گوێی لەدەنگی بەهەشتییەکان دەبێ، دەڵێ: ئەی پەروەردگاری من! توخوا بمبەرە ژوورەوە بۆناو بەهەشت!

خودایش دەفەرموێ: ئەی ئادەمیزاد! چەندە ورکن‌و پەلپگرو بێبارو بێ پەیمانیت، بەچی لە کۆڵم دەبیتەوە، ئەرێ بەوە رازی دەبیت‌و بەرۆکم بەردەدەیت‌و کۆتایی بەداواکانت دەهێنی، ئەگەر بەقەد دوو ئەوەندەی جیهانت لەناو بەهەشتا پێ بدەم؟ ئەویش شتی وا بەزۆر دەزانێ، بۆیە دەڵێ: ئەی خودایە! خۆتۆ لای خۆت خوداوەندی هەردوو جیهانی کەچی مەزاق بەهەژارێکی داماوی وەك من دەکەی!!

ئیبنو مەسعوود پێکەنی‌و فەرمووی: بۆچی لێم ناپرسن کە لەبەرچی پێ دەکەنم؟ گوتیان: لەبەرچی پێدەکەنی؟ فەرمووی: پێغەمبەریش (دروودی

خودای لەسەر بێ) ئاوا پێکەنی، یارانیش عەرزیان کرد (ڕەزاو خۆشنوودی خودایان لێ بێ) فەرموویان پێی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! بەچی پێدەکەنی؟ فەرمووی: بەوە پێدەکەنم کە ئەو پیاوە عەرزی خودا دەکا: خۆتۆ لای خۆت خودای هەموانی، خاوەندی هەردوو جیهانی، کەچی مەزاق و شۆخی بەداماوێکی وەك من دەکەی، خاوەند سەیری لەم قسە قوتەی دێ و لە قسەکەی پێ دەکەنێ! خودایش دەفەرموێ پێی: من شۆخی و مەزاق بەتۆ ناکەم و مەبەستم ڕاستەقینەیە نەك گاڵتە، بەڵام کەس باڵا دەستی من نییە، ئەوەی ئارەزووی بکەم دەیکەم!). {تاج/١٠، لاپەڕە: ٥١٦، زنجیرە: ١٥٨، ژمارە: ٤ + ریاض صالحین/٤ — تاج-٥ ژ-٥٧٩٢ چ-٤— ٥/١٨٨٤، زنجیرە/٣٧٢}.

ئەمەیش دەقی وەرگەڕاوی ژمارە: (٦٥٧١)ی صەحیحی بوخارییە، لە (كتاب الرقائق، باب آخر أهل النار خروجاً):

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوکەسەی کەلەدوا هەموو کەسێ لەدۆزەخ دەردەچێ و لەدوا هەموو کەسێکیش دەچێتە بەهەشت دەزانم کێیەو حاڵی چۆنە، پیاوێکە بە گاگۆڵکە لەدۆزەخ دەردەچێ، خودای پیرۆزو گەورە دەفەرموێ: بڕۆ بچۆرە بەهەشتەوە ئەویش دەچێ بەڵام بە خەیاڵ وا دەزانێ کە لەبەهەشتا جێگەی نەماوەو هەمووی پڕبووەو جێگەی ئەو نابێتەوە، لەبەرئەوە دەگەڕێتەوەو دەڵێ: پەروەردگارم! چووم جێگەم دەست نەکەوت، هەموو پڕبوو، خودای پیرۆزو گەورەیش دەفەرموێ: بڕۆ بچۆرە بەهەشت، ئەویش دیسان دەچێتەوە، بەڵام دیسان وا بەخەیاڵیدا دێ کە بەهەشت پڕە، دیسانەوە دەگەڕێتەوەو دەڵێ: ئەی خودایە! دەبینم هەمووی پڕبووە. خودا پێی دەفەرموێ: من پێت دەڵێم بڕۆ بچۆرە بەهەشت، بەقەد دنیاو دە ئەوەندەی

تریش بۆ تۆ، یا دەفەرموێ: دە ئەوەندەی جیهان بۆ تۆ، پیاوەکەیش – لەدڵی خۆیدا – دەڵێ: من چەندجار چووم جێگە نەماوە، خودایش هەروا دەفەرموێ، وادیارە گاڵتەم پێ دەکا بۆیە – عەرزی خودا دەکا: تۆ پادشای هەمووانی بۆ گاڵتە بەداماوێکی وەك من دەکەی، یا فەرمووی: دەڵێ: کەتۆ پادشای بۆ تەڵفیسی بەمن دەکەی! عەبدوڵڵای راوی ئەم فەرموودەیە فەرمووی: سەیرم کرد پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە عەنتیکەیی قسەی ئەو پیاوە واپێکەنی ددانە پێشینەکانی وەدەرکەوتن، چونکە خودا ئەو هەموو خەڵاتەی دەکا، کەچی ئەویش ئاوا قسەی لەڕووە!، فەرموودەگێڕەوە دەفەرموێ: (جاران وا باوبوو: دەیانگوت: کە ئەم پیاوە لەناو بەهەشتییەکاندا پایەی لەهەمووان کەمترە!).

## (٨٤) باب: أدنى أهْلِ الجَنَّ مَنزِلَةً فِيهَا
## پلەنزمترین کەس لەبەهەشتا

١١٨- عَنْ أَنَسٍ - رضى الله عنه - قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ - صلى الله عليه وسلم - « يَجْمَعُ اللَّهُ النَّاسَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَقُولُونَ لَوِ اسْتَشْفَعْنَا عَلَى رَبِّنَا حَتَّى يُرِيحَنَا مِنْ مَكَانِنَا . فَيَأْتُونَ آدَمَ فَيَقُولُونَ أَنْتَ الَّذِى خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ ، وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ ، وَأَمَرَ الْمَلاَئِكَةَ فَسَجَدُوا لَكَ ، فَاشْفَعْ لَنَا عِنْدَ رَبِّنَا . فَيَقُولُ لَسْتُ هُنَاكُمْ - وَيَذْكُرُ خَطِيئَتَهُ وَيَقُولُ - ائْتُوا نُوحًا أَوَّلَ رَسُولٍ بَعَثَهُ اللَّهُ . فَيَأْتُونَهُ فَيَقُولُ لَسْتُ هُنَاكُمْ - وَيَذْكُرُ خَطِيئَتَهُ - ائْتُوا إِبْرَاهِيمَ الَّذِى اتَّخَذَهُ اللَّهُ خَلِيلاً . فَيَأْتُونَهُ ، فَيَقُولُ لَسْتُ هُنَاكُمْ - وَيَذْكُرُ خَطِيئَتَهُ - ائْتُوا مُوسَى الَّذِى كَلَّمَهُ اللَّهُ فَيَأْتُونَهُ فَيَقُولُ لَسْتُ هُنَاكُمْ ، فَيَذْكُرُ خَطِيئَتَهُ - ائْتُوا عِيسَى فَيَأْتُونَهُ فَيَقُولُ لَسْتُ هُنَاكُمْ ، ائْتُوا مُحَمَّدًا - صلى الله عليه وسلم - فَقَدْ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ فَيَأْتُونِى فَأَسْتَأْذِنُ عَلَى رَبِّى ، فَإِذَا رَأَيْتُهُ وَقَعْتُ سَاجِدًا ، فَيَدَعُنِى مَا شَاءَ اللَّهُ ، ثُمَّ يُقَالُ ارْفَعْ رَأْسَكَ ، سَلْ تُعْطَهْ ، وَقُلْ يُسْمَعْ

، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ . فَأَرْفَعُ رَأْسِي ، فَأَحْمَدُ رَبِّي بِتَحْمِيدٍ يُعَلِّمُنِي ، ثُمَّ أَشْفَعُ فَيَحُدُّ لِي حَدًّا ، ثُمَّ أُخْرِجُهُمْ مِنَ النَّارِ ، وَأُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ ، ثُمَّ أَعُودُ فَأَقَعُ سَاجِدًا مِثْلَهُ فِي الثَّالِثَةِ أَوِ الرَّابِعَةِ حَتَّى مَا بَقِيَ فِي النَّارِ إِلاَّ مَنْ حَبَسَهُ الْقُرْآنُ » . وَكَانَ قَتَادَةُ يَقُولُ عِنْدَ هَذَا أَىْ وَجَبَ عَلَيْهِ الْخُلُودُ .[١١٨]

**تەواوی واتای ئەم ژمارە (١١٨)میە لە ژمارە (١٢٠)دا لەدواوە دێت.**

**١١٩- حَدِّيث أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ:** « إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ مَاجَ النَّاسُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ فَيَأْتُونَ آدَمَ فَيَقُولُونَ لَهُ اشْفَعْ لِذُرِّيَّتِكَ. فَيَقُولُ لَسْتُ لَهَا وَلَكِنْ عَلَيْكُمْ بِإِبْرَاهِيمَ – عَلَيْهِ السَّلاَمُ – فَإِنَّهُ خَلِيلُ اللَّهِ. فَيَأْتُونَ إِبْرَاهِيمَ فَيَقُولُ لَسْتُ لَهَا وَلَكِنْ عَلَيْكُمْ بِمُوسَى – عَلَيْهِ السَّلاَمُ – فَإِنَّهُ كَلِيمُ اللَّهِ. فَيُؤْتَى مُوسَى فَيَقُولُ لَسْتُ لَهَا وَلَكِنْ عَلَيْكُمْ بِعِيسَى – عَلَيْهِ السَّلاَمُ – فَإِنَّهُ رُوحُ اللَّهِ وَكَلِمَتُهُ. فَيُؤْتَى عِيسَى فَيَقُولُ لَسْتُ لَهَا وَلَكِنْ عَلَيْكُمْ بِمُحَمَّدٍ –صلى الله عليه وسلم– فَأُوتَى فَأَقُولُ أَنَا لَهَا. فَأَنْطَلِقُ فَأَسْتَأْذِنُ عَلَى رَبِّي فَيُؤْذَنُ لِي فَأَقُومُ بَيْنَ يَدَيْهِ فَأَحْمَدُهُ بِمَحَامِدَ لاَ أَقْدِرُ عَلَيْهِ الآنَ يُلْهِمُنِيهِ اللَّهُ ثُمَّ أَخِرُّ لَهُ سَاجِدًا فَيُقَالُ لِي يَا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَأْسَكَ وَقُلْ يُسْمَعْ لَكَ وَسَلْ تُعْطَهْ وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ فَأَقُولُ رَبِّ أُمَّتِي أُمَّتِي. فَيُقَالُ انْطَلِقْ فَمَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ بُرَّةٍ أَوْ شَعِيرَةٍ مِنْ إِيمَانٍ فَأَخْرِجْهُ مِنْهَا. فَأَنْطَلِقُ فَأَفْعَلُ ثُمَّ أَرْجِعُ إِلَى رَبِّي فَأَحْمَدُهُ بِتِلْكَ الْمَحَامِدِ ثُمَّ أَخِرُّ لَهُ سَاجِدًا فَيُقَالُ لِي يَا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَأْسَكَ وَقُلْ يُسْمَعْ لَكَ وَسَلْ تُعْطَهْ وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ. فَأَقُولُ أُمَّتِي أُمَّتِي. فَيُقَالُ لِي انْطَلِقْ فَمَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ فَأَخْرِجْهُ مِنْهَا. فَأَنْطَلِقُ فَأَفْعَلُ ثُمَّ أَعُودُ إِلَى رَبِّي فَأَحْمَدُهُ بِتِلْكَ الْمَحَامِدِ ثُمَّ أَخِرُّ لَهُ سَاجِدًا فَيُقَالُ لِي يَا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَأْسَكَ وَقُلْ يُسْمَعْ لَكَ وَسَلْ تُعْطَهْ وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ فَأَقُولُ يَا رَبِّ أُمَّتِي أُمَّتِي. فَيُقَالُ لِي

---

[١١٨] **بخاری: ٦٥٦٥. مسلم/شيحا: ٤٧٤.**

انْطَلِقْ فَمَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ أَدْنَى أَدْنَى أَدْنَى مِنْ مِثْقَالِ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ فَأَخْرِجْهُ مِنَ النَّارِ فَأَنْطَلِقُ فَأَفْعَلُ ». هَذَا حَدِيثُ أَنَسٍ الَّذِي أَنْبَأَنَا بِهِ فَخَرَجْنَا مِنْ عِنْدِهِ فَلَمَّا كُنَّا بِظَهْرِ الْجَبَّانِ قُلْنَا لَوْ مِلْنَا إِلَى الْحَسَنِ فَسَلَّمْنَا عَلَيْهِ وَهُوَ مُسْتَخْفٍ فِي دَارِ أَبِي خَلِيفَةَ – قَالَ – فَدَخَلْنَا عَلَيْهِ فَسَلَّمْنَا عَلَيْهِ فَقُلْنَا يَا أَبَا سَعِيدٍ جِئْنَا مِنْ عِنْدِ أَخِيكَ أَبِي حَمْزَةَ فَلَمْ نَسْمَعْ مِثْلَ حَدِيثٍ حَدَّثَنَاهُ فِي الشَّفَاعَةِ قَالَ هِيهِ. فَحَدَّثْنَاهُ الْحَدِيثَ. فَقَالَ هِيهِ. قُلْنَا مَا زَادَنَا. قَالَ قَدْ حَدَّثَنَا بِهِ مُنْذُ عِشْرِينَ سَنَةً وَهُوَ يَوْمَئِذٍ جَمِيعٌ وَلَقَدْ تَرَكَ شَيْئًا مَا أَدْرِي أَنَسِيَ الشَّيْخُ أَوْ كَرِهَ أَنْ يُحَدِّثَكُمْ فَتَتَّكِلُوا. قُلْنَا لَهُ حَدِّثْنَا. فَضَحِكَ وَقَالَ خُلِقَ الإِنْسَانُ مِنْ عَجَلٍ مَا ذَكَرْتُ لَكُمْ هَذَا إِلاَّ وَأَنَا أُرِيدُ أَنْ أُحَدِّثَكُمُوهُ « ثُمَّ أَرْجِعُ إِلَى رَبِّي فِي الرَّابِعَةِ فَأَحْمَدُهُ بِتِلْكَ الْمَحَامِدِ ثُمَّ أَخِرُّ لَهُ سَاجِدًا فَيُقَالُ لِي يَا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَأْسَكَ وَقُلْ يُسْمَعْ لَكَ وَسَلْ تُعْطَ وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ. فَأَقُولُ يَا رَبِّ ائْذَنْ لِي فِيمَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. قَالَ لَيْسَ ذَاكَ لَكَ – أَوْ قَالَ لَيْسَ ذَاكَ إِلَيْكَ – وَلَكِنْ وَعِزَّتِي وَكِبْرِيَائِي وَعَظَمَتِي وَجِبْرِيَائِي لأُخْرِجَنَّ مَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ».

مەعبەدی کوڕی هیلال (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: سابیتی کوڕی بونانیمان کرد بەتکاکارو چووین بۆلای ئەنەسی کوڕی مالیک (ڕەزای خودای لێ بێ) کاتێ گەیشتینە خزمەتی، نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد، سابیت ڕوخسەتی خواست بۆمان، چووینە ژوورەوە بۆ خزمەتی، سابیتی لەلای خۆیدا لەسەر کورسییەکەی جێکردەوەو دانیشتین. سابیت عەرزی کرد: ئەی باوکی حەمزە! ئەم برادەرە بەصرەییانە، کە هاتوون بۆلای تۆ، دەیانەوێ فەرموودەکەی تکاو شەفاعەتیان بۆ بگێڕیتەوە، ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ ڕۆژی قیامەت بوو، خەڵك دەورووژێن بەناویەکاو تاس دەیانباتەوەو دەشەڵەژێن‌و هاوار دەبەن بۆ ئادەم‌و پێی دەڵێن: تکابکە بۆ وەچەو نەوەکەت دەفەرموێ: ئەوە

بۆمن دەست نادا، بڕۆن بۆلای ئیبراهیم (دروودی خودای لەسەر بێ) چونکە ئەو دۆستی ئازیزی خودایە، کە دەچنە خزمەتی، دەفەرموێ: ئەوە بۆمن دەست نادا، بڕۆن بۆلای مووسا، کە هاوڕازی خودایە، کە دەچنە لای مووسا دەفەرموێ: ئەوە بۆمن دەست نادا، بڕۆن بۆلای عیسا (دروودی خودای لەسەر بێ) کە گیانێکی پیرۆزە لەلایەنی خوداوەو بە فەرموودەی (کُنْ فیَکُون = ببەو دەبێ)ی خودا خۆی پەیدا بووە، کە دەچنە لای عیسا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەوە بۆمن دەست نادا، بەڵام بڕۆن بۆلای موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) کە هاتنە لای من، دەڵێم: ئەمە بۆمن باشەو من بۆ ئەمە باشم. جا دەڕۆمو داوای مۆڵەتو پێگا دەکەم بۆلای پەروەردگارم، ڕێگەم پێ دەدرێ، لەخزمەتی خوادا رادەوەستم، بەجۆرێکی تایبەتی، سوپاسو ستایشێکی وەهای دەکەم، کە ئێستا توانای ئەو جۆرە سوپاسو ستایشەم نییە، بەڵام لەوکاتەدا خودا دەیخاتە ناو دڵمەوە، سوپاسو ستایشێکی ئاوای دەکەم کە ئێستا یارای ئەوەم نییە، لەدواییدا لەپەو روو کوڕنووشی بۆدەبەم، پێم دەگوترێ: ئەی موحەممەد! سەرت هەڵبڕە، قسەبکە، قسەت ڕەوایە، گوێ بۆ قسەت شل دەکرێ، فەرموو داوابکە، هەموو داوایەکت دەدرێ پێت، فەرموو تکابکە تکای تۆ قەبووڵ دەکرێ، ئەوجەلە منیش دەڵێم: خودایە! بەزەییت بەئومەتی مندا بێتەوە، خودایە! بەزەییت بە ئومەتی مندا بێتەوە، خودایە! بەزەییت بەئومەتی مندا بێتەوە، جا دەگوترێ: بڕۆ هەرکەسێ بەقەد سەنگی دەنکە جۆیێ، باوەڕو ئیمان لەناو دڵیا بێ، لەدۆزەخ دەری بهێنە، منیش دەچم ئەوانە گشتیان لەئاگر دەردەهێنم، دیسانەوە دەگەڕێمەوە بۆ خزمەتی پەروەردگارمو، بەدەستووری جاری پێشوو، سوپاسو ستایشو کوڕنووشو داوای سۆزو رەحمەتو وەڵام لەنێوانمانا روودەدا ئەوجا لەسەر فەرمانی پەروەردگارم، هەرکەسێ بەقەد گەردیلەیێ، یا بەقەد

**دەنکی خەرتەلەیێ، ئیمانو باوەڕ لەدڵیدابێ، لەدۆزەخ دەری دەهێنم. ئەنجا لەسەری جاری سێیەما، پێم دەگوترێ: بچۆ هەرکەسێ بەقەد گەلێ گەلێ کەمتر، لەسەنگی دەنکە خەرتەلەیێ باوەڕ بەخودا لەدڵیا هەبێ، لەدۆزەخ دەری بهێنە. جا دەچم ئەوانیش لەدۆزەخ دەردەهێنم. جا لەسەری جاری چوارەما، لەپاش سوپاسو پرسیارو وەڵام، دەڵێم: ئەی پەروەردگاری نازدارم! مۆڵەتم بدە: کە هەرکەسێ گوتوویەتی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ = هەر خودا خودایەو بەس، بێجگە لەیەزدانی پاك خودای تر نییە) لەدۆزەخ دەری بهێنمو بیبەم بۆ ناو بەهەشت؟**

**خودا دەفەرموێ: (بەگەورەیی‌و شکۆمەندی خۆم، هەروا بە کیبریاو مەزنایەتی خۆم، ئەوەی گوتوویەتی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) خۆم لەدۆزەخ دەریدەهێنم. (تاج/٥، زنجیره: ١٣٠، ژماره: ٥٦٩٥).**

١٢٠ - عَنْ ابي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قالَ: اتِيَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِلَحْمٍ فَرُفِعَ الَيْهِ الذرَاعُ وَكَانَتْ تُعْجِبُهُ فَنَهَشَ مِنْهَا نَهْشَةً ثمَّ قَالَ: (و انَا سَيِّدُ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَهَلْ تَدْرُونَ مِمَّ ذلِكَ؟ يَجْمَعُ اللّٰهُ النَّاسَ الاوَّلِينَ وَالاخِرِينَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ يُسْمِعُهُمْ الدَّاعِي وَيَنْفُذهُمْ الْبَصَرُ وَتَدْنُو الشَّمْسُ فَيَبْلُغُ النَّاسَ مِنْ الْغَمِّ وَالْكَرْبِ مَا لا يُطِيقُونَ وَلا يَحْتَمِلُونَ فَيَقُولُ النَّاسُ: الا تَرَوْنَ مَا قَدْ بَلَغَكُمْ الا تَنْظرُونَ مَنْ يَشْفَعُ لَكُمْ الَى رَبِّكُمْ؟ فَيَقُولُ بَعْض النَّاسِ لِبَعْض عَلَيْكُمْ بادَمَ فَيَاتُونَ ادَمَ عَلَيْهِ السَّلام فَيَقُولُونَ لَهُ: انْتَ ابُو الْبَشَرِ خَلَقَكَ اللّٰهُ بِيَدِهِ وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ وَامَرَ الْمَلائِكَةَ فَسَجَدُوا لَكَ اشْفَعْ لَنَا الَى رَبِّكَ الا تَرَى الَى مَا نَحْنُ فِيهِ الا تَرَى الَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟ فَيَقُولُ ادَمُ انَّ رَبِّي قَدْ غَضبَ الْيَوْمَ غَضبا لَمْ يَغْضبْ قَبْلَهُ مِثلَهُ وَلَنْ يَغْضبَ بَعْدَهُ مِثلَهُ وَانَّهُ قَدْ نَهَانِي عَنْ الشَّجَرَةِ فَعَصَيْتُهُ نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي اذهَبُوا الَى غَيْرِي اذهَبُوا الَى نُوحٍ.

فَيَاتُونَ نُوحًا فَيَقُولُونَ: يَا نُوحُ انَّكَ انْتَ اوَّلُ الرُّسُلِ الَى اهْلِ الارْض وَقَدْ سَمَّاكَ اللّٰهُ عَبْدًا شَكُورًا اشْفَعْ لَنَا الَى رَبِّكَ الا تَرَى الَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ: انَّ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ قَدْ غَضبَ الْيَوْمَ غَضبا لَمْ يَغْضبْ قَبْلَهُ مِثلَهُ وَلَنْ يَغْضبَ بَعْدَهُ مِثلَهُ وَانَّهُ قَدْ كَانَتْ لِي دَعْوَةٌ دَعَوْتُهَا عَلَى قَوْمِي نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي اذهَبُوا الَى غَيْرِي اذهَبُوا الَى ابْرَاهِيمَ فَيَاتُونَ ابْرَاهِيمَ فَيَقُولُونَ يَا ابْرَاهِيمُ انْتَ نَبِيُّ اللّٰهِ وَخَلِيلُهُ مِنْ اهْلِ الارْض اشْفَعْ لَنَا الَى رَبِّكَ الا تَرَى الَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ: لَهُمْ انَّ رَبِّي قَدْ غَضبَ الْيَوْمَ غَضبا لَمْ يَغْضبْ قَبْلَهُ مِثلَهُ وَلَنْ يَغْضبَ بَعْدَهُ مِثلَهُ وَانِّي قَدْ كُنْتُ كَذبْتُ ثلاث كَذباتٍ فَذكَرَهُنَّ ابُو حَيَانَ فِي الْحَدِيث نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي اذهَبُوا الَى غَيْرِي اذهَبُوا الَى مُوسَى فَيَاتُونَ مُوسَى فَيَقُولُونَ: يَا مُوسَى انْتَ رَسُولُ اللّٰهِ فَضلَكَ اللّٰهُ بِرسَالَتِهِ وَبِكَلامِهِ عَلَى النَّاسِ اشْفَعْ لَنَا الَى رَبِّكَ الا تَرَى الَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ: انَّ رَبِّي قَدْ غَضبَ الْيَوْمَ غَضبا لَمْ يَغْضبْ قَبْلَهُ مِثلَهُ وَلَنْ يَغْضبَ بَعْدَهُ مِثلَهُ وَانِّي قَدْ قَتَلْتُ نَفسًا لَمْ اومَرْ بِقَتْلِهَا نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي اذهَبُوا الَى غَيْرِي اذهَبُوا الَى عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ.

فَيَاتُونَ عِيسَى فَيَقُولُونَ يَا عِيسَى انْتَ رَسُولُ اللّٰهِ وَكَلِمَتُهُ الْقَاهَا الَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ وَكَلَّمْتَ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ صَبِيًّا اشْفَعْ لَنَا الَى رَبِّكَ الا تَرَى الَى مَا نَحْنُ فِيهِ فَيَقُولُ عِيسَى انَّ رَبِّي قَدْ غَضبَ الْيَوْمَ غَضبا لَمْ يَغْضبْ قَبْلَهُ مِثلَهُ قَط وَلَنْ يَغْضبَ بَعْدَهُ مِثلَهُ وَلَمْ يَذكُرْ ذنْبا نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي اذهَبُوا الَى غَيْرِي اذهَبُوا الَى مُحَمَّدٍ فَيَاتُونَ مُحَمَّدًا فَيَقُولُونَ: يَا مُحَمَّدُ انْتَ رَسُولُ اللّٰهِ وَخَاتِمُ الانْبِيَاء وَقَدْ غَفَرَ اللّٰهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذنْبِكَ وَمَا تَاخَّرَ اشْفَعْ لَنَا الَى رَبِّكَ الا تَرَى الَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟

فَانْطَلِقُ فَاتِي تَحْتَ الْعَرْشِ فَاقَعُ سَاجِدًا لِرَبِّي عَزَّ وَجَلَّ ثمَّ يَفْتَحُ اللّٰهُ عَلَيَ مِنْ مَحَامِدِهِ وَحُسْنِ الثنَاء عَلَيْهِ شَيْئًا لَمْ يَفْتَحْهُ عَلَى احَدٍ قَبْلِي ثمَّ يُقَالُ: يَا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَاسَكَ سَلْ تُعْطهْ وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ فَارْفَعُ رَاسِي فَاقُولُ: امَّتِي يَا رَبِّ امَّتِي يَا رَبِّ امَّتِي يَا رَبِّ فَيُقَالُ: يَا مُحَمَّدُ ادْخِلْ مِنْ امَّتِكَ مَنْ لا حِسَابَ عَلَيْهِمْ مِنْ الْبَابِ الايْمَنِ مِنْ

ابْوَابِ الْجَنَّةِ وَهُمْ شُرَكَاء النَّاسِ فِيمَا سِوَى ذلِكَ مِنْ الابْوَابِ ثمَّ قَالَ: وَالَّذي نَفْسِي بِيَدِهِ انَّ مَا بَيْنَ الْمِصْرَاعَيْنِ مِنْ مَصَارِيعِ الْجَنَّةِ كَمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَحِمْيَرَ اوْ كَمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَبُصْرَى).[١٢٠]

ئەبوهورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: رۆژێك مەرگەی گۆشتیان بۆپێغەمبەر هێنا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) حەزی لەگۆشتی دەست بوو لەبەر ئەوە دەستێکیان بۆدانا، قەپالێکی لێ گرت وفەرمووی: (لەدوارۆژدا، لەقیامەت دا خۆم گەورەو سەروەری بەرەی ئادەمیزادم، ئایادەزانن ئەوە بۆ؟ لەرۆژی دوارۆژدا خودا پێشینان وپاشینانی مەردووم، لەیەك دەشتی تەختی پان وبەریندا کۆدەکاتەوە، بانگکەرێ بانگیان بکا، هەمویان گوێیان لێیەتی وەدەنگی یەك کەس بەگوێی هەموویان دەگات، کەسێکیش تەماشایان بکا هەمویان دەبینێ، خۆریان لێ نزیك دەبێتەوە تەواو تەواو تینی هەتاوەکە زۆریان بۆ دێنێ، (بڕ: تاج/١٠ل- ٣٦٤ ز- ١٢٠ژمارە: ٣ )+ (تاج/٦ ل/٨ ز/٣ ژمارە:٣) مەردووم دەکەونە خەم و پەژارە وتەنگانەیەکی واوە، نە وزەیان لەبەردا دەمێنێ وەنە بەرگەی ئەوەدەگرن، لەناو خۆیان بەیەکتری دەڵێن : ئایا خۆدەبینن لەچ تەنگانەیەك داین، ئادەی بەڵکو کەسێك بدۆزینەوە لەلای خودای پەروەردگار تکامان بۆ بکات، لەم سەخڵەتی یە رزگارمان بکات.

دەڵێن : بابچین بۆ خزمەت باوە ئادەم، دەچنە خزمەتی (سەلامی خوای لێ بێ) پێی دەڵێن : ئەی ئادەم تۆ باوکی هەموو بەرەی ئادەمیزادی، خودا بەدەستی خۆی دروستیکردووی، لەگیانی خۆیی کردووە بەبەرتا، فەرمانی بەفریشتەکان کرد، کورنوشیان بۆ بردیت، کەوابوو تۆ لەلای خودا خاترت هەیە، لەبەر ئەوە

---

[١٢٠] تەجریدی بوخاری/٤، ژمارە: ١٦٧٠. بخاری: ٤٧١٢، ٣٣٤٠، ٣٣٦١. مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٩٢. مسلم: ١٩٤ = مسلم ترقیم شیحا: ٤٧٩.

لەخزمــەت خــوادا تكامــان بــۆ بكــە، ئايانــابينى كەچــيمان بەســەر هــاتووە، سەيرناكەی كەتووشى چ ڕۆژێكى ڕەش بووين، ؟ ئادەم (سەلامى خواى لێ بێ) دەفەرموێ : ئـەمڕۆ پـەروەردگارم ڕقێكـى ئـەوتۆى گرتـووە، نـە لەمەوبـەرو نـە لەمـەودوا، نـەڕقى واى هەڵـساوەو، نـەڕقى واى هەڵدەستێ، كـاتى خـۆى خـودا قەدەغـەى لێكـردم كـە لـەو درەختـە نـەخۆم، بـەڵام مـن بـە گـوێم نـەكردو بـێ فەرمانى ئەوم كرد، من بەتەنيا خەمى خۆمەو بەس (نەفسى، نەفسى، نەفسى = خۆم، خۆم، خۆم هەقم بەسەر كەسىترەوە نييە) بـچنەلاى كەسێكى تـر: بڕۆنـە خزمەتى نووح (بڕوانە : تاج/١ ز/٦ ژ/٣ ل/٢٨).

ئەوجا دەچنە خزمەتى نووح پێغەمبەر وعەرزى دەكەن : ئەى نووح ! تۆ يەكەم پێغەمبەرى ڕەوانە كراوىخوداى بۆسـەر خـەڵكى سـەر ڕووى زەوى، خـودا لەقورئاندا ناوى ناويت بەندەى سوپاس گوزار، وەك دەفەرموێ: ﴿ ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ إِنَّهُ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا﴾ ئيـسرا– ٣/١٧. كەواتـە: لەبـەر ئـەوە لەخزمـەت پەروەردگارتا تكامـان بـۆ بكـە، خـۆ دەبينـى حاڵمـان چـەن پەريـشان وپەشـێوە و چـيمان بەسـەردا هـاتووە؟ نـووحيش پێيـان دەفـەرموێ: ئـەمڕۆ پـەروەردگارم ڕقێكـى سـەختى واى هەڵـساوە، نــە لەمــەو بــەرو نــە لەمــەودوا، نــەڕقى واى هەڵساوەو، نەڕقى واى هەڵدەستێ، وەكى تريش من خودا نزايـەكى گيرابـووى پـێ خەلات كردم، بەڵام لـە جيهانـدا ئەونزايـەمم لەگەلەكەى خۆم كـرد ئـيتر ڕووى ئەوەم نەماوە: (نەفـسى، نەفـسى، نەفـسى= خـۆم، خـۆم، خـۆم) بـچن بۆخزمـەتى ئيـبراهيم (سـەلامى خـواى لـێ بـێ) دەچـنە خزمـەتى ئـەويش دەڵـێن : ئـەى ئيبراهيم ! تـۆ هـەم پێغەمبـەر ى خودايـت وهـەم خـەليلوڵلاى، واتـە : لەخـەڵكى سـەرڕووى زەوى تـەنها تـۆى هەڵبـژاردووە وكردوويتـى بەدۆسـتى ئازيزى خـۆى، لەخزمەت خوداى پەروەردگارتا تكامان بۆبكە، خۆ دەبينيت كەچۆن تووشى ئەم

هەمکە خەم وناخۆشی یە بووین، سا بەشکوو بەزەویبێتەوە پیاماندا ولەم تەنگانەیە سەر فەرازمان بفەرمووێ، دەفەرموێ : ئەمڕۆ پەروەردگارم ڕقی تەواوی هەڵساوە وەبۆ عوزر خوایی، باسی درۆکانی خۆی دەکات کەبریتین لە سێ درۆ، کە ئەبوحەییان، کە ئەو ڕاوییەی ئەم فەرموودەیە لەئەبوزورعەوە دەگێڕێتەوە باسی کردوون:

کە ئەم سێ شتەن : ﴿انّي سقيم﴾: من نەخۆشم، ﴿بلْ فعلَهُ كبيرُهمْ﴾: من نەم کردووە گەورەی بتەکان کردوویەتی، (انّها اختي) سارا خوشکمە ژنم نیە، - ئەوجا ئیبراهیمیش دەفەرموێ : نفسی، نفسی، نفسی خەمی خۆمەو بەس سێجار وا دەفەرموێ: بڕۆن بۆلای کەسێکی تر بچن بۆ خزمەتی مووسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێ!) دەڵێن : ئەی مووسا !تۆ فرستادەی نازداری یەزدانی پاکی، خودا بەپەیام و نامەو گفتوگۆ لەگەڵتا باوی تۆی داوە بەسەر هەموو مەردووم دا، دەی لەخزمەت خودادا تکامان بۆبکە، خۆ خۆت چاوت لەحاڵمانە کە توشی چ گۆبەندێك بووین، پێیان دەفەرموێ: ئەوە ڕاستەو وەك دەڵێن هەمووی وایە بەڵام ئەمڕۆ تکای وا گەورەو گشتی بەهەموو کەس ناکرێ، چونکە ئەمڕۆ خودا ڕقێکی وەهای هەڵساوە، سەرە ڕای ئەوەیش، من کاتی خۆی پیاوێکم لەخۆمەوە کوشت، خودا فەرمانی پێم نەکردبوو کەبیکوژم، ئاوا عوزر خوایی دەکاو دەفەرموێ: نەفسی، نەفسی، نەفسی، من تەنها مشووری خۆم دەخۆم وسێجار ئەمە دەفەرموێ. بڕۆن بۆلای کەسێکی تر، بڕۆن بۆخزمەتی عیسا (سەلامی خوای لێ بێ)! دەچن عەرزیدەکەن : ئەی عیسا! تۆ هەم پێغەمبەر ی خودای، هەم بەساوایی لەبێشکەدا قسەو گفتوگۆت لەگەڵ مەردووم دا دەکرد، هەم ئەو وشە پیرۆزە یەزدانییەی کەخودا بۆخۆی گەیاندی بەمەریەمی دایکی تۆ، هەم گیانێکی پاکی لەلایەنی خوداوە، تۆ لەلای خودا گەڵ

بەڕێزی، کەوابوو ئادەی بفەرموو لەخزمەت خودای خۆتا تکامان بۆ بکە ولەم سەختە تییە ڕزگارمان بکە، خۆخۆت چاوت لەبارودۆخمانە کەچیمان بەسەرهاتووە، دەفەرموێ: ئەمڕۆ پەروەردگارم ڕقێکی گەورەی وای هەڵساوە، نەفسی، نەفسی، نەفسی = خۆم، خۆم، خۆم، بڕۆن بۆلای کەسێکی تر بڕۆن بۆ خزمەت موحەممەد (دروودی خودای لێ بێ) وەعیسا (سەلامی خوای لێ بێ) باسی گوناهی خۆی ناکات، وەك پێغەمبەرەکانی تر باسی گوناهی خۆیان دەکەن.

جا ئەوجا دێن بۆ لای من، دەڵێن : ئەی موحەممەد! تۆ خاوەنی گەلێ بەهرەی گەورە گەورەی وەك ئەوەی پێغەمبەر ی خودای، دوا هێنەری پێغەمبەر انی و، دوا پێغەمبەری، خودا لەگوناهی بەرو دوات خۆش بووە، کەواتە: بفەرموو تکاو شەفاعەتمان بۆ بکە لەلای خودای خۆت خۆ خۆت دەبینیت کەواین لەچ گۆبەندێکدا ئیتر منیش دەردەچم وخۆم دەگەیەنمە ژێر تەخت وبارەگای خوداو، لەوێ کڕنوشێکی دوورو درێژی پڕلەستایشی جوان دەبەم بۆخودای خۆم، خودازمینم دەکاتەوە، جۆرە ستایشێکی زۆر نایاب وسوپاسێکی جوان جوانی خۆیم فێر دەکات و دەیخاتە ناو دڵمەوە، کە لەوەوبەر فێری کەسی تری نەکرد بێ، لەپاش دا دەفەرموێ: ئەی موحەممەد! سەرت هەڵبڕە، داوا بکە هەر چی داوا دەکەی دەی دەم بەتۆ، تکا بکە هەر تکایە بکەی، گەورەبێ یان بچوك گیرای دەکەم..

ئیتر منیش سەرم بەرزەوە دەکەم ودەڵێم : ئەی خودایە! بەزەیت بەگەلی مندا بێتەوە، چەند جارێك وا دەڵێم، جا دەگوترێ : ئەی موحەممەد ! ئەو حەفتاهەزار کەسانەی کە لێپرسینەوەیان لەسەر نیە، لەگەلی خۆت، ئەوانە لە دەرگاکانی لای ڕاستی بەهەشتەوە ببەرەناو بەهەشتەوە، ئومەتەکەشت لە هەموو دەرگاکانی تری بەهەشتیش دا، بۆ چوونە ژورەوە بۆناو بەهەشت،

هاوبەشی خەڵکەکەی تریش بن، ئەوجا فەرمووی : (بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە، کە دیارە خودای گەورەیە، بەینی دوو لاشیپانەکانی دەرگاکانی بەهەشت، بەقەدبەینی مەککەو حیمیەر دەبێ.یافەرمووی: بەقەد مابەینی مەککەو بوسرا دەبێ ) (تاج/١٠زنجیرە/١٣٠ژمارە:٨ ل/٤٠٤) + (ژمارە:٧١١ تەجرید= بەرگی/٢ ل/١٣٤).

ئەمەیش دەقی ژمارە (٩٢)ی پوختەی موسلیمە، بەرگی/١ ئاوا:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: رۆژێك مەرگەی گۆشتیان بۆ پێغەمبەر هێنا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) حەزی لەگۆشتی دەست بوو، لەبەرئەوە دەستێکیان بۆدانا، قەپاڵێکی لێ گرتو فەرمووی: (لە دوارۆژدا، لە قیامەتدا، خۆم گەورەو سەروەری بەرەی ئادەمیزادم، ئایا دەزانن ئەوە بۆ؟ لە رۆژی دوارۆژدا خودا پێشینانو پاشینانی مەردوم، لەیەك دەشتی تەختی پانو پۆرو بەریندا، کۆدەکاتەوە، بانگکەرێ بانگیان بکا، هەموویان گوێیان لێیەتی، دەنگی یەك کەس بەگوێی هەموویان دەگات، کەسێکیش لەلای خۆیەوە تەماشایان بکا هەموویان دەبینێ، وەك چۆن ئێستا بەهۆی رادیۆو تەلەفیزیۆنەوە لەهەموو کونو قوژبنێکی جیهاندا گوێمان لە دەنگو رەنگی وتارخوێنو قسەکەرو یاریکەرو کارکەرە ئاوا، خۆریان لێ نزیك دەبێتەوە تەواو تەواو، تینی هەتاوەکە زۆریان بۆ دێنێ (بڕوانە: تاج/١٠، لاپەڕە – ٣٤٦، زنجیرە: ١٢٠، ژمارە: ٣=تاج/٥ ز:١٢٠ ژمارە/٥٦٤٩) + (تاج/٦، لاپەڕە: ٨، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٣= تاج/٤ ز/٣ ژ/٣٦٩٢) مەردوم دەکەونە خەمو پەژارەو تەنگانەیەکی واوە، نەوزەیان لەبەردا دەمێنێ، ومنە بەرگەی ئەوە دەگرن، لەناو خۆیانا بەیەکتری دەڵێن: خۆ دەبینن لە چ تەنگانەیەکداین، ئادەی بەڵکوو کەسێك بدۆزینەوە لەلای خودای پەروەردگارمان تکامان بۆ بکات، سا بەڵکوو

لـەم تەنگانەیـە رزگارمـان بکـات. لـەناو خۆیانـا بەیـەکتری دەڵـێن: بابـچین بـۆ خزمەت باوە ئادەم، دەچنە خزمەتی (سلاوی خـودای لێ بـێ)، پێـی دەڵێن: ئـەی ئـادەم! تـۆ بـاوکی هـەموو بـەرەی ئـادەمیزادی، خـودا بەدەسـتی خـۆی لـە قـوڕ دروسـتی کـردووی، لـەگیانی خـۆیی کـردووە بـە بـەرتا، فـەرمانی کـردووە بـە فریشتەکانی، کوڕنووشیان بۆ بردیت، کەوابوو تـۆ لـەلای خـودا خـاترت هەیـە، لەبەرئـەوە لـە خزمـەت خـودادا تکامـان بـۆ بکـە، ئایـا نـابینی کەچیمان بەسـەر هاتووە، سەیرناکەی کە تووشی چ رۆژێکی رەش بووین؟

ئادەم دەفەرموێ: ئەمڕۆ پەروەردگارم رقێکی وای هەڵساوە، نە لەمەوبەرو نەلەمـەودوا، نـەڕقی وای هەڵـساوەو، نـەڕقی وای هەڵدەسـتێ، کـاتی خـۆی لـە بەهەشتا، خودا درەختێکی لێ قەدەغە کردووم‌و، فەرمووی: {وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ وَكُلاَ مِنْهَا رَغَداً حَيْثُ شِئْتُمَا وَلاَ تَقْرَبَا هَـذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الْظَّالِمِينَ} ئاوا فـەرمانی پـێ کـردم کـە لـەو درەختـە نـەخۆم، بـەلام مـن بـەگوێم نەکردو بێ فەرمانی ئەوم کردو لە درەختەکەم خوارد، من تەنیا خەمی خۆمەو بەس (نەفسی، نەفسی، نەفسی = خۆم، خۆم، خۆم، هـەقم بەسـەر کەسـی تـرەوە نییە). بچنە لای کەسێکی تر، بڕۆنە خزمەتی نووح (بڕوانە: تـاج/١، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٣٦، لاپەڕە: ٣٨).

ئەوجا عەشاماتە لێقەوماوەکە دەڕۆنە خزمەتی نووح پێغەمبـەر(دروودی خـودای لەسـەر بـێ) عـەرزی دەکـەن: ئـەی نـووح! تـۆ یەکـەم پێغەمبـەری رەوانـەکراوی خـوای، بۆسـەر خەڵـکی سـەر رووی زەوی، خـودا لەقورئانـدا نـاوی ناویت بەندەی سوپاسگوزار، وەك دەفەرموێ: {ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَـا مَـعَ نُـوحٍ إِنَّـهُ كَـانَ عَبْـدًا شَـكُورًا - سـورة الإسـراء/١٧/٣}. کەواتـە: لەبەرئـەوە لەخزمـەت پـەروەردگارتا تکامـان بۆبکـە، خـۆدەبینی حاڵمـان چـەن پەرێـشان‌و پەشـێوەو

چیمان بەسەرهاتووە؟ نووحیش پێیان دەفەرموێ: ئەمڕۆ پەروەردگارم رقێکی سەختی وای هەڵساوە، نە لەمەوبەرو نە لەمەودوا، نە رقی وای هەڵساوەو، نە رقی وای هەڵدەستێ، وەکی تریش من خودا نزایەکی گیرابووی پێ خەڵات کردم، بەڵام من پەلەم کردو لە جیهاندا ئەو نزایەمم لەگەڵەکەی خۆم کرد، ئیتر رووی تەکلیفم نەماوە (نەفسی، نەفسی، نەفسی = خۆم، خۆم، خۆم) بڕۆن بۆلای ئیبراهیم (سڵاوی خودای گەورەی لەسەر بێ).

دەچنە خزمەتی ئەویش دەڵێن: ئەی ئیبراهیم! تۆ هەم پێغەمبەری خودایتو هەم خەلیلوڵڵای. واتە: لە خەڵکی سەر رووی زەوی تەنها هەر تۆی هەڵبژاردووەو کردوویتی بە دۆستی ئازیزی خۆی، لە خزمەت خودای پەروەردگارتا تکامان بۆ بکە، خۆ دەبینیت کەچۆن تووشی ئەم هەمکە خەمو ناخۆشییە بووین، سا بەشکوو بەزەوی بێتەوە پیامانـاو لەم تەنگانەیە سەرفرازمان بفەرموێ. دەفەرموێ: ئەمڕۆ پەروەردگارم رقی تەواوی هەڵساوە، کە نە لەمەوبەرو نە لەمەودوا رقی وای هەڵنەساوەو هەڵناسێ، وە بۆ پۆزشو عوزرخوایی باسی سێ درۆکەی خۆی دەکات، کە ئەم سێ شتەن: ١- (إِنِّي سَقِيم) بۆئەوەی کە دەوری چۆڵکەن تا بتەکان بشکێنێ، دەڵێ: من پەتادارم، کەدەوری چۆڵ دەکەنو بتەکان دەشکێنێ، ٢- کەدێنەوە دەڵێن: بۆ ئەم بتانەت شکاندووە؟ دەفەرموێ: (بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ) من نەیانم شکاندووە، شەڕیان بووە لەناو خۆیانا، گەورەکەیان شکاندوونی!! ٣- زۆرداری دەیەوێ سارا خاتوون لە حەزرەتی ئیبراهیم بسێنێ، پێی دەڵێ ئەم ژنە چیتە؟ دەڵێ: ئەمە خوشکمە ژنم نییە (بڕوانە: تەجرید، ژمارە: ٢٢١٧/٩٩٣ فەتح = بەرگی/٣، لاپەڕە: ٥٨ + بەرگی/٤، لاپەڕە: ٣٦، ژمارە: ٣٣٥٨/١٣٤٩).




ئەوجا ئیبراهیم دەفەرموێ: نفسی، نفسی، نفسی، خەمی خۆمەو بەس، سێ جار وادەفەرموێ، وە دەفەرموێ: بڕۆن بۆلای کەسێکی تر، بچن بۆ خزمەتی مووسا پێغەمبەر (سڵاوی خودای لەسەر بێ)، دەچن بۆ خزمەتیو دەڵێن: ئەی مووسا! تۆ فروستادەی نازداری یەزدانی پاکی، خودا بە پەیامو نامەو گفتوگۆ لەگەڵتا باوی تۆی داوە بەسەر هەموو مەردومدا، دەی لە خزمەت خودادا تکامان بۆ بکە، خۆ خۆت چاوت لە حاڵمانە کە تووشی چی گۆبەندێك بووین، پێیان دەفەرموێ: ئەوە راستەو وەك ئێوە دەڵێن وایە، بەلام ئەمڕۆ تکای وا گەورەو گشتی بەهەموو کەسێ ناکرێ، چونکە ئەمڕۆ خودا رقێکی وەهای هەڵساوە، قەت رقی وای هەڵنەساوە، سەرەڕای ئەوەیش من کاتی خۆی پیاوێکم لەخۆمەوە کوشت، کە خودا فەرمانی پێ نەکردبوم کە بیکوژم، ئاوا پۆزش دەهێنێتەوەو دەفەرموێ: نفسی، نفسی، نفسی: من تەنها مشووری خۆم دەخۆمو بەس. سێجار وادەفەرموێ. ئەوجا دەفەرموێ: بڕۆن بۆلای کەسێکی تر، بڕۆن بۆ خزمەتی عیسا (سڵاوی خوای لێ بێ) دەچن عەرزی دەکەن: ئەی عیسا! تۆ هەم پێغەمبەری خودای، هەم بەساوایی لە بێشکەدا قسەو گفتوگۆت لەگەڵ مەردومدا کردووە، هەم ئەو وشە پیرۆزە یەزدانییەی کە خودا بۆخۆی گەیاندی بە مەریەمی دایکی تۆ، هەم گیانێکی پاکی لەلایەنی خوداوە، تۆ لەلای خودا گەلێ بەرێزی، کەوابوو ئادەی بفەرموو لە خزمەت خودای خۆتا تکامان بۆ بکەو لەم سەخڵەتییە رزگارمان بکە، خۆ خۆت چاوت لەبارودۆخمانە، کە چیمان بەسەرهاتووە، دەفەرموێ: ئەمڕۆ پەروەردگارم رقێکی گەورەی وای هەڵساوە، نە لەمەوبەرو نە لەمەودوا رقی وای نەهەڵساوەو نەهەڵئەسێ، نەفسی، نەفسی، نەفسی = خۆم، خۆم، خۆم. بڕۆن بۆلای کەسێکی تر، بڕۆن بۆلای موحەممەد (درووودو سڵاوی خودای لەسەر بێ).

عیسا (سلاوی خوای لێ بێ) باسی گوناه ناکا، وەك پێغەمبەرەکانی پێش ئەو، بۆ عوزر خوایی، باسی گوناهەکانی خۆیان دەکرد.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: جا ئەوجا دێن بۆلای من، دەڵێن: ئەی موحەممەد! تۆ خاوەنی کۆمەڵێ بەهرەو شانازیی گەورە گەورەی، وەك ئەوە پێغەمبەری خودای، دواهێنەری پێغەمبەرانی‌و دوا پێغەمبەری‌و لەدوا تۆ پێغەمبەری تر نەهاتووە، خودا لە گوناهی بەرودوات خۆش بووە، کەوابوو بفەرموو تکاو شەفاعەتمان بۆبکە لەلای خودای خۆت، خۆ خۆت دەبینیت کەواین لە چ مەینەتێکا، ئیتر منیش دەردەچم‌و خۆم دەگەیەنمە ژێر تەخت‌و بارەگای خوداو، لەوێ کڕنوشێکی دوورو درێژی پڕ لەستایشی جوان دەبەم بۆ خودای خۆم، خودا زەینم دەکاتەوە، جۆرە ستایشێکی زۆر نایاب‌و سوپاسێکی جوان جوانی خۆیم فێردەکات‌و دەیخاتە ناو دڵمەوە، کەلەوەوبەر فێری کەسی تری نەکردبێ، لەپاشدا خودا دەفەرموێ: ئەی موحەممەد! سەرت هەڵبڕە لە کوڕنووش، داوابکە لەخودا هەرچی داوا دەکەی دەیدەم بەتۆ، تکابکە هەرتکایێ تۆ بیکەیت، گەورەبێ، یا بچووك، گیرای دەکەم. ئیتر منیش سەرم بەرزەوە دەکەم‌و دەڵێم: ئەی خودایە! بەزەوییت بەگەلی موسوڵمانی مندا بێتەوە، چەند جارێك وا دەڵێم، جا دەگوترێ: ئەی موحەممەد! ئەو حەفتا هەزار کەسانەی کە لێپرسینەوەیان لەسەر نییە، لەگەلی موسوڵمانی خۆت، ئەوانە لە دەرگاکانی لای راستی بەهەشتەوە ببەرە ناو بەهەشتەوە، ئومەتەکەشت لەهەموو دەرگاکانی تری بەهەشتا، بۆ چوونە ژورەوە بۆناو بەهەشت، هاوبەشی ئەو خەڵکەی تربن. ئەوجا فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): بەوکەسە کە گیانی منی بەدەسە، کە دیارە کە خودای گەورەیە، بەینی دوو لاشیپانەکانی دەرگاکانی بەهەشت، بەقەد بەینی مەککەو

حیمیەر دەبێ. یا فەرمووی: بەقەد مابەینی مەککەو بوسرا دەبێ) گێڕانـەوەی ئێرە دەفەرموێ: بەقەد نێوانی مەککەو هەجەر دەبێ). (تاج/١٠، زنجیرە: ١٣٠، ژمارە: ٨ = ژمارە/٥٦٩١ بەرگی/٥ چ/٤، لاپەڕە: ٤٠٤) + (ژمارە: ٧١١ تەجرید = ١٤٧٤ فتح الباری = بەرگی/٢، لاپەڕە: ١٣٤).

## (٨٦) باب: اختباءُ النَّبيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دَعْوَةَ الشَّفَاعَةِ لِأُمَّتِهِ
## هەموو پێغەمبەرێ پاڕانەوەیەکی تایبەتی گیرابووی هەیە

١٢١- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْـهُ) قَـالَ: أَنَّ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « لِكُلِّ نَبِـيٌّ دَعْـوَةٌ مُـسْتَجَابَةٌ، فَتَعَجَّـلَ كُـلُّ نَبِـيٍّ دَعْوَتَـهُ، وَإِنِّـى اخْتَبَـأْتُ دَعْوَتِى شَفَاعَةً لأُمَّتِى يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَهِىَ نَائِلَـةٌ إِنْ شَـاءَ اللَّـهُ مَـنْ مَـاتَ مِـنْ أُمَّتِـى لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا».[١٢١]

ئەمە دەقی عەرەبی ژمارە (٩٥)ی مختصر صحیح مسلمە:

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەموو پێغەمبەرێ نزاو پاڕانەوەیـەکی تایبـەتی هەیە، کە خودا قەبووڵی دەکا لێی، هەموو پێغەمبەرەکانی تر، نزاکەی خۆیانیان بـەزویی لـەدنیادا کـردووەو نزاکـەیان گـیرا بـووە، بـەڵام مـن نزاکـەی خـۆمم هەڵگرتووە بۆ رۆژی قیامەت، لەوێ تکای پێ دەکەم بۆ ئۆمەتم، ئـیتر ئـەوەی لـە ئۆمەتم لەسەر ئیمانو باوەڕی راست بمرێو هیچ هاوبـەش بـۆ خـودا پـەیدانـەکا، خودا حەزکا ئەوکەسە بەرئەم تکاو شەفاعەتەی منە دەکـەوێ). (تـاج/٤، لاپـەڕە:

---

[١٢١] تەجرید/٥، ژمارە: ١٩٧٥. بخاری: ٦٧٠٤، ٧٤٧٤. مـسلم: ١٩٨ = شـیحا: ٤٩٠ = مختـصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٩٥.

٢٧٧، زنجیره: ٩١ — ش/ت) + (تەجریدی بوخاری/٢٣٩/٥/٥. ژمارە: ١٩٧٥ تەجرید = ٦٣٠٤، ٧٤٧٤ - فتح).

١٢٢ – حديث أنس عن نَبِيَّ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– قَالَ « كُلُّ نَبِي سَأَلَ سُؤالاً، لِكُلِّ نَبِيّ دَعْوَةٌ يَدْعُوهَا فَأَنَا أُرِيدُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ أَنْ أَخْتَبِئَ دَعْوَتِي شَفَاعَةً لأُمَّتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ ».[١٢٢]

له ئەبو هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێ) لەپێغەمەرەوە -درووودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: هەموو پێغەمەرێ نزاو پاڕانەوەیەکی تایبەتی خۆی هەیە، کە خودا گیرای دەکا لێی، هەموو پێغەمەرەکانی تر نزاکەی خۆیانیان بەزوویی لەدنیادا کردووەو نزاکەیان قەبوولکراوە، بەڵام من نزاکەی خۆمم هەلگرتووە بۆ ڕۆژی قیامەت، لەوێ تکای پێ دەکەم بۆ ئۆمەتم، ئیتر ئەوەی لە ئۆمەتم لەسەر ئیمانو باوەڕی ڕاست بمرێ و هیچ هاوبەش بۆ خودا پەیدا نەکا —خودا حەزکا- ئەوە ئەوکەسە بەر ئەم تکاو شەفاعەتەی منە دەکەوێ!. (تاج/٤/ ل/٢٧٧ ز/٩١ ژ/١ —باسی دڵسۆزی پێغەمەر بۆ گەلی خۆی).

### (٨٩) بابٌ: في قولِهِ تَعالَى: {وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الأَقْرَبِينَ - الشعراء : ٢١٤}
### باسی فەرمایشتی یەزدانی پاك: ئەی موحەممەد! خزمە نزیکەکانی خۆت هۆشیار بکەرەوەو لە تۆڵەی سەرپێچی لەفەرمانی خودا بیانترسێنە

١٢٣ – عنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِينَ أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ ﴿وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الأَقْرَبِينَ﴾ قَالَ: يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ أَوْ كَلِمَةً نَحْوَهَا اشْتَرُوا أَنْفُسَكُمْ لا أُغْنِي عَنْكُمْ مِنْ اللَّهِ شَيْئًا يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ لا أُغْنِي عَنْكُمْ مِنْ اللَّهِ شَيْئًا يَا عَبَّاسُ بْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ لا أُغْنِي عَنْكَ مِنْ اللَّهِ شَيْئًا وَيَا صَفِيَّةُ

[١٢٢] لەژمارە (١٢١)دا تەخریج کراوە.

عَمَّةَ رَسُولِ اللَّهِ لا أُغْنِي عَنْكِ مِنْ اللَّهِ شَيْئًا وَيَا فَاطِمَةُ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَلِينِي مَا شِئْتِ مِنْ مَالِي لا أُغْنِي عَنْكِ مِنْ اللَّهِ شَيْئًا). [١٢٣]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الأَقْرَبِينَ – الشعراو/٢٦-٢١٤﴾.

واتە: ئەی موحەممەد! خزمە هەرە نزیکەکانت هۆشیار بکەرەوەو بیانترسێنە لەقارو غەزەبی خودا، کاتێ ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە حەزرەت(دروودی خوای لەسەر بێ) ڕۆیشت لەسەر تەپۆڵکەی صەفا راوەستاو، بەدەنگی بەرز، فەرمووی: ئەی هۆزی قورەیش نەفسی خۆتان لەخودای گەورە بکڕنەوە، مـن لەلای خودا هیچ سودێ بەئێوە ناگەیەنم، ئەی نەوەی عەبدومەناف! من لەلای خودا هیچ سودێ بەئێوە ناگەیەنم، ئەی عەبباسی کوڕی عەبدولموطەلیب! ئەی مامەی پێغەمبەر! من لەلای خودا هیچ سوودێ بە تۆ ناگەیەنم، ئەی صەفییەی پووری پێغەمبەری خودا! من لەلای خودا هیچ سوودێ بە تۆ ناگەیەنم، ئەی فاطیمەی کچی پێغەمبەر! ئەگەر داوای ماڵی دنیا دەکەی ئێستا بیکە، هەتا بەشت بدەم دەنا لەقیامەتدا من هیچ سوودێ بەتۆ ناگەیەنم. (تاج/٧/٧٤ف-٣ز-٩، ریاض/١/٣٢٩ل-٢٦٤ز-٤٠).

## راڤەو شیکردنەوە:

ئەم جۆرە فەرموودەیە لەسەر ئەم شێوە رەهایە، کەپێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەقیامەتدا دەسەڵاتی هیچی نەبێ بۆکەس، چ خزم، چ بێگانە، جۆرە کێشەو دژایەتییەك، لەگەڵ چەند فەرموودەی تری صەحیحا دروست

---

[١٢٣] تەجرید/٢، ژمارە: ١١٤٠. بخاری: ٢٧٥٣، ٣٥٢٧، ٤٧٧١. مسلم: ٢٠٤ - مسلم/شیحا: ٥٠٠ = مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٩٨.

دەکا، چونکە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەدنیاو قیامەتا رەحمەتە بۆ هەموان، بەتایبەتی لەرۆژی دوارۆژدا گەورەترین پشتو پەنایە -لەپاش خودا- بۆ باوەڕداران، خاوەنی شەفاعەتی کوبرایە، بەتکای ئەو بەمەلایین تاوانبار عەفو دەکرێن، بەمەلایین مەلایین، پایەو پلەی موسوڵمانانو باوەڕداران بەرزەوە دەبێ، کەواتە:

١- ئەمە بەر لەوەبوو کەخودا ئاگاداری بکاتەوە کەلە قیامەتدا خاوەنی شەفاعەتول کوبرایە، وەهەروەها لەدونیادا سوودی زۆری جۆراو جۆری بۆ موسوڵمانان هەیە.

٢- یا مەبەست هەڕەشەو چاوترساندنو هۆشیار کردنەوەیە.

٣- یا مەبەست ئەوەیە کەئەگەر باوەڕ نەهێنن سوودی نابێ بۆیان.

٤- بۆ ئەوەی بەهێزیی فەرموودەکانی پێچەوانەی ئەم فەرموودەیە بزانی کە بەڵگەی روونو ئاشکران لەسەر سوودی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەهەردوو جیهاندا بۆ باوەڕداران فەرموو بڕوانە:

أ- بەرگی دووەم، لاپەڕە/١١١ف-٦٧٨+ل-٩٥ف-٦٧٠+ل-١٤٧ مەسەلەی نوێژی قەزای حاجەو کردنی پێغەمبەر بەتکاکار لەلای خودا، بەڵکوو گشت باسەکە بەتەواوی.

ب- تاج/١٠/٢٨٨ زنجیرەی/١٢٩بەتەواوی باسی تکا کردنی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەکا، هەروا زنجیرەی /١٣٠. لەلاپەڕە /٣٨٩ وە هەتا(٤٠٩) هەروا زنجیرە/١٣١ل-٤٠٩ هەتا/٤٢٠+تاج/٥ص٣٨٣.

ج- ریاض الصالحین/١ل-٢١٧ز-٣٠+ریاض/٤ل-١٣٦١ف-٥٩.

د- عمدة القاري/ج/٢٥ص١٢٧+١٣٠+١٢٣حدیث/٦٥.

هـ- فتح الباری ج/١٣ص٤٧٣ حدیث رقم: ٧٥٠٩+٧٥١٠+ ٧٥١٧ص٤٥٢-ص٤٦١.

**تێبینی:**

(ص‌و ج) نیشانه‌ی ئه‌صله عه‌ره‌بیه‌كانی (تاج‌و ریاض‌و ته‌جریدو فیقهی ئاسان) ه. ج= جلد، ص= صه‌حیفه، ل= لاپه‌ره، نیشانه‌ی وه‌رگه‌راوه كوردییه‌كه‌یانه. ز= زنجیره، ژ= ژماره. ئه‌مه له‌هه‌موو شوێنێ وایه.

١٢٤- عَنْ ابْنِ عَباسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: صَعِدَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الصَّفَا ذاتَ يَوْمٍ فَقَالَ: يَاصَبَاحَاهْ فَاجْتَمَعَتْ اليْهِ قُرَيْشٌ قَالُوا: مَا لَكَ؟ قَالَ: (ارَأيْتُمْ لَوْ اخْبَرْتُكُمْ انَّ الْعَدُوَّ يُصَبِّحُكُمْ اوْ يُمَسِّيكُمْ امَا كُنْتُمْ تُصَدِّقُونِي؟ قَالُوا: بَلَى قَالَ: ﴿فَانِّي نَذيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذابٍ شَدِيدٍ﴾ فَقَالَ ابُو لَهَبٍ: تَبا لَكَ الِهَذا جَمَعْتَنَا؟ فَانْزَلَ اللّهُ ﴿تَبَّتْ يَدَا ابِي لَهَبٍ﴾.[١٢٤]

ئه‌مه ده‌قی عه‌ره‌بی ژماره (١٦٨٧)ی ته‌جریدی بوخارییه:

ئیبنوعه‌بباس (ره‌زای خودایان لێ بێ) فه‌رمووی: كاتێ ئایه‌تی: ﴿وانذر عشيرَتك الاقربين﴾ ئه‌ی موحه‌مه‌د! خزم وخوێشانی خۆت، یه‌ك له‌دوای یه‌ك بترسێنه، له‌نزیك ترین یانه‌وه ده‌ست پێ بكه ).كاتێ ئه‌م ئایه‌ته هاته خواره‌وه، كه‌ئایه‌تی (٢٦/٢١٤) دووسه‌دوو چواردمیه له سووره‌تی شوعه‌را، كه‌سووره‌تی بیست وشه‌ش هه‌مه له‌سووره‌ته‌كانی قورئان.

ئیبنوعه‌بباس فه‌رمووی: كاتێ ئه‌م ئایه‌ته هاته خواره‌وه، ڕۆژێك پێغه‌مبه‌ر(دروودی خودای لێ بێ) ڕۆیشته سه‌ر ته‌پۆلكه‌ی سه‌فا، له‌وێ راوه‌ستا وبه‌ده‌نگی به‌رز هاواری كرد: ئه‌ی هاوار له‌م به‌یانی ڕۆژی ڕه‌شه! ). ئیتر قوره‌یش هه‌موو به‌ده‌نگی ئه‌م هاواره وه، چوون وله‌ده‌وری كۆ بوونه‌وه وگوتیان : ئه‌وه چیته، چی قه‌وماوه؟ فه‌رمووی: (ئه‌رێ پێم بڵێن : ئه‌گه‌ر هه‌واڵتان پێ

---

[١٢٤] ته‌جرید/٤، ژماره: ١٦٨٧. بخاری: ٤٨٠١، ١٣٩٤، ٣٥٢٥، ٣٥٢٦، ٤٧٧٠، ٤٩٧١، ٤٩٧٢، ٤٩٧٣. مسلم/شیحا: ٥٠٧، ٥٠٠.




بدەم کە لەشکری دوژمن سەر لەبەیانی، یا سەر لەئێوارە پەی دا دەبیٚو لەناکاو دەدا بەسەرتانا، ئایا باوەڕم پێدەکەن یان نا؟ )گوتیان بەڵێ باوەڕت پیٚ دەکەین، چونکە هەتا ئێستا درۆمان لەتۆ نەبیستووە ! فەرمووی : ( دەسا چاوتان بکەنەوەو خاس وخراپی خۆتان بزانن، من خودا کردوومی بە ترسێنەر بۆ ئێوە، هەتا ئاگادارتان بکەمەوە: ئەگەر لەفەرمانی من دەربچن وبە گوێم نەکەن، کە پێغەمبەری خودام، ئەوا بەزوویی لە گەڵ تۆڵەیەکی سەختی خودایی‌دا ڕووبەڕو دەبنەوە، ئیتر کەیفی خۆتانە، بەئیقتیباس لەم ئایەتە دەیفەرموو: ﴿ فانِّي نَـذيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذابٍ شَدِيدٍ﴾.

جا ئەبولەهەبی مامی پێی گوت: هەی لەناوچیت، دەستەکانت گۆدو شەلەل بن‌و عەمرت نەمێنیٚ، ئا بۆئەمە ئێمەت کۆکردوومەتەوە، گوتمان دەبیٚ چی قەوما بیٚ ! دوای ئەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لیٚ بیٚ) هەڵساو ڕۆیشت، ئەوجا خودای گەورە سوورەتی: ﴿تبّتْ يـدا ابـي لهـبٍ وتـبّ﴾ی لەزەم‌و هەجوی ئەبولەهەبدا نارده خوارەوە. (تاج/٧ ژ/٩ ل/٧٤ ژ/٣- سوورەتی شوعەراء، تاج/٧ ژ/٨٩ ژ/١ ل/٢٦٩- سوورەتی مەسەد =تەببەت یەدا ) + ( تجرید/١ ل/٢٧٠ ژ/١١٤٠ =٢٧٥٣ فتح).

ئەمەیش لەدواوە دەقێکی تری ئەم فەرموودەیە، ژمارە (٩٨)ی پوختەی موسلیم:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: کاتیٚ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە {وَأَنـذِرْ عَـشِيرَتَكَ الْـأَقْرَبِينَ - سـورة الـشعراء/٢١٤} . (واتە: ئەی موحەممەد! خزمە هەرە نزیکەکانت هۆشیار بکەرەوەو بیانترسێنە لەقارو غەزەبی خودا) حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بیٚ) قوڕەیشی بانگ کرد، کە کۆبوونەوە خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بیٚ) هەم بەشێوەی گشتی‌و

هەم بەشێوەی تایبەتی مەترسی دەنانە بەرو هۆشیاری دەکردنەوە، یەکە یەکەو کۆمەڵ کۆمەڵ ناوی هێنانو بۆ نموونە فەرمووی: ئەی نەوەی کەعبی کوڕی لوئەیی! خۆتان لەئاگری سووری دۆزەخ، بەئیمان هێنان، رزگارکەن، ئەی نەوەی مورڕەی کوڕی کەعب، ئەی نەوەی عەبدو شەمس، ئەی نەوەی عەبدومەناف، ئەی نەوەی هاشم، ئەی نەوەی عەبدولموتتەلیب خۆتان رزگارکەن لەئاگری دۆزەخ! ئەی فاتیمەی کچی موحەممەد خۆت رزگارکە لەئاگری دۆزەخ! بزانن کەمن لەلای خودا دەسەڵاتی هیچم نییە کە بیکەم بۆ ئێوە، ئەوەندە هەیە لەدنیادا مافی خزمایەتیتان بەجێ دەهێنم). {ریاض/١، لاپەڕە: ٢٦٤، زنجیرە: ٤٠، ژمارە: ٣٢٩/١٨} + {تاج/٧، لاپەڕە: ٧٤، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٣ - تاج-٤ ژ-٤٠١٩ ج-٤}.

**روونکردنەوە:**

بەکۆی دەنگ زاناکان دەفەرموون، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەجیهانو لەدوا رۆژدا، سوودی هەیە بۆ موسوڵمان، وە مەبەست لەم فەرموودەیەو وێنەی ئەم فەرموودەیە ئەمەیە: (ئەگەر کەسێ موسوڵمان نەبێو لەسەر بێ بڕوایی بمرێ، نە لەجیهاناو نە لەدوا رۆژدا، پێغەمبەر سوودی نابێ بۆی، چونکە کلیلی رزگاری کە باوەڕە بە پەیامی ئیسلام نییەتی). {بڕوانە فەرموودەی ژمارە: ٩٩ و ١٠٠ ی پوختەی موسلیم}.

## (٩٠) بابٌ: شفاعةُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِأبى طالب والتخفيف عنه بِسَبَبِهِ

## تكاى پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) بۆ ئەبو تاليبى مامەى، دەبێ بەهۆى سووكبوونى ئێش و ئازارو سزاى

١٢٥- عَنِ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلْ نَفَعْتَ أَبَا طَالِبٍ بِشَىْءٍ فَإِنَّهُ كَانَ يَحُوطُكَ وَيَغْضَبُ لَكَ؟ قَالَ: « نَعَمْ هُوَ فِى ضَحْضَاحٍ مِنْ نَارٍ، وَلَوْلاَ أَنَا لَكَانَ فِى الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ ».[١٢٥]

عەباسى كوڕى عەبدولموتەليب، كە حەق مامەى پێغەمبەر بوو، عەرزى كرد: ئەى پێغەمبەرى خودا! ئايا هيچ كەڵكێ، سوودێكت هەبوو بۆ ئەبوتاليبى مامەت، چونكە بەڕاستى ئەو زاتە لەكاتى خۆيدا، هەتا لەژيانا بوو، داڵدەى تۆى دەداو، لەسەرى دەكردیتەوە؟ خۆشەويست (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (بەڵێ وا لەناو تەنكاوى ئاگرەكەدا، خۆ ئەگەر من نەبوومايە جێگەى بن بنەوەى ناخى دۆزەخ دەبوو!). {تاج/٦، لاپەڕە: ٢١٣، زنجيرە: ١٠، ژمارە: ٢٢ - تاج-٤ ژ-٣٩١٣ - باسى سوورەتى تەوبە}.

### ڕوونكردنەوە:

عەباسى كوڕى عەبدولموتتەليب مامەى هەقى پێغەمبەرە، نازناوى ئەبو لفەضلە، دوو ساڵ لە پێغەمبەر گەورەتر بوو، بە منالى بزر دەبێ، دايكى ئاه (نەزر) دەكا، ئەگەر دۆزييەوە بەرگى ئاوريشم بۆ كەعبە بكا، وە ئەيدۆزێتەوە، جا نەزرەكەى جێبەجێ دەكا، ئەو يەكەم كەس بووە كە بەرگى بۆ كەعبە كردووە، لە غەزاى بەدردا ديل دەكرێ، بەسەرانە موسوڵمانەكان ئازادى دەكەن،

---

[١٢٥] تجريد/٤، ژمارە: ١٥١٠. بخارى: ٣٨٨٣، ٦٢٠٨، ٦٥٧٢. مسلم: ٢٠٩. شيحا: ٥٠٩ = مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٩٩، ١٠٠.

بەڵام لەو ماوەیەدا ئیسلام دەبێ، وە لەپێش ئازادکردنی مەککەدا، کۆچ دەکا بۆ مەدینە، لە غەزای فەتحی مەککەدا بەشداری دەکا، لە رۆژی حونەیندا، یەکێ بوو لەو موسوڵمانانەی کە هەڵ نەهاتن‌و دەوری پێغەمبەریان چۆڵ نەکردو پێغەمبەر دەیفەرموو: (عەباس پارچەیەکە لە من‌و من پارچەیەکم لە عەباس).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (هەرکەسێ ئازاری عەباس بدا، ئەوە ئازاری من دەدا، چونکە مامی مرۆڤ لە جێگەی باوکێتی).

عەباس کۆمەڵێ فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، لە صەحیحەینا فەرموودەی هەیە، لە بوخاریدا پێنج فەرموودەی هەیە، عەباس زۆر سەخی بوو، زۆر خزم دۆست بو، لەپاش ئەبو تالیب، لەناو مامەکانی پێغەمبەردا، کە یازدە مامەی بووە، عەباس لەوانی تریان زیاتر یاریدەی پێغەمبەری ئەدا، پێغەمبەر زۆر رێزی عەباسی دەگرت، دەیفەرموو: (عەباس مامەمە، هاوخەڵفی باوکمە). عەباس هۆشمەند بوو، نزای گیرا بوو، لە ساڵی حەفدەی کۆچیدا، بێ بارانی بوو، عومەر لەخوا داوای کرد کە لەبەر خاتری عەباسی مامەی پێغەمبەر بارانیان بۆ ببارێنێ، وە خودا بارانی بۆ بارانن (ژمارە: ٥٢٠، بەرگی/١/٤٩٥).

عەباس پیاوێکی بالا بەرزی سپیکەلەی جوان بوو، لە تەمەنی (٨٧) ساڵیدا، لە مانگی رەجەب، یا رەمەزاندا لە مەدینە، مەرگی خودایی، بوو بەمیوانی، لە ئیستیعابا دەفەرموێ: (عەباس پیاوێکی جوانی سپی‌و سووری لەش ناسکی بالا ناوەنجی بوو، دوو پەلکەی هەبوو ... لە مەدینە، لە رۆژی هەینیدا، لە شەوی دوازدەی رەجەبدا، لەپێش شەهید بوونی ئیمامی عوسماندا بە دوو ساڵ، بە مردنی خوا مردووە). هەندێ دەڵێن: لە رەمەزانی ساڵی سیی‌و دووی کۆچی، لە تەمەنی (٨٨) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، لە بەقیع نێژراوە،

ئیمامی عوسمان نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کردووە، سیی‌و دوو ساڵ لەسەردەمی ئیسلامدا ژیاوە، لەسەردەمی نەزانیشدا پەنجاو شەش ساڵ ژیاوە، کە دەکاتە: (٥٦ + ٣٢ = ٨٨) ساڵ، عەبدوڵڵای کوڕی دایهێڵایە ناو گۆڕەکەیەوە. (بڕوانە: بەرگی/٣/٣٤٤، ژمارە: ١٢١٨ + بەرگی/٤/٢٠٠، ژمارە: ١٥١٠ تەجرید + تاج/٥، زنجیرە: ١٧، لاپەڕە: ١٠٣ + تاج/٥، زنجیرە: ٢١، لاپەڕە: ١٣١ + تەجرید – ژمارە: ٧٢١، ٧٦١، ٧٨٨).

١٢٦- عَنْ ابِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّهُ سَمِعَ النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَذكِرَ عِنْدَهُ عَمُّهُ فَقَالَ لَعَلَّهُ تَنْفَعُهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيُجْعَلُ فِي ضحْضاحٍ مِنْ النَّارِ يَبْلُغُ كَعْبَيْهِ يَغْلِي مِنْهُ دِمَاغُهُ.[١٢٦]

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە خزمەتی پێغەمبەردا، باسی ئەبو تالیبی مامەی کرا، گوێم لێ بوو فەرمووی: (هیوام وایە کە لە ڕۆژی زیندووبوونەوەدا تکاو شەفاعەتی من سوودی هەبێ بۆی، سابەشکوو بخرێتە ناو ئاگرێکی تەنکەوە، دەگاتە قولەپێی، مێشکی دەکوڵێ پێی). (تاج/٦ ز/١٠ ف/٢١ ل/٢١٣- ش ).

[١٢٦] تەجرید/٤، ژمارە: ١٥١١. بخاری: ٣٨٨٥، ٦٥٦٤. مسلم: ٢١٠ = مختصر صحیح مسلم: ٥، ژمارە: ١٩٧٨ = مسلم/شیحا: ٢٠٣٦ = تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ٢٠٣٦ = بخاری/٦٥٦٢.

## (٩١) باب: أهْوَنُ أهْلِ النَّارِ عَذَاباً
## ئەوكەسەی لەدۆزەخا، كە لەهەموان ئازاری كەمترە

١٢٧- عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ أَهْوَنَ أَهْلِ النَّارِ عَذَابًا مَنْ لَهُ نَعْلَانِ وَشِرَاكَانِ مِنْ نَارٍ، يَغْلِي مِنْهُمَا دِمَاغُهُ، كَمَا يَغْلِي الْمِرْجَلُ، مَا يَرَى أَنَّ أَحَدًا أَشَدُّ مِنْهُ عَذَابًا، وَإِنَّهُ لأَهْوَنُهُمْ عَذَابًا».[١٢٧]

ئەمە دەقی عەرەبی پوختەی موسلیمە، ژمارە (١٩٧٨):

نوعمانی کوڕی بەشیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو دۆزەخیەی کە ئێش‌و ئازاری لەهەموو کەسێ سووکترە، کابرایەکە جووتێ پێڵاوی ئاگرینی لەپێدایە، جووتێ قەیتانی ئاگرینی پێوەیە، مۆخی ناو کاسەی سەری وەك مەنجەڵی سەر ئاگر، بەو پێڵاوانە دەکوڵێ، لەخۆی وایە کەس لەو ئازاری قورس‌و سەختتر نییە، بەڵام لەچاو خەڵکی تردا، لەگشت کەسێ ئازاری سووکترە!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٥٥، ژمارە: ٥٧٨٢} + {ریاض/١، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٣٩٨ – ترسان لەقاری خوا}.

### ڕوونکردنەوە:

نوعمانی کوڕی بەشیر خۆی‌و باوکی‌و دایکی صەحابەی پێغەمبەر بوون، ئەنصارییە، لە هۆزی خەزرەجە، دایکی ناوی عەمرەیە، خوشکی عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەیە، یەکەم منداڵی ئەنصارە کە لەپاش کۆچ لەدایك بووە، سەدو چواردە فەرموودەی گێڕاوەتەوە، لە دەستەی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر بوو، سەرکاری ئیبنو زوبەیر بوو لەسەر شاری حیمص، لەو ماوەدا کە خەڵکی

[١٢٧] مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ١٩٧٨. مسلم/شيحا: ٥١٥، تەجرید/٥، ژمارە: ٢٠٣٦. بخاری: ٦٥٦٢.

حیمص هەڵگەڕانەوە ئەو هەڵهات، بەڵام لە ڕۆژەکەی واسیطدا کوژرا، لە ساڵی شەستو پێنجی کۆچیدا، تەمەنی دەوری شەستو سێ ساڵ بوو، (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ).

## (٩٣) بابٌ: مُوَالاَة المؤمنين، وَمُقَاطَعَةُ غَيْرِهِمْ والبَرَاءَةُ مِنهُمْ
## باسی دۆستایەتی موسوڵمانانو پەیوەندی بڕین لەگەڵ کەسانی تردا

١٢٨- عَنْ عَمْرِو بْنَ الْعَاصِ، (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُول اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، جِهَارًا، غَيْرَ سِرٍّ، يَقُولُ: «أَلاَ إِنَّ آلَ أَبِى... (يَعْنِي فُلاَناً) لَيْسُوا لِي بِأَوْلِيَاءٍ، إِنَّمَا وَلِيِّيَ اللَّهُ وَصَالِحُ الْمُؤْمِنِينَ وَلكِنْ لَهُمْ رَحَمٌ أَبُلُّهَا بِبُلاَلِهَا». يعنى: أَصِلُهَا بِصِلَتِهَا.[١٢٨]

عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: بە گوێی خۆم بە ئاشکرا، بە دەنگی بەرز، نەك بە نهێنیو لەژێر لێوەوە، لە زاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (خانەوادەی نەوەی فیسارە کەس، کە ڕەگەزو نەژادو کەسوکاری منن، پشتیوانو سەروەری من نین، پشتو پەناو سەروەرو پشتیوانی من تەنیا خودایەو بەس، لەدوا خودا کەسو پشتو پەنای من هەموو موسوڵمانێکی خواناسی باشە، کە لەکاتی پێویستدا دەبن بە پارێزەرانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام). ئەوەندە هەیە خزمو کەسوکار مافی خزمایەتیان لەسەرم هەیە، هەتا خۆم ماوم لە دنیادا، بەپێی شەرعی خودا، سیلەی ڕەحمیان بەجێ دەهێنم. (ریاض/١ ل/٢٦٥ ژ/٣٣٠ ز/٤٠- ش).

---

[١٢٨] تەجرید/٥، ژمارە: ١٩١٨. بخاری: ٥٩٩٠. مسلم: ٢١٥ = شیحا: ٥١٨ - مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٥٩.

**مەبەست لەم فەرموودەیە جەخت کردنە لەسەر ئەم سێ شتە:**

١. پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- کەسایەتییەکی خێڵەکی نییە، کەبەکەسوکار و هۆزی خۆیەوە بنازێ.

٢. هەمیشە خودای گەورە پشتیوانی ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، وە بەپێی بەڵێنی خۆی: وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ لەکاتی پێویستدا پشتیوانی ئەم ئایینە پیرۆزە دەکا، هەروەها موسوڵمانان بەشێوەی گشتی.

بەجێ هێنانی سیلەی رەحم رەفتارێکی بەرزی ئیسلامییە، وە پێغەمەر خۆی لەوبوارەدا سەرمەشق و پێشەوایە.{ریاض/١، لاپەرە: ٢٦٥، زنجیرە: ٤٠، ژمارە: ٣٣٠ – ش. تەجرید: ١٩١٨}.

**روونکردنەوە:**

عەمری کوڕی عاص (رەزای خودای لێ بێ) لەپێش ئازادکردنی مەککەدا موسوڵمان بووە، پیاوێکی بلیمەت بووە، پێغەمبەر رێزی تایبەتی ئەوی دەگرت، چونکە داناو زاناو ئازا بوو، ئەو قنسرینی ئازادکرد، عومەر کردی بە حوکمداری فەلەستین. لە ئاژاوەکەی نێوانی عەلیو موعاوییەدا، عەمر لایەنگیری موعاوییە بوو، لەپاشا موعاوییە کردی بە فەرماندەی سوپایەکی گەورەو ناردی بۆ میسر، هەتا لە رۆژی جەژنی رەمەزانا لەوێ مرد، لە تەمەنی نەوەد ساڵیدا، لە (المقطم) نێژرا، عەبدوڵلای کوڕی نوێژی لەسەرکرد، ئەوجا گەڕایەوە نوێژی جەژنی بۆ خەڵکەکە کرد، وە لەشوێنی باوکی بوو بە حوکمداری سەر میسر، عەمر شاعیرێکی جوان بوو.

## (٩٤) باب: الدليل على دخول طوائف من المسلمين الجنة بغير حساب ولا عذاب
## كۆمەلانێ لە موسولمانان، بەبێ لێپرسینەوەو سزادان دەچنە بەهەشت

١٢٩- حَدَّثَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ - رضى الله عنه - قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - يَقُولُ « يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي زُمْرَةٌ هِيَ سَبْعُونَ أَلْفًا ، تُضِيءُ وُجُوهُهُمْ إِضَاءَةَ الْقَمَرِ ليلة البَدْرِ» . فَقَامَ عُكَاشَةُ بْنُ مِحْصَنٍ الأَسَدِيُّ يَرْفَعُ نَمِرَةً عَلَيْهِ قَالَ ادْعُ اللَّهَ لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ . فَقَالَ « اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ مِنْهُمْ » . ثُمَّ قَامَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ . فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ « سَبَقَكَ عُكَاشَةُ» .[١٢٩]

ئیبنوعەباس -رەزای خودایان لێبێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر- رۆژی لەمالْ دەرچوو هات بۆ ناو مان فەرمووی: (لەخەوما نەتەوەکانم یەکە یەکە پێ نیشان دران و ڕانوێنران لەبەرچاوم. دیارە کەخەوی پێغەمەرانیش هەقەو راستەو دروستە، تەماشام کرد: پێغەمەری وا هەبوو، نزیکەی دەپیاوی لەگەڵ بوو، وە هەبوو دوو پیاوی لەگەڵدا بوو، وە پێغەمەری واهەبوو کەیەك پیاوی لەگەڵدابوو، وەهەموو گەلەکەیان بریتی بوون لەو چەند کەسە، یالەو دووپیاوە، یالەو تاقە زەلامە! هەتا پێغەمەری وا هەبوو کەتەشریفی بەبەردەمما ڕەت دەبوو، کەسی لەگەل نەبوو، چونکە لەدنیادا لەگەلەکەی کەس باوەڕی پێنەهێنابوو!

هەتا لەدوای ئەوان تارمایی‌و عەشاماتێکی زۆرم بینی، تا چاوبڕکا ئاسۆیان داگرتبوو، گوتم دەبێ ئەم گەلە زۆرە کێبێ، تۆ بڵێی گەلی ئیسلامی من بێ؟ دەی خوادا ئەوان بن. بەڵام پێم گوترا ئەمە مووساو گەلی مووسان. ئەنجا پێم گوترا:

---

[١٢٩] تەجرید/٥، ژمارە: ١٨٧٦. بخاری: ٥٧٠٥، ٣٤١٠، ٥٧٥٢، ٦٤٧٢، ٦٥٤١. مسلم: ٢٢٠. شیحا: ٥٢١ + مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١٠١. شیحا: ٥٢٦.

ئادەی تەماشای ئێرەوە بکە و چاوبگێڕە بە ئاسۆی ئاسمانا کاتێ تەماشام کرد تارمایی عەشاماتێکی زۆرم دی، هەتا چاو برکا ئاسۆی داپۆشی بوو، دیسان گوتیانەوە پێم: ئادەی تەماشای ئەم لاولای خۆشت بکە، جا دیسان کەتەماشام کرد تا چاوبڕکا بەراست و بەچەپا، بەهەر چوارلادا، تارمایی عەشاماتێ بێشمار ئاسۆی داگرتبوو پێم گوترا.. ئەمە هەمووی نەتەوە (ئوممەت)ی تۆن، لەمانە حەفتا هەزار کەسیان بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشت).

جا لەپێش ئەوەدا کەپێغەمەر -دروودی لەسەر- باسی ئەوحەفتا هەزار کەسەیان بۆ بکا، کەکێن و کێ نین و چ کارەن، خۆی رۆیشتەوە بۆ ماڵەوە، یارانیش بڵاوەیان لێکرد، وەلەناو خۆیانا کردیان بەمقۆمقۆ و گوتیان:

ببێ و نەبێ ئەوانە ئێمەین، چونکە ئێمە بەردی بناغەی ئیسلاممان دامەزراند: بڕوامان هێنا بەخودا و پەیڕەوی پێغەمەرەکەیمان کرد، هەندێکی تریان گوتیان: ئێمە هەرچەند باوەڕمان هێناوە بەخوداو، بەپێغەمەری خودا، لەم ڕووەوە شایانی ئەوەین کەئێوە دەیڵێن، بەڵام لەبەر ئەوەی کەئێمە لەسەردەمی فرە خودایی (شرك) دا لەدایك بووین، ڕەنگ بێ لەبەرئەوە ئەوانە ئێمە نەبین، بەڵکوو ئەوانە نەتەوەی ئێمە بن، کەیەکسەر لەئیسلامەتیدا لەدایك بوون. جاکاتێ ئەم وتووێژە گەیشتەوە بەپێغەمەر -دروودی لەسەر- تەشریفی هات، فەرمووی: (ئەوانە کەسانێکن لەنەتەوەی ئیسلام، کە نووشتەناکەن و نووقڵانەی خراپ لێ نادەن و لەبەر هەندێ نەخۆشی کەوا باوە خەڵکی تر هەندێ شوێنی تایبەتی خۆیان بەنیازی چارە سەرو دەرمان خۆیان داخ دەکەن، ئەوان ئەوەناکەن و خۆیان لەبەرشتی واداخ ناکەن، بەڵکو هەمیشە بۆ جێبەجێ بوونی کارو فرمانیان پشت بەلوتفو کەرەم و بەخششی خودا دەبەستن و بەس!).




جا عەککاشەی کوڕی میحصەن -ڕەزای خوای لێ بێ- هەڵسا فەرمووی: ئەی پێغەمەری خودا! ئایا من لەم دەستەیەم یانا؟ فەرمووی: (بەڵێ تۆ لەوانی) پیاوێکی تریش هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمەری خودا! ئایا من لەوانم یانا؟ فەرمووی: (وەکاشە دەستپێشکەری لێکردیو ئەو بەهرە گەورەیەی بۆخۆی برد) (بڕ: تاج/٤ ز/٨٠ ل/٢٤٠ ژ/١) + (ریاض صالحین/کوردی/١ ز/١٠ ژ/٧٤ ل -٨٧- چاپی دووەم).

## ڕوونکردنەوە:

**یەکـــەم**: وەك لەفەرموودەی تری زۆری صەحیحەوە دەردەکەوێ: کەنوشتەکردن بەئایەتەکانی قورئان و بەناوە جوانەکانی خوداو بە پاڕانەوەی ڕێکی شەرع دروستە، یاخۆ داخکردن لەبەرهەندێ نەخۆشی دروستە، وەك داخکردنی لاجانگی مناڵ، بەمووررووی ئاقیق، یاداخکردنی دوگمەی مەیاسیری و زۆر شتی تری لەم بابەتە، بڕوانە: ژمارە:١٠٠٦ تجرید=٢٢٧٦ فەتحولباری=بەرگی/٣ ل-٨١ + تاج/٤ ز-٧٣ ل-٢١٣).

**دووەم**: عوککاشەی کوڕی میحصەن -ڕەزای خودای لێ بێ- لەموسوڵمانە پێشینەکانە، پیاوێکی زۆر جوان بوو، سوارچاکی وەك خۆی نەبوو، لەکۆچکارانە، ئامادەی جەنگی بەدرو جەنگەکانی تری پاشی بووە، پاڵەوانانە لەجەنگی بەدردا دەجەنگێ، شمشێرەکەی لەدەستیدا دەشکێ، چونکە زۆرینەی جەنگاوەرەکانی ئەو ڕۆژگارە زریەی ئاسنین و مەتاڵیان لەبەردابوو، کاتێ شمشێر بەتوندی بەری دەکەوت وەك بیکێشی بەئاسنو بەرددا وابوو، جاپێغەمەر -دروودی خوای لەسەر- بڕەدارێکی قەوی دەداتێو پێی دەفەرموێ: (بەمە جەنگ بکە) ئیتر لەخواوە ئەو بڕەدارە دەبێ بەشمشێرێکی درێژی پشت ئەستووری سپی ئیتر




وەكاشە شەڕی پێ دەكا هەتا خودا سەریان دەخات، لەوەدوایش ئەم شمشێرە لەلای وەكاشە دەمێنێ، هەتا لەشەڕی هەلگەڕاوەكانا، كەناوداره بەحوروبی ریددە، لەبوزاخە، لەسەردەمی جێنشینی ئەبوبەكری صەدیقا بەدەستی تولەیحەی كوڕی خوومیلید كوژرا، ئەم تولەیحەیە ئەوكاتە لافی پێغەمەرێتی لێدەدا، بەلاّم لەئەنجاما موسولّمان بۆوە، وە موسولّمانێكی دروستی لێ دەرچوو، وەكاشە لەم شەڕەدا، لەگەل سابیتی كوڕی ئەقرەمدا، پێش قەرەولّی ئیمامی خالیدی كوڕی وەلید بوون، تولەیحە و سەلەمەی برای هەر دووكیان كوشتن، لەشوێنێ كەناوی بوزاخە بوو، لەولاّتی یەمامە، كەوا لەیەمەن. لەئیستیعابا دەلێ: (كاتێ پێغەمەر —دروودی لەسەر- مەرگ بوو بەمیوانی عوكاشە، تەمەنی چل‌و چوار سالّ بوو، سالێ لەوەدوا شەهیدكرا). لەسالّی دوازدەی كۆچیدا شەهید بووە، دیارە كە گۆڕەكەی لەودەفەرمیە، لەگەلّ گۆڕی شەهیدەكانی تری حوروبی ریددەدا،

لێرەدا شتێ هەیە شایانی روونكردنەوەیە، ئەویش ئەوەیە: كەلەزۆر شوێن خزن‌و گۆڕی پیرۆزو شەخس هەیە بەناوی (وەكاشە)وە، وەخەلّكی ئەو دەفەرە، بەتایبەتی ڕەشەخەلّك و خەلّكی عەوام، خاوەنی ئەوگۆڕو قسنانە بەم حەزرەتی عەكاشەیە دەزانن لەبەرئەوە زۆر بەچاوی رێزو خۆشەویستییەوە تەماشای شەخسی ناو ئەو گۆڕانە دەكەن‌و بەگەرمی سەردانیان دەكەن، هەتا مەلاو زانایانیش بەشداری لەم هەست‌و سەردانانەدا دەكەن.

وەمن بەچاوی خۆم دوو مەرقەدم دیوە بەم ناوە، كەیەكێكیان وا لەقەراخ، وا لەنێوانی برایماوەو هەرگێنەدا، لەبەهارانا خەلّكێكی زۆر لەهەموو چینێ، لەژن‌و پیاو، لەگەورەو منالّ، لەشێخ‌و مەلاو نۆمی، لەرۆژی چوارشەمەدا، لەم گوندانەوە، هەتا ئێستاش دێن بۆسەردانی ئەم وەكاشەیە، وەچەندین گۆڕی

تری وەکاشە ناوی تریش لەشوێنیانی تریش هەیە. گۆڕێکی تریشم بەم ناوە لەناوچەی شوان، لەپارێزگای کەرکووك دیوە، لەبەهارانا بەتایبەتی لەم گوندانەوە دێن بۆئەم وەکاشەی کەوا لەپاڵ هەرگێنەدا: لە قەراخ: لەتیمارو گەڕمزیل و گڵەزەردەو قەڵاسوورەو سەرزەلو داریکەلی و تەنگی سەرو فیکە دەرەو برایماوە و هەرگێنەو کانی رۆشنایی و هاڵدەرە و چەندین گوندی تری ئەم دەڤەرەوە، سەرجەم خەڵکی ئەم گوندانە، بەخاو خێزانەوە، دەهاتن بۆسەردانی گۆڕی وەکاشەشە.

لەپاش مەراسیمی زیارەت، دەبوو بەسەیران، هەبوو هەڵ دەپەڕین، هەبوو نیشانیان دەنایەوە، ئیتر هەرکەسە بەجۆرێ تالەدوا نوێژی عەسر، دووبارە زیارەتیان دەکردەوە و ئەوجا بڵاومیان لێ دەکرد. وەمن بەچاوی خۆم دیومە کەشێخ محمودی مەلیكو عائیشە خانی خێزانی، لەگەڵ کۆمەڵێ چەکداری خۆیانا لەبەهاران، لەداریکەلییەوە، هاتبوون بۆ زیارەت و سەیران بۆ سەرئەم وەکاشەیە! ئامینە خانی سەرزە لیشیان لەگەڵدا بوو، کەژنێکی شاژنی خاوەن دیوەخان و هەڵوێستی مەردانەبوو لەزۆر کەسی خەڵکی برایماوە و خەڵکی سەرزەلو مەلاکانی ئەوناوچەیەم بیستووە: کە کۆمەڵێ پەیدا بوو بوون، دژایەتی گۆڕی پیاوچاکانیان دەکرد، ئەم جۆرە مەرقەدەپیرۆزەیان دەرووخان، وەنەیاندەهێشت خەڵك سەردانیان بکا، گوتیان: یەکی لەوکۆمەڵە ناوی بەکر بوو کوڕی مەلا رەئوفی هەرگێنەبوو، کەوالەپاڵ مەرقەدەکەدا، ئەو گۆڕی ئەم وەکاشەیەی تێك داو، بێ رێزی پێ کرد، گوتیان: ساڵ وەرنەگەڕا، کەبەر موشەکێ کەوت، یەك پەنجەیان بەئەنگوستیلەکەیەوە دۆزییەوە، کەبەهۆی ئەوپەنجەیەوە خوشکێکی ناسییەوە!!.




وەكاشەكەی تریش لەناوچەی شوان، حیزبی بەعس رووخاندی، لەگەل ئەوگوندە كوردانەی كەلەو ناوچەیە بوون، گوایە موخەریبین ئەو مەرقەدە بۆ خۆیان دەكەن بەبنكەو بارەگا، ئەگەر نەروو خێنرێ، وە حیزبی بەعس بەهەزاران مزگەوتو مەرقەدی پیاوچاك و شوێنی پیرۆزیان لەكوردستان رووخاند، تەنانەت زۆر لەمەلاو زەیوانو خزمەتگوزارانی ئەوشوێنە پیرۆزانەشیان كوشت، لەهەمووی سەیرتر ئێستا كەسانێ هەن، بۆ ئەو رژێمە خوێنرێژو خوێنمژە دەگرینو خۆزگەی بۆدەخوازن، بێگومان كەچارەنووسی ئەمانیش وەك چارەنووسی حیزبی بەعس دەبێ، ئەگەر خراپتریش نەبێكە ئەویش هەموومان دەزانین كەچی بەسەرهات!. وە وەكوو بیستوومە لەكەسی متمانەپێكراو، خزنی وەكاشە ناوی تریش هەیە بەهەمان ناوو نیشان، وە ئەمانە هەموویان گۆڕی پیاو باشانن وە هیچیان گۆڕی ئەم وەكاشەیە نین كەلەم فەرموودەیەدا ناوی هەیە.

ئەمەش دەقی تەرجەمەی فەرموودەكەی ئێرەیە:

ئەبو هومیرەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (درودی خودای لەسەر بێ): (تاقمێ لەنەتەوەی ئیسلامی من، كە حەفتا هەزار كەسن، دەچنە بەهەشت روخساریان گەشو رۆشنە، وەك مانگی شەوی چواردە).

ئەبو هورەیرە فەرمووی: عوكاشەی كوڕی میحصەنی ئەل ئەسەدی خەرقەیەكی رەنگ پڵنگی لەبەرابوو، هەڵی بڕیو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەخودا بپاڕێرەوە كە بمكا بەیەكێ لەو كۆمەڵە، فەرمووی: (ئەی خودایە عەكاشە بكە بەیەكێ لەوان).

ئەوجا پیاوێکی ئەنصاریش هەڵسا، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەخودا داوابکە، کەمنیش لەوان بم، فەرمووی: (وەکاشە دەستپێشکەری لێ کردیو ئەو بەهرە گەورەیەی برد بۆ خۆی!).

١٣٠- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - قَالَ « لَيَدْخُلَنَّ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي سَبْعُونَ أَوْ سَبْعُمِائَةِ أَلْفٍ - لاَ يَدْرِى أَبُو حَازِمٍ أَيُّهُمَا قَالَ - مُتَمَاسِكُونَ ، آخِذٌ بَعْضُهُمْ بَعْضًا ، لاَ يَدْخُلُ أَوَّلُهُمْ حَتَّى يَدْخُلَ آخِرُهُمْ ، وُجُوهُهُمْ عَلَى صُورَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ».[١٣٠]

ئەمەیش دەقی فەرموودەکەی ئێرەیە، کە دەقی ژمارە (٦٥٥٤)ی صەحیحی بوخارییە:

سەهلی کوڕی سەعد فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەنەتەوەی ئایینی من حەفتا هەزار کەس) یا فەرمووی: (حەوت سەد هەزار کەس دەچنە بەهەشت). فەرموودە گێڕەوە نەیدەزانی کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (حەفتا هەزار) یا فەرموویەتی: (حەوت سەد هەزار) فەرمووی: (ئەم خودا پێداوانە کاتێ دەچنە ناو بەهەشت، بەڕیز دەستی یەکترییان گرتووە، دەست لەیەکتری بەرنادەن، هەتا بەرودوا هەموویان دەڕۆنە ناو بەهەشتەوە، روویان گەش و گەشاوەیە، لەسەر شێوەی مانگی شەوی چواردە).

١٣١- عَنْ حُصَيْنُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ فَقَالَ: أَيُّكُمْ رَأَى الْكَوْكَبَ الَّذِى انْقَضَّ الْبَارِحَةَ؟ قُلْتُ: أَنَا. ثُمَّ قُلْتُ: أَمَا إِنِّى لَمْ أَكُنْ فِى صَلاَةٍ، وَلَكِنِّى لُدِغْتُ. قَالَ: فَمَاذَا صَنَعْتَ؟ قُلْتُ: اسْتَرْقَيْتُ، قَالَ: فَمَا حَمَلَكَ عَلَى ذَلِكَ؟ قُلْتُ: حَدِيثٌ حَدَّثَنَاهُ الشَّعْبِيُّ، قَالَ: وَمَا حَدَّثَكُمُ الشَّعْبِيُّ؟ قُلْتُ: حَدَّثَنَا عَنْ بُرَيْدَةَ بْنِ

---

[١٣٠] بخاری: ٦٥٥٤. مسلم/شيحا: ٥٢٥.

حُصَيْبٍ الأَسْلَمِيِّ أَنَّهُ قَالَ: لاَ رُقْيَةَ إِلاَّ مِنْ عَيْنٍ أَوْ حُمَةٍ، فَقَالَ: قَدْ أَحْسَنَ مَنِ انْتَهَى إِلَى مَا سَمِعَ، وَلَـكِنْ حَدَّثَنَا ابْنُ عَبَّاسٍ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: « عُرِضَـتْ عَلَيَّ الأُمَمُ، فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ وَمَعَهُ الرُّهَيْطُ، وَالنَّبِيَّ وَمَعَهُ الرَّجُلُ وَالرَّجُلاَنِ، وَالنَّبِيَّ لَـيْسَ مَعَهُ أَحَدٌ، إِذْ رُفِعَ لِي سَوَادٌ عَظِيمٌ فَظَنَنْتُ أَنَّهُمْ أُمَّتِي، فَقِيلَ لِي: هَـذَا مُوسَـى وَقَوْمُـهُ، وَلَـكِنِ انْظُرْ إِلَى الأُفُقِ، فَنَظَرْتُ فَإِذَا سَوَادٌ عَظِيمٌ فَقِيـلَ لِـي: انْظُـرْ إِلَـى الأُفُـقِ الآخَـرِ، فَنَظَرْتُ فَإِذَا سَوَادٌ عَظِيمٌ، فَقِيلَ لِي: هَذِهِ أُمَّتُكَ، وَمِـنْهُمْ سَـبْعُونَ أَلْفًـا يَـدْخُلُونَ الْجَنَّـةَ بِغَيْرِ حِسَابٍ وَلاَ عَذَابٍ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: فَلَعَلَّهُمُ الَّذِينَ صَحِبُوا رَسُولَ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَقَالَ بَعْضُهُمْ فَلَعَلَّهُمُ الَّذِينَ وُلِدُوا فِي الإِسْلاَمِ، وَلَمْ يُشْرِكُوا بِاللَّهِ، وَذَكَـرُوا أَشْيَاءَ فَخَرَجَ عَلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: مَا الَّذِي تَخُوضُونَ فِيـهِ؟ فَأَخْبَرُوهُ، فَقَالَ: هُمُ الَّذِينَ لاَ يَرْقُونَ وَلاَ يَسْتَرْقُونَ، وَلاَ يَتَطَيَّرُونَ، وَعَلَى رَبِّهِـمْ يَتَوَكَّلُـونَ، فَقَامَ عُكَّاشَةُ بْنُ مِحْصَنٍ، فَقَالَ: ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، فَقَالَ: أَنْتَ مِـنْهُمْ، ثُـمَّ قَـامَ رَجُلٌ آخَرُ فَقَالَ: ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، فَقَالَ: سَبَقَكَ بِهَا عُكَّاشَةُ».[١٣١]

ئەمە دەقی ژمارە (١٠١)ی پوختەی موسلیمە، زیادەی زۆری واتیادا:

حوصەینی کوڕی عەبدوڕەحمان فەرمووی: لە خزمەتی سەعیدی کوڕی جوبەیردا بووم، فەرمووی: دوێنێ شەو کێ ئەستێرە کشانەکەی بینی؟ گوتم: من. لەپاشا گوتم: لەڕاستیدا لەوکاتە درەنگەی شەودا خەریکی شەونوێژ نەبووم، بەڵام شت پێوەی دابووم. فەرمووی: ئەی چیت کرد؟ گوتم: نووشتم کردو دووعاو نزام بەسەردا خوێند، فەرمووی: چی ئەوەی پێکردیتو هۆی کردنی ئەو نووشتەکردنە چی بوو؟ گوتم: فەرمایشتێ کە شەعبی بۆی گێڕاینەوە، فەرمووی: ئەو فەرموودەیە چی بوو کە شەعبی گێڕایەوە بۆتان؟ گوتم: شەعبی

---

[١٣١] مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١٠١. مسلم/شيحا: ٥٢٦. تجريد البخاری/٤، ژمارە: ١٨٧٦ = بخاری: ٥٧٠٥، ٣٤١٠، ٥٧٥٢، ٦٤٧٢.




فەرمووی: بورەیدەی کوڕی حوصەیبی ئەسلەمی ئەم فەرمایشتەی پێمان فەرموو: (نووشتووی فرە تەواو ئەوەیە کە بۆ چاوەزاربێ، یا بۆ چارەی ژاری گەزندەو جانەوەری ژەهردار بێ!).

سەعید فەرمووی: (بەڕاستی کاریێ جوانە، کە مرۆڤ پابەندبێ بەو فەرموودەو فەرمایشتەوە، کە لەزانایانی دەبیستێ!).

بەڵام ئێمە ئیبنو عەباس گێڕایەوە بۆمان، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆژێ لەماڵ دەرچوو، هات بۆناومانو فەرمووی: (لەخەوما نەتەوەکانم یەکە یەکە پێ نیشاندرانو ڕانوێنران لەبەرچاوم، دیارە کە خەوی پێغەمبەرانیش هەقەو ڕاستەو دروستە، تەماشام کرد: پێغەمبەری وا هەبوو، نزیکەی دە پیاوێکی لەگەڵدا بوو، وە هەبوو دوو پیاوی لەگەڵدا بوو، وە پێغەمبەری وا هەبوو کە یەك پیاوی لەگەڵدا بوو، وە هەموو گەلەکەیان بریتی بوون لەوچەند کەسە، یا لەو دوو پیاوە، یا لەو تاقە زەلامە!! هەتا پێغەمبەری وابوو کە تەشریفی بە بەردەمما ڕەت دەبوو کەسی لەگەڵ نەبوو، چونکە لە دنیادا لە گەلەکەی کەس باوەڕی پێی نەهێنا بوو!!)

هەتا لەدوای ئەوان تارماییو عەشاماتێکی زۆرم بینی، تا چاو بڕکات ئاسۆیان داگرتبوو، گوتم: دەبێ ئەم گەلە زۆرە کێ بن، تۆ بڵێی گەلی ئیسلامی من بێ؟ زەینم بۆئەوە چوو کە ئەوان بن، بەڵام پێم گوترا: ئەمە مووساو گەلی مووسان، ئەنجا پێم گوترا: ئادەی تەماشای ئێرەوە بکەو چاو بگێڕە بە ئاسۆی ئاسمانا، کاتێ تەماشام کرد تارمایی عەشاماتێکی زۆرم دی، هەتا چاو بڕکا ئاسۆی داپۆشی بوو، دیسان گوتیانەوە پێم: ئادەی تەماشای ئەملاو لای خۆت بکەو سەیری ئاسۆ لەهەموو لایەکەوە بکە، جا دیسان کە تەماشام کرد، هەتا چاوبڕکا بەڕاستو بەچەپا، بەهەر چوارلادا، تارمایی عەشاماتێ بێشمار ئاسۆی




داگرتبوو، پێم گوترا: ئەمە هەمووی نەتەوە (ئۆمەت)ی تۆن‌و ئەمانە گەلی ئیسلامی موحەممەدن! لەمانە حەفتا هەزار کەسیان بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشت).

جا لەپێش ئەوەدا کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) باسی ئەو حەفتا هەزار کەسەیان بۆ بکا، کە کێن‌و کێ نین‌و چ کارەن، خۆی رۆیشتەوە بۆ ماڵەوە، یارانیش بڵاوەیان لێ کردو لەناو خۆیانا کردیان بە مقۆ مقۆو گوتیان: ببێ‌و نەبێ، ئەوانە ئێمەین، چونکە ئێمە بەردی بناغەی ئیسلاممان دامەزراند: بڕوامان هێنا بەخوداو پەیڕەوی پێغەمبەرەکەیمان کرد، هەندێکی تریان گوتیان: ئێمە هەرچەند باوەڕمان هێناوە بەخوداو، بە پێغەمبەری خودا، بەڵام لەبەرئەوەی کە ئێمە لەسەردەمی فرە خودایی (شِرْك)دا لە دایك بووین، رەنگ بێ لەبەرئەوە ئەوانە ئێمە نەبین، بەڵکوو ئەوانە نەتەوەی ئێمە بن، کە یەکسەر لە ئیسلامەتیدا لەدایك بوون‌و هەرگیز هاوبەشیان بۆ خودا دانەناوە، وە هەندێ تر هەندێ بۆ چوونی تریان هەبوو. جا کاتێ ئەم وتوو وێژە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هات بۆ ناویان، فەرمووی: (ئەوە مقۆ مقۆی چیتانە؟ عەرزیان کرد: کە باسی ئەوەمان دەکرد، فەرمووی: (ئەوانە کەسانێکن لە نەتەوەی ئیسلام، کە خۆیان نووشتە ناکەن‌و داوای نووشتە کردنیش لەکەس ناکەن‌و نوقڵانەی خراپ لێ نادەن‌و (لەبەر هەندێ نەخۆشی، وەك مایەسیری، کەوا باوە هەندێ کەس، هەندێ شوێنی تایبەتی خۆیان، بە نیازی چارەسەرو دەرمان، ئەو شوێنەیان، داخ دەکەن، ئەوان ئەوە ناکەن‌و خۆیان لەبەر شتی وا داخ ناکەن) بەڵکوو هەمیشە بۆ جێبەجێ بوونی کاروفرمانیان پشت بە لوتفو کەرەم‌و بەخشش‌و ویستی خودا دەبەستن‌و بەس).

حا وەكاشە (عەككاشـە)ی كـوڕی میحـصەن (رەزای خـودای لێ بـێ) هەڵسا فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا من لەم دەستەیەم یانا؟ وە نـزام بـۆ بكـە لـەلای خـودا كـە مـن یـەكێ بم لـەوان. فـەرمووی: (بـەڵێ تـۆ لـەوانی). پیاوێـكی تریش هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! نزام بۆ بكە لەلای خـودا كـە منـیش بكـا بەیـەكێ لـەوان. فـەرمووی: (وەكاشـە دەسپێـشكەری لێ كـردی‌و ئـەو بـەهرە گەورەیـەی بـرد بـۆ خـۆی). {بڕوانـە: تـاج/٣، زنجیرە: ٨٠، لاپـەڕە: ٣٨٦، ژمـارە: ٣٠٦٣/١ + زنجـیرە: ٧٣ هـەتا زنجـیرە: ٧٥ — باسـی دووعـاو نووشـتە} + {ریـاض صـالحین/كـوردی/١، زنجـیرە: ١٠، ژمـارە: ٧٤، لاپـەڕە: ٨٧ — چـاپی دووەم} + {تەجریدی بوخاری = مختـصر صـحیح البخـاری/كوردی/٥، لاپـەڕە: ١٦٨، ژمـارە: ١٨٧٤ = ٥٧٠٥ فتـح الباری‌و تەرەفەكانی، كە ئـەم ژمارانـەی تـرن: ٣٤١٠، ٥٧٥٢، ٦٤٧٢، ٦٥٤١}.

روونكردنەوە:

١- وەك لە ژمارە (٩٧)دا روونكرایەوە خـەونی پێغەمبـەر هەقـەو بەشێـكە لـە سـرووش (وەحـی). (بڕوانـە: تەجریـد/كـورد/١، لاپـەڕە: ١٢، ژمـارە: ٣/٣و تەرەفەكانی).

٢- لـە تەجریـدا، بـەرگی سـێ كـوردی ژمـارە: ٢٢٧٦/١٠٠٦. باسێـكی جـوانم لەبارەی نووشتەو دووعاوە نووسیوە، گەر بفەرمووی سـەرەنجی بـدەی بـێ سـوود نابێ. لەبەرگی پێنجیش‌دا، ژمارە: ٥٧٠٥/١٨٧٦ ژیننامـەی حـەزرەتی وەكاشـەم زۆر بـەجوانی نووسـیوە، لەگـەڵ چـەند سەرنجێـكا سـەبارەت بـە وەكاشـەو مەرقـەدە زۆرەكـانی، دیـسان تەماشـای مایـەی رەحمـەت‌و پیـت‌و فـەڕە. هـەروا ژیننامـەی سـەعیدی كـوڕی جوبەیریـشم لـە تەجریـدا، بـەرگی پێنجـی كـوردی ژمـارە:

٥٥١٥/١٨٣٣ زۆر بەجوانی نووسیوە، لەگەڵ چەند سەرنجێکا، خوێندنەوەی هۆی پیتو فەرە.

١٣٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِى قُبَّةٍ نَحْوًا مِنْ أَرْبَعِينَ رَجُلاً، فَقَالَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا رُبعَ أَهْلِ الْجَنَّةِ؟ قَالَ: قُلْنَا: نَعَمْ، فَقَالَ: « أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا ثُلُثَ أَهْلِ الْجَنَّةِ؟» فَقُلْنَا: نَعَمْ، فَقَالَ: وَالَّذِى نَفْسُ مُحمدٍ بِيَدِهِ، إِنِّى لأَرْجُو أَنْ تَكُونُوا نِصْفَ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَذَاكَ أَنَّ الْجَنَّةَ لاَ يَدْخُلُهَا إِلاَّ نَفْسٌ مُسْلِمَةٌ، وَمَا أَنْتُمْ فِى أَهْلِ الشِّرْكِ إِلاَّ كَالشَّعْرَةِ الْبَيْضَاءِ فِى جِلْدِ الثَّوْرِ الأَسْوَدِ. أَوْ كَالشَّعْرَةِ السَّوْدَاءِ فِى جِلْدِ الثَّوْرِ الأَحْمَرِ».[١٣٢]

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەناو خێوەتێکا بووین، دەوری چل پیاوێ دەبووین، لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەدی رازی دەبن کە ئێوەی گەلی موسوڵمان چواریەکی خەڵکی بەهەشت بن؟). فەرمووی: گوتمان: ئەرێ، رازی دەبین، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): ئەی رازی دەبن کە ئێوە سێیەکی خەڵکی بەهەشت بن؟ گوتمان: بەڵێ، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (بەوکەسە کە گیانی موحەممەدی بەدەسە، کە خودای تاكو تەنیایە، من ئومێد دەکەم کە ئێوە نیوەی خەڵکی بەهەشت بن، چونکە ئەوەی کە موسوڵمانە دەچێتە بەهەشت، ناموسوڵمان ناچێتە بەهەشت، دەی ئێوە لەچاو بتپەرستو هاوبەش پەیداکەرانا، وەك تاقە تەڵێ مووی سپی وایە، بە پێستی گایەکی رەشەوە، یاوەك تەڵێ مووی رەش وایە لە پێستی نۆبەنگایەکی

---

[١٣٢] مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١٠٢. شيحا: ٥٢٨. تجريد/٤، ژمارە: ١٣٤٢. بخاری/ ٣٣٤٨.

سووردا). تاج/٦/٢٦٦، ژماره: ٧، زنجیره: ١٨ - تاج-٤ ژ-٣٩٢١ + تاج/٧/٣٠، زنجیره: ٥، ژماره: ١ - تاج-٤ ژ-٣٩٩٥ + تاج/١٠/٢٦٦، ژماره: ٥، ٦}.

## (٩٦) باب قَوْلِه « يَقُولُ اللَّهُ لآدَمَ أخْرِجْ بَعْثَ النَّارِ مِنْ كُلِّ ألْفٍ تِسْعَمِائَةٍ وَتِسْعَةً وَتِسْعِينَ»

## خودا به ئادەم دەفەرموێ: نێردەی دۆزەخ جیابکەرەوە، لەهەموو هەزارێ، نۆسەدو نەوەدو نۆی بۆ دۆزەخە

١٣٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: يَا آدَمُ، فَيَقُولُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ فِي يَدَيْكَ، قَالَ: يَقُولُ: أَخْرِجْ بَعْثَ النَّارِ، قَالَ: وَمَا بَعْثُ النَّارِ؟ قَالَ: مِنْ كُلِّ أَلْفٍ تِسْعَمِائَةٍ وَتِسْعَةً وَتِسْعِينَ، قَالَ: فَذَاكَ حِينَ يَشِيبُ الصَّغِيرُ (وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُمْ بِسُكَارَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ» . قَالَ: فَاشْتَدَّ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَأَيُّنَا ذَاكَ الرَّجُلُ؟ فَقَالَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَبْشِرُوا فَإِنَّ مِنْ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ أَلْفاً وَمِنْكُمْ رَجُلٌ، قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنِّي لأَطْمَعُ أَنْ تَكُونُوا رُبُعَ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَحَمِدْنَا اللَّهَ تَعَالَى وَكَبَّرْنَا، ثُمَّ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنِّي لأَطْمَعُ أَنْ تَكُونُوا ثُلُثَ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَحَمِدْنَا اللَّهَ وَكَبَّرْنَا، ثُمَّ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنِّي لأَطْمَعُ أَنْ تَكُونُوا شَطْرَ أَهْلِ الْجَنَّةِ، إِنَّ مَثَلَكُمْ فِي الأُمَمِ كَمَثَلِ الشَّعَرَةِ الْبَيْضَاءِ فِي جِلْدِ الثَّوْرِ الأَسْوَدِ أَوِ الرَّقْمَةِ فِي ذِرَاعِ الْحِمَارِ».[١٣٣]

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: ئەی ئادەم! ئادەم (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: بفەرموو ئەی

---

[١٣٣] مختصر صحيح مسلم/١، ژماره: ١٠٣ - مسلم. شیحا: ٤٣١. تەجرید/٤، ژماره: ١٣٤٢. بخاری: ٣٣٤٨.

پەروەردگارم! وام لەخزمەتتا، فەرمانت بەچی هەیە هەتا جێبەجێی بکەم، هەتا خۆشنوودیو ڕەزامەندی تۆ دەردەست دەکەم، خێروچاکە وا لەدەستی تۆداو هەموو چاکەیێ بەدەستی تۆیە).

خودای گەورە پێی دەفەرموێ: (ئەی ئادەم! بەشی دۆزەخ لەنەوەی خۆت جیاوەکە، بابڕۆن بۆ ناوی). ئادەمیش عەرزی دەکا: (خودایە! بەشی دۆزەخ لەنەوەی من چەند لەچەندە؟). دەفەرموێ: (لەگشت هەزار کەسێ نۆسەدو نەوەدو نۆی بەشی ئاگری دۆزەخە، وە تاقە یەکێکی بەشی بەهەشتە!).

فەرمووی: ئەمە ئەوکاتەیە کە مناڵ پیر دەبێ وەك لە قورئانا دەفەرموێ: {يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُم بِسُكَارَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ}.

وە هەموو ئاوسو دووگیانێ خورپەی لێ دەکەوێو سکەکەی لەباردەچێو بەچکەکەی فڕە دەدا، دەبێ بەفەرتەنەو بشێوییەکی وا کەس سەرکەسی ناپەرژێ، کە تەماشای مەردووم دەکەی، لەتۆ وایە کە مەستو سەرخۆشنو ئارەقو بادەنۆشن، وا حەپەساوو شڵەژاوو پەرۆشن، وەگێژو وڕن، بەڵام سەرخۆشو مەستی چی؟ کێ دەیپەرژێتە سەرشتی وا، نەء نەء، مەستو سەرخۆش نین، بەڵام سزای سەختو توندی ئەو ڕۆژە واگێژو وڕی کردوون، دەڵێی سەرخۆشن.

فەرمووی: جا موسوڵمانەکان زۆر سەخڵەت بوونو دەستیان کرد بە گریانو عەرزی حەزرەتیان کرد: جا ئەی پێغەمبەری خودا! دەبێ ئەو تاقە کەسە کاممان بێت؟ پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (موژدەتان لێ بێ، شتەکە خۆی ئاوایە، نەوەك وەك ئەوەی کە ئێوە بۆی دەچن:

له ئێوه یەك كەس بۆ بەهەشتو له یەئجوجو مەئجوج هەزار كەس بۆ دۆزەخ دەبێ).

ئەوجا خۆشەویست فەرمووی: (سوێندم بەو تاقه خودایه كه گیانی من وا لەدەستی توانایی ئەودا، من ئومێد دەكەم كه ئێوەی دەستەی ئیمانداران چواریەكی خەڵكی بەهەشت بن). ئێمەیش لەخۆشیانا ئەڵلاهو ئەكبەرمان بەدەنگی بەرزكرد، بۆ دەربڕینی خۆشیو شادی، بە بۆنەی ئەم مژدەی پێغەمبەرەوه. حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەی من ئومێد دەكەم كه ئێوه سێیەكی خەڵكی بەهەشت بن). ئێمه دیسان لەخۆشیانا دەستمان كرد به (الله اكبر) كردن.

خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەی من ئومێد دەكەم كه ئێوه نیوەی دانیشتوانی بەهەشت بن). ئێمه دیسانەوه دەستمان كردەوه به (الله اكبر) كردن. ئەوسا خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (رێژەی ئێوه لەچاو ئەو خەڵكەی تردا، وەك تاقه موویەكی سپی وایه له پێستی گایەكی رەشدا، یا وەك ئەو پوولەكەیه وان كەوا به دیوی ناوەوەی رەفیسكی گوێدرێژەوه!). {بڕوانه: كۆتایی فەرموودەی ژمارە (١٠٢)ی پوختەی موسلیم} .

## ٢- كِتَابُ الطَّهَارَة
## نامەی پاكیو خاوێنی
### (٢) باب: وُجُوبُ الطَّهَارَةِ لِلصَّلَاةِ
### پاكیو خاوێنی مەرجەو پێویستە بۆ كردنی نوێژ

١٣٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَا تُقْبَلُ صَلَاةُ مَنْ أَحْدَثَ حَتَّى يَتَوَضأَ قَالَ رَجُلٌ مِنْ حَضرَمَوْتَ مَا الْحَدَث يَا أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ فُسَاءٌ أَوْ ضرَاط). [١٣٤]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەركەسێ دەستنوێژی شكا تادەستنوێژ نەگرێتەوە نوێژی دروست نییە) پیاوێكی حەضرەمەوتیش گوتی: ئەی ئەبوهورەیرە! دەسنوێژ بەچی دەشكێ؟ فەرمووی: بەبالێبوونەوەو تڕو تسو شتی وا).

ئەمە دەقی گێڕانەوەی پێشەوا موسلیمە بۆ ئەم فەرموودەیە، ئەمەیش دەقی ژمارە (١٠٤) پوختەی موسلیمە:

موسعەبی كوڕی سەعد فەرمووی: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر چوو بۆلای ئیبنو عامیر، بۆ هەواڵ پرسینی، چونكە نەخۆش بوو، ئیبنو عامیر بە ئیبنو عومەری گوت: ئەی ئیبنو عومەر! بۆ لەخودا ناپاڕێیتەوە بۆم؟ فەرمووی: بۆخۆم لە پێغەمبەرم بیست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (خودای

---

[١٣٤] تەجرید/١، ژمارە: ١٠٩. بخاری: ١٣٥، ٦٩٥٤. مسلم: ٢٢٥ – ٥٣٦. شیحا - مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١٠٤. شیحا: ٥٣٤.

گەورە نە نوێژ بەبێ دەسنوێژو پاکی گیرا دەکاو، نەخێر لەگزیو دزیو فزی قەبووڵ دەکا).

دەی تۆیش فەرمانداری سەر شاری بەصرە بوویت. {بڕوانە: تاج/١، لاپەڕە: ٢٠٨، زنجیرە: ٥٢، ژمارە: ١/ ٣٩٠}.

ئەوەوی دەفەرموێ: دوعاو نزاو پاڕانەوە بۆ بەدکارو ناموسوڵمان دروستە، وە پێغەمبەرو یارانی شتی وایان کردووەو پێشینانو پاشینانیش شتی وادەکەن، کە خودا هیدایەتی ناموسوڵمانان بداو تەوبە بەنسیبی تاوانبار بکا، کەواتە: مەبەستی ئیبنو عومەر لەم گوتەیە سەرکۆنەی ئیبنو عامیر بووە، هەتا واز لە نافەرمانی خودا بێنێو تەوبە بکا.

## (٣) باب: صِفَةُ الوُضُوءِ وَكَمَالِهِ
## چۆنیتی دەستنوێژو تەواوی دەسنوێژ

١٣٥- عنْ عُثمَانَ بْنَ عَفَّانَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أنهُ: (دَعَا بِإِنَاءٍ فَأَفْرَغَ عَلَى كَفَّيْهِ ثلَاث مِرَارٍ فَغَسَلَهُمَا ثمَّ أَدْخَلَ يَمِينَهُ فِي الْإِنَاءِ فَمَضمَض وَاسْتَنْشَقَ ثمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثلَاثا وَيَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ ثلَاث مِرَارٍ ثمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ ثمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ ثلَاث مِرَارٍ إِلَى الْكَعْبَيْنِ ثمَّ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْ تَوَضأَ نَحْوَ وُضوئِي هَذا ثمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ لَا يُحَدِّث فِيهِمَا نَفْسَهُ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذنْبِهِ. وفِي رواية: أنَّ عُثمَان (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَلَا أُحَدِّثكُمْ حَدِيثا لَوْلَا آيَةٌ مَا حَدَّثتُكُمُوهُ سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ لَا يَتوَضأُ رَجُلٌ يُحْسِنُ وُضوءَهُ وَيُصَلِّي الصَّلَاةَ إِلَّا غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الصَّلَاةِ حَتَّى يُصَلِّيَهَا قَالَ عُرْوَةُ الْآيَةَ إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنْزَلْنَا مِنْ الْبَيِّنَاتِ).[١٣٥]

---

[١٣٥] تەجرید/١، ژمارە: ١٢٦. بخاری: ١٩٥. مسلم: ٢٢٦ = ٥٣٧ شیحا = مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١٣٠.

حـومرانی نۆكـەری عـوثمـان (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: عوثمـان (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) داوای ئـاوی دەسـنوێژی كـردو ئـاوا لەسـەر ئـەم شـێوەیە دەستنوێژی گرت: لەپێشا ئاوی كرد بەهـەردوو دەسـتی خۆیـدا، هـەردوو دەسـتی تاهەردوو مووچەكانی سێ جار شۆرد، ئنجا دەستی ڕاستی كرد بەناو دەفرەكەداو سێ جار ئـاوی لـەدەمی و لـەلووتی راداو هنگی كـرد، ئنجا سـێ جـار دەم و چـاوی شـۆرد، ئـەنجا سـێ جـار دەسـتی ڕاسـتی هـەتا ئانیـشكی شـۆرد، ئینجا سـێ جـار بەوچەشنە دەستی چەپیشی شۆرد، ئینجا دەستی تـەڕی هێنـا بەسـەر سـەریداو، سەری خۆی مەسح كرد، ئینجا قاچی ڕاسـتی هـەتا هـەردوو قاپـە ڕەقەڵـەی سـێ جار شۆرد، ئینجا سـێ جـار بەوچەشـنە قاچی چەپیـشی شـۆرد، لەپاشا عوثمـان فەرمووی بەچاوی خۆم پێغەمبـەرم (دروودی خـودای لەسـەر بێ) دی وەك ئـەم دەستنوێژەی من گرتم لەبەرچاوی ئێوە، ئاوا دەستنوێژی گرت وئەوجا فـەرمووی (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) هەركەسـێ دەسـتنوێژێ بگـرێ لەچەشـنی ئـەم دەسـنوێژەی كەئێـستا مـن گـرتم، ئنجـا هەلـسێ دوو ركـات نوێـژی پـوختی دوور لەخـەیاڵی كاروبـاری دنیـایی بكـا، یـاپتر لـەدوو ڕكـات بكـا بەهـەمان شـێوە، ئـیتر خودای گەورە لەگوناهی لەوەپێشی خۆش دەبێ) لەگێڕانەوەیەكا: عوثمان (ڕەزای خوای لـێ بـێ) فـەرمووی: ئاگـادار بـن بائـەم فەرموودەیـەتان پـێ بڵـێم، بـەخودا لەبـەر ئـەو ئایەتـە نـەبێ كەهەڕەشـە لەشـاردنەوەی زانـستی ئـایینی دەكـا، بەپێویـستم نـەدەزانی كـەبۆتانی بگێڕمـەوە، بـەگوێ ی خـۆم لـەزاری پـیرۆزی خۆشەویـستم بیـست، دەیفـەرموو (دروودی خـودای لەسـەر بـێ): (هەركەسـێ دەسـتنوێژێ بـەجوانی بگـرێ، ئـەوجا نوێـژێ لـەپێنج فـەرزەكان بكـا، مـسۆگەر كـەخودا لـەگوناهی ئـەو ماوەیـەی هـەتا نوێـژە فەرزەكـەی تـری دوا ئـەو نوێـژە، خـۆش دەبـێ). (ت/ ١/ ١/١٣٥ ز-٢٨ ژ-٢٣٣). عـورووەی كـوڕی زوبـەیر دەفـەرموێ:

(مەبەست لەم ئایەتەی کەعوثمان لەم شوێنەدا ئاماژەی بۆ دەکا ئایەتی سەدو پەنجاو نۆی سورەتی بەقەرەیە کەدەفەرموێ: {إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ أُولَئِكَ يَلعَنُهُمُ اللّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ } واتە: (ئەو کەسانەی کەئەو بەڵگەو نیشانە رۆشنانە حەشار دەدەن، کەخوادی گەورەو سەروەر ناردوونیو لەنامە ئاسمانی یەکاندا روونی کردوونەتەوە بۆ مەردووم، ئەم جۆرە کەسانە لەسەر ئەم جۆرە تاوانە گەورانە، کەبریتی یە لەشاردنەوەی زانستی ئاینی، هەموو نەفرەتکەرێ نەفرەتو لەعنەتیان لێ دەکەن!).

**روونکردنەوە:**

گەرچی ئەم ئایەتە پیرۆزە دەرهەق بەخاوەن نامەکان هاتۆتە خوارەوە بەتایبەتی، بەلام بایەخ و عیبرەت بەگشتیایەتی ی بێژەیە، عیبرەت بە عومومی لەفظە، نەك بەهۆیە تایبەتەکە، کەواتە: هەرکەسێ زانستی ئایینی حەشاربدا، سەر بەهەر ئایینێ بێ، بەر هەڕەشەی ئەم ئایەتە دەکەوێ، فەرمانڕەوای سێیەمی موسوڵمانان ئیمامی عوثمانی کوڕی عەففان، دایکی ناوی (أروی) یە کچی پووری باوکی پێغەمبەرە لە پێغەمبەر منالترە، ناودەبرێ بە: ذو نورەین، واتە: دوو نوور، چوونکە دوو کچی پێغەمبەری هێناوە لەپێشا روقیەی هێناوە، کەروقیە دەمرێ ئوممو کەلثووم دەهێنێ، روقیەو ئوممو کەلثووم کچی پێغەمبەر بوون، دروودی خوا لە پێغەمبەرو رەزای خودا لەوان بێ، سەدو چل و شەش فەرموودەی لەکتێبە ناودارەکانی سوونەتدا هەیە، پێشەوا بوخاری یازدەیانی گێڕاوەتەوە.

لەپاش شەهید بوونی ئیمامی عومەر، لەیەکەم رۆژی موحەڕەمی ساڵی بیستو چواری کۆچی دا کرا بەجێ نشینی سێیەم، دەوڵەتی ئیسلام لەسەر دەستی ئەودا تەواو تەواو دامەزراو رووبەری فراوان بوو، سامان ئەوقی دایەوە، ماڵ زۆر زۆر بوو، وای لێ هاتبوو خەڵك کەنیزەکیان دەکڕی سەربەسەر بەپارە، گرنگترینو ناوادارترین کاری ئیمامی عوثمان جەمعی قورئان بوو، لەتەمەنی هەشتاو دوو ساڵیدا، لەفەرتەنەیەکی کوێرانەدا، لەڕۆژی هەینی دا، رێکەوتی هەژدەی مانگی قوربانی ساڵی (٣٥) کۆچی، لەکاتی دەورکردنەوەی قورئاندا، ئەسوەدی تەجیبی شەهیدی کرد، قورئانەکە لەباوەشی دا بوو خوێنەکەی پڕژا بەسەر ئەم ئایەتەدا: (فسیکفیکهم الله) هەزار رەحمەت لەئیمامی جەزەری کەلە (ذات الشفا) دا دەفەرموێ:

فـــــذبحوه تـــــالی القـــــرآن
بـــین یدیـــه المـــصحف العثمـــانی!

بەکوردی واتە:

وەك بــەرخ ســەربڕی، ســەربڕا عوثمــان
کــاتی شــەهید بــوون، قورئــان لەســەر ڕان

(بڕوانە: تاج/٥ /٣٣١/ ١ = تاج-٤ ز-٩٤ ژ-٣٦٨٤ هەروا تاج/ ٥/ ٤٥ ز ـ ٨ هەتا ف ـ ١٦ تاج-٣ ز-٨ ژ-٣٢٧٢ هەتا ٣٢٨٧).

ئەمەیش دەقی موسلیمە بۆ ئەم فەرموودەیە:

حـومرانی نۆکـەری ئیمـامی عوسمـان (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: عوسمان (رەزای خـودای لێ بـێ) داوای ئـاوی دەسنوێژی کـردو ئـاوا لەسـەر ئـەم شێوەیە دەسـنوێژی گـرت: لەپێـشا لـە دەفرەکـە ئـاوی کـرد بەهـەردوو دەسـتی خۆیدا، هـەردوو دەسـتی تـا هـەردوو مووچـەکانی سێجار شۆرد، ئینجا دەسـتی

راستی کرد بەناو دەفرەکەداو سێجار ئاوی لەدەمیو لە لووتی راداو هنگی کرد، ئینجا سێجار دەموچاوی شۆرد، ئینجا سێجار دەستی راستی هەتا ئەنیشکی شۆرد، ئینجا سێجار بەوچەشنە دەستی چەپیشی شۆرد، ئەنجا دەستی تەڕی هێنا بەسەر سەریدا، سەری خۆی مەسح کرد، ئینجا پێی راستی هەتا هەردوو قاپە ڕەقەڵەی سێجار شۆرد، ئینجا سێجار بەوچەشنە قاچی چەپیشی شۆرد، لەپاشا عوسمان فەرمووی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دی، وەك ئەم دەسنوێژەی من گرتم لەبەرچاوی ئێوە، ئاوا دەسنوێژی گرتو، ئەوجا فەرمووی (دروودو سڵاوی خودای گەورەی لەسەر بێ): (هەرکەسێ دەسنوێژێ بگرێ لەچەشنی ئەم دەسنوێژەی کە ئێستا من گرتم، ئەوجا هەڵسێ دوو رکات نوێژی پوختی دوور لە خەیاڵی کاروباری دنیایی بکا، یا پتر لەدوو رکات بکا بەهەمان شێوە، ئیتر خودای گەورە لە گوناهی لەوەپێشی خۆش دەبێ). (تاج/١، زنجیرە: ٢٨، ژمارە: ١).

ئیبنو شەهاب فەرمووی: (زانایانی ئێمە دەفەرموون: ئەمە نموونەی تێرو تەسەلترینی دەسنوێژی نوێژە، بۆکەسێ بیەوێ دەسنوێژی تەواو بگرێ).

## (٧) باب: فِي وُضُوءِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)
## باسی چۆنیەتی دەستنوێژی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ)

١٣٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَاصِمٍ الأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ، قَالَ: قِيلَ لَهُ: تَوَضَّأْ لَنَا وُضُوءَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَدَعَا بِإِنَاءٍ فَأَكْفَأَ مِنْهَا عَلَى يَدَيْهِ فَغَسَلَهُمَا ثَلاَثًا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فَاسْتَخْرَجَهَا، فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ مِنْ كَفٍّ وَاحِدَةٍ فَفَعَلَ ذَلِكَ ثَلاَثًا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فَاسْتَخْرَجَهَا، فَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاَثًا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فَاسْتَخْرَجَهَا، فَغَسَلَ يَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ مَرَّتَيْنِ، مَرَّتَيْنِ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فَاسْتَخْرَجَهَا

فَمَسَحَ بِرَأْسِهِ، فَأَقْبَلَ بِيَدَيْهِ وَأَدْبَرَ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ إِلَى الْكَعْبَيْنِ. ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا كَانَ وُضُوءُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).[١٣٦]

ئەمە دەقی ژمارە (١٢٥)ی پوختەی موسلیمە:

عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی عاصیمی ئەنصاری (ڕەزای خودای لێ بێ) کە یەکێ بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر پیاوێ پێی گوت: ئایا دەتوانی کە پیشانمان بدەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چۆن دەسنوێژی دەگرت؟ عەبدوڵڵا فەرمووی: بەڵێ باشە، جا داوای ئاوی کردو جامێ ئاویان بۆ هێنا، جامەکەی لار کردەوەو بە لێوی جامەکە ئاوی کرد بە دەستی خۆیداو سێ جار هەردوو دەستی خۆی لەدەرەوەی جامەکە بەو شێوەیە شۆرد، ئەوجا دەستی کرد بە جامەکەداو لوێچی ئاوی هەڵگرت و لەوتاقە لوێچە هەم ئاوی لەدەمی راداو هەم لە لووتی و هنگی کرد، سێ جار ئاوای کرد، ئەوجا بەسێ مشت ئاو دەموچاوی شۆرد، ئەوجا دەستی کردەوە بە دەفرەکەداو هەردوو دەستی تا هەردوو ئانیشکی دووجار دووجار شۆرد، ئەوجا دەستی کردەوە بەناو ئاوەکەداو دەستی دەرهێنایەوەو دەستی تەڕی هێنا بەسەر سەریدا، لەپێشا لە پێشە سەریەوە دەستەکانی بردن بۆ پشتە سەری، لەسەرەتاوە هەردوو دەستی بەتەڕی لە پێشی سەریەوە خشان بەسەر سەریدا هەتا پشتە ملی، ئەوجا بەرەودوا بەسەر سەریدا، بەکێشی کردن هەتا ئەو شوێنەی کە لەوێوە دەستی پێکرد، ئەوجا هەردوو پێی هەتا هەردوو قاپەڕە قەڵەی شۆرد. ئەوجا فەرمووی: ئەمە شێوەی دەسنوێژی پێغەمبەر بوو (دروودی خودای لەسەر بێ).

---

[١٣٦] مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١٢٥ - شيحا: ٥٥٤. تجريد/١، ژمارە: ١٣٩. بخاری: ١٨٥. مسلم: ٢٣٥ - ٥٥٤ شيحا.

**ڕوونكردنەوە:**

عەبدوڵڵای كوڕی زەید ئەنصارییە، ئوحودییە، بەدری نییە، واتە: ئامادەی غەزای ئوحود بووە، هاوبەشی تیادا كردووە، لەریزی لەشكری ئیسلاما، بەڵام بەشداری لە غەزای بەدردا نەكردووە، عەبدوڵڵا خۆیو باوكیو دایكی (ڕەزای خودایان لێ بێ) هاوڕێی پێغەمبەر بوون، چلو هەشت فەرموودەی هەیە، هەشتیان پەسەندی هەردوو پیرن، واتە: هەم شێخی بوخاریو هەم شێخی موسلیم ئەو هەشت فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، یەكێكیان ئەم فەرموودەیەیە كەواین لە خزمەتیدا، كە لەبوخاریدا لە هەشت جێگەدا، بەهەشت بۆنەوە دووبارە بۆتەوە، ئاوا: ١٨٥، ١٨٦، ١٩١، ١٩٢، ١٩٧، ١٩٩. بەشداری لە كوشتنی موسەیلەمەی كەزابا كردووە. ئەم زاتانە فەقێی بوون بۆ گێڕانەوەی فەرموودەكانی: عەبادی كوڕی تەمیم كە برازای بوو، لەگەڵ یەحیای كوڕی عەمارەو كەسانی تریش. لەتەمەنی حەفتا ساڵیدا، لەمانگی قوربانددا، لە شەڕەكەی ڕۆژی حەررەدا، كە لە (٦٣)ی كۆچیدا بوو، شەهید كرا (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ).

ئەمەیش ژمارە (١٣٩)ی تجریدە:

پیاوێ بەعەبدوڵڵای كوڕی زەیدی گوت: ئایا دەتوانی كەپیشانم بدەی كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چۆن دەسنوێژی دەگرت؟ عەبدوڵڵا فەرمووی: بەڵێ باشە، جاداوای ئاوی كردو لێی كرد بەهەردوو دەستی داو دووجار هەردوو دەستی هەتا هەر دوو مووچی خۆی شۆرد، ئینجا ئاوی لەدەمیو لەلووتی رادا، ئەوجا سێ جار روخساری خۆی شۆرد، ئەوجا هەردوو دەستی خۆی هەتا هەردوو ئانیشكی دووجار دووجار شۆرد، ئینجا بەهەردوو دەستی سەری خۆی تەڕكرد، لەپێشا لەپێشەسەریەوە بردنی بۆ پشتەسەری،

لەسەرمتاوە هەردوو دەستی لەپێشی سەریەوە بەتەڕی خشان بەسەر سەریدا هەتا پشتەملی، ئەوجا بەرەودوا بەسەر سەری دا بەکێشی کردن هەتا ئەو شوێنەی کەلەوێوە دەستی پێکرد، ئەنجا هەردوو پێی شۆرد).

## (٨) باب: الإِيتَارِ فِي الإِسْتِنْثَارِ وَالإِسْتِجْمَارِ

١٣٧- عنْ أَبي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: (مَنْ تَوَضأَ فَلْيَسْتَنْثِرْ وَمَنْ استَجْمَرَ فَلْيُوتِرْ).[١٣٧]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ دەستنوێژ دەگرێ باهنگ بکاو ئاو لەلوولتی رابدا، وەهەرکەسێ بەبەردو شتی وا تارات دەگرێ، بابەچەند بەردێکی تاك خۆی پاك بکاتەوە، وەك سێ یاپێنج یاحەوت.وە هەروەها). (ش/ ت/ ن- تاج/ ١/ ١٣٤/ ١ ز-٢٨ ژ-٢٣٣).

١٣٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ مَنَامِهِ فَتَوَضَّأَ فَلْيَسْتَنْثِرْ ثَلاثًا فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَبِيتُ عَلَى خَيْشُومِهِ).[١٣٨]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەخۆشەویستەوە(دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ لەخەو خەبەرتان دەبێتەوە دەستنوێژێ بشۆرن، وەسێ جار هنگ بکەنو ئاو لە لووتدان رادەن، تالووتتان لەئازار پاك بێتەوە، چونکە شەیتان لەناو سەرووی کونە لووتی نووستوودا شەو دەکاتەوە!).

---

[١٣٧] تەجرید/١، ژمارە: ١٢٧. بخاری: ١٦١. مسلم: ٢٣٧ = ٥٦١ شیحا.

[١٣٨] تەجرید/٢، ژمارە: ١٣٢٨. بخاری: ٣٢٩٥. مسلم: ٢٣٨ = ٥٦٣. شیحا = مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١٢٧.

## (٩) باب: وجوب غسل الرِّجْلَيْنِ بِكَمَالِهِمَا

## لەکاتی دەستنوێژگرتندا پێویستە هەردوو پێیەکان بەتەواوی بشۆرێن

١٣٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضي اللهُ عَنْهُما) قَالَ: (تَخَلَّفَ عَنَّا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفْرَةٍ سَافَرْنَاهَا فَأَدْرَكَنَا وَقَدْ أَرْهَقَتْنَا الصَّلَاةُ وَنَحْنُ نَتَوَضَّأُ فَجَعَلْنَا نَمْسَحُ عَلَى أَرْجُلِنَا فَنَادَى بِأَعْلَى صَوْتِهِ وَيْلٌ لِلْأَعْقَابِ مِنْ النَّارِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا).[١٣٩]

عەبدوڵلای کوڕی عەمر (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی بێ) فەرمووی: لەسەفەرێکا لەخزمەت پێغەمبەردا بووین، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەوتە دواوە، کەپێمان گەیشتەوە گەرمەی نوێژ بوو، ئێمەیش سەرگەرمی دەستنوێژ گرتن بووین، بەڵام قاچمان پشیلە شۆر دەکرد، وەك دەستی تەڕی پیابێنی ئاوا، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەی بینی‌و بەمەی زانی، سێ جار بەهەموو دەنگی خۆی بانگەوازی هەڵداو فەرمووی: (وای لەدەستی ئاگری دۆزەخ بۆ ئەو کەسەی کەبەباشی پاژنەی پێی لەکاتی دەستنوێژگرتنا، بەباشی نەشۆرێ!) (ت/١، زنجیرە: ٢٨ ژمارە: ٢٤٢).

١٤٠ – حَدِّيث أَبِي هُرَيْرَةَ – وَكَانَ يَمُرُّ بِنَا وَالنَّاسُ يَتَوَضَّئُونَ مِنَ الْمِطْهَرَةِ – قَالَ أَسْبِغُوا الْوُضُوءَ فَإِنَّ أَبَا الْقَاسِمِ – صلى الله عليه وسلم – قَالَ « وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ».[١٤٠]

جارێ ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەستەیەکی بینی لەدەستشۆرەکە دەستنوێژیان دەگرت، گوتی: بەتەواوی، بەجوانی دەستنوێژ بگرن، چونکە بەگوێی خۆم گوێم لێ بوو کە خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (ئەی هاوار! بۆ ئەوکەسانەی کە لەکاتی

---

[١٣٩] تەجرید/١، ژمارە: ٥٤. بخاری: ٦٠. مسلم: ٢٤١ = شیحا: ٥٧١، ٥٧٥، ٥٧٢.

[١٤٠] بخاری. وضوء: ١٦٥. مسلم/شیحا، طهارة: ٥٧١، ٥٧٥، ٥٧٣.

دەستنوێژگرتنیانا، بەباشی شادەمارەکەی سەر قنگە پاژنەیان ناشۆرن! ئەی هاوار لەدەست ئەو ئاگرەی کەبۆ ئەوانە ئامادەکراوە).

لەگێڕانەوەیەکا: (وای لەدەستی ئاگری دۆزەخ بۆ ئەوکەسەی کە بەباشی پاژنەی پێی ناشۆرێ، لەکاتی دەستنوێژگرتندا). (تاج/١، زنجیرە: ٢٨، ژمارە: ١٤٢).

## (١٢) باب: استحبَاب إطالَةِ الغُرَّةِ وَالتَّحْجِيلِ فِي الوُضُوءِ
## دەموچاو نووورانیو چارە شیرینی بەهۆی دەسنوێژی تێروپڕەوە

١٤١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ إِنَّ أُمَّتِي يُدْعَوْنَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ غُرًّا مُحَجَّلِينَ مِنْ آثارِ الْوُضوءِ فَمَنْ اسْتَطاعَ مِنْكُمْ أَنْ يُطيلَ غُرَّتَهُ فَلْيَفْعَلْ).[١٤١]

ئەبوهورەیرە فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (لەڕۆژی قیامەت دا ئوممەتم پێیان دەگوترێ: مارۆی چوارپەل سپی، چونکە ئەو شوێنانەی ئەندامیان کەئاوی دەستنێژ دەیانگرێتەوە سپیو گەشو جوانن، بەهۆی ئەسەرو شوێنەواری دەستنوێژەوە، دەی بۆ بەدەستهێنانی ئەم بەهرە گەورەیە لەکاتی دەستنوێژ گرتن دا چەندەی دەتوانن فەشیو گەشی ی خۆتان زۆرتر بکەن). (ریاض - ٨٢٤/٣+ تاج/١٠/ ٥٦ ژ-٦٩ ز-٩).

ئەمە ژمارە (١١٠)ی تجرید بوو، ئەمەیش ژمارە (١٢٨)ی پوختەی موسلیمە:

نوعەیمی کوڕی عەبدوڵلای ئەل-موجمیر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: بۆ خۆم ئەبو هورەیرەم بینی، ئاوا دەسنوێژی دەگرت: لەپێشا

---

[١٤١] تەجرید/١، ژمارە: ١١٠. بخاری: ١٣٦. مسلم: ٢٤٦ = ٥٧٨ شیحا + مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١٢٨.

روخساری خۆی شۆرد، زۆر بە تێرو پڕی، ئەوجا دەستی راستی شۆرد، لە ئانیشکی تێپەڕان، هەنێ لە قۆڵی لەگەڵیا شۆرد، ئەوجا دەستی چەپی شۆرد، هەتا گەیشتە قۆڵی، ئەنجا دەستی بەتەڕی هێنا بەسەر سەریدا، ئەوجا قاچی راستی شۆرد هەتا لاقی، ئەوجا قاچی چەپی شۆرد هەتا لاقی، ئەوجا ئەبو هورەیرە بەمنی فەرموو: (ئەی نوعەیم! ئا بەم شێوەیە پێغەمبەرم دیوە دەسنوێژی گرتووە).

ئەبو هورەیرە فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئێوەی گەلی ئیسلامی من، لە رۆژی قیامەتا، روخسار گەشو نوورین دەبنو، چوارپەل سپیو نەخشین دەبن، چونکە ئەو شوێنانەتان کەئاوی دەسنوێژ دەیانگرێتەوە، سپیو گەشو درەوشاوەن، بەهۆی ئاسەواری دەسنوێژی تەواوی تێرو تەسەلەوە، کەواتە بۆ مسۆگەر کردنی ئەم بەهرە گەورەیە، لەکاتی دەسنوێژ گرتندا، چەندە دەتوانن فەشی روخسارو گەشیی دەستو پێی خۆتان زۆرتر بکەن).

## (١٥) بابُ: السِّوَاكِ
## باسی سیواك

١٤٢- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى النـاس {أو عَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَفِى حَدِيثِ زُهَيْرٍ: عَلَى أُمَّتِى} لأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ».[١٤٢]

[١٤٢] مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٢٧٠ - مسلم/شيحا: ٥٥٨. بخاری: ٨٨٧، ٧٢٤٠ مسلم. سواك: ٥٨٨.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نەبادا ئازارو زەحمەتی موسوڵمانانو ئۆمەتم بدەم، دەنا فەرمانم پێ دەکردن کە بۆ هەموو نوێژێ سیواك بکەن). {تاج/١، لاپەڕە: ١٣١، زنجیرە: ٢٧، ژمارە: ٢٢٣ چاپی دووەم + تاج/١، لاپەڕە: ٢٣٤، زنجیرە: ٦٥، ژمارە: ٤٣٩ هەروا لە ژمارە: ٤٣٧ هەتا ٤٤٢}.

ئەمەیش دەقی ئەم فەرموودەیە لەبوخاریدا، لە سواکا:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نەبادا ئازارو دەردی سەری ئۆمەتم بدەم، ئەگینا بۆ گرتنی هەموو دەستنوێژێ فەرمانم پێ دەکردن بە سیواککردن!). (تاج/١، ژمارە: ٢٢٣، زنجیرە: ٢٧).

١٤٣- عَنْ أبي موسى (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَال: (أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ فَوَجَدْتُهُ يَسْتَنُّ بِسِوَاكٍ بِيَدِهِ يَقُولُ أُعْ أُعْ وَالسِّوَاكُ فِي فِيهِ كَأَنَّه يَتَهَوَّعُ). [١٤٣]

ئەمە دەقی گێڕانەوەی بوخارییە:

ئەبوموسا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێ) دار سیواکێکی لەدەستا بوو، سیواکی پێ دەکرد، دەیفەرموو: (ئوع، ئوع) وەك بڕشێتەوە ئاوا

١٤٤- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذا قَامَ مِنْ اللَّيْلِ يَشُوصُ فَاهُ بِالسِّوَاكِ). [١٤٤]

ئەمە دەقی ئەم فەرموودەیە، لە تەجریدی بوخاریدا (ژمارە: ١٧٦):

---

[١٤٣] تەجرید/١، ژمارە: ١٧٥. بخاری: ٢٤٤. مسلم: ٢٥٤ — ٥٩١ شیحا. تاج/١، زنجیرە: ٦٥، ژمارە: ٤٣٨. ریاض الصالحین/٣، زنجیرە: ٢١٥، ژمارە: ١٢٠١. فیقهی ئاسان/١، لاپەڕە: ٢٣، زنجیرە: ٧.

[١٤٤] تەجرید/١، ژمارە: ١٧٦. بخاری: ٢٤٥، ٨٨٩، ١١٣٦. مسلم: ٢٥٥ — ٥٩٢ شیحا.

حوذەیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەشەو لەخەو هەڵدەسا بۆ شەونوێژ، یا بۆهەر شتێ تر، سیواکی لەدەمی خۆی رادەداو سیواکێکی تەواوی دەکرد).

## (١٦) بابُ: خِصَالِ الفِطرَةِ
## باسی رەفتارە سروشتیەکان

١٤٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِي (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «الْفِطْرَةُ خَمْسٌ، أَوْ خَمْسٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: الْخِتَانُ وَالاِسْتِحْدَادُ وَتَقْلِيمُ الأَظْفَارِ وَنَتْفُ الإِبْطِ وَقَصُّ الشَّارِبِ».[١٤٥]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەم پێنجە لە سروشتی پاکن: خۆسوننەتکردن، بەرتاشین، نینۆك کردن، هەڵکێشانی مووی بنباڵ، بەرسمێڵ کردنو قرتاندنی مووی سمێڵ).

١٤٦- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عنهما) عَنْ النَّبِي (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « خَالِفُوا الْمُشْرِكِينَ، وَفِرُوا اللِّحى وَأَحْفُوا الشَّوَارِبَ».[١٤٦]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بە پێچەوانەی بت پەرستانو فرە خوا پەرستان بکەن، بەم ڕەنگە: ئێوە بە پێچەوانەی ئەوانەوە ریش تەواو بهێڵنەوەو

---

[١٤٥] مختصر صحيح مسلم/ ١، ژمارە: ١٨١ = شیحا: ٥٩٦. بخاری: ٥٨٨٩، ٥٨٩١، ٦٢٩٧. ریاض/٢، ژمارە: ١٢٠٨.

[١٤٦] تەجرید/٥، ژمارە: ١٩٠٤. بخاری: ٥٨٩٢. مسلم: ٢٥٩ - مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١٨٤. شیحا: ٦٠١.

سمـێڵ تـەواو كـورت بكەنـەوە). {تـاج/٤، لاپـەڕە: ١٣٧، زنجـيرە: ٤٢ ژ-٢٨٥٨-ش/د/ت/ن}.

١٤٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم): « انْهَكُوا الشَّوَارِبَ ، وَأَعْفُوا اللِّحَى»:

واتاكەی لەژمارەی پێش خۆیدا رابورد.

## (١٧) بَابُ: الإِسْتِطَابَةِ
## باسی تاراتگرتنو خۆپاككردنەوە

١٤٨- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِذَا أَتَيْتُمُ الْغَائِطَ فَلاَ تَسْتَقْبِلُوا الْقِبْلَةَ، وَلاَ تَسْتَدْبِرُوهَا، بِبَوْلٍ وَلاَ غَائِطٍ، وَلَكِنْ شَرِّقُوا أَوْ غَرِّبُوا». قَالَ أَبُو أَيُّوبَ: فَقَدِمْنَا الشَّامَ فَوَجَدْنَا مَرَاحِيضَ قَدْ بُنِيَتْ قِبَلَ الْقِبْلَةِ، فَنَنْحَرِفُ عَنْهَا، وَنَسْتَغْفِرُ اللَّهَ).[١٤٨]

ئـەبو ئـەيیوبی ئەنـصاری (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (كـە دەچـنە سەرپێشاو نـە ڕووبكەنـە ڕووگە (قيبلە) وە نەپشتی تێ بكەن، بەڵام ڕووبكەنە ئەملاو ئەولا).

ئەبو ئەیيوب دەیفـەرموو: لـەوەدوا كـە چووینە وڵاتـی شام، دەبیـنین ئاودەسـت هەیە ڕووەو ڕووگە دروست كراوە، كە دەچووینە ئەوجۆرە ئاودەستانەوە، بەپێی توانـا، ڕووی خۆمـان لـە ئاسـتی ڕووگـە وەردەچـەرخانو لەگـەڵ ئەوەشـا داوای لێبووردنمان لە خودا دەكرد، كە لێمان نـەگرێ. {تـاج/١/١١٩، زنجيرە: ٢٤، ژمـارە: ١٠/١٩١}.

---

[١٤٨] مختـصر صـحيح مـسلم/١، ژمـارە: ١٠٩ = مـسلم: ٢٦٤ = ٦٠٨ شـيحا. تجريـد/١، ژمـارە: ١١٧. بخاری: ١٤٤، ٣٩٤.

١٤٩- عَنْ وَاسِعِ بْنِ حَبَّانَ قَالَ: كُنْتُ أُصَلِّى فِى الْمَسْجِدِ، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ مُسْنِدٌ ظَهْرَهُ إِلَى الْقِبْلَةِ، فَلَمَّا قَضَيْتُ صَلاَتِى انْصَرَفْتُ إِلَيْهِ مِنْ شِقِّى، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: يَقُولُ نَاسٌ: إِذَا قَعَدْتَ لِلْحَاجَةِ فَلاَ تَقْعُدْ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ، وَلاَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: وَلَقَدْ رَقِيتُ عَلَى ظَهْرِ بَيْتٍ. فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَاعِدًا عَلَى لَبِنَتَيْنِ مُسْتَقْبِلاً بَيْتَ الْمَقْدِسِ، لِحَاجَتِهِ}.[١٤٩]

واسیعی کوڕی حەببان فەرمووی: لە مزگەوت نوێژم دەکرد، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر پشتی دابوو بە دیوارەکەی رووی قیبلەوە، کە نوێژەکەم تەواوکرد، لەلاکەی خۆمەوە چووم بۆلای، عەبدوڵڵا فەرمووی: کەسانێ هەن دەڵێن: کاتێ لەسەر پێشاو دانیشتی بۆ سەراوکردن، رووبەرووی قیبلە، یا رووبەرووی بەیتولەقدیس دامەنیشە. بەڵام من جارێ ئیشم هەبوو، چوومە سەر سەربانەکەی حەفصەی خوشکم، کە هاوسەری پێغەمبەر بوو، پێغەمبەرم دی خەریك بوو دەستی بەئاو دەگەیاند، لەسەر دووخشتی کاڵ رووبەرووی شام دانیشتبوو، کە بەیتولەقدیس والەوێ، پشتی لەرووگە بوو، سەراوی دەکرد}.

١٥٠- عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما) قالَ: ارْتَقَيْتُ فَوْقَ ظَهْرِ بَيْتِ حَفْصَةَ لِبَعْضِ حَاجَتِي ، فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقْضِي حَاجَتَهُ مُسْتَدْبِرَ الْقِبْلَةِ مُسْتَقْبِلَ الشَّأْمِ.[١٥٠]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: کەسانێ هەن دەڵێن: کاتێ لەسەر پێشاو دانیشتن بۆ سەراوکردن رووبەرووی قیبلە، یارووبەڕوی بەیتولەقدیس دامەنیشە. بەڵام من جارێ ئیشم هەبوو چوومە سەر سەربانەکەی حەفصەی خوشکم کەژنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر

[١٤٩] مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١١٠ - ٢٦٦ = ٦١٠شيحا. تجريد/١، ژمارە: ١١٨. بخاري/١٤٥.

[١٥٠] تەخریجەکەی لەژمارەی پێشوودا رابورد.

بێ) بوو: پێغەمبەرم دی خەریك بوو دەستی بەئاو دەگەیاند، لەسەر دووخشتی کاڵ ڕوو بەڕووی شام دانیشتبوو، پشتی لەڕووگە بوو، سەراوی دەکرد.(ش/د/ ١ ن / ن ـ تاج/ ١/ ١٢٠/ ١١ ز-٢٤ ژ-١٩٢).

## (١٨) باب: النَّهْيِ عَنِ الإِسْتِنْجَاءِ بِالْيَمِينِ
## جڵەوگیری لە تاراتکرتن بەدەستی راست

١٥١- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (إِذا شَرِبَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَتَنَفَّسْ فِي الْإِنَاءِ وَإِذا أَتَى الْخَلَاءَ فَلَا يَمَسَّ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ وَلَا يَتَمَسَّحْ بِيَمِينِهِ).[١٥١]

ئەبوقەتادە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ شت دەخۆنەوە لەناو جامەکەدا هەناسە مەدەن، کەسەراویش دەکەن بەدەستی راستتان چووکتان مەگرن، هەروا تاراتیش بەدەستی راستتان مەگرن). (ش/ د/ ت/ ن ـ تاج/ ١/ ١٢٠/ ١٣= ز-٢٤ ژ-١٩٤).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەبوقەتادە ناوی حاریث، یا نوعمان، یاعەمری کوڕی ڕەبیعی یە، نازناوی (فارس رسول الله) یە. واتە: شاسوارەکەی پێغەمبەری خودا، لەخزمەت حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەر بێ) ئامادەی غەزای ئوحودو غەزای خەندەق و غەزاکانی تری پاش خەندەق بووە، بەڵام واناودارەکە ئامادەی بەدر نەبووە، سەدوحەفتا فەرموودەی هەیە، یازدەیان پەسەندی هەردوو پیرن، دوو فەرموودەی تری لەبوخاریدا هەیە جگەلەو یازدەیەی کەپەسەندی هەردوو پیرن

---

[١٥١] تجرید/١، ژمارە: ١٢١. بخاری: ١٥٣. مسلم: ٢٦٧ = ٦١٢ - مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١١٤.

هەشــت فــەرموودەی تــری لەصــەحیحی موســلیم دا هەیــە، واتــە: کــۆی فــەرموودەکانی لەبوخاریـدا دەکاتـە: ١١+٢= ١٣ فـەرموودە، وەکۆی فـەرموودەکانی لەموسـلیم دا دەکاتـە یـازدە لەگـەڵ هەشـت دا یەکـسانە بـەنۆزدە، سـەرجەمی فـەرموودەکانی لـەبوخاریو موسـلیم دا دەکاتـە: ١١+٢+٨= ٢١ فـەرموودە. ڕاجیـایی هەیە لەشوێنی مردنیدا هەندێ دەفەرموون: لەمەدینە مردووە، هەنـدێ دەڵێن: لەکووفـە مـردووە، لەسـاڵی پـەنجاو چـواری کۆچـی دا لەتەمـەنی حـەفتا سـاڵیدا فــەرمانی هــەقی یــەزدانی بــەجێ هێنــاوە ڕەزای خــودای لێ بــێ. لەزانــستی فـەرموودەدا زانینــی زێـدو شـوێنی مـەرگو چـەندێتی تەمـەنو سـاڵی مـەرگی فـەرموودەزان (ڕاوی)و جێگـەی دانیـشتنیو نـاوی ناسـیاوی، بایـەخێکی چـاکی هەیە، زۆرجار دەبێ بەسەرچاوە بۆ ڕوون کردنەوەی فەرموودەکە، یابۆ لـەباریو نالـەباریی ڕشـتەکەی. بـۆ نموونـە: بـەپێ ی مەرجـی بوخـاری بەیـەك گەیـشتنی فــەقێو مامۆســتا، بۆگێڕانــەوەی فــەرموودە لەلایــەنی ئــەو فــەقێ یــەوە لــەو مامۆسـتایەوە پێویـستە، دەبـێ هـەردوولا هاوچـەرخ بـن، وەکـی تـریش ئیمـامی حەمزە لەغەزای ئوحوددا شەهید بووە، کەواتـە کەسـێ لـەوەوە داسـتانی غـەزای خەندەق بگێڕێتەوە ڕاست ناکا، بـەڵام داسـتانی غـەزای بـەدر بگێڕێتـەوە دەبـێو قسەکەی ڕێ ی تێدەچێ، چونکە ئیمـامی حـەمزە یـەکێك بـووە لەپاڵەوانـەکانی غەزای بەدر، کەلەساڵی دووەمی کۆچی دا ڕووی داوە، لەغەزای ئوحـوددا شـەهید بووە کەلەساڵی دوەمی کۆچی دا روی داوە، دەی چۆن ئـەقڵ دەیگـرێ کـەئیمامی حەمزە داستانی غەزای خەندەق بگێڕێتەوە کەلەسـاڵی چوارەمی کۆچـیدا ڕووی داوە.

بێجگـە لـەم ئەبوقەتادەیـە لـەناو یـارانی پێغەمبـەردا کەسـێکی ترنییـە کەســناوی ئەبوقــەتادە بــێ، کەواتــە: ئەگــەر یــەکێ فــەرموودەیێ بداتــەپاڵ

ئەبوقەتادەیەکی تر لەهاوڕێیانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قسەکەی جێگەی گومانێکی گەورەیە، بگرە درووییەکی ڕووتە، چوونکە بەپێچەوانەی فەرمایشتو ڕای پسپۆڕانی ئەم زانستەوەیە.

## (١٩) باب: التَيَمُن فِي الطهُور وَغَيْرِهِ
## پێشخستنی لای ڕاست لەکاری پەسەندا

١٥٢- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعْجِبهُ ألتيمنُ فِي تَنَعُّلِهِ وَتَرَجُّلِهِ وَطهورهِ وَفِي شَأْنِهِ كُلِّهِ).[١٥٢]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) (تابۆی بکرایە لەگشت کاروبارێکی خۆی دا حەزی لەوەبوو کەلای ڕاست پێش بخات، وەك پێلاو لەپێ کردنو سەرداهێنانو مووشانەکردنو دەستنوێژ گرتنو گشت کاروبارێکی بایەخداری تر). (ش/ د/ ت/ ن ـ تاج/ ١/ ٤/١٥٤ تاج١ ز-٣٢ ژ-٢٨٠ + تاج/ ٤/ ١٤٠/ ٤).

## (٢١) باب: الإستنجاءِ بالماء مِنَ التبرُزِ
## تاراتگرتن بەئاو لەدوا سەراو

١٥٣- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قالَ: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذا خَرَجَ لِحَاجَتِهِ أَجِيءُ أَنَا وَغُلَامٌ مَعَنَا إِدَاوَةٌ مِنْ مَاءٍ يَعْنِي يَسْتَنْجِي بِالماء). وفي رِواية: من ماء وعنزة، يستنجى بالماء.[١٥٣]

ئەنەس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەدەچوو بۆسەراو، منو کوڕێکی تر، جەوەندەیێ ئاومان

---

[١٥٢] تجريد/١، ژمارە: ١٢٩. بخاری: ١٦٨. مسلم. طهارة: ٢٨٦ = ٦١٦ شيحا.

[١٥٣] تجريد/١، ژمارە: ١٢٠. بخاری: ١٥٠. مسلم: ٢٧١ = ٦١٩ شيحا.

هەڵدەگرتو شوێنی دەکەوتین، واتە: بەوئاوە تاراتی دەگرت، لەگێڕانەوەیەکدا: منو کوڕێکی تر لەسێرەی مندا، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەچوو بۆ سەراو جەوەنـدەیێ ئاومان بۆ دەبرد، بەو ئاوە تاراتی دەگرت، وەنەقیزەکەیشمان لەگەڵ خۆمان دەبرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دایدەچەقاندو دەیکرد بەبەربەست (سوترە) لەکاتی نوێژدا). (ش/ د/ ت ـ تاج/ ١/ ١٢٢/ ١ ز ـ ٢٥ ژ-٢٠١).

١٥٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذا تَبرَّزَ لِحَاجَتِهِ أَتَيْتُهُ بِمَاءٍ فَيَغْسِلُ بِهِ). (١٥٤)

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: (حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) کاتێ دەردەچوو بۆسەراو، من ئاوم بۆی دەبرد، لەپاش تەواوبوونی سەراوەکەی، تاراتی پێ دەگرتو شوێنەکەی دەشۆرد پێی). (تەجرید/١، ژمارە: ٦٠).

## (٢٢) باب: المَسْحِ عَلَى الخُفَّيْنِ
## دەستی تەڕهێنان بەسەر خوفدا

١٥٥- عَنْ جَرِيرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنهُ بَالَ ثمَّ تَوَضأَ وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ ثمَّ قَامَ فَصَلَّى فَسُئِلَ فَقَالَ رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَنَعَ مِثلَ هَذا قَالَ إِبْرَاهِيمُ فَكَانَ يُعْجِبُهُمْ لِأَنَّ جَرِيرًا كَانَ مِنْ آخِرِ مَنْ أَسْلَمَ). (١٥٥)

---

(١٥٤) مسلم. شیحا: ٦٢٠. بخاری: ١٥١ = تەجرید/١، ژمارە: ١٦٠.

(١٥٥) تجرید البخاری/١، ژمارە: ٢٤٧. بخاری: ٣٨٧. مسلم: ٦٢١ = مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١٣٦ب

**هەممام (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: جەریری کوڕی عەبدوڵڵا جارێ گمێزی کردو خۆی پاك کردەوەو ئەوجا دەستنوێژی گرتو، لەباتی شۆردنی قاچەکانی دەستی تەڕی بەسەر سۆڵەکانیدا کە لەپێیدا بوون هێنا، ئەوسا هەڵسا بەسۆڵەکانیەوە نوێژی کرد، جا پیاوێ رەخنەی لێ گرتو لێی پرسی: چۆن شتی وادەکەی، پێت ناشۆری‌و بەپێڵاوەوە نوێژ دەکەی؟! فەرمووی: بۆنایکەم، من بەچاوی خۆم دیومە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەمان شتی کردووە.**

**ئەعمەش کە یەکێکە لە پیاوانی رشتەی ئەم فەرموودەیە فەرمووی: ئیبراهیم کە مامۆستای ئەعمەشە لەم رشتەیەدا، فەرمووی: موسوڵمانان ئەم فەرموودەی جەریریان زۆر بەدڵ بوو، چونکە جەریر لەدوا هاتنی ئایەتی دەستنوێژ کەوا لە سوورەتی مائیدەدا، ئیسلام بووە، ئەمەیش واتای وایە دەستهێنان بە سۆڵدا، کە لەپێش هاتنی ئەم ئایەتەدا هەبووە نەسخ نەبۆتەوە بەهاتنی ئەم ئایەتە.**

**١٥٦- عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: كَانَ أَبُو مُوسَى يُشَدِّدُ فِي الْبَوْلِ، وَيَبُولُ فِي قَارُورَةٍ وَيَقُولُ: إِنَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ كَانَ إِذَا أَصَابَ جِلْدَ أَحَدِهِمْ بَوْلٌ قَرَضَهُ بِالْمَقَارِيضِ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ لَوَدِدْتُ أَنَّ صَاحِبَكُمْ لاَ يُشَدِّدُ هَذَا التَّشْدِيدَ، فَلَقَدْ رَأَيْتُنِي أَنَا وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَتَمَاشَى، فَأَتَى سُبَاطَةَ قَوْمٍ خَلْفَ حَائِطٍ، فَقَامَ كَمَا يَقُومُ أَحَدُكُمْ فَبَالَ، فَانْتَبَذْتُ مِنْهُ، فَأَشَارَ إِلَيَّ، فَجِئْتُهُ فَقُمْتُ عِنْدَ عَقِبِهِ حَتَّى فَرَغَ). زادَ فِي رِوايَة: (فَتَوَضَّأَ فَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ).[١٥٦]**

---

[١٥٦] **مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١٣٧ = مسلم: ٢٧٣ = شیحا: ٦٢٣. تەجرید/١، ژمارە: ١٦٣. بخاری: ٢٢٤، ٢٢٥.**

ئەبو وائیل فەرمووی: ئەبو مووسای ئەشعەری خۆی زۆر دەپاراست لەکاتی میزکردنـا، تەنانـەت میـزی دەکـردە شووشـەوە مـەبادا پریـشکی بەرکـەوێ، بـۆ پاساوی ئـەم توندڕەوییـەی لـەم بارەیـەوە دەیفـەرموو: ئەگـەر کەسـێ لەنـەوەی ئیـسرائیل، واتــە: لــە ملـەتی جوولەکـە، ئەگـەر میــز لــە لەشـیان بکەوتایــە، ئەوجێـگەیەی بـە مەقەسـت دەبـڕی، چـونکە بـە ئـاوو شـتی وا پـاك نـەدەبۆوە. حوزەیفەیش فەرمووی: خۆزگەم ئەبو مووسای برادەرتان، لەم بارەیەوە ئەوەندە بەتوندی نەیگرتایـە، چـونکە شـتی وا بەپێـچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرەوەیـە، چونکە جارێ لە خزمەت پێغەمبەردا پێکەوە دوو بەدوو دەڕۆیشتین، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چووە سەر سەرانگوێلکی هۆزێ، لەپەنا دیوارێـکا بوو، وەك چۆن ئێوە بە ڕاوەستانەوە لەسەر پێ گمێز دەکەن، ئەویش ئاوا لەسەر ئـەو سـەلوێنکە بـە پێـوە وەسـتاو گمێـزی کـرد، منـیش ویـستم لـەکاتی گمیـز کردنەکەدا لێی دوور بکەومەوە، بەڵام ئامـاژەی بـۆکردم کـە لێـی نزیـك ببمـەوە، هەتا ببم بە حەشارگە بۆی‌و خەڵکەکە لەسەر ئەو شێوەیە نەیبینن، منـیش وام کرد، چووم لەلای قنگە پاژنەیدا راوەستام خۆم کرد بـە پـەردە هـەتا گمێزەکـەی تـەواو کـرد. {تـاج/١/١٢٠ — ش/د/ت/ن} لـە گێڕانەوەیـەکدا: (ئـەنجا دەسـتنوێژی گرت‌و مەسحی دوو سۆلەکەی پێی کرد).

**ڕوونکردنەوە:**

وا دەردەکــەوێ کــە پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســـەر بـــێ) لــەم سـەراوکردنەدا مەهانـەی ڕەوای بووبـێ، وەك نەپـەرژان‌و خۆپاراسـتن لـە بـۆن‌و پیسی زبڵدانەکە، لەهەمان کاتدا بەڵـگەی ئەومیـشە بـە پێـوە گمیزکـردن، لەبـەر هەندێ هۆ دروستە‌و ناڕەوا نییە، گەرچی پێغەمبەر نەیی کردووە لـە میزکـردن بە پێوە.

١٥٧- عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُول اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ وَأَنَّهُ ذهَبَ لِحَاجَةٍ لَهُ وَأَنَّ مُغِيرَةَ جَعَلَ يَصُبُّ الْمَاءَ عَلَيْهِ وَهُوَ يَتَوَضأُ فغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ وَمَسَحَ برَأْسِهِ وَمَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ).[١٥٧]

ئەمە دەقی تەجریدی بوخاری بوو، ئەمەیش کوردییەکەیەتی:

موغیرەی کوڕی شوعبە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چووە دەرەوە ڕۆیشت بۆسەراو، منیش بەجەوەندەییێ ئاوەوە شوێنی کەوتم، جالەسەراوەکەی لێ بۆوە ئاوەکەم کرد بەدەستیاو دەسنوێژی گرت، وەلەجیاتی شۆردنی پێی دەستی تەڕی هێنا بەسەر هەردوو سۆڵەکانیدا، سۆڵ: واتە: خوفف). (ش/ د/ ت/ ن ـ تاج/ ١/ ١٤٠/ ١ =ز-٢٩ ژ-٢٤٧).

١٥٨- عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَاتَ لَيْلَةٍ فِي مَسِيرٍ، فَقَالَ لِي: أَمَعَكَ مَاءٌ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَنَزَلَ عَنْ رَاحِلَتِهِ، فَمَشَى حَتَّى تَوَارَى فِي سَوَادِ اللَّيْلِ، ثُمَّ جَاءَ، فَأَفْرَغْتُ عَلَيْهِ مِنَ الإِدَاوَةِ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ، وَعَلَيْهِ جُبَّةٌ مِنْ صُوفٍ، فَلَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يُخْرِجَ ذِرَاعَيْهِ مِنْهَا، حَتَّى أَخْرَجَهُمَا مِنْ أَسْفَلِ الْجُبَّةِ، فَغَسَلَ ذِرَاعَيْهِ، وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ أَهْوَيْتُ لأَنْزِعَ خُفَّيْهِ، فَقَالَ: دَعْهُمَا فَإِنِّي أَدْخَلْتُهُمَا طَاهِرَتَيْنِ». وَمَسَحَ عَلَيْهِمَا}.[١٥٨]

ئەمە دەقی ژمارە (١٣٧)ی پوختەی بوخارییە:

موغیرەی کوڕی شوعبە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێکا، شەوێ لە خزمەتی پێغەمبەردا بووم، فەرمووی پێم: ئاوت پێیە؟ گوتم: بەڵێ. لە ولآخەکەی دابەزیو ڕۆیشت بۆ سەراوکردن، هەتا لەتاریکی شەوەکەدا

(١٥٧) تەجرید/١، ژمارە: ١٣٧. بخاری: ١٨٢ مسلم وچوو: ٦٢٥، ١٧٨٦.

(١٥٨) تجرید/١، ژمارە: ١٣٧. بخاری: ٢٠٣. مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١٣٨ = شیحا: ٦٣٠.

لەبەرچاو وون بوو، لەپاشا هاتەوەو ویستی دەستنوێژ بگرێ، منیش لە جەوەندەکە ئاوم کرد بە دەستیدا، جا دەموچاوی شۆرد، جبەیەکی خوری لەبەردا بوو، ویستی قۆڵەکانی هەڵماڵێ، بەلاَم قۆڵی جبەکە تەسك بوو، بۆی هەڵنەماڵرا، هەتا قۆڵەکانی داکەندو لەژێر جبەکەوە هەردوو باسکی شۆرد، دەستی تەڕی هێنا بەسەریدا، دانەویمەوە کە سۆلەکانی لەپێ داکەنم هەتا پێیەکانی بشوات، فەرمووی: (وازیان لێ بێنە، بە دەستنوێژەوە لەپێم کردوون، پێویست بەشۆردن ناکا). ئەوجا لەجیاتی شۆردنی پێی دەستی تەڕی هێنا بەسەر هەردوو سۆلەکانیدا، سۆل واتە: خوفف} . (تاج/١/١٤٠، ژمارە: ١ – ش/ن).

١٥٩- عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ عَنْ أَبِيهِ (رضى الله عنه) قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم) ذَاتَ لَيْلَةٍ فِى سَفَرٍ فَقَالَ « أَمَعَكَ مَاءٌ » . قُلْتُ نَعَمْ . فَنَزَلَ عَنْ رَاحِلَتِهِ ، فَمَشَى حَتَّى تَوَارَى عَنِّى فِى سَوَادِ اللَّيْلِ ، ثُمَّ جَاءَ فَأَفْرَغْتُ عَلَيْهِ الإِدَاوَةَ ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ ، وَعَلَيْهِ جُبَّةٌ مِنْ صُوفٍ ، فَلَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يُخْرِجَ ذِرَاعَيْهِ مِنْهَا حَتَّى أَخْرَجَهُمَا مِنْ أَسْفَلِ الْجُبَّةِ ، فَغَسَلَ ذِرَاعَيْهِ ، ثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ ، ثُمَّ أَهْوَيْتُ لأَنْزِعَ خُفَّيْهِ فَقَالَ « دَعْهُمَا ، فَإِنِّى أَدْخَلْتُهُمَا طَاهِرَتَيْنِ ، فَمَسَحَ عَلَيْهِمَا »:[١٥٩]

موغیرەی کوڕی شوعبە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێکا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە لەشکرەکە دواکەوت، منیش لە خزمەتیدا دواکەوتم، چوو دەستی بەئاو گەیاندو فەرمووی: (ئایا ئاوت پێیە؟) گوتم: بەڵێ. جا مەتارەکەم بۆ برد، لەئاوی مەتارەکە هەردوو دەستی هەتا مووچەکانی شۆرد، ئینجا ڕوخساری شۆرد، ئەنجا ویستی قۆڵەکانی هەڵماڵێ، بەلاَم قۆڵی جبەکەی تەسك بوو بۆی هەڵنەماڵرا، بۆیە لەژێر جبەکەوە قۆڵی دەرهێناو جبەکەیدا بەسەر شانیاو هەردوو باسکی شۆردو، مەسحی پێشە

---

[١٥٩] مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١٤٠ = شيحا: ٦٣٢ (ر: ١٥٨).

سەری‌و سەر مێزەرەکەی کرد، هەروا مەسحی سۆلەکانی کرد لەباتی شۆردنی قاچەکانی. ئەنجا سواری وڵاخەکەی بوو، منیش سواری وڵاخەکەی خۆم بووم‌و شوێنی کەوتم‌و رۆیشتین هەتا گەیشتینەوە بە خەڵکەکە، روانیمان دەستیان کردووە بە نوێژ، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف بەرنوێژییەکەی بۆ دەکردن، رکاتێکی پێ کردبوون، کاتێ هەستی بەهاتنی پێغەمبەر کرد، ویستی بێتە دواوەو شوێنەکەی چۆڵ بکا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاماژەی بۆکرد، کە لە شوێنی خۆی بمێنێ‌و نوێژەکەیان بۆتەواو بکا، ئەویش وایکردو تەواوی نوێژەکەی بۆمان کرد، من‌و پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە هاتین، لەپشت عەبدوڕەحمانەوە نوێژمان دابەست، جا کاتێ کە ئەو سڵاوی نوێژی دایەوە، پێغەمبەر سڵاوی نەدایەوە، بەڵکوو هەڵسا ئەو رکاتەی کرد کە لەپێش ئێمەوە ئەوان کردبوویان، ئەوجا سڵاوی دایەوە، جا منیش هەڵسام پێغەمبەر چی کرد منیش هەمان شتم کردو سڵاوم دایەوە}.

## (٢٧) بابُ: حُكْم وُلُوغِ الكَلْبِ
## بڕیاری شوێن دەم‌و دەم تێنانی سەگ

١٦٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذا شَرِبَ الْكَلْبُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ فَلْيَغْسِلْهُ سَبْعًا).[١٦٠]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ سەگ، یان بەراز دەمی نایە ناو حاجەت‌و

---

[١٦٠] تەجریدی بوخاری = مختصر صحيح البخاري بەکوردی/١، ژمارە: ١٣٢. بخاری: ١٧٢. مسلم: ٢٧٩ = شيحا: ٦٤٦.

قاپتانــەوە هەرچــی تێدایــە بیڕێــژن، ئینجـا حــەوت جـار بــەئاو بیــشۆرن). لەگێڕانــەوەی (٦٤٩)ی موســلیم تــەرقیم شــیحادا: (یەکــەمیان بــەخۆڵاو). لەگێڕانەوەیەکی تـردا: (جاری حەوتـەمیان بـەخۆڵاو). (ش/ د/ ت/ ن ـ تـاج/ ١/ ١٠٩/ ٤ = ز-٢٤ ژ-١٦٢).

## (٢٨) باب: النهي عن البول في الماء الراكد.
## جڵەوگیری لەمیزکردن لەناو ئاوی ڕاوەستاودا

١٦١- عَنْ أبي هريرة (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النبيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَه قَـالَ: (لَا يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ فِي الْمَاءِ الدَّائِمِ الذِّي لاَيَجْرِي ثُمَّ يَغْتَسِلُ فِيهِ).[١٦١]

ئـەبوهورەیرە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسەر بـێ) فـەرمووی: (کەسـتان گمیـز مەکەنـە نـاو ئـاوی ڕاوەسـتاوەوە، کەلەبـەری نـەڕوا لەپاشیـشا بـچێت خـۆی تیـادا بشوات). (تـاج/١/١٠٥/٦ = تـاج/١، لاپەڕە: ١٠٥، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ١٥١/٦).

## (٣٠) باب: وجوب غسل البول وغيره من النجاسات إذا حصلت في المسجد وأن الأرض تطهر بالماء من غير حاجة إلى حفرها.
## ئەگەر لەناو مزگەوتا، پیسی ڕویدا، وەك میزو شتی تری وا، پێویستە كە بشۆرێ بۆ شۆردنی زەوی ئەوەندەی بەسە كە ئاوی پیا بكرێ، پێویست بەهەڵكەندن ناكات

١٦٢- عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَيْنَمَـا نَحْـنُ فِـى الْمَـسْجِدِ، مَـعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) إِذْ جَـاءَ أَعْرَابِـىٌّ فَقَـامَ يَبُـولُ فِـى الْمَـسْجِدِ، فَقَـالَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مَهْ مَهْ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَـلَّى اللَّـهُ

---

[١٦١] تجرید/١، ژمارە: ١٧١. بخاری: ٢٣٩. مسلم: ٢٨٢ - ٦٥٣، ٦٥٥ شیحا.

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « لاَ تُزْرِمُوهُ دَعُوهُ » فَتَرَكُوهُ حَتَّى بَالَ، ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دَعَاهُ فَقَالَ لَهُ: « إِنَّ هَذِهِ الْمَسَاجِدَ لاَ تَصْلُحُ لِشَيْءٍ مِنْ هَذَا الْبَوْلِ وَلاَ الْقَذَرِ، إِنَّمَا هِيَ لِذِكْرِ اللّٰهِ عَزَّ وَجَلَّ، وَالصَّلاَةِ وَقِرَاءَةِ الْقُرْآنِ» أَوْ كَمَا قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). قَالَ: فَأَمَرَ رَجُلاً مِنَ الْقَوْمِ، فَجَاءَ بِدَلْوٍ مِنْ مَاءٍ فَشَنَّهُ عَلَيْهِ}.[١٦٢]

ئەمە دەقی مختصر صحیح مسلم، ژمارە (١٨٦) بوو، سوودی زۆری واتیادا، بۆیە نووسیمان:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەخزمەتی پێغەمبەردا بووین، (دروودی خودای لەسەر بێ)، لەناو مزگەوتەکەی پێغەمبەر، لە مەدینە، لە خزمەتیدا دانیشتبووین، لەناکاوا عەرەبێکی دەشتەکی هات، هەڵسا لەناو مزگەوتەکەدا، لەبەرچاوی ئێمە بەپێوە راوەستاو دەستی کرد بەمیزکردن!

هاوڕێیانی پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) تێیان خوڕی: کوڕە! نەکەی، کوڕە! نەکەی. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (میزەکەی پێ مەبڕن، وازی لێ بێنن، با میزەکەی تەواو بکا).

ئەوانیش وازیان لێ هێنا هەتا میزەکەی تەواوکرد. ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کابرای میزکەری بانگ کرد بۆلای خۆیو پێی فەرموو: (مزگەوت خانەی خودایە، جێگەی پاكو خاوێنییە، جێگەی میز لێکردنو هیچ جۆرە پیسییەکی تر نییە، بەڵکوو جێگای زیکرو یادی خودای گەورەو سەروەرە، جێگای نوێژزە، جێگەی قورئان خوێندنو شتی وا پیرۆزە).

فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یا ئاوای پێ فەرموو، یا فەرمایشتێکی تری ئاوای پێ فەرموو. فەرمووی: ئەوجا پێغەمبەر (دروودی

---

[١٦٢] تجرید/١، ژمارە: ١٦١. بخاری: ٢٢٠. مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١٨٦ = شیحا: ٦٥٩.

خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد بە پیاوێ، سەتڵێ ئاوی هێنا، بەرە بەرە کردی بەسەر جێ میزەکەی کابرادا). {تاج/١٠/١١٠، زنجیرە: ٢٣ تاج-٥ چ-٤ ز-٢٣- ش/د/ت/ن}.

**ڕوونکردنەوە:**

١- ڕاگرتنی پاكو خاوێنی مزگەوتو، گسکدانو پاککردنەوەی لەهەموو جۆرە پیسییەك، مزگەوت جێگەی خوا پەرستیو یادو زیکری خوداو دەورو دەرسی قورئانو سوننەتو زانستە شەرعییەکانە، دەست نادا بۆ شتی تر، وەك شتی پیسو کاری ناشەرعیو ناڕەوایی، نەرمو نیانی لەگەڵ نەزانو نەفامو ئەم جۆرە کەسانەدا، کارێکی زۆر پەسەندە، خراپیش پلە پلەیە، کەواتە: ڕێگە بەکردنی خراپ دەدرێ، هەتا خراپتر ڕوونەدات، کەشتی وا لەشەرعا پێی دەگوترێ: دەفعی ئەقبەح بە قەبیح.

لە تەدریبی راویدا، بەرگی/١، لاپەڕە: ٥٣٨. دەفەرموێ: (وَيَنْبَغِي لِلرَّاوِي بِالْمَعْنَى أَنْ يَقُولَ عُقَيْبَهُ: أَوْ كَمَا قَال، أَوْ نَحْوَهُ، أَوْ شِبْهَهُ، أَوْ مَا أَشْبَهَ هذا مِنَ الأَلْفَاظِ): واتە: بۆ کەسێ فەرموودەکە، بەمەعنا ریوایەت دەکا، دەبێ یەکسەر لەدوایەوە بڵێ: پێغەمبەر یا ئاوای فەرموو، وەك ئەمەی کە ئێستا من گێڕامەوە، یا شتێکی تری ئاوای فەرموو، کە ئەمە واتاکەی بوو!).

## (٣١) باب: حكم بول الطفل الرضيع وكيفية غسله.
## بڕیاری میزی منالّی شیرەخۆرە چییەو چۆن ئەشۆرێت؟

**١٦٣- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) يُؤْتَى بِالصِّبْيَانِ فَيَدْعُو لَهُمْ ، فَأُتِيَ بِصَبِيٍّ فَبَالَ عَلَى ثَوْبِهِ ، فَدَعَا بِمَاءٍ فَأَتْبَعَهُ إِيَّاهُ ، وَلَمْ يَغْسِلْهُ .[١٦٣]**

**عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کوڕێکی ساوای مەمکەخۆرەیان هێنا بۆ خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) مندالّەکە میزیکرد بەکۆشی پێغەمبەردا، جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) داوای ئاوی کردو ئاوەکەی کرد بەسەر جێگەی میزەکەداو بەس، بەلاّم نەیشۆرد). (تاج/١، زنجیرە: ٢٣، ژمارە: ١٦٧).**

**١٦٤- عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتَ مِحْصَنٍ (رَضِيَ اللَّهُ عنها)، أَنَّهَا أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِابْنٍ لَهَا لَمْ يَبْلُغْ أَنْ يَأْكُلَ الطَّعَامَ، قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: أَخْبَرَتْنِي أَنَّ ابْنَهَا ذَاكَ بَالَ فِي حِجْرِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمَاءٍ فَنَضَحَهُ عَلَى ثَوْبِهِ وَلَمْ يَغْسِلْهُ غَسْلاً}.[١٦٤]**

**ئوم قەیسی کچی میحصەن (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کوڕێکی کوڕپەم هەبوو، نانە خۆرە نەبوو بوو، بۆ موبارەکیو پیرۆزی بردم بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە کۆشی خۆیدا دایینیشاند، منالّەکە میزی کرد بە جلەکانیدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داوای ئاوی کردو ئاوەکەی لە جلەکەی پرژاند، ئیتر نەیشۆرد). {تاج/١/١١١/٤ ژ-١٦٦ ج-٤- ش/د/ت/ن}.**

---

**[١٦٣] مسلم شيحا: ٦٦٠، بخاري: ٦٣٥٥.**

**[١٦٤] تجريد/١، ژمارە: ١٦٢، بخاري: ٢٢٣، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١٨٢ = شيحا: ٦٦٥.**

**روونکردنەوە:**

**ئوم قەیس خوشکی وەکاشەی کوڕی میحصەنە، لە موسوڵمانە پێشینەکانە، لە مەککە ئیسلام بووە، وە کۆچی کردووە بۆ مەدینە، بیستو چوار فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، لە صەحیحەیندا دوو فەرموودەی هەیە، زۆر تەمەن درێژ بووە، ئیمامی نەسائی، بەڕشتەی خۆی دەگێڕێتەوە کە ئوم قەیس دەفەرموێ: کوڕێکم مرد، زۆر بۆی پەرۆش بووم، بە مردوو شۆرەکەم گوت: تەرمی کوڕەکەم بە ئاوی سارد مەشۆرە دەیکوژیت، وەکاشەی برام ئەمە دەگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەوە چییەتی وادەکا، تەمەنی درێژبێ). ئەبولحەسەن کە ئەم فەرموودەیە لە ئوم قەیسەوە دەگێڕێتەوە، دەفەرموێ: بە پیرۆزیی ئەو نزایەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ژنێکی تر گومان نابەم کە بەقەد ئەو تەمەن درێژبێت).. {بڕوانە: تەجریدی بوخاری/٥/١٦٨، ژمارە: ١٨٧٦ = ٥٧٠٥و ئەترافەکانی: ٣٤١٠، ٥٧٥٢، ٦٤٧٢، ٦٥٤١ فەتحولباری} .**

## (٣٢) باب: حكم المنى
## باسی بڕیاری تۆماو

١٦٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) فَقَالَتْ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ عَنِ الْمَنِيِّ يُصِيبُ الثَّوْبَ فَقَالَتْ كُنْتُ أَغْسِلُهُ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) ، فَيَخْرُجُ إِلَى الصَّلاَةِ وَأَثَرُ الْغَسْلِ فِي ثَوْبِهِ بُقَعُ الْمَاءِ. [١٦٥]

---

[١٦٥] **مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١٨٨ = شیحا: ٦٧٢، مختصر صحيح البخاری = تجرید/١، ژمارە: ١٦٦، بخاری: ٢٢٩، مسلم: ٢٨٩ - ٦٦٧ شیحا.**




پرسیارکرا لە عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەبارەت بەتۆماوی پیاو ئەگەر بەر جل‌وبەرگ بکەوێ دەشۆرێ یانا؟ فەرمووی: جاری وادەبوو تۆماو بەجلەکانی پێغەمبەرەوە هەبوو دەیمشۆرد، کەدەچوو بۆ نوێژ بۆ مزگەوت هێشتا جێگە شۆراوەکە تەڕ بوو، وەك پەڵەیێ لەرەنگێکی تر بەجلەکەیەوە دیار بوو (تاج/١، زنجیرە: ٢٣، ژمارە: ١٧٤ — ش/د/ت/ن).

ئەمەیش دەقی ژمارە (١٨٨)ی پوختەی موسلیمە:

عەبدوڵڵای کوڕی شەهابی خەولانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەلای عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) میوان بووم، دوو لۆ جلم لەبەردا بوو، لەخەوا شەیتانی بووم، هەردوو جلەکەمم هەڵکێشا لە ئاوو شۆردمن، کارەکەرێکی عائیشە، ئەم حاڵی جل شۆردنەی من دەبینێ، وە دەچێ هەواڵی ئەمە دەدا بە عائیشە، عائیشە ناردی بەشوێنما، چووم بۆلای، فەرمووی: خێربوو وا جلەکانی خۆتت شۆردووە، هۆی ئەوە چی بوو؟ منیش گوتم: لەخەوا شەیتانی بووم، کەشتی وا بۆ نووستوو کارێ ئاساییە کە جلەکەی بشوات. عائیشە فەرمووی: ئایا تۆماوت بەو دوو جلەوە بینی؟ گوتم: نەء. فەرمووی: گریمان ئەگەر تۆماویان پێوە بوایە باوەڕت وابوو کە تۆماوەکە پیسەو لەبەرئەوە پێویستە جلەکان بشۆرێن‌و لەبەرئەوە دەتشۆرین؟ چۆن شتی وا دەکەیت‌و کەی شتی وا پیسە، لە کاتێکا کە من بەخودی خۆم تۆماوم دەدی بەجلەکەی پێغەمبەرەوە، کە وشکەوە بوو بوو بە نینۆك دەمکراند‌و ئیتر نەیم دەشۆرد، پێغەمبەریش بەوە ئیکتیفای دەکردو فەرمانی نەدەکرد کە بیشۆرین، کەواتە: تۆماو پاکە).

## (٣٣) باب: نجاسة الدم وكيفية غسله
## خوێن پیسە، چۆنێتی شۆردنی خوێن

١٦٦- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) قَالَتْ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَتْ: إِحْدَانَا يُصِيبُ ثَوْبَهَا مِنْ دَمِ الْحَيْضَةِ كَيْفَ تَصْنَعُ بِهِ؟ قَالَ: « تَحُتُّهُ، ثُمَّ تَقْرُصُهُ بِالْمَاءِ، ثُمَّ تَنْضَحُهُ، ثُمَّ تُصَلِّي فِيهِ».[١٦٦]

ئەسمای کچی ئەبوبەکر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ژنێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: ئەگەر خوێنی بێنوێژی بەر جلەکانمان کەوت چی لێ بکەین؟ فەرمووی: (بی وولێنو بی کرێننو ئەوجا بە ئاو هەڵی گوڵۆفنو دەستی تێ بخەن، لەپاشا پاك بیشۆرن، ئیتر نوێژی پێوە بکەن). {تاج/١/١١٠، زنجیرە: ٢٣، ژمارە: ١٦٢ – ش/د/ت/ن} .

### روونکردنەوە:

ئەسماء کچی ئەبوبەکری صدیقە، خوشکی باوکی عائیشەی هاوسەری پێغەمبەرە، خوشکی دایكو باوکی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکرە، ژنی حەزرەتی زوبەیرە، (بڕوانە ژمارە: ٨)، ناودارە بە (ذات النِّطَاقين) لەپێش کۆچدا بە بیستو حەوت ساڵ لەدایك بووە، هەژدەهەم کەس بووە کە موسوڵمان بووە، پەنجاو شەش فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) هەژدە فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە، هەژدەیشی لە موسلیمدا هەیە، چواردەیان پەسەندی هەردوو لایە، کەواتە سەرجەمی فەرموودەکانی لە بوخاریو موسلیمدا، دەکاتە: ١٤ + ٤ + ٤ = ٢٢ فەرموودە، لەپاش شەهید بوونی عەبدوڵڵای کوڕی، لە مەککە، لەساڵی حەفتاو سێی کۆچیدا، لە تەمەنی سەد

---

[١٦٦] تجرید البخاری/١، ژمارە: ١٦٤، بخاری: ٢٢٧، مسلم: ٣٣٣ - ٦٧٣ ترقیم شیحا = مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١٨٩.

ساڵیدا، بە مردنی خوا، کۆچی دوایی کرد، کە مرد هیچ ددانی نەکەوتبوو، ئەقڵیشی ساغو تەواو بوو، (رەزای خودای لێ بێ). {بڕوانە ژمارە: ٧٨٤ تەجرید/٢، لاپەڕە: ٣}.

## روونکردنەوەیەکی گرنگ

لەبەرئەوەی کە نوێژ کۆڵەکەی دینە، وە زۆرینەی خوێنەرانیش هێزیان بە فامی تەواوی زۆر لە فەرموودەکان ناشکێ، لەبەرئەوە بەپێی سەرچاوەکانی بەردەست، بەتایبەتی شەرحی نەوەویو فەتحولباری، بڕیارە شەرعییەکان لە فەرموودەکان روون دەکەینەوە، هەتا سەر لەخوێنەر نەشێوێ. ئیتر بەپشتی خوداو خودا یاریدەرمان بێ.

## (٣٤) باب: الدليل على نجاسة البولو وجوب الإستبراء منه
## بەڵگەی پیسی گمێز، لەگەڵ پێویستبوونی خۆپاراستن لە گمێز

١٦٧- عَنْ ابْنُ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى قَبْرَيْنِ، فَقَالَ: «أَمَا إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ، أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ، وَأَمَّا الآخَرُ فَكَانَ لاَ يَسْتَتِرُ مِنْ بَوْلِهِ» . قَالَ: فَدَعَا بِعَسَبٍ رَطْبٍ فَشَقَّهُ بِاثْنَيْنِ. ثُمَّ غَرَسَ عَلَى هذَا وَاحِداً وَعَلَى هذَا وَاحِداً، ثُمَّ قَالَ: « لَعَلَّهُ أَنْ يُخَفَّفُ عَنْهُمَا مَا لَمْ يَيْبَسَا».[١٦٧]

ئیبنو عەباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینە، یا لە مەکە، بەلای باخە خورمایەکا

---

[١٦٧] تجرید/١، ژمارە: ١٥٩، بخاری: ٢١٦، مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١١٣ = ٢٩٢ = شیحا: ٦٧٥.

رابورد، گوێی لەدەنگی دوو مرۆڤ بوو، کە تازە مردبوون، لەناو گۆڕەکانیاندا سزا دەدران. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خاوەنی ئەم دوو گۆڕە سزا دەدرێن، لەسەر شتێ سزا دەدرێن کە خۆیان لە ژیانیانا بە گەورەو گرانیان دانەناوە، بەبێ نرخیان زانیوە، بەڵام ئەو شتە لەلای خودا، گوناهو تاوانێکی گەلێ گەورەیە، یەکێکیان لەسەر ئەوە ئازار دەدرێ کە لە دنیادا قسە چێن بوو، دوو زمانی دەکرد، قسەی دەهێناو دەبرد، بۆ تێکبەردانی خەڵک لەیەکتری، ئەویتریشیان لەسەرئەوە ئازار دەدرێ، چونکە لەحاڵی ژیانیدا خۆی لە گمێزی خۆی نەدەپاراستو، لەکاتی مێزکردندا خۆی لەپاڵ شتێکدا حەشار نەدەدا).

ئەنجا خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) داوای پەلکە دارخورمایەکی تەڕی کردو کردی بەدوو لەتەوەو، هەرکەرتەی لەسەر گۆڕێکیان داچەقاند.

عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمەت بۆچی کرد، بۆ وات کرد؟ فەرمووی: (چونکە گیاو داری سەوزو درەختی تەڕی سەر گۆڕ، تاوشك دەبێو تەڕایی تیادا نامێنێ، دەپاڕێنەوە بۆ مردووەکە، جا کەوابوو بەشکوو ئەم دوولەتە پەڵکە خورما سەوزەیە لەم روانگەیەوە، باری ئازاریان سووك بکەن، هەتا ئەوکاتەی کە وشك دەبنو لە تەسبیحات کردن دەکەون بۆیان ببن بەمایەی رەحمەت). {تاج/١/١١٠، زنجیرە: ٢٣، ژمارە: ١٦٦/٣ – ش/د/ت/ن = بوخاریو موسلیمو ئەبو داوودو تەرمەزیو نەسائی – پڕ گۆڕە پیرۆزەکانیان لە رەحمەتی خودا بێ}.

ئەمەیش ژمارە (١٥٩)ی تەجریدە:

ئیبنوعەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (درוودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینە، یالەمەککە، بەلای باخە خورمایەکا رابورد، گوێ ی لەدەنگی دوو مرۆڤ بوو، لەناو گۆڕەکانیان دا سزا دەدران، پێغەمبەر (درוودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خاوەنی ئەم دوو گۆڕە سزا دەدرێن، لەسەر شتێ سزا دەدرێن کەخۆیان لەژیانیانا بەگەورەو گرانیان دانەناوە، بەبێ نرخیان زانیوە، بەڵام ئەو شتە لەلای خودا، گوناهو تاوانێکی گەلێ گەورەیە، یەکێکیان لەسەرئەوە ئازار دەدرێ چونکە لەحاڵی ژیانی دا خۆی لەگمیزی خۆی نەدەپاراستو، لەکاتی میزکردن دا خۆی لەپاڵ شتێك دا حەشار نەدەدا، ئەویتریشیان قسەچێن بوو، دووزمانی دەکرد، قسەی دەهێناو دەبرد بۆ تێکبەردانی خەڵك لەیەکتری!).

ئەنجا حەزرەت (درוودی خودای لەسەر بێ) پەلکە دارخوارمایەکی سەوزی هەلگرتو کردی بەدوو لەتەوەو، هەرکەرتەی لەسەر گۆڕێکیان داچەقاند. گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمەت بۆچی کرد؟ فەرمووی: (چونکە گیاو داری سەوزو درەختی تەڕی سەرگۆڕ، تاوشك دەبێو تەرایی تێدا نامێنێ دەپارێتەوە بۆ مردووەکە، جاکەوابوو بەشکوو ئەم دوولەتە پەلکە خورما سەوزەیە لەم روانگەیەوە، باری ئازاریان سووك بکەن، هەتا ئەوکاتەی کەوشك دەبنو لەتەسبیحات کردن دەکەون!) (تاج/ ١/١١٠/ ٣ = ز-٢٣ ژ-١٦٥ ش/ د/ ت/ ن).

### روونکردنەوەیێ:

بڕیار (حوکم)ە کانی شەریعەت لەسەرچاوە گەورەکانی شەریعەت وەردەگیرێن، پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێ، لەکاروباری ئایینی دا، وەك پێشینانە باشەکان، چاویان لەدەمی زانا گەورەکان بێ، وەك شێخی ئەزهەر، وەك

جەنابی مامۆستا مەلاعەبدولکەریمی مودەڕیس، وەك هەموو مەلا گەورەکانی تری جیهانی ئیسلام. وەلەکاتی پێویست دا موراجەعەی کتێبە گەورەکانی شەرع بکرێ.

بەڵام بەداخەوە، لەوڵاتی ئێمەدا، بەتایبەتی لەکوردستانی ئازیزدا، شیرازەی کاروبار تێکچووە، کەسانی وا خۆیان بەمەلا ناگۆڕنەوە فەقێ ی تەواویش نین، خۆزگا بەخۆزگایی خودا، لایەنە ئیسلامییەکان هەقیان بەسەر بابەتە فیقهیەکانەوە نەبوایە، دەوری قازیو مەلاو موفتیان نەبینیبایە، چونکە ئەرکی پیرۆزی سەرشانی ئەوان پشتگیریی شەریعەتە، نەشری دەعوەتە، بەرگری یە لەئیسلام، هەوڵدانو تێکۆشانە بۆ پیادەکردنی دەوڵەتی قورئان!

ئەوەی من بەچاوی خۆم میبینم کارەساتێکی زۆر دڵتەزێنە، کەئەویش ئەمەیە: ڕەشەخەڵکێکی جەهێڵی وا دروست بوون باوەڕیان بەلایەنەکەی خۆیان زیاتر هەیە تابەفەرمایشتی توحفەو ئوممی شافیعیو صەحیحی بوخاری، هەتا ئێوارێ تۆ بڵێ ی لەمینهاجی نەوەوی دا وادەفەرموێ، ئەو خەڵکە سەرلێشێواوە شتی وابەبیدعەت دادەنێ، تەنانەت دووبەرەکیو ڕاجیایی یەکی گەورەی وا دروست بووە، لەناو ڕیزی نوێژی جەماعەتدا، دەزانرێ نوێژکەرەکە لەچ لایەنێکەو سەربەکێ یە! زوربەی ئەمانە لاوی غەربزەدەو کۆنە پیری عیلمانین!

بەداخەوە لایەنە نەیارەکانی ئیسلام ئەم هەڵە گەورەیان قۆستۆتەوە، یەك بەهەزار لەگیرفانی خۆیانەوە لێ ی زیاد دەکەنو، ئەوەندەی تر ئاگری ئاژاوە لەنێوان لایەنو گوروپو گورۆهە ئیسلامییەکان دا خۆش دەکەن!

من لەم کتێبە پیرۆزەدا عەرزی ئازیزانی خۆم دەکەم: نابێ لایەنگیرانی ئەو لایەنانە خۆیان لەتێکڕای موسوڵمانان جیا بکەنەوە، وەدەبێ پەیڕەوی مەزهەبی خۆیان بکەن، نابێ هەندێ بابەتو مەسائیلی خیلاف بکەن بەمارکە

موســـەججەلە بۆخۆیـــان، منـــیش لەگـــەڵ ئـــەوەدام کەپـــەیڕەوی ســـوننەت بەتێگەیشتنەوە لەپێشترو باشترە لەپەیڕەوی کردنی کوێرانەی مەزهەب!

بەڵام شتی وا بەرنامەیـەکی هێـدیو دوورودرێـژی دەوێ، کەلـەخودا بـەزیاد بـێ ئێـستا ئـەو بەرنامەیـە لەگەشـەکردن دایـە، وەبـەهیچ جـۆرێ پێویـستی بەپـشگوێ خـستنی ئـەم مەزهەبـە گەورانـە نییـە، بـەڵکوو خوایـاربێ هەمیـشە کۆششی باشی پاشـینانی نەتـەوەی ئیسلام دەبـێ بەتەواوکـەری کۆشـشی پـیرۆزی پێـشینانی ئـەم نەتەوەیـە، ڕەحمــەت لەوکەســە، لەولایەنـە، لەومەلایـە، لـەو موسوڵمانە کەقسەی خێر بۆ موسوڵمانان دەکا، ریزەکانی موسوڵمانان یەك دەخا، گوێ بۆ قسەی هەق دەگرێ.

**جا وامن لێرەدا لەبابەت ئەم فەرموودەیەوە، بۆ کەسی خۆی ئەم چەند خاڵە روون دەکەمەوە:**

١- دێنـیو سـەردانی گـۆڕو گۆڕسـتان سـوننەتێکی گەورەیـە، بـۆ پیـاوو ژن سوننەتە، ڕەحمەت لەوکەسەی بەپێی شەریعەت سەردانەکەی ئەنجام دەدا.

٢- پێـشەوا نـەوەوی (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) لەبـەرگی سـێیەمی شـەرحی صەحیحی موسلیما، لەلاپەڕە (٢٠٢ ژ-٦٧٥ شیحا) دا، لەباسی (الـدلیل علـی نجاسـة البول ووجوب الاستبراء منه) دا، بەدەق دەفەرموێ: (واستحب العلماء قراءة القرآن عند القبر لهذا الحدیث، لأنه إذا کان یرجی التخفیف بتـسبیح الجریـد فـتلاوة القـرآن أولی والله أعلم) واتە: زاناکان دەفەرموون: خوێنـدنی قورئـان لەسـەر گـۆڕ بـەپێی ئەم فەرموودەیـە سـوننەتە،چوونکە لەشـوێنێ بـەهۆی پیـتو فـەڕی تەسـبیحات کردنـی پەلکـە خورمـای سـەوزەوە، سـزای مـردوو سـووك ببـێ، دیـارە کەبـەهۆی قورئانخوێندنی موسوڵمانەوە باشتر سزای سووك دەبێ).

٣- عەللامەی عەینیش (ڕەزای خوای لێ بێ) هەمان را لەخەططابییەوە راگوێز دەکاو دەفەرموێ: (ئەم مەسەلەیە راجیایی تیادایە، ئەبوحەنیفەو ئەحمەد (ڕەزای خوایان لێ بێ) رایان وایە کەپاداشی خوێندنی قورئان دەگا بەمردوو، بەپێ ی ئەو فەرموودەیەی کەوا ئەبوبەکری نەجار لەکتێبی (السنن) دا، لەعەلی کوڕی ئەبوطالیبەوە دەیگێڕێتەوە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ لەگۆڕستانەوە رەت بێو یازدەجار (سورەتی قل هو الله أحد) بخوێنێ، ئەوجا پاداشەکەی ببەخشێ بەمردووەکان، بەقەد ژمارەی مردوەکان پاداشی پێ دەدرێ).

٤- لەکاتی خوێندنی قورئانا سەکینەو مایەی ئارامیو فریشتەی رەحمەت دادەبارن، بوخاریو موسلیمو تیرمیذی (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەگێڕنەوە: بەراء (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: شەوێ ئوسەیدی کوڕی حوزەیر سوورەتی کەهف دەخوێنێ، لەوکاتەدا ماینەکەی لەلایەوە بەدوو گوریس بەسرابۆوە، پەڵە هەورێ دەدا بەسەریاو دەیگرێتە ناوو، دەست دەکا بەگڕخواردن بەدەوریداو لێی نزیك دەبێتەوە، ماینەکەشی کەئەمە دەبینێ سڵی لێ دەکاو، هەڵ دەسەڵەمێتەوە، جا بۆبەیانی هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەمەی بۆ گێڕایەوە، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەوە فریشتەی ئارامیو مایەی رەحمەتو ئاسایش بوون لەبەرخاتری قورئانەکە داباریون!)

٥- مەعقیلی کوڕی یەسار (ڕەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (یاسین دڵی قورئانە، هەرکەسێ ئەم سورەتە ساخ بۆ رەزای خودا بخوێنێ، بەنیازی پاداشی باشی ئەوجیهان، مسۆگەر خودا لێی خۆش دەبێ، سوورەتی یاسین لەسەر مردووی خۆتان بخوێنن!) (نەسائیو

ئەحمەدو ئیبنوماجە گێڕاویانەتەوە ئیبنوحیببان بەفەرموودەیەکی دروستی داناوە). واتە: بەحەدیسێکی صەحیحی داناوە.

٦- دەقی ئایەتو فەرموودەی زۆر هەیە لەسەرئەوە کەمردوو سوودو بەهرە لەکردەوەی کەسێکی تر وەردەگرێ. وەك:

أ- قورئان دەفەرموێ: (وكان أبوهما صالحاً) وە دەفەرموێ: (ربنا اغفر لنا ولإخواننا الذين سبقونا بالإيمان) وە دەفەرموێ: (من يشفع شفاعة حسنة يكن له نصيب منها) وە دەفەرموێ: (والذين آمنوا واتبعتهم ذريتهم بإيمان ألحقنا بهم ذريتهم).

ب- نزاو پاڕانەوەی زیندوو بۆ مردوو سوودی هەیە بۆی، نوێژ لەسەر مردوو سوودی هەیە بۆی، بەپێی فەرموودەی ساخ، کەشەیخەین گێڕاویانەتەوە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کەسێ بمرێو ڕۆژووی لەسەربێ، کەسوکاری دەتوانن لەباتی ئەو بەرۆژوو بن) وەك دروشمێکی گشتی، بۆ قەزاگێڕانەوە بۆ مردوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (فدين الله أحق أن يقضى). حەجیش بۆ مردوو قەزا دەکرێتەوە، فەرموودە لەسەر ئەمە لەبوخاریو موسلیمو تیرمیزیدا هەیە، خێری وەقف دەگا بەمردوو، لەفەرموودەی ساخ دا دەڵێ: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! دایکم مردووە، ئایا سوودی هەیە بۆی ئەگەر من ئێستا خێری بۆ بکەم؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (بەڵێ). قەرزدانەوەیش بۆ مردوو سوودی هەیە.

٧- نوێژی مردوو لەسەر گۆڕ دروستە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی لەپاش هەشت ساڵ نوێژی مردووی لەسەر شەهیدەکانی ئوحود کرد، ئەوەیش مەعنای وایە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قورئانی لەسەر مردوو خوێندووە،چونکە فاتیحەی لەو نوێژەدا خوێندووە (بڕوانە: ٤٦١).

٨- ئیمـامی تـیرمیـذی بەڕشـتەیەکی جـوان دەیگێڕێتـەوە: ئیبنوعـەبباس (ڕەزای خوایان لـێ بـێ) دەفـەرموێ: جارێ پیـاوێ لـەیارانی پێغەمبـەر (درووودی خودای لەسەر بێ) نازانێ چاتۆڵەکەی لەسـەر گۆڕێ هەڵدەدات، کـەگوێ دەگـرێ والەناو گۆڕەکەدا یەکێ سـوورەتی (تبارك الـذي بيـده الملـك) دەخـوێنێ تاتـەواوی دەکا، جادەچێتە خزمەتی حەزرەت (ڕەزای خوای لـێ بێ) عەرزی دەکا: قوربـان! ئەی پێغەمبەری خودا! نەمزانی چاتۆڵەکەمم لەسەر گۆڕێ هـەڵ دابـوو، کەچـی مرۆڤێکی تیـا بـوو، کەلـەو گۆڕەدا نێـژرابوو، سـوورەتی تـەبارەکی خوێنـد هـەتا تەواوی کرد، جا پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەو سوورەتە شوورەو پەرژینەو کەسـێ بیخـوێنێ دەبـێ بەفریارەسـیو ڕزگـاری دەکـا لـە سـزاو ئێشو ئازاری گۆڕ).

٩- زۆر لەو عیبادەتانەی کە پێغەمبـەرانو بەنـدە باشـەکانی خـودا لـەپاش مردنیان کردوویانە یادەیکەنو بەندە لەصەحیحی سوننەتدا بەرچاوم کـەوتوون لەئورجوزەی (بين يدي كتاب الله) دا تۆمـارم کـردوون وەك ئـەم چـەن بابەتانـەی وان لـەم چـەن هەڵبەسـتەدا دەی ئـەم جـۆرە شـتانە ئـەوە دەگەیـەنن، کەلـەپاش مـردنیش خێری کردەوەی باش دەگـا بـەخاوەنی، وەعەلاقـەو پەیوەنـدی لـەنێوان مردوانو زینـدواندا بەتەواوی نەپچڕاوە. ئەمە چەند نموونەیەکە.

لحـــافظ (الملـــك) الـــذي يتلوهـــا
في كـــل يـــوم نـــال مـــا يرجوهـــا
تنجيـــه مـــن عقوبـــة القبـــور
وتـــشفع ولـــه لـــدى الغفـــور
وجـــاء في الخـــبر أن الميتـــا

قرأهـا في قـبره، قِـسْ يـا فتـى!
لـو لم يفـد هـذا، فهـذا الرجـل
مـا كـان في دار الثـواب يعمـل
وبعـض الانبيـاء بعـد المـوت
تعبـداً قـدْ طـاف حـول البيـت
وبعـضهم بـالحج قـد أهـلا
وبعـضهم في قـبره قـد صَـلّى
أمهـم الرسـول بالمـصلى
لمَّـا سَـرى في قدسـنا المعـلا!
قـد اقتـدى الأمـوات بالأحيـاء
إذ أمهـم أحمـد في الإسـراء
هـذا مـن التكـريم للخيـار
فـلا مجـال فيـه للـشرار!
أن نلـهم التـسبيح حـين نخلـد
يثبـت أن الله دومـا نعبـد
والحمـد والتـسبيح والـسجود؟

١٠- لەچوارچێوەی ئەم ڕوونکردنەوەمیەدا بەندە لەکتێبی (بین یدیه کتاب الله) دا گوتوومە:

یاسین تقرأ على الأموات
وجارة لسورة الصافات
قرآن ربي قلبه یاسین
فقلب تاليها بها يلين
وقبر من تتلى عليه يؤهل
إذ السكينة عليه تَنْزِلُ
ومن ختمها على المحتضر
وذكرُ مايدعُوهُ للتذكّر!
يازائر القبور كن مسلماً
وداعياً لهم بخير واعلما:
خير هدية من الزُّوَّارِ
(قراءة القرآن والأذكار)
إن الجريدَ الأخضر إذ يذكر
على القبور ذنبها قد يغفر
بختم ياسين القبور عطروا
أفرض بأنك الجريد الأخضر!
ليس لتفريج الكروب مثلها
وكل ليل قبل نوم فاتلها
إن المدار لعلى الإخلاص
وقوة اليقين في الخلاص

ئەمەش چەن شیعرێکە لەو پێرستە کەبەحیسابی ئەبجەد ژمارەی سورەتەکان لەناو شیعرەکاندا، لەسەر ئەم شێوەیە تۆمارکراوە: (لو- زل) لو= ٣٦ کە دەکاتە ژمارەی سوورەتی یاسین. زل= ٣٧ کەدەکاتە ژمارەی سوورەتیصافات، کەیەکسەر والەدوا یاسینەوە، ئیتر هەروا، لەهەمان کاتدا خودی شیعرەکەیش مەعنا یەکی جوانی ئاسایی تری هەیە:

هـــــود ويوســـــف ورعـــــد ســـــور
لِرَمْزِهَـــا (يـــا بيجـــي) نعـــم الـــصور!
بـــالفكر ســـبر غـــوره تمـــيط
بكهـــف مـــريم العـــلا (يحـــيط)
(كطـــل) غيـــث في حقـــول الفـــوم
العنكبـــوت في جـــوار الـــروم
(لا - لب) لي إن لم أقل ياهاني + (لقمان قبل سجدة القرآن)
ياسين والصافات قد تقاسموا + (لو - زل) عَالِمٌ لزل عَالَمٌ
عـــيني لقلـــبي في فـــداه (مـــزحم!)
محمـــد في فتحـــه (ص) مكـــرم
لـــولا هـــدى الـــرحمن يـــاحنون
في الواقعـــة بـــشدة (نهـــون)
بـــسورة الحديـــد نـــصف الـــسور
قـــد إنتهـــى عـــددها في نظـــري
عـــدد نـــصف ســـور القـــرآن
جمـــع (الحديـــد:زن) بـــلا نقـــصان!

وعـــــــددي (وز) بـــــــسين ادرجـــــوا
رقـــــم تحــــــريم وملــــــك يخـــــرج
إلى المعـــــــارج بعينهـــــــا آشـــــــز
في (جـــــدّ نـــــوح) رقـــــم نـــــوح قـــــد ســـــطر!
والنازعـــــــات جـــــــارة لعـــــبس
(عطـــــف) الجـــــوار منهمـــــا تأســـــس!
(لان) لتكـــــــويز والانفطـــــــار
(نُبْـــــلٌ) رزقـــــتم منـــــه ياصـــــغاري!
(فـــــج) هـــــوى المطففـــــين مـــــن ســـــلك
بالانـــــشقاق (دف) يمـــــن مامـلـــــك
(فـــــه) بـــــالبروج (وف) هـــــا تبجـــــيلا!
ورتلـــــن ياطارقـــــاً تـــــرتيلاً!

بڕوانە شەرحی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیم ج/٣ ص ٢٠٢، ج/ ١٨ ص ١٤٤، ج/ ٦ ص ٨١، ص ١٠١، ص ٢١٩، عمـدة القـاری ج/٢٠ ص ٣١، ص ٣٥ ج/٣ ص ١١٨ ج/٦ ص ١١٨، ج/ ١٦ ص ١٣٥، ج/ ٨ ص ١٥٢، ص ١٥٦، ج/١٧ ص ١٤١، ص ٦٤، ص ١٦٥، تاج الاصول ج/١ ص ٨٦، ص ٣٧٧، ص ٣٧٩، ص ٣٨١، ص ٣٨٣، ج/٣ ص٢٨٠، ج/ ٤ ص ١٤، ص ٢١، ص ٢٣، مغنـی المحتـاج/١/ ٣٦٤/ ٣٦٨ ج/٣/ ٦٨-٧٠. الفقـه الميـسر/١/٢٩٥ ج/٢/٣٠١- ٣١٠. فيقهی ئاسان/١/ ٣٨٩، ٤٠٠- ٤١٢. (نامـەی زانـین لـەم کتێبـە پـیرۆزە، فەرموودەی ژمارە: (٢٧٥) + تاج/١ ص٢٩٢ حەلکردنی چەن شیعرێ لەم شیعرانەی سـەرەوە: قورئـان (١١٤) سـوورەتە، نیـوەی دەکاتـە: (٥٧) کـەرێك دەکاتـە کـۆی پیتەکانی (الحدید) کەسورەتی ژمـارە (٥٧) ی قورئانـە: أ= ١ ل= ٣٠ح= ٨ د= ٤ ی=

١٠ د= ٤ هـەموو دەكاتـە: ١+٣٠+ ٨+ ٤+ ١٠+ ٤= ٥٧. سـوورەتی مـەعاریج ژمارەكـەی (٧٠) یە، عەینیش كەیەكێكە لەپیتـەكانی (المعـارج) بەحیـسابی جومـەل دەكاتـە (٧٠) (فج) هوی الخ، أی قـسماً بـسورة الانـشقاق مـن سـلك طریـق أهـواء المطففـين الجائرة في المعـاملات دَفَّ ـ أی استأصـل ونـسف ـ بركـة مالـه. أو المعنـی هكـذا: مـن سلك طريق أهواء المكتالين المحتالين محق الله بركة ماله، بـسبب الـشقاق والمنازعـة مـع الـذين غـشهم بـالتطفيف ونحـوه، وضـمن هـذا المعنـی يـشير (فـج=٨٣) إلى رقـم السورة المطففين و (دف=٨٤) إلى رقم سورة الانشقاق، واتـە: ناوكەوانـەكان، لەسـەر ئەو ڕیزەی كەوان لەشیعرەكەدا وەك (فە=٨٥) ژمارەی برووجە (وف=٨٦) ژمارەی سوورەتی طاریقە وە هەروەها ـ وەرگێڕ.

## ٣- كتاب الحيض
## نامەی بێنوێژی (سوڕی مانگانەی ژنانە)
### (١) باب: مباشرة الحائض فوق الإزار
### خۆتێکەڵ کردن لەگەڵ هاوسەری بێنوێژدا لەسەر پەردەوە

١٦٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عنها) قَالَتْ: كَانَ إِحْدَانَا إِذَا كَانَتْ حَائِضًا، أَمَرَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ تَأْتَزِرَ فِي فَوْرِ حَيْضَتِهَا، ثُمَّ يُبَاشِرُهَا، قَالَتْ وَأَيُّكُمْ يَمْلِكُ إِرْبَهُ كَمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَمْلِكُ إِرْبَهُ.[١٦٨]

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لە پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەوبێ)، فەرمووی: ئەگەر یەکێ لە ئێمەی هاوسەرانی پێغەمبەر، بێنوێژ بوایە، تەنانەت ئەگەر لە گەرمەی بێنوێژیشدا بوایە، ئەگەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیویستایە لەوکاتی بێنوێژییەدا، دەستی لەگەڵ تێکەڵ بکا، فەرمانی پێدەدا، بەرکۆشێکی دەدا بە نێوانی ناوکی‌و ئەژنۆیدا، ئەوجا لەسەر ئەو بەرکۆشەوە دەستی بۆی دەبردو لەگەڵیدا خۆی تێکەڵ دەکردو خۆشی لێ وەردەگرت، تاڕادەی ڕەحەتبوون، بەلام بەبێ دروستبوون‌و تێخستن. عائیشە فەرمووی: بەلام کێ لە ئێوە دەتوانێ، لەکاتی وا ناسکا، یاڕۆی خۆی بۆ زەوت بکرێ، وەك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یاڕۆی خۆی بۆ زەوت دەکراو لە جێگەی حەرام کە دامەن‌و شەرمگایە، دەیپاراست} . {بڕوانە: ژمارە: ١٧٣ لەدواوە} .

١٦٩- حديث مَيْمُونَةَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - إِذَا أَرَادَ أَنْ يُبَاشِرَ امْرَأَةً مِنْ نِسَائِهِ أَمَرَهَا فَاتَّزَرَتْ وَهْيَ حَائِضٌ.[١٦٩]

---

[١٦٨] مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١٧٧ = شيحا: ٦٧٨، تجريد/١، ژمارە: ٢١٢، ٣٠٢، ٣٠٣، ٢٠٣٠.

مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر (درودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لە مەیموونە بێ) فەرمووی: جاران ئەگەر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بیویستایە، لەگەڵ یەکێ لەژنەکانیدا، راکشێو لەزەتو خۆشی لێ وەربگرێ، ئەگەر ژنەکەی لەبێنوێژیدا بوایە، فەرمانی پێ دەکرد کە بەرکۆشێ بگرێتەوە، ئیتر لەسەر ئەو بەرکۆشەوە دروست دەبوو لەگەڵیدا، بەبێ لاقەکردن).

**روونکردنەوە:**

مەیموونەی کچی حاریث، دایکی موسوڵمانان، لەساڵی شەش، یا حەوتی کۆچی، لەسەریف پێغەمبەر هێنای، لەهەمان شوێن لەساڵی (٥١) ی کۆچی مردووە، هەندێ دەفەرموون لە (٦٦)ی کۆچیدا لەوشوێنە کۆچی دوایی کردووە، ئیبنو عەبباس، کە خوشکەزای بوو نوێژی تەرمی لەسەر کردو لەگەڵ دوو خوشکەزای تریدا دایانهێڵایە ناو گۆڕەکەیەوە، مەیموونە لەپێشا ناوی (بەرە)بوو، پێغەمبەر ناوەکەی گۆڕیو ناوی نا مەیموونە. واقیدی دەفەرموێ: (دوا هەمین ژنی پێغەمبەر بووە کە مردووە).

**(٢) باب: الإضطجاع مع الحائض في لحاف واحد**
**راکشان لەگەڵ هاوسەری بێنوێژدا لەناو یەك نوێندا**

١٧٠- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ أُمِّ المؤمِنِينْ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قَالتْ: (بَيْنَا أَنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُضطجِعَةٌ فِي خَمِيصَةٍ إِذ حِضتُ فَانْسَلَلْتُ فَأَخَذتُ ثِيَابَ حِيضتِي قَالَ أَنُفِسْتِ؟ قُلْتُ نَعَمْ فَدَعَانِي فَاضطجَعْتُ مَعَهُ فِي الْخَمِيلَةِ).[١٧٠]

---

[١٦٩] صحيح مسلم ترقيم شيخ خليل مأمون شيحا: ٦٧٩، بخاری: ٣٠٣.

[١٧٠] تجريد/١، ژمارە: ٢٠١، بخاری: ٢٩٨، مسلم: ٢٩٦ = شيحا: ٦٨١.

ئوممو‌سه‌له‌مه‌ی هاوسه‌ری پێغه‌مبه‌ر (درودی خودای له‌سه‌ر بێ) که‌یه‌کێکه له‌دایکانی موسوڵمانان، فه‌رمووی: جارێ له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ردا له‌ژێر جاجمێکی بازوودا پاڵکه‌وتبووم، له‌ناکاو له‌و ده‌مه‌دا که‌وتمه بێ نوێژی یه‌وه، ئیتر خۆم له‌ژێر جاجمه‌که دزی یه‌وه‌و، چووم خۆم گۆڕی‌و جلی بێنوێژییه‌که‌مم له‌به‌رکرد. فه‌رمووی: (ئه‌وه تێکه‌وتیت؟) گوتم: به‌ڵێ. ئه‌وجا بانگی کردمه‌وه، چوومه‌وه له‌گه‌ڵیا له‌ژێر مه‌وجه‌که‌دا راکشامه‌وه.

### روونکردنه‌وه:

ئوم سه‌له‌مه (ره‌زای خودای لێ بێ) هاوسه‌ری پێغه‌مبه‌ره، (٣٧٨) فه‌رمووده‌ی هه‌یه، سیازده‌یان په‌سه‌ندی هه‌ردوو پیره، دوو کۆچ‌و ره‌وی له پێناوی ئیسلاما کردووه، کۆچێ بۆ حه‌به‌شه، کۆچێ بۆ مه‌دینه، له‌مانگی شه‌شه‌لانی ساڵی چواری کۆچیدا، پێغه‌مبه‌ر (درودی خودای له‌سه‌ر بێ) هێناویه‌تی، له‌ته‌مه‌نی هه‌شتاو چوار ساڵیدا، له به‌هاری ساڵی شه‌ست‌و چواری کۆچیدا، له مه‌دینه کۆچی دوایی کردووه، ئه‌بو هوره‌یره نوێژی مردووی له‌سه‌رکرد، له گۆڕستانی به‌قیع به‌خاك سپێردرا. {تاج/٣، لاپه‌ڕه: ٦٧٣، زنجیره: ٣٧، ٣٨، ٣٩، ٤٠، ٤١}.

١٧١- حديثُ أم سَلَمَة قَالَتْ: وَكُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَالنَّبِيُّ - صلى الله عليه وسلم - مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ مِنْ الْجَنَابَةِ.[١٧١]

ئوم سه‌له‌مه‌ی هاوسه‌ری پێغه‌مبه‌ر (درودی خودا له‌سه‌ر پێغه‌مبه‌رو ره‌زای خودا له‌هه‌موو هاوسه‌رو له‌گشت هاوه‌ڵ‌و په‌یره‌وانی هه‌تا رۆژی دوایی) فه‌رمووی: جاران من‌و پێغه‌مبه‌ر (درودی خودای له‌سه‌ر بێ) به‌یه‌که‌وه خۆمان

---

[١٧١] مسلم شیحا: ٦٨١، بخاري: ٢٩٨.

دەشۆرد لەیەك دەفر، هەردوو لاشمان لەشمان گران بوو، واتە: لەشمان پیسبوو. (تاج/١، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ١٥٢ + زنجیرە: ٣١، ژمارە: ٢٦٩).

## (٣) باب: جواز غسل الحائض رأس زوجها وترجيله
## سەرشانەکردنو سەر شۆردنی مێرد لەکاتی بێنوێژیدا

١٧٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها) قَالَتْ: إِنْ كُنْتُ لأَدْخُلُ الْبَيْتَ لِلْحَاجَةِ، وَالْمَرِيضُ فِيهِ، فَمَا أَسْأَلُ عَنْهُ إِلاَّ وَأَنَا مَارَّةٌ، وَإِنْ كَانَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيُدْخِلُ عَلَيَّ رَأْسَهُ وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ فَأُرَجِّلُهُ، وَكَانَ لاَ يَدْخُلُ الْبَيْتَ إِلاَّ لِحَاجَةٍ، إِذَا كَانَ مُعْتَكِفًا}. [١٧٢]

ئەمە دەقی ژمارە (٢٠٢)ی تەجریدی بوخارییە، بەهرەی پتری تیادایە، لەدەقی ئەصڵەکە:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاری وادەبوو خۆم لەناو مزگەوتا خەڵوەم دەکێشا، کە لە زاراوی شەرعی پیرۆزدا پێی دەگوترێ: (إعتكاف)، جا بۆ کاروباری تایبەت دەچوومەوە بۆماڵەوەم، بەڵام زۆر بە پەلە کارەکەمم ئەنجام دەداو دەگەڕامەوە بۆ مزگەوت، تەنانەت ڕێ دەکەوت: نەخۆشی لێ بوو، هەواڵپرسی دوورو درێژم لەگەڵ ئەنجام نەدەدا، بەڵکوو هەر بەدەم ڕێگەوە، بەسەر پێوە هەواڵم دەپرسیو بەس، یەکسەر دەگەڕامەوە بۆ خەڵوەگاکەم لە مزگەوت.

هەروا عائیشە دەفەرموێ: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە لەناو مزگەوتا خەڵوەی دەکێشا، لە دەرگای هۆدەکەی خۆمەوە، کە لەسەر

---

[١٧٢] مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١٧٤ = ٦٨٣ شیحا، تجرید البخاری: ٩٢٨ - بخاری: ٢٠٢٩، ٢٠٣٣، ٢٠٣٤.

مـالّى مزگـەوتا بـوو، مـن لـەناو ھۆدەكـەى خۆمـدا بـووم، لەسـەر ئـەو حالّـە قـژە سەريم شانە دەكـرد، وە حـەزرەت (دروودى خـوداى لەسـەر بـێ) بـۆ سـەراويش نەبوايە، لەكاتى خەلّوە كێشانا، نەدەھاتەوە بۆ مالّەوە}. {تاج/٢/١٤٦، زنجيرە: ٧٥، ژمارە: ١٤٦٣ ج/٤ — ش/د/ت/ن}.

١٧٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (كنت أغتسل أنا ورسـول الله (صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) من اناء واحد كلانا جنب، وكان يأمرني فأتزر، فيباشرني وأنا حائض وكان يخرج رأسه إلى وهو معتكف فأغسله وأنا حائض) وفي ريواية عنهـا (رَضِـيَ اللهُ عَنْها) قالت:(كَانَتْ إحْدَانَا إذا كَانَتْ حَائِضا فَأَرَادَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ أَنْ يُبَاشِرَهَا أَمَرَهَا أَنْ تَتَّزِرَ فِي فَوْرِ حَيْضِتِهَا ثمَّ يُبَاشِرُهَا قَالَتْ وَأَيُّكُمْ يَمْلِـكُ إِرْبَـهُ كَمَـا كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمْلِكُ إِرْبَهُ):[١٧٣]

عائيشە (ڕەزاى خواى لـێ بێ) فەرمووى: جارى وادەبـوو خـۆمو پێغەمبـەر پێكەوە لەيەك دەفر خۆمان دەشۆرد، ھەردووكمانيش لەشمان پيس بوو. ھەندێ جاريش بێ نوێژ دەبووم، پێغەمبەر (درودى خـوداى لەسـەر بـێ) فـەرمانى پـێ دەكـردم، بەركۆشـم دەپۆشـى، ئـەوجا لەسـەر ئـەو بەركۆشـەوە دەسـتى لەگـەلّما تێكـەلّ دەكـردو خۆشـى لـێ وەردەگـرتم، زۆرجـاريش لـەناو مزگـەوتا خـەلّوەى دەكێـشا، لـەناو مزگەوتەكـەوە سـەرى خـۆى دەھێنايـە نـاو ھۆدەكـەى منـەوە، كەبەتەنيشتى مالّى مزگەوتەوە بوو، منيش سەريم دەشۆرد لەوكاتەيشدا بێنوێـژ بووم.

لەگێڕانەوەيـەكى تـردا عائيـشە دەفـەرموێ: ئەگـەر يـەكێ لەئێمـەى ھاوسەرانى پێغەمبەر (درودى خوداى لەسەر بێ) لەگەرمـەى بێنوێژيـدا بوايـە، ئەگەر پێغەمبەر بيويستايە لەوكاتەدا دەستى لەگەلّ دا تێكەلّ بكا، فەرمانى دەدا

---

[١٧٣] تجريد/١، ژمارە: ٢٠٢ = ٣٠٢ مسلم: ٢٩٣ = ٦٧٨ شيحا.

بەرکۆشێکی دەدا بەنێوانی ناوکیو ئەژنۆی دا، ئەوجا لەسەر ئەو بەرکۆشەوە دەستی بۆ دەبردو لەگەڵیدا خۆی تێکەڵ دەکردو خۆشی لێ وەردەگرت بەڵام بەبێ دروست بوون. عائیشە فەرمووی: بەڵام کێ لەئێوە دەتوانێ کە وەك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئارەزووی خۆی بۆ زەوت بکرێو سنوور نەبەزێنێ.

١٧٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قالتْ: (كانَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَّكِئُ فِي حَجْرِي وَأَنَا حَائِض ثُمَّ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ). [١٧٤]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاری وادەبوو پێغەمبەری خوا (دروودی خودای لەسەر بێ) سەری لەسەر کۆشم دادەنا، لەوکاتەدا من بێنوێژ بووم، وەلەسەر ئەو حاڵە قورئانی دەخوێند.

## ڕوونکردنەوە:

ژنی بێنوێژ پاکە، ئاوو نانی دەستی حەڵاڵە، لێکەوتنی دروستە چونکە پاکە، نەوەوی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوەیە کەخوێندنی قورئان لەکاتی ڕاکشانو پاڵکەوتنا دروستە، هەروا لەنزیکی جێگەی پیسایشەوە. شێخی عەینی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (ئەمەی نەوەوی دەفەرموێ: کەلەنزیکی جێگەی پیساییەوە خوێندنی قورئان دروستە جێگەی سرنجە، چونکە بەم قسەیەبێ نابێ خوێندنی قورئان بەرابەر بەئاودەست ناباشی (کەراهەتی) ی هەبێ، بەڵام پێویستە کەکاری واناباش بێ،

[١٧٤] تجريد:٢٠٠ = ٢٩٧، ٧٥٤٩، مسلم: ٣٠١ = ٦٨٠، ٦٩١، شيحا = مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١٧٥، شيحا: ٦٩١.

لەبەرخاتری ڕێزگرتنی قورئان، چونکە دەوروبەری شت حوکم‌و بڕیاری ئەو شتەی هەیە).

## (٤) باب: المذي
## بڕیاری مەزی لە یاسانامەدا

١٧٥- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ رَجُلاً مَذَّاءً، فَكُنْتُ أَسْتَحْيِى أَنْ أَسْأَلَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِمَكَانِ ابْنَتِهِ، فَأَمَرْتُ الْمِقْدَادَ بْنَ الأَسْوَدِ، فَسَأَلَهُ، فقال: «يَغْسِلُ ذَكَرَهُ وَيَتَوَضَّأُ».(١٧٥)

ئیمامی عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: مەزیم زۆر بوو، شەرمیشم دەکرد بۆ خۆم ڕاستەوخۆ لە پێغەمبەر بپرسم، چونکە فاطیمەی کچی خێزانم بوو، جا بە میقدادی کوڕی ئەسوەدم گوت کە بۆ ئەمە لێی بپرسێ، کەلێی پرسی بوو فەرموو بووی: (چووکی بشۆرێ‌و دەستنوێژ بگرێ، چونکە دەرچوونی مەزی دەستنوێژ دەشکێنێ، بەڵام شتی وا خۆشۆردن (غوسڵ) پێویست ناکا، چونکە لەش پیس ناکات). {تاج/١/١١٣ — ش/د/ت/ن = بوخاری‌و موسلیم‌و ئەبو داودو تەرمەزی‌و نەسائی ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە}.

### ڕوونکردنەوە:

١- مەزی وشەیەکی عەرەبییە، ئاوێکی ڕوونی سپی لینجە، لەکاتی دەستبازی‌و ماچ‌و مۆچ‌و وروژانی ئارەزوودا دەردەچێ، بەبێ خۆشی‌و بەبێ هەڵقوڵین‌و دەرپەڕین، چووکیشی پێ سست نابێتەوە، زۆرجار هەست بە دەرچوونی ناکرێ، لەژنا زۆرترە هەتا پیاو، ڕۆڵی چەورکردن دەبینێ لە کرداری

---

(١٧٥) مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١٤٤ = شيحا: ٦٩٣، تجريد/١، ژمارە: ١٠٦، بخارى: ١٣٢، ١٧٨، ٢٦٩.

جووت بووندا. بەپێی شەرع پیسە بەر هەرکوێ بکەوێ، پێویستە ئەو جێگە بشۆرێ، دەستنوێژ دەشکێنێ بەڵام دەرچوونی لەش پیس ناکات.

٢- رەفتاری شیرین لەگەڵ ماڵی خەزورانا سوننەتە، هەروا لەگەڵ خێڵی زاوادا، وا سوننەتە مێرد لەگەڵ خێڵی خەزوورانا باسی سەرجێیو شتی وا نەکا کەبۆنی شتی وای لێبێ.

کاتێ فەقێ بووم، لەگەڕەکی خۆمان، لە مزگەوتی قەرەچێوار، لەگەڕەکی چوارباخ، لە سلێمانی، مامۆستا مەلا موحەممەدی حافظ، کە خەڵکی ئەو پشت کێوە بوو گێڕایەوە، گوتی:

(جارێ لە گوندێ لای ئێمە، کابرایێ کچێکی خۆی دابوو بەزەلامێ، دێکە یەك حەوزی هەبوو، زۆرجار کابرای زاوا لەبەرچاوی خەزووریو خەڵکی دێکە خۆی رووت دەکردەوەو غوسڵی لەش پیسی دەردەکرد، رۆژێ لەناو حەوزەکەدا، خەزورەکەی بە خەنجەر دایگرتو کوشتیو گوتی: ئاوا دەتکوژم، چەندم پێ گوتیت شەرمت هەبێ، شەو چی لەکچێم دەکەی بەرۆژ باسی مەکە، هەروازت نەهێنا، دەبخۆ دەردت بێت!!).

## (٦) باب: جواز نوم الجنب وإستحباب الوضوء له
## خەوتن بۆ لەشپیس دروستە بەڵام باش وایە دەستنوێژ بگرێ

١٧٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عنها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا كَانَ جُنُبًا فَأَرَادَ أَنْ يَأْكُلَ أَوْ يَنَامَ، تَوَضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ).[١٧٦]

---

[١٧٦] بخاری: ٢٨٨ = تجرید/١، ژمارە: ١٩٦، مسلم: ٣٠٦ = ٧٠٢.




عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (پێغەمبەری خودا (درووودی خودای لەسەر بێ) کاتێ لەشی پیس بوایە، کە دەیویست شت بخوات، یا بخەوێ، دەستنوێژێکی دەگرت وەك دەستنوێژی نوێژ).

١٧٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - أَيَرْقُدُ أَحَدُنَا وَهُوَ جُنُبٌ قَالَ « نَعَمْ إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَلْيَرْقُدْ وَهُوَ جُنُبٌ».[١٧٧]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودا لەخۆی و لەباوکی بێت) فەرمووی: باوکم عومەری کوڕی خەتاب لە پێغەمبەری پرسی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا دروستە بەلەشی پیسەوە بخەوین؟ فەرمووی: (بەڵێ دروستە، بەلام واباشە لەکاتی وادا دەستنوێژێ بگرن ئەوسا بخەون!).

١٧٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّهُ قَالَ ذَكَرَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ لِرَسُولِ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - أَنَّهُ تُصِيبُهُ الْجَنَابَةُ مِنَ اللَّيْلِ ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - «تَوَضَّأْ وَاغْسِلْ ذَكَرَكَ ثُمَّ نَمْ».[١٧٨]

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: عومەری کوڕی خەتاب عەرزی پێغەمبەری کرد: گەڵێ جارێ دەکەوێ، لەشەودا لەشم پیس دەبێ، لەکاتی وادا چی باشە؟ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێی: (لەپێشا دەستنوێژێ بگرە، وە چووکت بشۆرە، ئەوسا بخەوە).

ئەمەیش لەدواوە دەقی ژمارە (١٦٣)ی پوختەی موسلیمە، لەم بارەیەوە:

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِى قَيْسٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها) عَنْ وِتْرِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (فَذَكَرَ الْحَدِيثَ) قُلْتُ: كَيْفَ كَانَ يَصْنَعُ فِى الْجَنَابَةِ، أَكَانَ يَغْتَسِلُ قَبْلَ أَنْ يَنَامَ أَمْ يَنَامُ قَبْلَ أَنْ يَغْتَسِلَ؟ قَالَتْ: كُلُّ ذَلِكَ كَانَ يَفْعَلُ، رُبَّمَا اغْتَسَلَ فَنَامَ،

---

[١٧٧] بڕوانە ژمارە (١٧٦) بۆ تەخریجەکەی.

[١٧٨] بخاری: ٢٩٠، مسلم: ٧٠٢.

وَرُبَّمَا تَوَضَّأَ فَنَامَ، قُلْتُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي جَعَلَ فِي الأَمْرِ سَعَةً).{الحديث/٧٠٣. مسلم. حيض}:

عەبدوڵلای کوڕی ئەبو قوبەیس فەرمووی: پرسیارم لە عائیشە کرد، (ڕەزای خودای لێ بێ) سەبارەت بەکردنی وەتری پێغەمبەر خۆی، کە چەندو کەی و چۆن بووە، جا کە وەڵامی ئەمەی دامەوە، عەرزیم کرد: ئەی جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی لەشپیسیدا چی دەکرد؟ ئایا لەپێشا خۆی دەشۆردو ئەوجا دەنووست، یا لەپێشا دەخەوت، لەپاشا خۆی دەشۆرد؟ عائیشە فەرمووی: هەردوو لایانی دەکرد: جار جارە لەپێشا خۆی دەشۆردو ئەوجا دەنووست، یا لەپێشا دەخەوت، لەپاشا خۆی دەشۆرد، جار جارەیش بەس دەستنوێژی دەگرتو دەخەوت. قسە گێڕەوە کە عەبدوڵلای کوڕی قەیسە دەڵێ: منیش گوتم: سوپاس بۆ ئەو خودایەی کەئەم کارەی ئاوا گوشاد کردووە. {تاج/١/١٥٦ ژ-٢٨٥ چ-٤ — م/د/ت/ن}.

١٧٩- عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدُورُ عَلَى نِسَائِهِ فِي السَّاعَةِ الْوَاحِدَةِ مِنْ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَهُنَّ إِحْدَى عَشْرَةَ وَفِي رِوايـة: تِسْعُ نِسْوَةٍ. قِيلَ: لِأَنَسٍ أَوَكَانَ يُطِيقُهُ قَالَ كُنَّا نَتَحَدَّثُ أَنَّهُ أُعْطِيَ قُوَّةَ ثَلَاثِينَ).[١٧٩]

ئەمە دەقی ژمارە (١٨٨)ی تجریدی بوخارییە:

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: سەردەمێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یازدە ژنی هەبوو، جاری وادەبوو لەیەك تاودا، بەشەو یابەڕۆژ، دەڕۆیشتەلای هەر یازدەیانو یەکە یەکە لەو ماوەیەدا دروست دەبوو لەگەڵیان. لەگێڕانەوەیەکا: نۆژنی هەبوو. گوترا: جا ئایا توانای ئەوەی هەبوو لەکاتێکی وا کەما لەگەڵ ئەوەندە هاوسەردا دروست ببێ؟ ئەنەس فەرمووی:

---

[١٧٩] تجرید/١، ژمارە: ١٨٨، بخاری: ٢٦٨، مسلم: ٧٠٦.

بەڵێ، ئێمە قسەی ئەوەمان لێ دەکرد: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم لایەنەوە توانای سیی پیاوی پێ دراوە. (ت/١/١٥٦/١٠ ز-٣٢ ژ-٢٨٦ ـ ش/د/ت/ن).

## (٧) باب: وجوب الغسل على المرأة بخروج المنى منها
## ژنیش وەك پیاو شەیتانی دەبێو خۆشۆردنی لەشپیسی دەکەوێتە سەر هەرکاتێ ئاوی هاتەوە

١٨٠- عَنْ إِسْحَاقُ بْنُ أَبِى طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسُ قَالَ: جَاءَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ وَهِىَ جَدَّةُ إِسْحَاقَ، إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَتْ لَهُ، وَعَائِشَةُ عِنْدَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ الْمَرْأَةُ تَرَى مَا يَرَى الرَّجُلُ فِى الْمَنَامِ، فَتَرَى مِنْ نَفْسِهَا مَا يَرَى الرَّجُلُ مِنْ نَفْسِهِ؟ فَقَالَتْ عَائِشَةُ: يَا أُمَّ سُلَيْمٍ فَضَحْتِ النِّسَاءَ تَرِبَتْ يَمِينُكِ، فَقَالَ لِعَائِشَةَ: « بَلْ أَنْتِ فَتَرِبَتْ يَمِينُكِ، نَعَمْ فَلْتَغْتَسِلْ يَا أُمَّ سُلَيْمٍ إِذَا رَأَتْ ذَالِكِ».[١٨٠]

ئەمە دەقی ژمارە (١٥٤)ی پوختەی موسلیمە، کە ئەمە تەرجەمەکەیەتی:

ئیسحاقی کوڕی ئەبو طەلحە فەرمووی: ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئوم سولەیم، کە دایکی ئەنەس بوو، وە نەنکی ئەم ئیسحاقە بوو، کە ناوی تەواوی: ئیسحاقی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو طەلحە بوو، ئوم سولەیم هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوکاتەدا عائیشە لەوێ بوو، ئوم سولەیم بە پێغەمبەری فەرموو: (ئەی پێغەمبەری خودا! خودا لەگوتنی قسەی ڕەوا شەرم ناکا، وە قسەی ڕەوای پێ خۆشە، دەی چۆن پیاو لەخەونا شەیتانی دەبێ، ژنیش ڕێك وەك ئەو لەخەونا شەیتانی دەبێو ڕەحمەت دەبێو ئاوی دێتەوە، جا لەکاتی وادا ئەگەر ژنێ

---

[١٨٠] تجريد/١، ژمارە: ١٠٥، بخارى: ١٣٠، مسلم: ٣١٣، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١٥٤ - ٧٠٧.

شەیتانی بوو خۆشۆردنی لەسەرە یانا؟ حەزرەتی عائیشە کەلەوێ بوو، پێی فەرموو: ئەی ئوم سولەیم! واوات لێ بێ، ئەم پرسیارە ناشیرینە چی بوو کردت، حەیای ژنانت برد، ئافرەتانت ریسوا کرد، چونکە نهێنی ئەوانت ئاشکرا کرد)، پێغەمبەریش بە عائیشەی هاوسەری فەرموو: (بەڵکوو تۆ واوات لێ بێت، ئەم پرسیارەی ئوم سولەیم جێگەی خۆیەتی، پرسیارێکی رەوایە، هیچ عەیبی نییە) ئەوجا حەزرەت بە ئوم سولەیمی فەرمووی: (بەڵێ ئەی ئوم سولەیم، ئەگەر ژن خەونی وای بینیو شەیتانی بوو، ئەوە بە شەرع لەشی پیس دەبێو خۆشۆردنی لەشپیسی لەسەرە، کەواتە باخۆی بشۆرێو لەشپیسی خۆی دەربکا). {تاج/١/١٤٦، زنجیرە:٣٠، ژمارە: ٥}.

**روونکردنەوە:**

ئیسحاق کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو طەلحەیە، ئەبو طەلحە مێردی ئوم سولەیمی دایکی ئەنەسی کوڕی مالیکە، کە مامی دایکی ئیسحاقەو برای دایکی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو طەلحەیە، کە عەبدوڵڵا باوکی ئیسحاقە.

ئەبو طەلحە زرِبابی ئەنەسی کوڕی مالیکە، مێردی ئوم سولەیمە. {بڕوانە: تەجرید/٣/٤٤، ژمارە: ٦١٧ = ١٢٨٥ فەتح}.

**ئەمەیش گێڕانەوەی ژمارە (١٠٥)ی تجریدە:**

ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەو بێ) فەرمووی: ئوم سولەیمی دایکی ئەنەسی کوڕی مالیك هات بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! خودا لەگوتنی قسەی رەوا شەرم ناکا، کەوابوو ئایا ئەگەر ئافرەت شەیتانی بوو خۆشتنی لەسەرە یانا؟ پێغەمبەر فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر ئاوی بێتەوەو هەستی پێ بکا. ئوم سەلەمەش رووی خۆی داپۆشیو فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا!

بۆچی ئافرەتیش شەیتانی دەبێ؟ فەرمووی (درووودی خودای لەسەر بێ): هەژارۆکە! ئەی چۆن؟ ئەی ئەگەر شەیتانی نابێتو ئاوی نایەتەوە ئەی بەچی شێوەیێ منالەکەی لێ ی دەچێ؟). (تاج-١ ف-٥ ز-٣٠ = ژ-٢٦٢ چ-٤ ـ د/ش).

## (٩) باب: صفة غسل الجنابة
## باسی چۆنێتی خۆشۆردنی لەشپیسی

١٨١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذا اغْتَسَلَ مِنْ الْجَنَابَةِ بَدَأَ فَغَسَلَ يَدَيْهِ ثمَّ يَتَوَضأُ كَمَا يَتَوَضأُ لِلصَّلَاةِ ثمَّ يُدْخِلُ أَصَابِعَهُ فِي الْمَاءِ فَيُخَلِّلُ بِهَا أُصُولَ شَعَرِهِ ثمَّ يَصُبُّ عَلَى رَأْسِهِ ثلَاث غُرَفٍ بِيَدَيْهِ ثمَّ يُفِيض الْمَاءَ عَلَى جِلْدِهِ كُلِّه).[١٨١]

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (درووودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەسەر هاوسەرەکانی) فەرمووی: دەستوری پێغەمبەر وابوو کەبۆ لەشپیسی خۆی دەشۆرد، لەپێشا هەردوو دەستی خۆی دەشۆرد، تامووچەکانی، ئینجا بەدەستی راست ئاوی دەکرد بەدەستی چەپیداو، ناوگەلی دەشۆرد، ئەوجا دەق وەك دەسنوێژی نوێژ دەستنوێژێکی دەگرت! ئنجا ئاوی هەلدەگرتو پەنجەی دەخستە بن مووەکانی سەری، تادەیزانی کەوا تەواو تەربوون، ئەوجا سێ مشت ئاوی دەکرد بەسەر سەریدا، لەپاشا سەراپا باقی مەندەی لەشی خۆی دەشۆرد، لەپاشان هەردوو قاچیشی دەشۆرد. (ت/١/١٥٣/٢ ز-٣٢ ژ-١٧٩ ـ ش/ د/ت/ ن).

١٨٢- عَنْ مَيْمُونَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَتْ: (تَوَضأَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وُضوءَهُ لِلصَّلَاةِ غَيْرَ رِجْلَيْهِ وَغَسَلَ فَرْجَهُ وَمَا

---

[١٨١] تجرید/١، ژمارە: ١٧٩، بخاری: ٢٤٨، مسلم: ٣١٦ = ٧١٦، ٧٦٥، مختصر صحیح مسلم: ١٥٥.

أَصَابَهُ مِنْ الْأَذى ثمَّ أَفَاض عَلَيْهِ الْمَاءَ ثمَّ نَحَّى رِجْلَيْهِ فَغَسَلَهُمَا هَذِهِ غُسْلُهُ مِنْ الْجَنَابَةِ).[١٨٢]

**مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئاوی خۆشۆردنم دانا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپێشا دووجار یاسێ جار هەردوو دەستی خۆی شۆرد، ئینجا ئاوی کرد بەدەستی چەپیداو، ناوگەڵی خۆی شۆرد، لەپاشا بەزەوییەکە دەستی خۆی سڕی، هەتا بەتەواوی شوێنەواری تارات گرتنەکە بەدەستیەوە نەما، ئنجا سەرتاپا هەموو لەشی خۆی شۆرد، ئنجا لەشوێنەکەی خۆی گواستیەوە، ئنجا هەردوو قاچی خۆی شۆرد، لەگێڕانەوەیەکدا: ئنجا سێ جار سەری خۆی شۆرد. واتە: لەپێش شۆردنی لەشیدا. لەگێڕانەوەیەکی تردا: جامنیش پەڕۆیەکم بۆهێنا کەخۆی پێ وشك بکاتەوە بەلام پەڕۆکەی نەویستو، ئاوەکەی بەدەستی لەلەشی تەکاند. (ت/١/١٥٢/١- ز-٣٢ ژ-٢٧٧ = ش/د/ت/ ن).**

**ئەمە هی ژمارە (١٨٠)ی تجرید بوو، ئەمەیش ژمارە (١٥٥)ی پوختەی موسلیمە:**

**مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئاوی خۆشۆردنی لەشپیسیم، بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دانا، لەپێشا دووجار، یا سێ جار هەردوو دەستی خۆی لە دەرەوەی دەفرەکەدا شۆرد، ئەوجا دەستی کرد بەناو دەفرەکەداو ئاوی کرد بە دەستی چەپیداو، ناوگەڵی خۆی بەدەستی چەپی شۆرد، لەپاشا بە زەوییەکە دەستی خۆی زۆر باش سڕیو شوێنەواری چەپەڵییەکەی لێ کردەوە، هەتا بەتەواوی شوێنەواری تاراتگرتنەکە بەدەستیەوە نەما، ئەوجا دەستنوێژێکی گرت وەك دەستنوێژی نوێژ، ئەوجا**

---

**[١٨٢] تجرید/١، ژمارە: ١٨٠، بخاری: ٢٤٩، مسلم: ٣١٧، مختصر/١، ژمارە: ١٥٥، شیحا: ٧٢٠.**




دەستی کرد بە خۆشۆردنو لەپێشا سێ مشتی کرد بەسەر سەری خۆیدا، کە هەرمشتێ پڕ هەردوو لوێچە، ئەوجا هەموو لەشی خۆی شۆرد، ئەوجا شوێنەکەی خۆی گۆڕیو لە جێگە تازەکەیدا هەردوو قاچی شۆری. ئەوجا منیش خاولییەکم هێنا بۆی، کەخۆی پێ وشك بکاتەوە، بەڵام خاولییەکەی نەویست). {تاج/١/١٥٢، زنجیرە: ٣٢، ژمارە: ١ ژ-٢٩٠ چ-٤}.

ئەمەیش دەقی فەرموودەکەی ئێرەیە:

قَالَتْ مَيْمُونَةُ: صَبَبْتُ لِلنَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) غُسْلاً ، فَأَفْرَغَ بِيَمِينِهِ عَلَى يَسَارِهِ فَغَسَلَهُمَا ، ثُمَّ غَسَلَ فَرْجَهُ ، ثُمَّ قَالَ بِيَدِهِ الأَرْضَ فَمَسَحَهَا بِالتُّرَابِ ، ثُمَّ غَسَلَهَا ، ثُمَّ تَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ، وَأَفَاضَ عَلَى رَأْسِهِ ، ثُمَّ تَنَحَّى فَغَسَلَ قَدَمَيْهِ ، ثُمَّ أُتِيَ بِمِنْدِيلٍ ، فَلَمْ يَنْفُضْ بِهَا:

مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئاوی خۆشۆردنم دانا بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەپێشا دووجار، یا سێجار هەردوو دەستی خۆی شۆرد، ئاوەکەی بەدەستی راستی دەکرد بەسەر دەستی چەپی خۆیداو ئەوجا دەیشۆردن، ئەوجا ئاوی کرد بەدەستی چەپی خۆیداو ناوگەڵی شۆرد، لەپاشا بەزەوییەکە دەستی خۆی سڕی، هەتا بەتەواوی ئەسەرو شوێنەواری تاراتگرتنەکەی پێوە نەمێنێ، ئەوجا دەستی شۆرد، ئینجا ئاوی لەدەمو لووتی رادا، ئینجا روخسارو هەردوو دەستی خۆی شۆرد، ئەنجا سەرتاپا هەموو لەشی خۆی شۆرد، ئینجا لەشوێنەکەی خۆی گۆستیەوە، ئەوجا هەردوو قاچی خۆشی شۆردن! ئەنجا خاولییەکەم هێنا بۆی کەخۆی پێ وشك بکاتەوە). (تاج/١، زنجیرە: ٣٢، ژمارە: ٢٧٧).

١٨٣- عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ كَانَ النَّبِيُّ - صلى الله عليه وسلم - إِذَا اغْتَسَلَ مِنَ الْجَنَابَةِ دَعَا بِشَيْءٍ نَحْوَ الْحِلاَبِ ، فَأَخَذَ بِكَفِّهِ ، فَبَدَأَ بِشِقِّ رَأْسِهِ الأَيْمَنِ ثُمَّ الأَيْسَرِ ، فَقَالَ بِهِمَا عَلَى رَأْسِهِ .

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (جاران پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کەبۆ لەشپیسی خۆی دەشۆرد، پڕ دەوری گۆزمیێ ئاوی داوادەکرد، ئەوجا پڕ مشتێ ئاوی هەڵدەگرتو لەپێشا دەیکرد بەلای ڕاستی سەریدا، ئەمجا دەیکرد بەلای چەپی سەریدا، ئەنجا بەمست بەهەردوو دەستی ئاوی دەکرد بەسەر تەوقە سەری خۆیدا). (تەجرید/١، ژمارە: ١٨٥. بخاری: ٢٥٨).

## (١٠) باب: القدر المستحب من الماء في غسل الجنابة
## ئەو ئەندازە ئاوەی کە پەسەندە بۆ خۆشۆردنی لەشپیسی

١٨٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ مِنْ قَدَحٍ يُقَالُ لَهُ الْفَرَقُ).[١٨٤]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران منو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەیەکەوە لەیەك دەفر خۆمان دەشۆرد، پێیان دەگوت: (فەرەق) شازدە (ڕەتڵ) ئاوی دەگرت. لەگێڕانەوەیەکا: هەردوو لایشمان لەشمان پیس بوو. (تاج/١، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ١٥٢).

١٨٥- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عنها) ، أَنَا وَأَخُوهَا مِنَ الرَّضَاعَةِ، فَسَأَلَهَا عَنْ غُسْلِ رَسُولِ اللَّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنَ الْجَنَابَةِ؟ فَدَعَتْ بِإِنَاءٍ قَدْرِ الصَّاعِ، فَاغْتَسَلَتْ، وَبَيْنَنَا وَبَيْنَهَا سِتْرٌ، وَأَفْرَغَتْ

---

[١٨٤] تجرید/١، ژمارە: ١٨١، بخاری: ٢٦١، مسلم: ٣١٩ - ٧٢٩ مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١٦١.

عَلَـى رَأْسِـهَا ثَلاَثًـا. قَـالَ: وَكَـانَ أَزْوَاجُ النَّبِـيِّ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) يَأْخُـذْنَ مِـنْ رُءُوسِهِنَّ، حَتَّى تَكُونَ كَالْوَفْرَةِ).(١٨٥)

ئـەبو سـەلەمەی کوڕی عەبـدوڕەحمان، کـە خوشـکەزای شـیریی حـەزرەتی عائیـشە بـوو، چونکە ئـوم کولـثومی خوشـکی شـیری پێـدابوو، فـەرمووی: (مـنو برایـەکی شـیریی عائیـشە (رەزای خـودای لێ بـێ) ڕۆیـشتین بـۆ خزمـەتی، بـرا شیرییەکەی، کەناوی عەبدوڵڵای کوڕی یەزید بوو، لەبارەی چۆنێتیی خۆشۆردنی لەشپیسی پێغەمبـەرەوە پرسیاری لێـکرد، ئـەویش داوای نزیکـەی صاعێ ئـاوی کرد، خۆی شۆرد، لە تەوقە سەریەوە دەستی کرد بە ئاوکردن بەسەر خۆیدا، سێ مشتی لە ئاوەکە دەرهێناو کردی بەسەر سەری خۆیدا، لەنێوانی ئێمەو لەنێوانی عائیشەدا پەردەیێ هەبوو، ئەو شوێنانەی لە جەستەی عائیشە شاردبۆوە، کە لـە لەشـی ئـافرەتی خـۆیی، تەماشـاکردنی نادروسـتە) فـەرمووی: لـەپاش وەفـاتی پێغەمبـەر، هاوسـەرەکانی، قـژی سـەری خۆیـان کـورت دەکـردەوە، هـەتا وەك تۆپەڵەی لێ دەهات لە دەوری سەریانو لە گوێچکەیان ڕەت نەدەبوو.

١٨٦- عنْ أَنَس (رَضي اللهُ عَنْهُ) قال: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَغْسِلُ أَوْ كَانَ يَغْتَسِلُ بِالصَّاعِ إِلَى خَمْسَةِ أَمْدَادٍ وَيَتَوَضأُ بِالْمُدِّ).(١٨٦)

ئەنەس (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: گـەڵێ جـار وادەبـوو پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بەمـەن (صـاع) یـەك ئـاو خـۆی دەشـۆرد، یـان دەیگەیانـدە پێـنج مـشت (مـودد) جاروبـاریش بەیـەك مـشت ئـاو دەسـتنوێژێکی دەگرت! (ت/ ١/ ١٣٢/ ٧ ز-٢٧ ژ-٢٢٧ ـ ش/ د/ ت/ ن).

---

(١٨٥) تجريد/١، ژمارە: ١٨٢، بخارى: ٢٥٢، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١٥٦، شيحا: ٧٢٦.

(١٨٦) تجريد/١، ژمارە: ١٤٨، بخارى: ٢٠١، مسلم: ٣٢٥ - ٧٢٨، ٧٢٤، ٧٣٥.

**راڤەو روونکردنەوە:**

صاع ئەیارەیەکە چوار مودد (مست: مشت) دەگرێ، مودديش ئەیارەیەکی شەش گۆشەیە، درێژیی زلعێکی نزیکەی (٩/٢) سم. مودد لەعەرەبیدا بەمشتیش دەگوترێ. جا لەحەدیثو لەشەرعا، مەگەر نیشانەیەکی لابەر (قرينه صارفة) هەبێ، دەنا مەبەست لەموود مشتی مرۆڤ نییە، بەڵکوو مەبەست ئەو ئەیارە ناوبراوەیە، کەزوربەی وەرگێڕە کوردەکان تەرجەمەیان کردووە بەمشت، یابەمست، بەڵام تەرجەمەکە زۆر سەرکەوتوو نییە، چونکە خەڵك بەمشتی دەست تێ دەگەن.

**(١١) باب: إستجاب إفاضة الماء على الرأس وغيره ثلاثا**
**سوننەتە کە سێ جار سەرو جەستە بشۆرێ، لەکاتی خۆشۆردندا**

١٨٧- عَنْ جُبَيْرُ بْنُ مُطعِمٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (أَمَّا أَنَا فَأُفِيض عَلَى رَأْسِي ثَلَاثا). وَأَشَارَ بِيَدَيْهِ كِلْتَيْهِمَا.[١٨٧]

جوبەیری کوڕی موطعیم (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەراستیدا من بەش بەحاڵی خۆم، سێ مشت ئاو دەکەم بەسەرما) جابیر فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەهەردوو دەستی نیشانی دا کەمەبەست لەمشت پڕ هەردوو دەستە.

**راڤەو شیکردنەوە:**

جوبەیر لەپیاوماقوڵانی قورەیش بوو، نوێنەری قورەیش بوو کەهاتە خزمەت حەزرەت بۆ بەردانی دیلەکانی غەزای بەدر، لەکاتی ئازادکردنی

[١٨٧] تجرید/١، ژمارە: ١٨٤، بخاری: ٢٥٤، مسلم: ٣٢٧ = ٧٣٨.

مەککەدا موسوڵمان بوو، زانایەکی بنەچەناس‌و ڕەگەز ناسێکی گەورە بوو، لەئەبوبەکری صەدیقەوە ئەو زانستە فێر بوو بوو، شەست فەرموودەی هەیە، نۆیان لەبوخاریدا هەن، لەمەدینە لەساڵی پەنجاو چواری کۆچیدا مردووە).

١٨٨- عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ (رَحِمَهُ الله) قَالَ: (حَدَّثَنَا أَبُو جَعْفَرٍ أَنَّهُ كَانَ عِنْدَ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ هُوَ وَأَبُوهُ وَعِنْدَهُ قَوْمٌ فَسَأَلُوهُ عَنْ الْغُسْلِ فَقَالَ يَكْفِيكَ صَاعٌ فَقَالَ رَجُلٌ مَا يَكْفِينِي فَقَالَ جَابِرٌ كَانَ يَكْفِي مَنْ هُوَ أَوْفَى مِنْكَ شَعَرًا وَخَيْرٌ مِنْكَ ثُمَّ أَمَّنَا فِي ثَوْبٍ).[١٨٨]

ئەبوئیسحاق (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەبوجەعفەر موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوطالیب، کەناسراوە بە (ئەلباقیر) گێڕایەوە بۆمان فەرمووی: مەن‌و باوکم لەخزمەت جابیری کوڕی عەبدوڵلادا بووین، کۆمەڵێ تری لەخزمەتدا بوو، لەبارەی خۆشۆردنەوە کەچەندێ ئاو بەشی دەکا لێیان پرسی، فەرمووی: (مەنێکت بەسە!) (مەن = صاع).

پیاوێ گوتی: مەنێ ئاو بەشم ناکا کەخۆمی پێ بشۆرم. جابیر فەرمووی: مەنێ ئاو بۆ خۆشۆردن‌و غوسڵ دەرکردن بەشی پێغەمبەری دەکرد، کەلەتۆمووی زۆرتر بوو، وەلەتۆیش چاکتر بوو، کەواتە: قسەی وامەکە، لەپاشا کەنوێژ بوو، پێشەوا جابیر (ڕەزای خوای لێ بێ) لەیەك لۆجل دا بەرنوێژی بۆکردین.

[١٨٨] تجرید/١، ژمارە: ١٨٣ = بخاری: ٢٥٢، مسلم: ٧٤١، شیحا.

## (١٣) باب: إستجاب إستعمال المغتسلة من الحيض فرصة من مسك في موضوع الدم

## ژنی بێنوێژ، کاتێ پاك دەبێتەوەو خۆی دەشۆرێ، وا سوننەتە پارچەیێ میسك بەکار بهێنێ بۆ شوێنی خوێنەکە

١٨٩- عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ أَسْمَاءَ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) سَأَلَتِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَنْ غُسْلِ الْمَحِيضِ؟ فَقَالَ: « تَأْخُذُ إِحْدَاكُنَّ مَاءَهَا وَسِدْرَتَهَا، فَتَطَهَّرُ فَتُحْسِنُ الطُّهُورَ، ثُمَّ تَصُبُّ عَلَى رَأْسِهَا فَتَدْلُكُهُ دَلْكًا شَدِيدًا حَتَّى تَبْلُغَ شُئُونَ رَأْسِهَا، ثُمَّ تَصُبُّ عَلَيْهَا الْمَاءَ، ثُمَّ تَأْخُذُ فِرْصَةً مُمَسَّكَةً فَتَطَهَّرُ بِهَا» فَقَالَتْ أَسْمَاءُ: وَكَيْفَ أَتَطَهَّرُ بِهَا؟ فَقَالَ: «سُبْحَانَ اللَّهِ تَطَهَّرِينَ بِهَا». فَقَالَتْ عَائِشَةُ: (كَأَنَّهَا تُخْفِي ذَلِكَ) تَتَبَّعِينَ أَثَرَ الدَّمِ، وَسَأَلَتْهُ عَنْ غُسْلِ الْجَنَابَةِ؟ فَقَالَ: « تَأْخُذُ مَاءً فَتَطَهَّرُ فَتُحْسِنُ الطُّهُورَ أَوْ تُبْلِغُ الطُّهُورَ، ثُمَّ تَصُبُّ عَلَى رَأْسِهَا فَتَدْلُكُهُ حَتَّى تَبْلُغَ شُئُونَ رَأْسِهَا، ثُمَّ تُفِيضُ عَلَيْهَا الْمَاءَ». فَقَالَتْ عَائِشَةُ: نِعْمَ النِّسَاءُ نِسَاءُ الأَنْصَارِ لَمْ يَكنْ يَمْنَعُهُنَّ الْحَيَاءُ أَنْ يَتَفَقَّهْنَ فِي الدِّينِ}.[١٨٩]

**ئەمە دەقی ژمارە (١٧٢)ی پوختەی موسلیمە، بەهرەی پترِی تیادایە:**

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەسمائی کچی شەکەل، کە ژنێکی ئەنصاری بوو، لە پێغەمبەری پرسی، لەبارەی چۆنێتی خۆشۆردنی بێنوێژیی؟ فەرمووی: (هەرکامێکتان لە ئێوەی ژنان، هەرکاتێ کەویستی خۆی بشۆرێو لەشپیسی خۆی دەربکا، با لەپێشا ئاوو مۆردەکەی ئامادە بکاو خۆی پاك بکاتەوەو تاراتێ جوان بگرێ، ئینجا دەستنوێژێکی جوان بگرێ، ئینجا ئاو بکا بەسەر سەریاو دەستی تێ بخا، زۆر باش هەڵی بگلۆفێ تا ئاو دەگاتە بنی موومەکانی سەری، ئەو حەلە ئاو بکا بەسەر خۆیا سەراپا، ئینجا گوڵە لۆکەیەکی

[١٨٩] مختصر صحيح مسلم: ١، ژمارە: ١٧٢ = شيحا: ٧٤٨، تجريد/١، ژمارە: ٢٠٦ = ٣١٤، ٣١٥، ٧٣٥٣.

میسکاوی، یا گوڵێ خوری میسکاوی، یا پەڕۆیەکی پاکی بۆنخۆش بهێنێ خۆی پێ پاك بکاتەوەو تاراتی پێ بگرێ!).

ئەسمائیش باش تێ نەگەیشت، گوتی: چۆن چۆن خۆی پێ پاك بکاتەوەو تاراتی پێ بگرێ؟ فەرمووی: (سوبحانەڵلا سەیرە بۆ تێ ناگەی؟! خۆتی پێ پاك بکەرەوەو تاراتی پێ بگرەو تەواو).

عائیشەیش (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: منیش ئەسمام راکێشا بەلای خۆمەوە، کە کچی شەکل بوو، وە پێم گوت: وەرە من تێت دەگەیەنم: پەڕۆ بۆنخۆشەکە بهێنە بەشوێنی خوێنەکەداو، دایبنێ لەناو شەرمتا، تاناو گیانت بۆ ساردی لێ نەبێو بۆنی خۆش بێ.

لەکاتی ئەم قسانەدا، کە عائیشە دەیویست ئەسماء لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر حاڵی بکا، بەچپە دوو بەدوو لەگەڵ ئەسمادا قسەی دەکرد، بەشێوەیێ کە هەر ئەسما گوێی لێ بێ، خەڵکەکەی تر قسە شەرماوییەکانی ئەوانی نەدەبیست.

لەگێڕانەوەیەکدا: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) سێجار فەرمووی: پارچەیەکی میسکاوی بێنەو، تاراتی پێ بگرە، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شەرم گرتیو رووی کرد بەولاوە، عائیشە دەیگوت: ژنگەلی یاریدەدەران (أنْصَار) ژنگەلی چاکن، ئافەریم بۆخۆیان! شەرمو شکۆ رێگەی ئەوەی لێ نەدەگرتن کە بۆخۆیان شارەزای ئایین بکەن).

## (١٤) باب: المستحاضة وغسلها وصلاتها
## ژنی هەمیشە بێنوێژ چۆن چۆنی خۆی دەشۆرێو نوێژ دەکا

١٩٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضي اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (جَاءَتْ فَاطمَةُ بِنْتُ أَبِي حُبَيْشٍ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي امْرَأَةٌ أُسْتَحَاض فَلَا أَطهُرُ أَفَأَدَعُ الصَّلَاةَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لَا إِنَّمَا ذَلِكِ عِرْقٌ وَلَيْسَ بِحَيْض فَإِذا أَقْبَلَتْ حَيْضَتُكِ فَدَعِي الصَّلَاةَ؟ وَإِذا أَدْبَرَتْ فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ ثمَّ صَلِّي). وقال (ثم توضأي لكل صلاة، حتى يجئ ذلك الوقت).[١٩٠]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: فاطیمەی کچی ئەبوحوبەیش هات بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێی پرسی: ئەی پێغەمبەری خودا! من ئافرەتێکم حاڵم وایە هەمیشە بێنوێژمو کەتێکەوتم پاك نابمەوە، جا ئایا هەتا حاڵم ئاوەهابێ واز لەنوێژ بهێنم یانا؟ فەرمووی: نەء، چوونکە ئەوە دەمارەو خوێنی بەربووە، وەئەوە خوێنی بێ نوێژیی نییە، بەلاّم لەوەپێش چەن ڕۆژ دەکەوتیتە بێ نوێژییەوە، ئێستاش لەم حاڵەدا بەقەد ئەو ڕۆژانەی بێنوێژیی جارانت نوێژ مەکە، ئنجا خۆت بشۆرەو نوێژی خۆت بەئاسایی بکە.لەگێڕانەوەیەکا: (کاتێ سەرەتای بێ نوێژی یەکەی جارانت دەستی پێ کردەوە، ئیتر وادابنێ کە لەوێوە دەکەویتە بێ نوێژیەوە، کەواتە: ئیتر نوێژ مەکە هەتا بەقەد ئەو ڕۆژانە دەڕوا، ئنجا باخوێنەکەش نەوەستێ بەلاّم تۆ وادابنێ کەپاك بوویتەتەوە، جابەنیازی خۆشۆردنی بێنوێژیی خۆت بشۆرەو ئەوجا بەئاسایی نوێژی خۆتی لێ بکە) وەفەرمووی: (وە بۆ هەموو نوێژێکیش دەسنوێژێکی تازە بگرەوە، هەتا دیسانەوە دەچێتەوە کاتی ناوبراوی خۆت ئیتر

[١٩٠] تجرید/١، ژمارە: ١٦٥ = ٢٢٨، بخاری مسلم: ٣٣٣ = ٧٥١ + مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١٧٩ - شیحا: ٧٥٣، تاج/١، زنجیرە:٢٦، ژمارە: ٣٠٤.

دووباره وادابنێ کەوا تازە تێ دەکەویتو واز لە نوێژ بهێنە ومبەقەد رۆژانی بێنوێـژی جارانـت، ئـیتر ئەمـە پیشەی هەمیشەت بێ!) (ت/ ١/ ١٦٥/١+٣ هەتا لاپەڕە١٧٠ = ز-٣٦ ژ-٣٠٤).

بەهرەکانی ئەم فەرموودەیە: ١- گوفتوگۆی ڕووبەڕوی ژنو پیاوی بیانی لەبارەی کارو باری ئایینی یەوە دروستە. ٢- بیستنی دەنگی ژن بۆ پێویستی ی رەوا دروستە. ٣- بەڵگەیە لەسەر پیسیی خوێن. ٤- بەڵگەیە لەسەر ئەوە ژنی هەمیشە بێنوێـژ بـۆ هـەموو فـەرزێ دەسـنوێژی سـەربەخۆ دەگـرێ. ٥- لـەکاتی بێنوێژیدا نوێژ نادروستە.

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: ئـوم حەبیبـەی کـچی جـەحش، کـە ژنخوشـکی پێغەمبـەر بـوو، لـە وەخـتو ناوەختـا دەکەوتـە سـەر خـوێنی بێنوێژیی، هات داوای فەتوای لە پێغەمبەر کرد، عەرزی کـرد: ئـەی پێغەمبـەری خودا! من هەمیشە بێنوێژم، چارم چییە؟

ئەمە گێڕانەوەی تەجرید (ژمارە: ١٦٥) بوو، ئەمەیش گێڕانەوەی پوختەی موسلیم (ژمارە: ١٧٩):

فەرمووی (درووودی خودای لەسەر بێ): (ئـەوە بێنوێـژیی نییـە، بەڵـکوو هەمیشە بێنوێژییە، حـەیز نییـە، إستحاضـەیـە، چونکە ئـەوە رەگێـکی تایبەتـە خوێنی بەربووە، کەواتە هەرکاتێ بـەپێی ئـەو بەڵـگەو نیشانانەی کە بۆمـاوەی بێنوێژیی ژنی هەمیشە بێنوێژ دانراون، هەرکاتێ بەپێی ئەو بەڵـگەو نیـشانانە، زانیت کە واماوەی بێنوێژییەکەت تەواو بووە ئیتر خۆت بشۆرەو لەشپیسی خۆت دەرکەو، ئیتر نوێژەکانت بەنەدا بە ڕێـکوپێـکی بکە).

ئیتر ئوم حەبیبە بۆ هەموو نوێژێـکی فەرز، لـەکاتی کردنـی ئـەو نوێـژەدا، لەپێش کردنەکەیدا غوسڵێـکی دەکرد.

لەیثی کوڕی سەعد، کە مامۆستای مامۆستاکەی شێخی بوخارییە، کە ئەم فەرموودەیە لە ئیبنو شەهابەوە دەگێڕێتەوە، ئەویش لە عوروەوە دەیگێڕێتەوە، عوروەیش لە عائیشەی پووریەوە دەیگێڕێتەوە، ئەم لەیثی کوڕی سەعدە دەفەرموێ: ئیبنو شەهاب باسی ئەوەی بۆمن نەکردووە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بە ئوم حەبیبەی کچی جەحش کردبێ، کە بۆ هەموو نوێژێ خۆی بشۆرێ، بەڵام ئەمە شتێ بوو کە ئوم حەبیبە خۆی دەیکرد}. {بڕوانە: بەرگی/١ تاج. زنجیرە: ٣٦، ٣٧، ٣٨}.

١٩١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها) قَالَت: اسْتَفْتَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ بِنْتُ جَحْشٍ (رَضِيَ اللّهُ عنها) رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَتْ: إِنِّي أُسْتَحَاضُ؟ فَقَالَ: «إِنَّمَا ذَلِكِ عِرْقٌ فَاغْتَسِلِي ثُمَّ صَلِّي»، فَكَانَتْ تَغْتَسِلُ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ. قَالَ اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ: لَمْ يَذْكُرِ ابْنُ شِهَابٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَمَرَ أُمَّ حَبِيبَةَ بِنْتَ جَحْشٍ (رَضِيَ اللّهُ عنها) أَنْ تَغْتَسِلَ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ، وَلَكِنَّهُ شَيْءٌ فَعَلَتْهُ هِيَ}.[١٩١]

ئەمە دەقی عەرەبی ژمارە (١٧٩)ی پوختەی موسلیمە زیادەی بەسوودی واتیادا:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوەڵو هاوسەرە پاکیزەکانی) فەرمووی: ئوم حەبیبەی کچی جەحش، کە ژنخوشکی پێغەمبەر بوو، حەوت ساڵ هەمیشە بێ نوێژبوو، لەوەختو ناوەختا هەمیشە دەکەوتە سەر خوێنی بێنوێژیی، لەمبارەیەوە پرسیاری لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کرد، ئەی پێغەمبەری خودا! من ئەمە حاڵمە، چارم چییە؟ فەرمووی: غوسڵی خۆت دەرکە، وە فەرمووی: (ئەوە ڕەگێکی تایبەتە خوێنی بەربووە!) ئیتر ئوم حەبیبە بۆ هەموو نوێژێکی

[١٩١] مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١٧٩، تەخریجەکەی لە ژمارە: ١٩٠دا ڕۆیشت.

فەرز، لەکاتی کردنی ئەو نوێژەدا، لەپێش کردنەکەیدا غوسڵی خۆی دەردەکرد، ئەوجا نوێژەکەی دەکرد.

### (١٥) باب: وجوب قضاء الصوم على الحائض دون الصلاة
### ژنی بێنوێژ لەکاتی بێنوێژییەکەیدا نابێ نوێژ بکاو نابێ ڕۆژوش بگرێ، بەلام لەوەدوا، لەکاتی پاکیدا دەبێ ڕۆژوەکان بگێڕێتەوە، بەلام گێڕانەوەی نوێژی لەسەر نییە

١٩٢- عَنْ مُعَاذَةَ قَالَتْ سَأَلْتُ عَائِشَةَ، فَقُلْتُ: مَا بَالُ الْحَائِضِ تَقْضِي الصَّوْمَ وَلاَ تَقْضِي الصَّلاَةَ، فَقَالَتْ: أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ؟! قُلْتُ: لَسْتُ بِحَرُورِيَّةٍ، وَلَكِنِّي أَسْأَلُ، قَالَتْ: كَانَ يُصِيبُنَا ذَلِكَ، فَنُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّوْمِ، وَلاَ نُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّلاَةِ}.[١٩٢]

موعازە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە عائیشەم پرسی: گوتم: بۆچی ژنی بێنوێژ ڕۆژووی ڕەمەزان دەگرێتەوە لەوەدوا، کەچی نوێژە فەرزەکان، هی کاتی بێنوێژییەکەی لەوەدوا ناگێڕێتەوە؟! فەرمووی: بۆ تۆویش حەرووریەیتو لەو خەواریجانەی کە دەڵێن: دەبێ ژن نوێژی کاتی بێنوێژیش وەك ڕۆژوو بگێڕێتەوە؟ گوتم: نەخەیر، من لەوان نیم، بەلام پرسیارەو دەیکەم، فەرمووی: چونکە جاران بە سەرینیی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەکەوتینە بێنوێژییەوە، لەپاش پاکبوونەوەو خۆشۆردن، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێمان دەکرد کە ڕۆژوو بگرینەوە، بەلام نوێژ نەگێڕینەوە}. {بڕوانە: تاج/١/١٦٣، زنجیرە: ٣٥، ژمارە: ٣٢٩٩ چ٤ — ش/د/ت/ن}.

---

[١٩٢] مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١٨٠ - شیحا: ٧٦١، ٧٥٩ = ٣٣٥ - ترقيم: محمد فؤاد عبدالباقي لصحيح مسلم + تجريد/١، ژمارە: ٢٠٩ = بخاري: ٣٢١.

**ڕوونكردنەوە:**

**موعـازەی كـچی عەبـدوڵڵای عەدەوییـە، كـە ناسـراوە بـە ئـوم صـەهبائی بەصرییە، ژنـی ئەصیلەی كوڕی ئەشـیەم بـوو، لـە پەیڕەوانـە، واتـە: تابیعییـە، گێڕانەوە لە عائیشەو عەلی‌و كەسانی ترەوە ئەنجام دەدا، لەشەش كتێبەكەدا، كـە نـاودارن بـە كوتـوبی سـیتتە گێڕانـەوەی هەیـە، كـە ئـەم كتێبانـەن: بوخـاری‌و موسلیم‌و ئـەبو داوودو تەرمـەزی‌و نەسائی‌و ئیبنـو ماجـە، ئەمانـەیش لـەوەوە گێڕانەوەی فـەرموودەیان لـەوەوە ئـەنجام داوە: ئـەبو قەلابـەو قـەتادەو یەزیـدی رەشك‌و ئەییوب‌و عاصمی ئەحوەل‌و كەسانی تریش.**

**ژنێكی متمانە پێكراو بوو، یەكێ بوو لە فەرمووده زانە گـەورەكان، واتـە: حوججـە بـوو لـە بابـەتی فـەرموودەدا، ژنێـكی زۆر خـوا پەرسـت بـوو، دەڵـێن: لەپاش مردنی ئـەبو صـەهبای مێـردی لـەناو نوێنـا نەخـەوتووەو لەسـەر قـاڵی‌و دۆشەك دانەنیـشتووە هـەتا مـردووە. ئـەبو بـشیر، كـە خـوا ناسێـكی بەصـرەییە، دەڵێ: چووم بۆ سەردانی خاتوو موعازە، فەرمووی: سكم دێشێ، دەڵـێن: نـەبیزی جـەڕ (خۆشـاوی كووپەڵـە) دەرمـانی ئـەم ژانـە سـكەی تۆیـە. منـیش چـووم پـڕ قاپێـكم لەو خۆشاوە بۆ هێنا، ئـەویش لـەلای خۆیـا دانـاو فـەرمووی: (خودایـە! خـۆت ئاگـات لێیـەتی، كـە مـن لـە عائیـشەی هاوسـەری پێغەمبـەرەوە ئـەم حـەدیثـەیەم گێڕاوەتـەوە: كـە پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) نـەیی كردووە لـە نـەبیزی جـەڕە، خودایـە ئەگـەر ڕاسـتم كـردووە لـە گێڕانـەوەی ئـەم فەرموودەیەدا، ئەم خۆشاوەم لە كۆڵ بخەیت‌و كارێكی وابكەیت كـە نەیخۆمـەوە بۆ ئەم ژانە سكە!**

**ئەبو بشیر فەرمووی: جاهـەر لەخۆیـەوە قاپەكـە قڵپـەوە بـوو، خۆشـاوەكە هەمووی ڕژا، خودا سك ئێشەكەی لە كۆڵ خست‌و ژانەكەی نەما.**

ئیمامی زەهەبی دەفەرموێ: موعازە بە شەو هەر خەریکی شەو نوێژو تاعەت بوو، وە دەیفەرموو: سەرم سوڕدەمێنێ، لەچاوێ کە بە شەو دەخەوێ، ئیبنو جەوزی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ساڵی هەشتاو سێی کۆچی، مەرگی بەهەقی بەجێهێناوە.

## (١٦) باب: تستر المغتسل بثوب ونحوه
## خۆشۆر بە پەردەو شتی وا پەردە بۆخۆی دەکا

١٩٣- حَديثُ أُمِّ هَانِئٍ بِنْتِ أَبِى طَالِبٍ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَمِعَ أُمَّ هَانِئٍ بِنْتَ أَبِى طَالِبٍ تَقُولُ ذَهَبْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - عَامَ الْفَتْحِ ، فَوَجَدْتُهُ يَغْتَسِلُ ، وَفَاطِمَةُ ابْنَتُهُ تَسْتُرُهُ قَالَتْ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَقَالَ « مَنْ هَذِهِ » . فَقُلْتُ أَنَا أُمُّ هَانِئٍ بِنْتُ أَبِى طَالِبٍ . فَقَالَ « مَرْحَبًا بِأُمِّ هَانِئٍ » . فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ غُسْلِهِ ، قَامَ فَصَلَّى ثَمَانِىَ رَكَعَاتٍ ، مُلْتَحِفًا فِى ثَوْبٍ وَاحِدٍ ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ ، زَعَمَ ابْنُ أُمِّى أَنَّهُ قَاتِلٌ رَجُلاً قَدْ أَجَرْتُهُ فُلاَنَ بْنَ هُبَيْرَةَ . فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - « قَدْ أَجَرْنَا مَنْ أَجَرْتِ يَا أُمَّ هَانِئٍ » . قَالَتْ أُمُّ هَانِئٍ وَذَاكَ ضُحًى:[١٩٣]

ئوم هانی کچی ئەبو طالیب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ساڵی ئازادکردنی شاری مەککە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەرووی مەککەوە بوو، چووم بۆ خزمەتی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەستا چوو خۆی بشۆرێ، فاطیمەی کچی پەردەیەکی بۆ گێڕایەوە، هەتا لەشی لەکاتی خۆشۆردنەکەیدا دەرنەکەوێ، کاتێ لێ بۆوە جلەکانی کردەوە بەری، ئەوجا هەشت رکات نوێژی سوننەتی چێشتەنگاوی کرد، لەهەموو دوو رکاتێکا

---

[١٩٣] تجرید/١، ژمارە: ٢٢٤، بخاری: ٣٥٧، مسلم ترقیم محمد فؤاد: ٣٣٦ - مسلم ترقیم شیحا: ٧٦٣.

ســـلاوی دەدایـــەوە). {تەجریـــد/٢٠٧/١، ژمـــارە: ١٩٤ = ٢٨٠، ٣٥٧، ٣١١٧، ٦١٥٨ + تاج/٤٨٥/١، ژمارە:٩٥٦ چ٤}.

**روونکردنەوە:**

بڕوانە: فەرموودەی ژمارە (٣) لەم بەرگە، ژیاننامەی ئـەبو تالیـب، هـەروا بڕوانە فەرموودەی ژمارە: (٣٦) لـەم بەرگـە، ژیـانی ئیمـامی عـەلی کـە بـرای ئـوم هانیئە. ئوم هانی چل‌و شەش فەرموودەی هەیە، دەڵێن: ئەم لەدوا ئیمامی عـەلی مردووە، هەق ئامۆزای پێغەمبـەرە، ئـوم هـانی نـاوی فاخیتەیـە، خوشـکی هـەقی عەلی‌و عەقیل‌و جەعفەرو تالیبە، دایکیان نـاوی فـاطیمـەی کچی ئەسـەدە، ئـوم هانی ژنی هوبەیرە بوو، لە هوبەیرە ئەم منالانەی بووە: عەمرو هانی‌و یوسف‌و جەعدە. ئوم هانی فەرموودەی لە شەش کتێبەکەدا هەیە، حەدیثەکانی ئەو ئـەم زاتانــە دەیگێڕنــەوە: جەعــدەی کــوڕی‌و یــەحیای کــوڕی جەعــدەی کــوڕی‌و کوڕەزایەکی تری کەناوی هاروون بووەو ئیبنو عـەباس کـە ئـامۆزای بـووە، سـاڵی ئازادکردنی مەککە ئیسلام بووە.

ئەمـە پوختــەی موسـلیم (ژمـارە: ١٥٧) بـوو، ئەمــەیش تەجریـد (ژمـارە: ٢٢٤)ە:

ئوممهانیئی کچی ئـەبوطالیـب (ڕەزای خـوای لــێ بـێ) فـەرمووی: سـاڵی ئـازاد کردنـی شـاری مەککـە، ڕۆیـشتم بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) کەچووم خەریك بوو خۆی دەشۆرد، فاطیمەی کچی بەپارچەیێ جـل پەردەی بۆ کردبوو، فەرمووی: کەسلاوم لێ کرد، فـەرمووی: (ئـەو ژنـە کـێ یـە؟) گــوتم: مـــنم ئوموهـــانیئی کـــچی ئـــەبوطـــالیـــبم. جافـــەرمووی: (مەرحـــەبا لـــەئوممهانیێ). جاکـــاتێ لەخۆشـــۆردنەکەی لێ بـــۆوە هەشـــت ڕکـــات نوێـــژی چێـــشتەنگاوی کـــرد، لـــەدوا هـــەموو دوو ڕکاتێکـــەوە ســـلاوی دەدایـــەوە، لـــەکاتی

نوێژەکەدا یەك پارچە جلکی ئاڵاندبوو بەخۆیەوە، کەسڵاوی دایەوە عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! عەلی برام دەیەوێ پیاوێ بکوژێ کەکوڕی هوبەیرەی مێردی منە، وەمنیش پەنایم داوەو، ئەمانم پێی داوە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی ئوممو هانیێ! وائەمانمان دا بەهەرکەسێ تۆ ئەمانی بدەیتێ!) ئوممو هانیێ فەرمووی: کاتیش چێشتەنگاو بوو. (ت/١/١٤٨/١، ت/١/٤٨٥/٤ بڕوانە: زنجیرەی پێنجەم، فەرموودەی ژمارە ـ ١٩٤) = ز-٣١ ژ-٢٦٧ + ز-١٧٩ ژ-٩٥٦، لە تەجریدی بوخاری).

## (١٨) باب: جواز الإغتسال عريانا في الخلوة
## مرۆی تەنیا خۆی دروستە کە بەڕوتی خۆی بشۆرێ

١٩٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنْ مُحَمَّدٍ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، (فَذَكَرَ أَحَادِيثَ مِنْهَا) وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « كَانَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ يَغْتَسِلُونَ عُرَاةً، يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى سَوْأَةِ بَعْضٍ، وَكَانَ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ يَغْتَسِلُ وَحْدَهُ، فَقَالُوا: وَاللَّهِ مَا يَمْنَعُ مُوسَى أَنْ يَغْتَسِلَ مَعَنَا، إِلاَّ أَنَّهُ آدَرُ. قَالَ: فَذَهَبَ مَرَّةً يَغْتَسِلُ، فَوَضَعَ ثَوْبَهُ عَلَى حَجَرٍ، فَفَرَّ الْحَجَرُ بِثَوْبِهِ. قَالَ: فَجَمَحَ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ بِإِثْرِهِ يَقُولُ: ثَوْبِي حَجَرُ! ثَوْبِي حَجَرُ. حَتَّى نَظَرَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ إِلَى سَوْأَةِ مُوسَى، وَقَالُوا: وَاللَّهِ مَا بِمُوسَى مِنْ بَأْسٍ، فَقَامَ الْحَجَرُ حَتَّى نُظِرَ إِلَيْهِ، قَالَ: فَأَخَذَ ثَوْبَهُ، فَطَفِقَ بِالْحَجَرِ ضَرْبًا، قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَاللَّهِ إِنَّهُ بِالْحَجَرِ نَدَبٌ: سِتَّةٌ أَوْ سَبْعَةٌ، ضَرْبُ مُوسَى بِالْحَجَرِ.[١٩٤]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نەوەی ئیسرائیل (کە ناسراون بە بەنی

---

[١٩٤] تجرید/١، ژمارە: ١٩٢، بخاری: ٢٧٨، مسلم: ٣٣٩، محمد فؤاد = مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١٥٨ = مسلم ترقیم شێخ خلیل مأمون شیحا: ٧٦٨.

ئیسرائیل) بەرووتو قووتی، لەبەرچاوی یەکتری خۆیان دەشۆرد، بەڵام مووسا (سڵاوی لێ بێ) پیاوێکی زۆر بە شەرمو شکۆ بووە، هەمیشە خۆی باش دادەپۆشی، بە ڕەنگێکی وا پێستی لەشی هیچ نەدەبینرا، وەهەر بەتەنهایش خۆی دەشۆرد، جا هەندێ کەسیان بەم جۆرە قسە ناشیرینانە ئازاری دڵی مووسایان دەداو، دەیانگوت: ببێو نەبێ بۆیە مووسا بەو شێوەیە خۆی دادەپۆشیو بەجیا خۆی دەشواو لەگەڵ ئێمەدا خۆی ناشۆرێ، دیارە نەنگێ بە لەشیەوە هەیە، سایا بەڵەکە، یا دەبەو قۆڕە، یا دەردێکی تری هەرهەیە).

جا خودای گەورەو سەروەر ویستی ئەم قسەو باسەی ئەوانە بەدرۆ بخاتەوە، پاکیو بێ نەنگی موسا (سڵاوی لێ بێ) دەربخا، جا بۆیە ڕۆژێ مووسا (سڵاوی لەسەر بێ) بەتەنیا خۆی لەوان کلا کردو ڕۆیشت بۆ چۆڵێ، لەوێ خۆی بشۆرێ، جا جلەکانی لەبەرخۆی داکەندو، لەسەر بەردێ داینان، کاتێ کەخۆی تەواو شۆرد، چوو بۆلای جلەکانی تا لەبەریان بکاتەوە، بەڵام بەفەرمانی خودای گەورە بەردەکە جلەکەی مووسای فڕاند!

مووسایش داردەستەکەی خۆی هەڵگرتو نیشتە سەربەردەکەو رایکرد بەشوێنیداو بانگی کرد: بەردەکە! جلەکانم دانێ، بەردەکە! جلەکانم دانێ، بەردەکەیش ڕۆیشت، مووسایش شوێنی کەوت، هەتا گەیشت بە کۆمەڵێ لەنەوەی ئیسرائیلو گشتیان تەماشای لەشی مووسایان کرد، بە رووتو قووتیو بەچاوی خۆیان بینییان کە لەشو لارو جەستە لەوە جوانترو پاکتر نابێو زۆر دوورە لەو درۆیانەی کە ئەوان دەیانڵێن، جا ئەوجا بەردەکە رەق راوەستاو مووسایش جلەکەی هەڵگرتەوەو دەستی کرد بە لێدانی بەردەکە، بە گۆچانەکەی چەند کوتەکێکی باشی لێدا!

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: سـوێندم بـە خـودای گەورە، مووسا وا بەتوندی بەردەکەی داپڵۆسـی بـوو، سـێ یـا چوار، یـا پێـنج، یـا شەش، یا حەوت خـاڵی لێ کردبـوو، ئـاوا قرنجانـدبووی وەك جێـگە بـرین، ئەمـە ئەو داستانەیە کە خودای گەورە بەم ئایەتە ئاماژەی بۆ دەکاو دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ آذَوْا مُوسَى فَبَرَّأَهُ اللَّهُ مِمَّا قَالُوا وَكَـانَ عِندَ اللَّهِ وَجِيهًا - سورة الأحزاب/ ٣٣/٦٩}:

واتە: ئەی کەسانێ کە باوەڕتان هێنـاوە بـە خـوداو بـە پێغەمبـەری خـودا! وەك ئەوانە مەبن کە ئـازاری دڵـی مووسـایان دەدا، تـا خـودای گـەورە پـاکی‌و بـێ نـەنگی‌و بـێ گـەردی مووسـای دەرخـستو قـسە ناهەقـەکانی ئـەوانی بـەدرۆ خستەوە، لە راستیدا مووسا لەلای خودای گەورە گەلێ خاوەن خـاترو قـەدرو زۆر پایە بەرزو رێزدار بوو). {تاج/١٠١/٧ — ١٩ — ش/ت}.

## (١٩) باب: الإعتناء بحفظ العورة
## بایەخدان بە پاراستنی شەرمگا

١٩٥- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَنْقُلُ مَعَهُمُ الْحِجَارَةَ لِلْكَعْبَةِ، وَعَلَيْهِ إِزَارُهُ، فَقَالَ لَهُ الْعَبَّـاسُ عَمُّـهُ: يَـا ابْـنَ أَخِي لَوْ حَلَلْتَ إِزَارَكَ فَجَعَلْتَـهُ عَلَـى مَنْكِبِـكَ دُونَ الْحِجَـارَةِ، قَـالَ: فَحَلَّـهُ فَجَعَلَـهُ عَلَـى مَنْكِبِهِ، فَسَقَطَ مَغْشِيًّا عَلَيْهِ. قَالَ: فَمَا رُؤِيَ بَعْدَ ذَلِكَ الْيَوْمِ عُرْيَانًا).[١٩٥]

جابیری کوڕی عەبـدوڵلا (رەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: کاتـێ هـۆزی قـوڕەیش لـەپێش ڕەوانـەکردن (بیعثـەت)ی پێغەمبـەردا، کەعبـەیان دروسـت کـردەوە، پێغەمبـەرو عەباسـی مامـەی بەیەکـەوە لەگـەڵ خەڵـکەکەدا بـەردیان

---

[١٩٥] مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١٦٠ = شیحا: ٧٧٠، بخاری: ٣٦٤، ١٥٨٢، ٣٨٢٩ - تجرید/٢٣١.

دەهێنا بۆ دروستکردنەوەی کابە، عەباس بە پێغەمبەری فەرموو: ئەی کوڕی برام! ئەی برازای ئازیزم! تۆیش وەك هاوەڵەکانت، شەرواڵەکەت بکەرەوەو بیخەرە سەر شانت، با بەرد سەرشانت نەبا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەوا دەکا شەرمگای دەردەکەوێ، ئیتر لەشەرمانا دەبووریتەوەو خرپ بەردەبێتەوەو دەکەوێتە سەر زەوی، وەچاوی لەترسی خودا بەرەو ئاسمان ئەبڵەق دەبێ، وە دەفەرموێ: (دەرپێکەم کوانێ؟) ئەوجا دەرپێکەی لەبەردەکاتەوە، ئیتر لەوڕۆژەوە بەدواوە بەرووتی نەبینراوە).

## (٢١) باب: إنما الماء من الماء
## ئاو لە ئاوەوەیە

١٩٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَرْسَلَ إِلَى رَجُلٍ مِنْ الْأَنْصَارِ فَجَاءَ وَرَأْسُهُ يَقْطُرُ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَعَلَّنَا أَعْجَلْنَاكَ فَقَالَ نَعَمْ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذا أُعْجِلْتَ أَوْ قُحِطتَ فَعَلَيْكَ الْوُضوءُ). [١٩٦]

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) ناردی بەشوێن پیاوێکی ئەنصاریدا، کەهات بۆ خزمەتی تازە خۆی شۆردبوو، هێشتا سەری ئاوی لێ دەتکا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ڕەنگ بێ فریا نەکەوتبێ لەبەر پەلە پەل ئیشەکەت تەواو بکەی؟) گوتی: بەڵێ جووتبوونەکەم بۆ تەواو نەکرا کەتۆ ناردت بەشوێنما یەکسەر خۆم شۆردو هاتم بۆ خزمەتت. حەزرەت (دروودی

---

[١٩٦] تجرید/١، ژمارە: ١٣٦، بخاری: ١٨٠، مسلم ترقیم محمد فؤاد: ٣٤٥ - مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١٥١، شیحا: ٧٧٣.

**خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (هەركاتێ جووتبوونت بۆ تەواو نەكراو ئاوت نەهاتەوە، بەس دەستنوێژت لەسەرە، خۆشۆردنت لەسەر نییە).**

**ڕوونكردنەوە:**

**ئەم بڕیارە لەپێشەوە وابووە، لەكاتى وادا خۆشۆردن پێویست نەبووە، بەلأم كاتێ ئیسلامەتى بەتەواوى دامەزرا ئەم بڕیارە هەڵوەشایەوە، ئەوەوى (ڕەزاى خواى لێ بێ) دەفەرموێ: یەك گرتن (ئیجماع - كۆدەنگى) هەیە لەسەر ئەوە كەخۆشۆردن پێویستە لەسەر مرۆڤ هەركاتێ سەرى چووك چووبەناو پیش یابەناو پاش دا، هەرچەند هیچ لایەكیشیان ئاویان نەیەتەوە: (تاج/١/ ١٤٥/ ٤ ز- ٣٠ ز-٢٦١).**

**١٩٧- حديث أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ أَنَّهُ قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِذَا جَامَعَ الرَّجُلُ الْمَرْأَةَ فَلَمْ يُنْزِلْ؟ قَالَ: « يَغْسِلُ مَا مَسَّ الْمَرْأَةَ مِنْهُ ، ثُمَّ يَتَوَضَّأُ وَيُصَلِّى».[١٩٧]**

**ئوبەیى كوڕى كەعب (ڕەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: عەرزى پێغەمبەرم كرد: ئەى پێغەمبەرى خودا! پێم بفەرموو: ئەگەر پیاو لەگەڵ هاوسەرى خۆى جووت ببێو پێكەوە دروست ببن، بەلأم ئاوى نەیەتەوە، ئایا چى لەسەرەو چى بكات؟ فەرمووى (درودى خوداى لەسەر بێ): (ئەو شوێنەى جەستەى بشۆرێ كە بەر جەستەى ژنەكە كەوتووە، واتە: تارات بگرێو ئەوسا ئەگەر ویستى نوێژبكا، ئەوا دەستنوێژ بگرێو بەس).**

**١٩٨- عنْ زَيْدَ بْنَ خَالِدٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ: سَأَلَ عُثمَانَ بْنَ عَفَّانَ قَالَ قُلْتُ: أَرَأَيْتَ إِذا جَامَعَ فَلَمْ يُمْنِ؟ قَالَ عُثمَانُ يَتَوَضأُ كَمَا يَتَوَضأُ لِلصَّلَاةِ، وَيَغْسِلُ ذكَرَهُ. قَالَ**

---

**[١٩٧] مسلم/شیحا: ٧٧٧، بخارى: ٢٩٣.**

عُثمَانُ: سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَأَلْتُ عَنْ ذلِكَ عليّا وطلحةَ وأُبَيَّ بنَ كَعْبٍ (رَضيَ اللَّهُ عَنْهُمْ) فأمروا بذلك).[١٩٨]

زەیدی کوڕی خالید (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پرسیم لە عوثمانی کوڕی عەففان ، گوتم: پێم بفەرموو: ئەگەر پیاو جووت بوو لەگەڵ کەسێ، بەڵام ئاوی نەهاتەوە، بڕیارەکەی چییە، لەشی پیس دەبێ یانا؟ عوثمان (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (چووکی بشۆرێو دەستنوێژێ وەك دەستنوێژێ نوێژ بگرێو تەواو). عوثمان فەرمووی: (ئەمەم لە پێغەمبەر خۆی بیستووە) زەید فەرمووی: هەمان پرسیارم لەعەلیو زوبەیرو طەلحەو ئوبەیی کوڕی کەعب کرد، ئەوانیش فەرموویان: چووکی بشواو دەسنوێژێ بەو شیوەیە بگرێ).

**(٢٢) باب: نسخ (الماء من الماء) وجوب الغسل بالتقاء الختانين**
**ئەوە هەڵوەشاوەتەوە کە دەڵێ: (ئاو لە ئاوەوەیە) بەڵکوو کە خەنجەر چوو بە کیلانا خۆشۆردن پێویست دەبێ**

١٩٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذا جَلَسَ بَيْنَ شُعَبِهَا الْأَرْبَعِ ثُمَّ جَهَدَهَا فَقَدْ وَجَبَ الْغَسْلُ).[١٩٩]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ پیاو لەناو چوارپەلی ئافرەتا دانیشتو لەگەڵیا دروست بوو، بائاویشی نەیەتەوە، ئیتر خۆشۆردن لەسەر هەردوولا پێویست دەبێ) (ت/١/ ١٤٤/ ١ ـ ز-٣٠ ژ-٢٥٨ = ش/د/ ن).

---

[١٩٨] تجريد/١، ژمارە: ١٣٥، بخاری: ١٧٩، ٢٩٢، مسلم. حیض: ٣٤٥، ترقیم محمد فؤاد: ٧٧٩.

[١٩٩] تجريد/١، ژمارە: ١٩٧، بخاری: ٢٩١، مسلم: ٣٤٣ = ٧٨١.

ئەمە (ژمارە: ١٩٧ - تجريد) بوو، ئەمەيش (ژمارە: ١٥٢ مختصر صحيح مسلم)ە:

ئەبو مووسا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: سەبارەت بەم بابەتە، کۆمەڵێ لە کۆچکاران و لە یاریدەدەران، راجیایی کەوتە نێوانیان، یاریدەدەران دەیانگوت: خۆشۆردن پێویست نابێ، هەتا ئاو نەیەتەوە، بەلام کۆچکاران دەیانگوت: بەڵکو هەرکاتێ چووك رۆچوو بەشەرمگادا، ئیتر خۆشۆردن پێویست دەبێ، فەرمووی: ئەبو مووسا فەرمووی: من چارەی ئەم پرسیارەتان بۆ دەکەم، فەرمووی: جا هەڵسام چووم بۆ خزمەتی دایکە عائیشە، لە دەرگاکەوە داوای رێخوازیم کرد، کەبچم بۆ خزمەتی، رێگەم پێدرا، عەرزیم کرد: ئەی دایکە! یا عەرزیم کرد: ئەی دایکی موسوڵمانان! من دەمەوێ پرسیارێکت لێ بکەم، بەلام شەرمت لێ دەکەم، فەرمووی: (هەرپرسیارێ کە شەرم ناکەی لەو دایکەتی بپرسیت کەلێی بوویت، شەرم مەکە ئەو پرسیارەش لەمن بکە، خۆ منیش بە شەرعی خوا دایکتم، گوتم: خۆشۆردنی لەش پیسی بەچی پێویست دەبێ؟ فەرمووی: بەراستی لە کەسێکی شارەزات پرسی، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ پیاو لەناو چوار پەلی ئافرەتدا، دانیشت و لەگەڵیا دروست بوو، با ئاویشی نەیەتەوە، ئیتر خۆشۆردن لەسەر هەردوو لا پێویست دەبێ).

## (٢٤) باب: نسخ الوضوء مما مست النار

## دەستنوێژگرتن بەهۆی خواردنو خواردنەوەی شتێكەوە، كە بەئاگر پوختە كرابێ، هەڵوەشاوەتەوە

٢٠٠- عَنْ عبدالله بن عباس أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (أَكَلَ كتف شَاةٍ ثمَّ صَلَّى وَلَمْ يَتَوَضأْ).[٢٠٠]

عەبدوڵلای كوڕی عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوكی بێت) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) جارێ لەلای مەیموونەی پوورم گۆشتی دەستی مەڕێكی خوارد، ئەوجا هەڵسا نوێژی كرد، لەپاش خواردنی گۆشتەكە دەستنوێژی تازە نەكردەوە.

٢٠١- عنْ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ أَبَاهُ أَخْبَرَهُ (أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَحْتَزُّ مِنْ كَتِفِ شَاةٍ فَدُعِيَ إِلَى الصَّلَاةِ فَأَلْقَى السِّكِّينَ فَصَلَّى وَلَمْ يَتَوَضأْ).[٢٠١]

عەمری كوڕی ئومەییە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەرم دی (دروودی خودای لەسەر بێ) شانی مەڕێكی بەدەستەوە بوو، بەچەقۆیێ پارچە پارچەی دەكردو دەیخوارد، لەوكاتەدا بانگیان كرد بۆ نوێژ، ئیتر گۆشتو چەقۆكەی داناو هەڵساو چوو بەرنوێژی یەكەی بۆ كردن، بەڵام لەبەر خواردنی گۆشتەكە دەستنوێژی نەگرتەوە. (ت/ ٤/ ٥٣/ ١٧ تاج-٣ ز-١٦ ژ-٢٦٥٢ ـ ش/ ت) .

لە موسلیما ئاوایە: (ژمارە: ١٤٨ مختصر صحیح مسلم):

---

[٢٠٠] تجرید/١، ژمارە: ١٥٤، مسلم: ٣٥٤ = ٧٩٤، مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١٤٨، مسلم شیحا: ٧٩١.

[٢٠١] تجرید/١، ژمارە: ١٥٢ = بخاری: ٢٠٨، مسلم: ٣٥٥ = ٧٨٨ = مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١٤٨، شیحا: ٧٩١.

جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی ئومەییەی ئەل‌ضەمری، لەعەمری باوکیەوە، فەرمووی: باوکم فەرمووی: پێغەمبەرم دی (دروودی خودای لەسەر بێ)، شانە مەڕێکی بەدەستەوە بوو، بەچەقۆیێ پارچە پارچەی دەکردو دەیخوارد، لەوکاتەدا بانگیان کرد بۆ نوێژ، ئیتر گۆشتو چەقۆکەی داناو هەڵساو چوو بەرنوێژییەکەی بۆ کردن، بەڵام لەبەر خواردنی گۆشتەکە کە بەئاگر دروست کرابوو، دەستنوێژی نەگرتەوە).

**ڕوونکردنەوە:**

عەمری کوڕی ئومەییە زۆر ڕەشیدو قسە زان بوو، گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەینارد بە نوێنەر بۆ کاری گرنگ، نامەیەکی پێغەمبەری برد بۆ نەجاشی لە حەبەشە، هەروا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردی بۆ مەککە، لەوێ تەرمەکەی خوبەیبی شەهیدی، لەسێدارەکەی کردەوەو هێنایەوە، بیست فەرموودەی هەیە، لە بوخاریدا دوو فەرموودەی هەیە، هەتا سەردەمی جێنشینی موعاوییە مابوو، لەمەدینە مردووە.

٢٠٢- عَنْ مَيْمُونَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَكَلَ عِنْدَهَا كَتِفًا ثُمَّ صَلَّى وَلَمْ يَتَوَضأْ).[٢٠٢]

مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای من شانێ گۆشتی خوارد، ئەوجا هەڵسا نوێژی کرد، لەپاش خواردنی گۆشتەکە دەستنوێژی نوێ نەکردەوە.

---

[٢٠٢] تجرید/١، ژمارە: ١٥٤، مسلم: ٣٥٦ = شیحا: ٧٩٤ + مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١١٧ = شیحا: ٨٠٤.

مەيموونـەی كـچی حـاريـث، دايكـی موسـوڵمانان، لەسـاڵی شـەش ياحـەوتی كۆچی، لەسەريف پێغەمبەر (درוودی خودای لەسەر بێ) هێنای، لەهەمان شوێن لەساڵی (٥١) ی ك، بێژراويشە لە (٦٦) ی ك مردووە، ئيبنووعەبباسی خوشكەزای نوێژی لەسەر تەرمەكەی كرد.

**ڕوونكردنەوە:**

مەيموونەی كچی حاريـث، دايكـی موسـوڵمانان، لەسـاڵی شـەش، يـا حـەوتی كۆچـی، لەسـەريف پێغەمبـەر هێنـای، لەهـەمان شـوێن لەسـاڵی (٥١) ی كۆچـی مردووە، هەندێ دەفەرموون لە (٦٦)ی كۆچيدا لەوشوێنە كۆچی دوايـی كـردووە، ئيبنـو عـەبباس، كـە خوشـكەزای بـوو نوێـژی تـەرمی لەسـەر كـردو لەگـەڵ دوو خوشـكەزای تريـدا دايانهێڵايـە نـاو گۆڕەكەيـەوە، مەيموونـە لەپێـشا نـاوی (بەڕە)بوو، پێغەمبەر ناوەكەی گۆڕیو نـاوی نـا مەيموونـە. واقيـدی دەفـەرمێ: (دوا هەمين ژنی پێغەمبەر بووە كە مردووە).

٢٠٣- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضي اللهُ عَنْهُما) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ شَرِبَ لَبَنًا فَمَضمَض وَقَالَ إنَّ لَهُ دَسَمًا.[٢٠٣]

ئيبنوعـەبباس (ڕەزای خودايـان لـێ بـێ) فـەرمووی: جـارێ پێغەمبـەر (درוودی خـودای لەسـەر بـێ) شـيری خـواردەوە، لەپاشـا ئـاوی لـەدەمی رادا، فەرمووی: شير چەوریو بەڵخی هەيە).

[٢٠٣] تجريد/١، ژمـارە: ١٥٥ = بخـاری: ٢١١، مـسلم. حـيض: ٣٥٨ - شـيحا: ٧٩٦ - مختـصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١٤٩.

## (٢٦) باب: الدليل على أن من تيقن الطهارة ثم شك في الحديث فله أن يصلي بطهارته

## دڵنیابوون له پاکی به بۆرەگومان هەڵناوەشێتەوە

٢٠٤- عَنْ عَبْدِاللهِ بنْ زَيدٍ الأنْصاري (رَضي اللهُ عَنْهُ) قالَ: (أَنَّهُ شَكَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الرَّجُلُ الَّذي يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ يَجِدُ الشَّيْءَ فِي الصَّلَاةِ فَقَالَ لَا يَنْفَتِلْ أَوْ لَا يَنْصَرِفْ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتًا أَوْ يَجِدَ رِيحًا).[٢٠٤]

عەبدوڵلای کوڕی زەیدی ئەنصاری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەت حەزرەتدا (درودی خودای لەسەر بێ) سکاڵای ئەو حاڵەم کرد کە جاری واهەیە مرۆڤ لەناو دەست نوێژدا واهەست دەکا، کەتەڕای یەك، یا بایەك، یاشتێ، لەپێشیەوە یالەپاشیەوە دەردەچێ، ئایا حوکم و بڕیاری ئەم حاڵە چی یە؟ دەستنوێژ بەشتی وا دەشکێ یانا؟ فەرمووی: (بالەکاتی وادا وادانێ کەدەستنوێژەکەی نەشکاوەو ماوە، لەبەرئەوە پێویست ناکا کەخۆی لەنوێژەکەی بدزێتەوەو نوێژەکەی ببڕێ، بەڵام هەرکاتێ دەنگی بایەکی بیست، یابۆنی دەرچوویەکی کرد، یاهەستی بەدەرچوونی تەڕایی یەك کرد ئەوە دەستنوێژەکەی دەشکێ). (ت ـ ١/ ١٣٦ ف ـ ١ ز-٢٦ ژ-٢٠٧، ٢٠٨).

### ڕاڤەو شیکردنەوە:

دەرچوونی تۆماو (مەنی) ڕاجیایی تیادایە کەلەدەستنوێژ شکێنەکانە یانا، ئەم فەرموودەیە یاسایەکە لەیاسا سەرەکییەکانی فیقە، کەهەموو شتێ لەسەر ئەصلی خۆی دەمێنێ، تا بەبەڵگە بارێ تری بۆ دەچەسپێ گومان لەکاتی وادا زیانی نییە.

---

[٢٠٤] تجريد/١، ژمارە: ١١١ = بخاری: ١٣٧، مسلم. حيض: ٣٦١، محمد فؤاد = شيحا: ٨٠٢ = مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١٥٠ = شيحا: ٨٠٣.

پیاوانی ڕشتەی ئەم فەرموودەیە شەش کەسن، ڕشتەکە خۆی ئاوایە: (حدثنا علي قال حدثنا سفيان قال حدثنا الزهري عن سعيد بن المسيب عن عباد ابن تميم عن عمه).

**چەند خاڵێکی گرنگ هەیە لەبابەتی زانستی فەرموودە شوناسی یەوە، لەم بۆنەیەدا ئاماژەی بۆ دەکەین:**

١. ئەم ڕشتەیە تەحدیثو عەنعەنەی تیادایە.

٢. پیاوانی ئەم ڕشتەیە شەش کەسن پێنجیان لەپیاوانی (الكتب الستة) ن، کوتوبی سیتە ئەم شەش پەڕاوەن: بوخاری، موسلیم، ئەبوداود، تیرمیذی، نەسائی، ئیبنوماجە، بەڵام لەم شەش کەسە (عەلی) یان لەپیاوانی بوخاریو ئەبوداوودو تیرمیذیو نەسائی یەو بەس، چواریشیان مەدینەیین، عەلی بەسرەیی یە، سوفیان مەککەیی یە، لەم ڕشتەیەدا صەحابی لەصەحابییەوە ڕیوایەت دەکا، لەسەر فەرمایشتی کەسانێ کەدەفەرموون عەببادیش صەحابییە، عەبدوڵلای کوڕی زەید ئوحودی یە واتە: ئامادەی غەزای ئوحود بووە، هاوبەشی تیادا کردووە خۆیو باوکیو دایکی هاوڕێی پێغەمبەر بوون، چلو هەشت فەرموودەی هەیە هەشتیان پەسندی هەردوو پیرن، لەتەمەنی حەفتاساڵیدا، لەمانگی قوربان دا لەشەڕەکەی ڕۆژی حەررەدا، کەلە (٦٣) کۆچیدا بوو شەهید کرا.

ئەمەیش دەقی ژمارە (١٥٠)ی مختصر صحيح مسليمە:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جاری وا هەیە کە مرۆڤ وا هەست دەکا، کە تەڕاییەك، یا بایەك، یا هەرشتێ کە دەستنوێژ بشکێنێ، لە پێشیەوە، یا لە

پاشیەوە، لەسکی دەردەچێ، بەڵام دوو دڵە لەوەو دڵنیا نییە لە روودانی، با لەکاتی وادا، وا دابنێ کە دەستنوێژەکەی ماوەو نەشکاوە، لەبەرئەوە پێویست ناکا (ئەگەر) لەناو مزگەوتدا بوو، مزگەوتەکە بەجێ بهێڵێ، یا ئەگەر لەناو نوێژا بوو، نوێژەکەی ببڕێو خۆی بدزێتەوە. بەڵام هەرکاتێ کە سوور دەیزانی کەوا دەستنوێژەکەی شکا، وەك ئەوە بایەکی لێ بۆوەو گوێی لەدەنگی بوو، یا بۆنی چوو بەسەریا، یا هەستی بە دەرچوونی دەستنوێژ شکێنی لە سکی کرد، وە شتەکەی لەلا روونو ئاشکراو بێگومان بوو، ئەوە لەباری وادا دەستنوێژەکەی دەشکێ، جا ئەگەر لەناو نوێژدا بوو، با نوێژەکەی ببڕێ، ئەگەر لەناو مزگەوتا بوو چاوەڕوانی نوێژی دەکرد، با دەرچێو بچێ دەستنوێژەکەی تازە بکاتەوە).

## (٢٧) باب: طهارة جلود الميتة بالدباغ
## کەوڵی مردارەوە بوو بە خۆشەکردن پاك دەبێتەوە

٢٠٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عنهما) قَالَ: تُصُدِّقَ عَلَى مَوْلاَةٍ لِمَيْمُونَةَ بِشَاةٍ فَمَاتَتْ، فَمَرَّ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: « هَلاَّ أَخَذْتُمْ إِهَابَهَا فَدَبَغْتُمُوهُ فَانْتَفَعْتُمْ بِهِ؟ فَقَالُوا: إِنَّهَا مَيْتَةٌ. فَقَالَ: « إِنَّمَا حَرُمَ أَكْلُهَا ». [٢٠٥]

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ مەڕێکیان بەزەکات دابوو بە کارەکەرێکی مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر، کە ئازادکراوی مەیموونە بوو، مەڕەکە مردارەوە بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەلاکی مەڕەکەی بینی فڕەدرابوو، فەرمووی: (ئەی ئەوە بۆچی کەڵکتان لە پێستەکەی وەرنەگرتووە؟). گوتیان: ئاخر ئەمە مردارەوە بووە، ئیتر چۆن

---

[٢٠٥] تجریدی کوردی/٢، ژمارە: ٧١٧، ١٤٩٢، بخاری: مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١١٧ = شیحا: ٨٠٤ حیض.

کەڵکی لێ وەربگرین؟ فەرمووی: (شتی مردارەوە بوو تەنیا خواردنی دروست نییە، واتە: دروستە سوود لەکەوڵی مردارەوە بوو وەربگیرێ).

**ڕوونکردنەوە:**

مەیموونەی کچی حاریث، دایکی موسوڵمانان، لەساڵی شەش، یا حەوتی کۆچی، لەسەریف پێغەمبەر هێنای، لەهەمان شوێن لەساڵی (٥١) ی کۆچی مردووە، هەندێ دەفەرموون لە (٦٦)ی کۆچیدا لەوشوێنە کۆچی دوایی کردووە، ئیبنو عەبباس، کە خوشکەزای بوو نوێژی تەرمی لەسەر کردو لەگەڵ دوو خوشکەزای تریدا دایانهێڵایە ناو گۆڕەکەیەوە، مەیموونە لەپێشا ناوی (بەرە)بوو، پێغەمبەر ناوەکەی گۆڕیو ناوی نا مەیموونە. واقیدی دەفەرموێ: (دوا هەمین ژنی پێغەمبەر بووە کە مردووە).

### (٢٨) باب: التيمم
### باسی تەیەموم

٢٠٦- عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) أَنَّهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالْبَيْدَاءِ، أَوْ بِذَاتِ الْجَيْشِ انْقَطَعَ عِقْدٌ لِي، فَأَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى الْتِمَاسِهِ، وَأَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ، وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ، وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ، فَأَتَى النَّاسُ أَبَا بَكْرٍ، فَقَالُوا: أَلاَ تَرَى مَا صَنَعَتْ عَائِشَةُ؟ أَقَامَتْ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَبِالنَّاسِ مَعَهُ وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ؟ فجاء أبوبكر ورسول الله (صلى الله عليه وسلم) واضِعٌ رَأْسَهُ عَلَى فَخِذِي قَدْ نَامَ، فقال: حَبِسْتِ رَسُلَ اللهِ والناسَ وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ، وَلَيْسَ مَعَهُم مَاءٌ قَالَتْ عَائِشَةُ: فَعَاتَبَنِي أَبُوبكْر، وَقَالَ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقُولَ، وَجَعَلَ يَطْعُنُنِي بِيَدِهِ فِي خَاصِرَتِي، فَلاَ يَمْنَعُنِي مِنَ التَّحَرُّكِ إِلاَّ مَكَانُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى

فَخِذِي، فَنَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى أَصْبَحَ عَلَى غَيْرِ مَاءٍ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ آيَةَ التَّيَمُّمِ، فَتَيَمَّمُوا، فَقَالَ أُسَيْدُ بْنُ الْحُضَيْرِ وَهُوَ أَحَدُ النقبَاءِ: مَا هِيَ بِأَوَّلِ بَرَكَتِكُمْ يَا آلَ أَبِي بَكْرٍ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ (رَضِيَ اللّهُ عنها): فَبَعَثْنَا الْبَعِيرَ الَّذِي كُنْتُ عَلَيْهِ، فَوَجَدْنَا الْعِقْدَ تَحْتَهُ ).[٢٠٦]

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو هاوسەرەکانی بێ) لەسەفەرێکا، کەوتینەڕێ، رۆیشتین تا گەیشتینە بەیداء، یا گەیشتینە (ذات الجیش) لەوێ گەردانەیەکی من پچڕایەوەو گوم بوو، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوێ مایەوە بەهیوای دۆزینەوەی ئەو گەردانەیە، خەڵکەکەیش لەخزمەتیدا مانەوە، ئەمە لەکاتێکا بوو، کە نەشوێنەکە ئاوی لێ بوو، وە نەخەڵکەکە ئاویان پێ بوو، جا خەڵکەکە چوون بۆلای ئەبوبەکری باوکم‌و گلەیی دەکەن‌و دەڵێن: نابینی کە عائیشەی کچت چی کرد؟ پێغەمبەرو ئەو عەشاماتەی لەم بیابانە چۆڵ‌و بێ ئاوەدا، بۆ گەردانەیێ گل داوەتەوەو، ئاویشمان پێ نییە! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خەوتبوو، سەری لەسەر رانم بوو، لەوکاتەدا ئەبوبەکر بە توورەیی هات، فەرمووی: پێغەمبەرو ئەم عەشاماتەت لەم شوێنە چۆڵ‌و بێ ئاوەدا، بەبێ ئاو گل داوەتەوە، ماتڵت کردوون بەخوت‌و خۆڕایی، ئەمە ئیش بوو تۆ کردت؟ ئیتر چەندە خودا حەزکا ئەبوبەکر گلەیی لێ کردم‌و بۆ تەمێ کردن قسەی پێ گوتم، خۆش خۆشیش بەسەرە سیخورمە دەیکوتایە کەلەکەم، منیش هەرچەندە ئێشم پێ گەیشتبوو،

---

[٢٠٦] مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١٦٥ - شیحا: ٨١٤، تجرید البخاری/١، ژمارە: ٢١٦، بخاری: ٣٣٤.

بەلام لەبەرئەوەی کەسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر رانم بوو – جووڵەم پێ نەدەکرا!

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوشەوە خەوت تا بەیانی، کاتێ کەبەیانی هەستا ئاو نەبوو بۆ دەستنوێژ، جا خودا ئایەتی تەیەمومی ناردە خوارەوە کە دەفەرموێ: {فَلَمْ تَجِدُواْ مَاء فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُ}:

واتە: ئەگەر لەهەموو ئەم شێوە کارانەدا، کەباسکران بۆتان، ئاونەبوو، بۆ دەستنوێژگرتنو خۆشۆردنی لەشکرانی، ئەوا قەستی هەڵگرتنی گڵێکی پاك بکەنو، لەباتی دەستنوێژ، یا لەجیاتی خۆشۆردنی لەشکرانی، لە تۆزی ئەو گڵە پاکە دەست بهێنن بەروخسارو بەهەردوو دەستتاندا، هەتا ئانیشك، ئیتر ئەوە برێتی دەستنوێژ، یا لەشپیسی دەرکردن بەئاو دەکەوێ). ئیتر تەیەمومومان کرد. جا بەم بۆنەیەوە، ئوسەیدی کوڕی حوزەیر (کە لەشەوی پەیمانی بەیعەتول عەقەبەی دووەمدا یەکێك بوو لە نەقیبەکان) فەرمووی: ئەی خانەوادەی ئەبوبەکری صەدیق! بەڕاستی ئێوە بنەماڵەیەکی پیرۆزن، بۆ ئەم نەتەوەی ئیسلامە بوون بەپیتو فەڕو خێرو بەرەکەتو مایەی پیرۆزیی، ئەوەتا ئەم داهاتنەی تەیەمومە، کەکار ئاسانییەکی گەورەیە بۆ موسوڵمانان، بەهۆی ئێوەوە بوو، چونکە گومبوونی گەردانەکەی عائیشە بوو بەهۆی پەیدابوونی تەیەموم، ئەمەیش یەکەم پیتو فەڕی ئێوە نییە بۆ ئەم نەتەوەیە، بەڵکوو پیتو فەڕی ئێوە لەم بابەتەوە زۆر زۆرە.

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: سەیر لەوەدا بوو ئەو وشترەی کەمن لەو سەفەرەدا سواری دەبووم، پاڵکەوتبوو، کاتێ هەڵمان ساند گەردانەکە

لەژێریدا بوو، ئیتر دۆزیمانەوە {تاج/١/١٧١، ژمارە: ١، زنجیرە: ٣٩ + تاج/٥، لاپەڕە/ ١٧٦، زنجیرە: ٤٦، ژمارە/١/٢٤٣٢ = تاج-٣ ژ-٣٤٧ ج-٤}.

٢٠٧- عَنْ شَقِيقٍ قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا مَعَ عَبْدِ اللَّهِ وَأَبِي مُوسَى، فَقَالَ أَبُو مُوسَى: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَرَأَيْتَ لَوْ أَنَّ رَجُلاً أَجْنَبَ فَلَمْ يَجِدِ الْمَاءَ شَهْرًا كَيْفَ يَصْنَعُ بِالصَّلاَةِ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لاَ يَتَيَمَّمُ، وَإِنْ لَمْ يَجِدِ الْمَاءَ شَهْرًا، فَقَالَ أَبُو مُوسَى: فَكَيْفَ بِهَذِهِ الآيَةِ فِي سُورَةِ الْمَائِدَةِ: (فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا) فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لَوْ رُخِّصَ لَهُمْ فِي هَذِهِ الآيَةِ لأَوْشَكَ إِذَا بَرَدَ عَلَيْهِمُ الْمَاءُ أَنْ يَتَيَمَّمُوا بِالصَّعِيدِ! فَقَالَ أَبُو مُوسَى لِعَبْدِ اللَّهِ: أَلَمْ تَسْمَعْ قَوْلَ عَمَّارٍ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي حَاجَةٍ فَأَجْنَبْتُ فَلَمْ أَجِدِ الْمَاءَ فَتَمَرَّغْتُ فِي الصَّعِيدِ كَمَا تَمَرَّغُ الدَّابَّةُ، ثُمَّ أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: « إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكَ أَنْ تَقُولَ بِيَدَيْكَ هَكَذَا ». ثُمَّ ضَرَبَ بِيَدَيْهِ الأَرْضَ ضَرْبَةً وَاحِدَةً ثُمَّ مَسَحَ الشِّمَالَ عَلَى الْيَمِينِ، وَظَاهِرَ كَفَّيْهِ وَوَجْهَهُ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: أَوَلَمْ تَرَ عُمَرَ لَمْ يَقْنَعْ بِقَوْلِ عَمَّارٍ (رَضِيَ اللَّهُ عنها)؟.[٢٠٧]

ئەمە دەقی عەرەبی ژمارە (١٦٦)ی پوختەی موسلیمە:

شەقیق (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەت عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودو ئەبو مووسای ئەشعەریدا، دانیشتبووم، ئەبو مووسا بە ئیبنو مەسعوودی فەرموو: ئەی باوکی ئەوڕەحمان! تۆ رات چییە بۆ ئەم پرسیارە: گریمان پیاوێ، لەشی پیس بوو، وە ئاو نەبوو، تەنانەت ئەگەر هەتا مانگێکیش ئاوی دەست نەکەوێ، کە دەستنوێژ بگرێ بۆ نوێژ، چۆن نوێژ بکا؟

ئیبنو مەسعوود فەرمووی: نابێ تەیەمموم بکا، ئەگەر مانگێکیش ئاوی دەست نەکەوێ. ئەبو مووسا فەرمووی: ئەی ئەم ئایەتە چۆن کاری پێ بکرێ،

---

[٢٠٧] مختصر صحيح مسلم/١٦٦ = شيحا: ٨١٦، تجريد/١، ژمارە: ٢١٩، بخاری: ٣٣٨.

كه له سوورەتی مائیدەدایه، كه دەفەرموێ: {فَلَمْ تَجِدُواْ مَاء فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا}.

ئیبنو مەسعوود له وەڵامی ئەم پرسیارەی ئەبو مووسادا فەرمووی: ئەگەر ئەو خەڵكه بەپێی ئەم ئایەته مۆڵەت بدرێن، دوورنییه هەر كەئاو ساردبوو، بچن بەخۆڵ تەیەمموم بكەن، ئەبو مووسایش به عەبدوڵلای كوڕی مەسعوودی فەرمووو: باشه ئەم فەرموودەیەی عەمماری كوڕی یاسرت نەبیستووه كه دەفەرموێ: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) منی نارد بۆ كارێ، لەڕێ لەشم پیس بوو، خۆشۆردنی لەشپیسیم كەوته سەر، وه ئاوم دەست نەكەوت بۆ خۆشۆردن، چووم خۆم له خۆڵه پەتانێدا گەوزان، وەك چۆن وڵاخ له خۆڵا خۆی دەگەوزێنێ ئاوا، لەپاشا كه هاتمەوه بۆ خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەمەم بۆی باسكرد، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (تەنها ئاوەهات بەس بوو: كه بەدەست ئاوا بكەی) ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەردوو دەستی خۆی ماڵی به زەوییەكەدا یەكجارو، فووی لێ كردن، تا تۆزەكەیان تۆزێ سووك بێ، ئەوسا بەهەردوو ناولەپی مەسحی دەموچاوی‌و هەردوو دەستی خۆی كرد}.

بەڵام عەبدوڵلا فەرمووی: با ئاگام لەم داستانه هەیه، بەڵام ئەوەبوو ئیمامی عومەر قەناعەتی بەم قسەیەی عەممار نەبوو (تاج/١/١٧٧ ژ-٣١٧ ج-٤).

**روونكردنەوە:**

كاتێ ئاو نەبوو، یا ئاو له حوكمی نەبوودا بوو، ئەوە دروسته بۆ لەشپیس، ژن بێ یا پیاو، بەهەر هۆیێ لەشی پیس بووبێ، لەباتی دەستنوێژ تەیەمموم بكا، وه لەجیاتی خۆشۆردن تەیەمموم بكا، بۆ هەموو نوێژێ تەیەمموومێ دەكا، هەتا بەئاو خۆی دەشوا.

دروسته بۆ حەلاڵو هاوسەر، لەگەڵ یەکتری دروست ببن، با سووریش بزانن کە ئاو نییە بۆ خۆشۆردن، لەکاتی وادا دەتوانن تەیەمموم بکەنو نوێژ بکەن.

٢٠٨- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (جَاءَ رَجُلٌ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطابِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) فَقَالَ إِنِّي أَجْنَبْتُ فَلَمْ أُصِبْ الْمَاءَ فَقَالَ عَمَّارُ بْنُ يَاسِرٍ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطابِ أَمَا تَذكُرُ أَنَّا كُنَّا فِي سَفَرٍ أَنَا وَأَنْتَ فَأَمَّا أَنْتَ فَلَمْ تُصَلِّ وَأَمَّا أَنَا فَتَمَعَّكْتُ فَصَلَّيْتُ فَذكَرْتُ ذلك لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكَ هَكَذا فضرَبَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِكَفَّيْهِ الْأَرْض وَنَفَخَ فِيهِمَا ثمَّ مَسَحَ بِهِمَا وَجْهَهُ وَكَفَّيْهِ).[٢٠٨]

ئەورەحمانی کوڕی ئەبزا (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: پیاوێ هاتە خزمەت عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) عەرزی کرد: لەشم پیسەو ئاوم دەست ناکەوێ چارم چییە؟ عەمماری کوڕی یاسریش لەوێ بوو، بەعومەری کوڕی خەتابی فەرموو: ئایا لەبیرتە کەجارەکە منو تۆ رەوتەنی بووین، لەو سەفەرەدا لەشمان پیس بوو، کاتێ نوێژمان لێ بوو تۆ نوێژت نەکرد، بەلام من خۆم لەخۆڵا گەوزانو ئەوجا نوێژم کرد، ئەوەبوو کەئەمەم بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باس کرد فەرمووی: (تەنها ئاوەهات بەس بوو) ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەردوو لەپی خۆی مالی بەسەر رووی زەوییەکەداو، فووی لێ کردن تاتۆزەکەیان تۆزێ سووك بێ، ئەوسا بەهەردوو ناولەپی مەسحی دەموچاوی‌و هەردوو دەستی خۆی ی کرد! . (ت/ ١/ ١٧٧/ ١= ز-٤١ ژ-٣١٧ = تاجول ئوصول بەرگی یەکەم، لاپەرە (١٧٧) فەرموودەی

---

[٢٠٨] تجريد/١، ژمارە: ٢١٩، بخاری: ٣٣٣٨، مسلم. حیض: ٣٦٨ - شیحا: ٨١٨.

ژمارەیەکی ئەولاپەڕەیە لەوەرگەڕاوە کوردی یەکەی لەچاپی یەکەم = ز-٤١ ژ-٣١٧ چاپی چوارەم).

عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبزای خوزاعی خۆیو باوکی صەحابی بوون (ڕەزای خوایان لێ بێ). ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) لەپەسنی جوانی عەبدوڕەحمانا دەیفەرموو: (عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبزا یەکێکە لەو بەهرەوەرانە کەخودا بەهۆی زانینی قورئانەوە پایەبەرزی کردوون) خۆی زۆرتر فەرموودەی لەئیمامی عومەرو ئوبەییەی کوڕی کەعبەوە دەگێڕایەوە، سەعیدو عەبدوڵلا، کەکوڕی خۆی بوون لەگەڵ موحەممەدی کوڕی ئەبولەجالیدا، فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، عەبدوڕەحمان دەیفەرموو: (نوێژم بەجەماعەت لەپشتی پێغەمبەرەوە کردووە).

٢٠٩- عَنْ عُمَيْرًا مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّه سَمِعَهُ يَقُولُ: أَقْبَلْتُ أَنَا وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ يَسَارٍ مَوْلَى مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى دَخَلْنَا عَلَى أَبِى جُهَيْمِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ الصِّمَّةِ الأَنْصَارِيِّ فَقَالَ أَبُو الْجُهَيْمِ: أَقْبَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ نَحْوِ بِئْرِ جَمَلٍ، فَلَقِيَهُ رَجُلٌ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ فَلَمْ يَرُدَّ رَسُولِ اللّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَيْهِ حَتَّى أَقْبَلَ عَلَى الْجِدَارِ فَمَسَحَ بِوَجْهِهِ وَيَدَيْهِ ثُمَّ رَدَّ السَّلاَمَ).[٢٠٩]

عومەیری ئازادکراوی ئیبنو عەباس فەرمووی: لە ئیبنو عەباسم بیست فەرمووی: منو ئەوڕەحمانی کوڕی یەساری ئازادکراوی مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چووین بۆلای ئەبو جەهمی کوڕی حاریثی کوڕی صوممەی ئەنصاری، کە هاوەڵی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بوو، کە چووینە خزمەتی، ئەبوجەهم فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای بیری جەمەلەوە هات، پیاوێ پێی گەیشتو

[٢٠٩] تجريد/١، ژمارە: ٢٢٦، بخاری: ٣٣٨، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١٦٧، شيحا: ٨٢٠.

سـلاّوی لێـکرد، پێغەمبـەریش (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) سـلاّوەکەی نەسـەندەوە، هـەتا رووی کـردە دیوارەکـەو لـە گـەردی سـەر بـەردی دیوارەکـە روخساری خۆیو هەردوو دەستی هەتا ئانیشکەکانی مەسح کرد، ئەوجا کە تەیەممومەکەی تەواوکرد، وەلاّمی سلاّوی پیاوەکەی دایەوە). {تاج/١/١٧٧، ژمارە: ٣١٨ ج-٤}.

ئەم فەرموودەیە لە شەرحی بلوغ المرامدا (ژمارە: ٢٥٨) ئاوایە:

وَاتَّفَقَا عَلَى حَدِيثِهَا فِي قِصَّةِ أَنْبِجَانِيَّةِ أَبِي جَهْمٍ، وَفِيهِ: {فَإِنَّهَا أَلْهَتْنِي عَنْ صَلَاتِي}. {تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٢٣٧ = ٣٧٣، ٧٥٢، ٥٨١٧ فتح الباری. پوختەی موسلیم/٢٣٢ = ١٢٣٩ موسلیم تەرقیمی شیحا = ٥٥٦ موسلیم}:

ئەمە ئەو فەرموودەیە کە لێرەدا دانەری (بلوغ المرام) ئاماژەی بۆ دەکا، لە پوختەی موسلیما (٢٣٢):

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسا دەستی کرد بەنوێژکردن، کراسێکی لەسەر خەتی خوری گوڵ گوڵی لەبەردا بوو، لەناو نوێژەکەیدا سەرنجێکی گوڵو نەخشەکانی کراسەکەی دا، کاتێ لە نوێژەکەی بۆوە، فەرمووی: (گوڵو نەخشەکانی ئەم کراسە خەریکیان کردمو نەیانهێشت لەناو نوێژەکەمدا، باش دڵ بدەمە نوێژەکەم کەواتە ئەمە ببەنەوە بۆ ئەبو جەهمی کوڕی حوزەیفەو کراسە ئەنبیجانییە سادەکەی ئەو بهێنن بۆ من!). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٢٩١٥ -ش}.

## روونکردنەوە:

ئەبو جەهم هاوڕێیەکی ناوداری پێغەمبەرە، کراسێکی گوڵ گوڵی خوری بەدیاری دەدەدا بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (دروودی

خودای لەسەر بێ) لەبەر ئەو هۆیەی کە لە فەرموودەکەدا باسکرا، کراسەکە دەنێرێتەوە بۆ ئەبو جەهم، بەلام لەبەرئەوەی کە بەهۆی گێڕانەوەی دیارییەکەیەوە بۆی، دلگیرنەبێ، داوای لێ دەکا: کە بیگۆڕێتەوە بە کراسێکی سادەی بێ نەخش بۆی.

ئەم فەرموودەیە بەلگەی ئەوەیە کە ئەو نەخشو نیگارو نووسینو وێنانەی کەوان بە میحرابو دیواری رووی قیبلەی مزگەوتەوە، هەمووی کارێکی ناباشو ناپەسەندن، نەبوونیان گەلێ چاکرتە، بگرە ئەگەر بکرێ فەرشو رایەخو بەرماڵی ناو مزگەوتیش هەتا سادەو بێ نەخشو نیگار بێ باشترە، بەلام هەرچۆن بێ بەم جۆرەشتانە نوێژ بەتاڵ نابێتەوە.

ئەبو جەهم لە مەسلەمەی فەتحە، یەکێ بوو لەپیاو ماقوولانی قورەیش، رەگەز ناسێکی چاك بوو، یەکێ بوو لەو چوار کەسە، کە قورەیش زانستی رەگەزو نژادی لێ وەردەگرتن، زۆر تەمەن درێژ بوو، دووجار ئامادەی دروستکردنەوەی خانووی کەعبە بوو بوو، جارێ لەسەردەمی نەزانیداو، جارێ لەسەردەمی ئیبنو زوبەیردا، یەکێ بوو لەو چوار کەسەی کە تەرمی ئیمامی عوثمانیان ناشت، کە حەکیمی کوڕی حزامو جوبەیری کوڕی موطعیمو نیاری کوڕی مکرمو ئەبو جەهم بوون.

ئەبو جەهم دەیفەرموو: لە نەزانیدا وازم لەمەینۆشی هێنا، مەبادا بێ ئەقڵم بکا، ناوی لە بوخاریو موسلیمدا هاتووە، ئەمە ئەو ئەبو جەهمەیە، کە فاطیمەی کچی قەیس، راوێژی بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد لەبارەیەوەو عەرزیکرد: موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیانو ئەبو جەهم خوازبێنییان کردووم، تۆ فەرمانت بەچییە). {بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٢٢٨٠ ج/٤} + {بوخاری/١، زنجیرە: ٩٦، ژمارە: ٥٧٧}.

## (٢٩) باب: الدليل على أن المسلم لاينجس

## بەڵگە لەسەرئەوە کە موسوڵمان بەزیندوویی و بەمردوویی پاکەو پیس نابێ

٢١٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ): أَنَّهُ لَقِيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي طَرِيقٍ مِنْ طُرُقِ الْمَدِينَةِ وَهُوَ جُنُبٌ، فَانْسَلَّ فَذَهَبَ فَاغْتَسَلَ، فَتَفَقَّدَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَمَّا جَاءَهُ قَالَ: أَيْنَ كُنْتَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ؟ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَقِيتَنِي وَأَنَا جُنُبٌ فَكَرِهْتُ أَنْ أُجَالِسَكَ حَتَّى أَغْتَسِلَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « سُبْحَانَ اللَّهِ إِنَّ الْمُؤْمِنَ لاَ يَنْجُسُ».[٢١٠]

**ئەمە دەقی ژمارە (١٦٨)ی پوختەی موسلیمە:**

**ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەشم پیس بوو، لەیەکێ لە رێگەکانی مەدینە تووشی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بووم، لەبەرئەوە کە لەشم گران بوو، خۆم لێ شاردەوەو چووم خۆم شۆردو ئەوسا هاتمەوە بۆ خزمەتی، لەو ماوەیەدا پێغەمبەر هەواڵی منی پرسی بوو، کە ئەبو هورەیرە چی لێ هات، کە گەڕامەوە خزمەتی فەرمووی: (ئەی ئەبو هورەیرە! ئەوە لەکوێ بووی؟). گوتم: راستیەکەی لەشم پیس بوو، لەبەرئەوە حەزم نەکرد کە بەلەشی ناپاکەوە لە خزمەتتا دابنیشم، چووم خۆم شۆردو هاتمەوە بۆ خزمەتت. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سوبحانەڵڵا! چەند سەیریت! موسوڵمان چۆن پیس دەبێت! جەستەی موسوڵمان بە زیندوویی و بە مردوویی پاکە پیس نابێت).**

---

[٢١٠] تجرید/١، ژمارە: ١٩٥، بخاری: ٢٨٥، مسلم: ٨٢٢، شیحا = مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١٦٨.

**روونکردنەوە:**

١- مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوەیە زاتی مرۆڤ بە سروشت پاکە، بەهیچ شتێ پیس نابێ، نە بەلەشگرانی، نە بەکفر، نە بەکردنی گوناهو تاوانو نەبە حەیزو منالبوون.

٢- بەلام ئەگەر پیسیەك بەر شوێنێکی کەوت، پێویستە کە بیشۆرێ، چونکە ئەم پیسیە جیایە لە پیسی سروشتی.

لەهەمان کاتدا واباشە کە مرۆڤ بە زووترین کات لەشپیسی خۆی دەربکاتو بە لەشی پاکو بەشێوەی جوانو رێکو پێکەوە بچێتە ناو کۆڕو مەجالیسەوە.

## (٣٢) باب: ما يقول إذا أراد دخول الخلاء
## گوتەی کاتی سەراوکردن

٢١١- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا دَخَلَ الْخَلاَءَ قَالَ: « اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ».[٢١١]

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەیویست بچێتە ناو ئاودەستەوە دەیفەرموو: {اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ} . واتە: ئەی خودایە! پەنا دەگرم بە پەنای تۆ لە شەڕی گۆڵو دێڵی شەیتانی چەپەڵ). {تەجرید/١/١٤١، ژمارە: ١٤٢/١١٥. تاج/١/١١٨، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ١٨٧/٥} .

---

[٢١١] تجريد/١، ژمارە: ١١٥، بخاری: ١٤٢، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١٠٨ = ٣٧٥ = ٨٢٩.

## (٣٣) باب: الدليل على أن نوم الجالس لا ينقض الوضوء
## بەڵگەی ئەوە کە خەو بە دانیشتنەوە دەستنوێژ ناشکێنێ

٢١٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَجِيٌّ لِرَجُلٍ - وَفِي حَدِيثِ عَبْدِ الْوَارِثِ: وَنَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُنَاجِي الرَّجُلَ - فَمَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ حَتَّى نَامَ الْقَوْمُ.[٢١٢]

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ قامەت کرا بۆ نوێژی خەوتنان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوکاتەدا، لە گۆشەیەکی مزگەوتدا، لەگەڵ پیاوێکا دانیشتبوو، دوو بەدوو چپەیان دەکردو قسەی نهێنی خۆیان دەکرد، هەر نەهات بەلای نوێژەکەوە هەتا هەندێ لە نوێژکەرەکان خەو بردنیەوەو خەویان لێ کەوت، ئەوسا پێغەمبەر هەڵساو هات بەرنوێژییەکەی بۆ کردین).

[٢١٢] تجرید/١، ژمارە: ٣٦٦ = ٦٤٢، بخاری. مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١٤٥ = مسلم: ٣٧٦ = ٨٣١ شیحا.

## ٤- كتاب الصلاة
## نامەی نوێژ
### (١) باب: بدء الأذن
### باسی سەرەتای دەستپێکردنی بانگ

٢١٣- عَنْ عبدالله بْنَ عُمَرَ (رَضِىَ اللّهُ عنهما) أنّهُ قَالَ: كَانَ الْمُسْلِمُونَ حِينَ قَدِمُوا الْمَدِينَةَ يَجْتَمِعُونَ فَيَتَحَيَّنُونَ الصَّلَوَاتِ، لَيْسَ يُنَادَى بِهَا أَحَدٌ، فَتَكَلَّمُوا يَوْمًا فِي ذَلِكَ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: اتَّخِذُوا نَاقُوسًا مِثْلَ نَاقُوسِ النَّصَارَى، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: قَرْناً مِثْلَ قَرْنِ الْيَهُودِ، فَقَالَ عُمَرُ (رَضِي اللهُ عَنْهُ): أَوَلاَ تَبْعَثُونَ رَجُلاً يُنَادِي بِالصَّلاَةِ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « يَا بِلاَلُ قُمْ فَنَادِ بِالصَّلاَةِ ».[٢١٣]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: کاتێ موسوڵمانان کۆچیان کرد بۆ مەدینە، هێشتا بانگ دانەمەزرابوو، خۆیان لە مزگەوت کۆ دەبوونەوەو چاودێری کاتی نوێژیان دەکردو بۆی کۆدەبوونەوە. ڕۆژێ لەم بارەیەوە دەستیان کرد بە ڕاوێژو گفتوگۆ، هەندێکیان فەرموویان: بازەنگێ دابنێین وەك هی نەصرانییەکان، وەك ئەوان لەکاتی نوێژدا ناقووس (بۆڵ) لێ بدەین، هەندێ تریان فەرموویان: ئەی بۆ ئێمەیش وەك جوولەکەکان کەڕەنایەك دروست نەکەین بۆ خۆمان و لەکاتی نوێژا فووی پیابکەین!

عومەریش (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەی بۆ پیاوێ نانێرن کەبچێ بانگ بدا بۆ نوێژ؟ ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕاوێژو

---

[٢١٣] تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٣٥٠ = ٦٠٤، بخاری. صحیح مسلم ترقیم محمد فؤاد: ٣٧٧، مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١٩٠ = ترقیم خلیل مأمون شیحا: ٨٣٥.

پێشنیارەکەی عومەری پەسەند کردو فەرمووی: (ئەی بیلال! هەڵسە بانگ بدە بۆ نوێژ) بیلالیش هەڵسا بانگی فەرموو.

## (٢) باب: الأمر بشفع الأذن وإيتار الإقامة
## وشەکانی بانگ جووت دەگوترێن بەڵام وشەکانی قامەت تاك تاك دەگوترێن

٢١٤- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أُمِرَ بِلاَلٌ أَنْ يَشْفَعَ الأَذَانَ وَيُوتِرَ الإِقَامَةَ - زَادَ يَحْيَى فِي حَدِيثِهِ عَنِ ابْنِ عُلَيَّةَ - فَحَدَّثْتُ بِهِ أَيُّوبَ فَقَالَ: إِلاَّ الإِقَامَةَ.[٢١٤]

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بە بیلال کرد، کە وتەکانی بانگ جووتە بڵێ، وە وتەکانی قامەت تاك تاك بڵێ، یەحیا کە لە ئیبنو عولەییەوە ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە، ئەمەی زیادە: ئیبنو عولەییە فەرمووی: کە ئەم فەرموودەیەم گێڕایەوە بۆ ئەییوب، ئەمەی لێ پتر کرد: (إِلاَّ الإقامَـةَ) واتە: وتەی (قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ) نەبێ، بەڵام ئەم وتەیە لە قامەتا دووجار بڵێ). {تاج/١/٢٢٦/٤٢١ – ش/د/ت/ن}.

### ڕوونکردنەوە:

١- مەبەست لەم وەرگێڕانو تەرجەمەیە، تێگەیشتنە لەمەبەستی تەواوی فەرموودەکە، کە لەڕووی فیقەو بڕیارە شەرعییەکانو چۆنێتی ڕووداوو داستانەکانەوە.

---

[٢١٤] مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١٩٢ - شیحا: ٨٣٦، تجرید/١، ژمارە: ٣٥١ - بخاری: ٦٠٥، ٦٠٣.

٢- تێگەیشتن و حاڵیبوون لەم رستەیە: {زَادَ يَحْيَى فِى حَدِيثِهِ عَنِ ابْنِ عُلَيَّةَ فَحَدَّثْتُ بِهِ أَيُّوبَ فَقَالَ إِلاَّ الإِقَامَةَ}. پێویستی بەم شیکردنەوە هەیە: (رشتەی ئەم فەرموودەیە لە صەحیحی موسلیمدا ئیمامی موسلیم لەدوو شەیخی خۆیەوە دەیگێڕێتەوە، یەکەمیان ئیمامی موسلیم (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: حَدَّثَنَا خَلَفُ بْنُ هِشَامٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ خَالِدٍ الْحَذَّاءِ، عَنْ أَبِى قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: أُمِرَ بِلاَلٌ أَنْ يَشْفَعَ الأَذَانَ، وَيُوتِرَ الإِقَامَةَ). گێڕانەوەی مامۆستای یەکەمی موسلیم لەم گێڕانەوەیەدا کە خەلەفە، لێرەدا تەواو دەبێ، گێڕانەوەی مامۆستای دووەمی موسلیم ئاوایە: موسلیم دەفەرموێ: (یەحیای کوڕی یەحیا ئەم فەرموودەیەی پێمان فەرموو، کە ئیسماعیلی ناسراو بە ئیبنو عولەییە، ئەم هەواڵەی پێمان فەرموو، لە خالیدی کوڕی حەذذائەوە، لە ئەبو قیلابەوە، لە ئەنەسەوە، فەرمووی: {أُمِرَ بِلاَلٌ أَنْ يَشْفَعَ الأَذَانَ، وَيُوتِرَ الإِقَامَةَ}. یەحیا فەرمووی: ئیبنو عولەییە فەرمووی: کە ئەم فەرموودەیەی خالیدی حەذذائم گێڕایەوە بۆ ئەییوبی سەختییانی کە ئەویش شاگردی ئەبو قیلابەیەو ئەبو قیلابە مامۆستای ئەویشە، وەك مامۆستای خالیدی حەذذاءە، ئەییوب ئاوا فەرموودەکەی لە ئەبو قیلابەوە، لە ئەنەسەوە گێڕایەوە: { أُمِرَ بِلاَلٌ أَنْ يَشْفَعَ الأَذَانَ، وَيُوتِرَ الإِقَامَةَ إِلاَّ الإِقَامَةَ} بە زیادەی وشەی (إِلاَّ الإِقَامَةَ).

## (٧) باب: القول مثل قول المؤذن لمن سمعه ثم يصلي على النبي صلى الله عليه وسلم ثم يسأل له الوسيلة

## کەسێ گوێی لەبانگ بێ چۆن وەڵامی بداتەوە

٢١٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذا سَمِعْتُمْ النِّدَاءَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ الْمُؤَذِّنُ). (الحديث ٦١١) وعن معاوية (رَضي اللهُ عَنْهُ) مثله إلى قوله: وأشهد أن محمدا رسول الله. وكما قال: حي

على الصلاة، قال: لاحول ولا قوة إلا بالله وقال: هكذا سمعنا نبيكم (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يقول).[٢١٥]

**له تەجریددا (ژمارە: ٣٥٥) ئاوایە:**

**ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ گوێتان لەبانگ دەبێ بانگدەر چ دەڵێ ئێوەش ئەوە بڵێنەوە). (ت/١/٢٣٠/١ ز-٦٣ ژ-٤٢٩ = ش/د/ ت/ ن).**

**موعاوییە (ڕەزای خوای لێ بێ) جارێ گوێی لەبانگ بوو، لەسەرەتای بانگەوە بانگدەر هەرچی دەفەرموو ئەویش گووتەکەی ئەوی دووبارە دەکردەوە، هەتا (وأشهد أن محمداً رسول الله) بەڵام کاتێ بانگدەر گوتی: (حي على الصلاة) موعاوییە فەرمووی: (لاحول ولاقوە إلا بالله) کاتێکیش بانگدەر گوتی: (حي على الفلاح) موعاوییە فەرموویەوە: (لاحول ولاقوة الا بالله) ئیتر لەپاش (حي على الفلاح) بانگدەر هەرچی فەرموو موعوییە ئەوەی دووبارە کردەوە، بەبێ زیادوکەم. لەپاشا فەرمووی: لەسەر ئەم شێوەیەی کەڕابوورد وەڵامی سەندنەوەی بانگم بەگوێی خۆم ژنەوتووە لەزاری پیرۆزی پێغەمبەری خۆشەویستی ئێوە. (دروودو سڵاوی خودای لەسەربێ).**

**ڕوونکردنەوە:**

**یەکەم: بۆمەشق کردن لەسەر وەرگێڕانی زاراوەکانی زانستی فەرموودە، هەروەها بۆ شارەزا بوون بەرەبەرە لەمەرجەکانی هەردووپیر -کەبوخاریو موسلیمن، (ڕەزاو رەحمەتی خودایان لێ بێ) دەڵێین: پێشەوا عەسقەلانی لەم**

[٢١٥] مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١٩٨، شیحا: ٨٤٧، تجريد/١، ژمارە: ٣٥٥، بخاری: ٦١٢، ٦١٣، ٩١٤.

شوێنەدا دەفەرموێ: پێشەوا موسلیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لەعومەری کوڕی خەططابەوە، فەرموودەیێ دەردەهێنێ، وێنەی ئەم فەرموومیەی موعاوییەیە، بەڵام بوخاری دەری نەهێناوە، چونکە راجیایی هەیە لەوەدا کەئەم فەرموودەی عومەرە پەیوەست (موصول)ە، یا بەرەڵایە واتە مورسەلی صەحابی یە، وەك پێشەوای فەرموودەناسی گەورە دارەقوطنی ئامـاژەی بـۆکردووە. ئەم فەرموودەیەی موعاوییەیش موسلیم دەری نەهێناوە، واتە: نەیگێڕاوەتەوە، چوونکە ئەوپترییەی کەجێگەی مەبەستە لەم فەرموودەیە بەپێی مەرجی موسلیم نیە، چونکە ڕشتەکەی نەناسێکی تێدایە. واتە: زیادە مەقصوودەکەی بەپێی مەرجی موسلیم نیە،

**دووەم:** بانگو قامەت لەم کاتانەدا سوننەتن: لەپێش نوێژدا، لەکاتی ناونانی منـاڵی ساوادا، لەکاتێکا کەسێ دەنگێ بەرگوێی بکەوێو لەجنۆکەو پەریو شتی وا بترسێ سوننەتە بانگ بدا، یاقامەت بکا، چونکە شەیتان لەدەنگی بانگو قامەت هەڵدێ، بیسەر هەموو وشەیێ، خودی وشەکە یادیکرەکەی کەلەکاتی بیستنی ئەو وشەیەدا دەگوترێ، لەپاش بانگدەرەوە، بەشێنەیی، بەدەنگی نزم لەبەرخۆیەوە دەڵێتەوە، ئەمەش بۆگشت موسوڵمانێ کەگوێی لەبانگ بێ سوننەتە، تەنانەت بۆ بێ دەستنوێژو لەشپیسیش، مەگەر بۆکەسێ کەمەهانەی هەبێ، وەك سەراوکەرو نوێژکەرو کەسێ لەگەڵ حەڵاڵیدا دروست بووبێ، ئەمانە بۆیان هەیە لەپاش تەواوبوونی کارەکەیان بەرێز بانگەکە بسێننەوە، بەمەرجێ زۆر بەینی نەکەوتبێ! مەرجە بانگدەرو قامەتکەر موسوڵمان بن، مەرجە بانگدەر قامیدەبێو خاوەن تەمیزو هۆش بێو نێرینەیش بێ، خوێندنی قورئانو ویردو یادەکانی تر، وەك تەسبیحاتو صەڵاوات، بۆ سەندنەوەی بانگو قامەت دەبڕێ. تەسبیحات کردن لەپێش نوێژی بەیانیو

نوێـژی هـەینی دا دروسـتە، سـەڵاواتدانیش لەسـەر پێغەمبـەر هـەروا، گەرچـی ئەمانە تـازە قـەڵان‌و لەسـەردەمی پێغەمبـەردا نـەبوون لەبەرئـەوە بگـرە ئەگـەر نـەکرێن باشـترە، بـەڵام کردنیـان زیـانی نییـە. تـەرجیع‌و تـەثویـب سـوننەتن، سـوننەتە وەقفـەو وەسـتان بەزەنـەی رێ لـەکاتی گـوتنی هـەموو (الله اکبر) یێکـا، بانگـدەر هـەموو وشـەیێ بەسـەریەکەوە بەیـەك هەناسـەبلێ، وەسـوننەتە بۆبانگدەرو قامەتکـەر لـەپێش بـانگ‌و قامەتەکـەوە سـەڵاوات لەسـەر پێغەمبـەر بدەن‌و نزا ناسراوەکە بخوێنن کەدەفەرموێ: (اللهم صل وسلم وبـارك علـى النـبيُّ الكريم... الخ) وەسوننەتەلەنێوانی بانگ‌و قامەتـدا هەمووکەسێ نـزای بـاش بکـا بـۆ ئیـشی دیـن‌و دنیـای خـۆی‌و موسـوڵمانان. (بڕوانـە: شـەرحی نـەوەوی، فەتحولباری، فیقهی ئاسان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە/ ١٤٤ ـ ١٤٦).

له (مختصر صحيح مسلم = پوختەی موسلیم ژمارە: ١٩٥) ئاوایە:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (رەزای خـودا لـەخۆی‌و لـە عـەمری بـاوکی) فـەرمووی: ژنـەوتم لـە خۆشەویـست (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەیفەرموو: (کاتێ گوێتان لەبانگ بوو، بانگدەر چی دەڵێ ئێوەش ئەوە بڵێنـەوە، لەپاشا کە لەوەڵامی بانگەکە دەبێتـەوە، صـەڵاوات لـە دیـاری مـن بـدەن، چونکە هـەر کەسـێ یـەك صـەلاوات لەسـەر مـن بـدا، خـودای گـەورە لـەباتی ئـەوە دە رەحمەت دەڕێژێ بەسەریدا، لەپاش ئەوەیش داوای پایـەی (الوسـيلة)م لـە خـودا بۆ بکەن، کە یەکێـکە لە پایە هەرە بەرزەکانی بەهەشت، دانـراوە بـۆ بەندەیـەکی فرە باش لە بەندە هەرە باشەکانی خودا، وە بۆ ئەو نـەبێ بـۆ کەسـی تـر دەسـت نادا، وەمن ئومێد دەکەم‌و هیوام هەیـە کـە خـۆم ئـەو بەندەیـە بم، جا ئـەوەیش بزانن ئەو کەسەی کە داوای ئەم پایەی ئەلوەسیلەیە، لـەخودا بکـا بـۆ مـن، ئـیتر

تکاو شەفاعەتی منیش بۆ ئەو لەرۆژی قیامەتا سەر دەگرێ). {تاج/١/٢٣٠، زنجیرە: ٦٣، ژمارە: ٤٢٩}.

**ڕوونکردنەوە:**

پێشەوا نەوەوی دەفەرموێ: (وەڵامدانەوەی بانگ لەم کەسانەوە سوننەتە: کەسێ دەستنوێژی هەبێ، یا نەیبێ، لەشی پاك بێ، یا لەشی پیس بێ، بێنوێژ بێ یا لەپاکیدا بێ، بۆ هەموو کەسێ لەسەر هەر حاڵێ بێ، لەهەر بارودۆخێکا بێ وەڵامدانەوە سوننەتە، لەم کاتانەدا نەبێ: لەکاتی سەراوداو لەکاتی جووتبوونی ژنو مێرددداو لەکاتی ئەم جۆرە شتانەدا، هەروا لەناو نوێژدا).

**(٨) باب: فضل الأذن وهروب الشيطان عند سماعه**

**بەهرەی بانگ، هەڵهاتنی شەیتان لەکاتی بیستنی بانگا**

٢١٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ أَدْبَرَ الشَّيْطَانُ، وَلَهُ ضُرَاطٌ حَتَّى لاَ يَسْمَعَ التَّأْذِينَ، فَإِذَا قَضَى التَّأْذِينُ أَقْبَلَ حَتَّى إِذَا ثُوِّبَ بِالصَّلَاةِ أَدْبَرَ حَتَّى إِذَا قَضَى التَّثْوِيبَ أَقْبَلَ، حَتَّى يَخْطُرَ بَيْنَ الْمَرْءِ وَنَفْسِهِ يَقُولُ لَهُ: اذْكُرْ كَذَا، اذْكُرْ كَذَا . لِمَا لَمْ يَكُنْ يَذْكُرُ مِنْ قَبْلُ، حَتَّى يَظَلَّ الرَّجُلُ مَا يَدْرِي كَمْ صَلَّى».[٢١٦]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ بانگ دەدرێ بۆ نوێژ شەیتان هەڵدەتۆرێنێو حەرت لێ دەدا، تا گوێی لە بانگەکە نەبێ، جا کە بانگەکە تەواو

---

[٢١٦] مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١٩٦ - شیحا: ١٢٦٧، محمد فؤاد: ٣٨٩، تجريد/١، ژمارە: ٣٥٢، بخاری: ٦٠٨.

دەبێ، دیسان دێتەوە تاقامەت دەکرێ بۆ نوێژ ئەوجا دووبارە هەڵدەتۆرێنێتەوە، کە قامەت تەواو دەبێ دیسان دێتەوە، دەچێتە بنکڵێشەی نوێژکەرەوەو پێی دەڵێ: بیر لەمە بکەرەوەو بیر لەوە بکەرەوە، وە ئەوشتانەی لەناو نوێژەکەدا وەبیردێنێتەوە کە لەوەپێش لەبیری نەبوون، هەتا خەریکی بکاو دڵی لەلای نوێژەکەی نەبێو خوضوعو خوشوعی لێ تێک بدا، هەتا بەرادەیەکی وا، دڵی بێ ئاگادەکا، لەئاستی نوێژەکەی، کەنازانێ چەن رکات نوێژی کردووە). {تاج/١/٢٢٢، زنجیرە: ٥٩، ژمارە: ٤١٤}.

**(٩) باب: إستجاب رفع اليدين حذو المنكبين مع تكبيرة الإحرام والركوع وفي الرفع من الركوع وأنه لايفعله إذا رفع من السجود**

**دەست بەرز کردنەوە هەتا ئاستی هەردوو سەرشان لەم کاتانەدا: لەگەڵ (الله أكبر)ی نوێژدابەستنداو لەگەڵ (الله أكبر)ی چوون بۆ چەمینەوەو لەگەڵ نزای بەرزبوونەوە لە چەمینەوە، بەڵام لەکاتی بەرزبوونەوە لە کورنووش لەگەڵ (الله أكبر)دا دەست بەرز ناکرێتەوە**

٢١٧- عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا قَامَ لِلصَّلاَةِ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى تَكُونَا حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ كَبَّرَ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، وَإِذَا رَفَعَ مِنَ الرُّكُوعِ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ وَلاَ يَفْعَلُهُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ مِنَ السُّجُودِ).[٢١٧]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) کاتێ هەڵدەسا بۆ نوێژ دابەستن، لەپێشا بەرەو رووگە دەوەستاو ئەوجا هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە، هەتا پشتی هەردوو

[٢١٧] تجريد/١، ژمارە: ٤٠٢ = ٧٣٥، بخاری. مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٢٧٢ = ٨٦٠ شیحا = ٨٦٠، ٨٥٩، ٨٦٢، ترقيم محمد فؤاد: ٣٩٠.

دەستی ڕێـك دەگەیشتنە بەرابـەر هـەردوو شـانیو سـەرپەنجەكانی دەگەیشتنە ئاستی نەرمەی گوێـكانی، ئاوا لەسەر ئەو شێوەیە ڕووی هەردوو لەپەكانی بەرەو ڕووگە بوو، ئەوجا بە ئەڵلاهو ئەكبەر نوێژی دادەبەست. وەكاتێ دەیویـست كـە بچێت بۆ چەمینەوە، دیسان بەو چەشنە دەستەكانی بـەرز دەكـردەوەو ئـەڵلاهو ئەكبەری دەكردو دەچەمایەوە. كاتێ لە چەمینەوە هـەڵ دەسـایەوە دەیفـەرموو: (سَمِعَ اللّٰهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) دیسان لەم كاتەیشدا هەردوو دەستی بەهەمان چەشن بەرز دەكردەوە، هەتا ئاستی هەردوو سەر شانەكانی، ئـەوجا دەیفـەرموو: (رَبَّنَـا وَلَــكَ الحَمْدُ). بەڵام كاتێ كوڕنووشی دەبـردو كاتێ سـەری لـە كوڕنـووش هـەڵ دەبـڕی ئەڵلاهو ئەكبەری دەكرد، بەڵام دەستی بەرز نـەدەكردەوە). {تاج/١/٢٥٥، زنجیرە: ٧٣ چاپی یەكەم. ژمارە: ٤٨٦ — ش/د/ت/ن}.

لە تەجرید (ژمارە: ٤٠٢)دا ئاوایە:

عەبدوڵلای كوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لـێ بێ) فـەرمووی: سـەرنجم دەدا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بەئەڵلاهوئەكبـەر نوێـژی دادەبەست، وەلەوكاتەدا هەردوو دەستی بەرز دەكردەوە، تاپشتی هەردوو دەستی دەگەیشتنە بەرابـەر هەردووشـانیو، سـەرپەنجەكانی دەگەیـشتنە ئاسـتی نەرمـەی گوێكـانی وەكـاتێ دەچـوو بۆچـەمینەوە دیـسانەوە ئەڵلاهوئەكبـەری دەكـردو دیـسان بەوچەشـنە دەستەكانی بـەرز دەكـردەوە، وەكـاتێ لەچـەمینەوە هـەڵ دەسـایەوە دەیفەرموو: (سمع الله لمن حمده) دیسان لەم كاتەیش دا هەردوو دەستی بەهەمان چەشن بەرز دەكردەوە تائاستی هەردوو سەرشانەكانی، ئەوجا دەیفەرموو: (ربنـا ولـك الحمـد) بـەڵام كـاتێ كوورنوشـی دەبـردو لەوكاتـەدا كەسـەری لـەكوڕنوش هەڵدەبڕی ئەڵلاهوئەكبەری دەكرد بەڵام دەستی بەرز نەدەكردەوە. (ت/١/٢٥٥ ز-٧٣ ژ-٤٨٦ چ-٤).

٢١٨- حديث مَالِكَ بْنَ الْحُوَيْرِثِ عَنْ أَبِى قِلاَبَةَ: أَنَّهُ رَأَى مَالِكَ بْنَ الْحُوَيْرِثِ إِذَا صَلَّى كَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ ، وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ رَفَعَ يَدَيْهِ ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ رَفَعَ يَدَيْهِ ، وَحَدَّثَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) صَنَعَ هَكَذَا: {تجريدى بوخارى/١، ژمارە: ٤٠٢ = ٧٣٥، ٧٣٦، ٧٣٨، ٧٣٩. پوختەى موسليم ٢٧٢ = موسليم شيحا ٨٦٠ = مسلم ٣٩٠} :[٢١٨]

**دەقى ئەم فەرموودەيە لە پوختەى موسليما:**

**عەبدوڵڵاى كوڕى عومەر (رەزاى خودايان لىٚ بىٚ) فەرمووى: خۆشەويست (دروودى خوداى لەسەر بىٚ) كاتىٚ هەڵدەستا بۆ نوێژ دابەستن، لەپێشا بەرەو رووگە ڕادەوەستاو، ئەوجا هەردوو دەستى بەرز دەكردەوە، هەتا پشتى هەردوو دەستى رێك دەگەيشتە بەرابەر هەردوو شانىو، سەرپەنجەكانى دەگەيشتنە ئاستى نەرمەى گوێكانى، ئاوا لەسەر ئەو شێوەيە رووى هەردوو لەپەكانى بەرەو رووگە بوو، ئەوجا بە ئەڵڵاهوئەكبەر نوێژى دادەبەست. وەكاتىٚ دەيويست كەبچێت بۆ چەمينەوە ديسان بەو چەشنە دەستەكانى بەرز دەكردنەوەو ئەڵڵاهوئەكبەرى دەكردو، دەچەمايەوە، كاتىٚ لەچەمينەوە هەڵدەسايەوە، دەيفەرموو: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) ديسان لەم كاتەيشدا، هەردوو دەستى بەهەمان چەشن بەرزدەكردەوە، هەتا ئاستى هەردوو سەرشانەكانى، ئەوجا دەيفەرموو: (رَبَّنَا وَلَكَ الحَمْدُ). بەلاّم كاتىٚ كوڕنووشى دەبردو كاتىٚ سەرى لەكوڕنووش هەڵدەبڕى ئەڵڵاهوئەكبەرى دەكرد، بەلاّم دەستى بەرز نەدەكردەوە. {تاج/١ لاپەڕە ٢٥٥، زنجيرە: ٧٣، چاپى يەكەم، ژمارە: ٤٨٦ چاپى چوارەم — ش/د/ت/ن}.**

---

**[٢١٨] تجريد/١، ژمارە: ٤٠٢، بخارى: ٧٣٥، ٧٣٦، ٧٣٨، ٧٣٩. صحيح مسلم ترقيم محمد فؤاد: ٣٩٠ = مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٢٧٢ - شيحا: ٨٦٠.**

وَلِمُسْلِمٍ عَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) نَحْوُ حَدِيثِ ابْنِ عُمَرَ، وَلَكِنْ قَالَ: {حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا فُرُوعَ أُذُنَيْهِ}. {مسلم شيحا ٨٦٤ = مسلم ٣٩١}:

**ئەمە ئەم فەرموودەیە لە موسلیمدا:**

**مالیکی کوڕی حوومیریث (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەرم بینی کاتێ نوێژی دائەبەست... تا دوایی ڕێك وەك فەرموودەکەی ئیبنو عومەر کە لەژمارە (٢٩٠)دن ڕۆیشت.**

## ڕوونکردنەوە:

**١- جیاوازی فەرموودەکەی مالیکی کوڕی حوومیریث لە فەرموودەکەی ئیبنو عومەر ئەوەیە: (فەرموودەکەی ئیبنو عومەر دەفەرموێ: پێغەمبەر لەم سێ کاتەدا دەستەکانی تا ئاستی سەرشانەکانی هەڵدەبڕی، بەڵام فەرموودەکەی مالیك دەڵێ: پێغەمبەر لەم سێ کاتەدا دەستەکانی تا ئاستی هەردوو سەرشانی هەڵدەبڕین و سەرپەنجەکانی دەگەیشتنە ئاستی نەرمەی گوێکانی).**

### (١٠) باب: إثبات التكبير في كل خفض ورفع في الصلاة إلا رفعه من الركوع فيقول فيه: سمع الله لمن حمده

### لەگەڵ هەموو دانەوینەوەو بەرزەوە بونێکا (الله أكبر) هەیە، تەنیا لەکاتی سەر بەرزکردنەوە لە چەمینەوە، ئەڵڵاهو ئەکبەر ناکرێ، دەڵێ: (سمع الله لمن حمده)

٢١٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي بِهِمْ ، فَيُكَبِّرُ كُلَّمَا خَفَضَ وَرَفَعَ ، فَإِذَا انْصَرَفَ قَالَ إِنِّي لأَشْبَهُكُمْ صَلاَةً بِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم).[٢١٩]

---

[٢١٩] تجرید/١، ژمارە: ٤٢٧ - بخاری: ٧٨٩، ٧٨٥، مسلم ترقیم شیحا: ٨٦٦ - مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٢٧٤.

ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: گەلێ جار کە ئەبو هورەیرە بەرنوێژیی بۆ موسوڵمانان دەکرد، هەموو جارێ کە دائەنەوی، یا سەری بەرزەوە دەکرد، ئەڵلاهوئەکبەری دەکرد، جا کاتێ کە لێ دەبوّوە لەنوێژەکە، دەیفەرموو: بەخودا نوێژی من لەنوێژی ئێوە، زیاتر لەنوێژی پێغەمبەر دەکات).

٢٢٠- عَنْ أبي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ يُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْكَعُ، ثُمَّ يَقُولُ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ حِينَ يَرْفَعُ صُلْبَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، ثُمَّ يَقُولُ وَهُوَ قَائِمٌ: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَهْوِي سَاجِدًا، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَسْجُدُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ، ثُمَّ يَفْعَلُ مِثْلَ ذَلِكَ فِي الصَّلاَةِ كُلِّهَا حَتَّى يَقْضِيَهَا، وَيُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ مِنَ الْمَثْنَى بَعْدَ الْجُلُوسِ. ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: إِنِّي لأَشْبَهُكُمْ صَلاَةً بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).(٢٢٠)

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، کاتێ هەڵ دەستا بۆ نوێژ، ڕووەو ڕووگەی پیرۆز ڕادەوەستاو، ئەوجا لەپێش هەموو شتێکا بە ئەڵلاهو ئەکبەری نوێژ دابەستن، نوێژی دادەبەست، کە دەچووش بۆ چەمینەوە ئەڵلاهو ئەکبەری دەکرد، کاتێ لە چەمینەوەیش پشتی هەڵ دەبڕی دەیفەرموو: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ: هەرکەسێ سوپاسی خودا بکا، خودا سوپاسەکەی قەبووڵ دەکا). ئینجا کە ڕێك ڕادەوەستا دەیفەرموو: (رَبَّنَا وَلَكَ الحمدُ: ئەی پەروەردگارمان! سوپاس هەر بۆ تۆیە).

---

(٢٢٠) تجريد/١، ژمارە: ٤٣٧ = ٧٨٩، مسلم ترقيم شيحا: ٨٦٦ = مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٢٧٤.

ئەوجا کە دائەنەوی بۆ کورنووش، لەوکاتەدا دەیفەرموو: ئەڵلاهو ئەکبەر، کاتێکیش کە سەری لە کورنووش هەڵدەبڕی دیسان ئەڵلاهو ئەکبەری دەکرد، دیسان کە دادەنەوی بۆ کورنووشی دووەم ئەڵلاهو ئەکبەری دەکرد، دیسان کە سەری لە کورنووشی دووەم هەڵ دەبڕی دەیفەرموو: ئەڵلاهو ئەکبەر. ئیتر لەهەموو رکاتێکا ئاوای دەکرد، هەتا نوێژەکەی تەواو دەکرد، لەپاش دانیشتنی تەحیاتی یەکەمیش کە لە رکاتی دووەمدا دەخوێندرێ، کە هەڵ دەسایەوە بۆ رکاتی سێیەم ئەڵلاهو ئەکبەری دەکرد.

ئەوجا ئەبو هورەیرە فەرمووی: (من لە هەمووتان زیاتر هەوڵ دەدەم کە نوێژەکەم لە نوێژی پێغەمبەر بچێت، هەتا کار بەو فەرموودەیەی پێغەمبەر بکەن کە دەفەرموێ: صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي: وەك خۆم نوێژ بکەن، کە دەمبینن لەبەر چاوتان نوێژ دەکەم!).

**روونکردنەوە:**

١. ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە تەکبیر کردنو ئەم زیکرانەی تر، دەبێ هاوکات بن لەگەڵ ئەم جموجووڵانەداو درێژ بکرێنەوە لەگەڵیانا، لەسەرەتایانەوە تا کۆتایان. بۆ نموونە کاتێ دەست دەکا بە دانەوین بۆ روکووع ئەڵلاهو ئەکبەر دەکاو درێژی دەکاتەوە، هەتا دەگاتە حەددی روکووع، ئەوجا ویردی ناو روکووع دەخوێنێ، ئەوجا لەکاتی سەرەتای بەرزەوە بوونا، لە روکووع دەڵێ: (سمع الله لمن حمده) وە درێژی دەکاتەوە، هەتا رێك رادەوەستێ، ئەوجا بەراوەستانەوە ویردی ئیعتیدال دەخوێنێ، کەلای کەمەکەی ئەمەیە: (رَبَّنَا لَكَ الحمدُ). ئیتر هەموو ئەڵلاهو ئەکبەرەکانی تریش لەسەرەتای شوێنەکەیانەوە دەست پێ دەکاو درێژی دەکاتەوە تا کۆتایی شوێنەکەیان.




٢. أ- هەموو نوێژێكی دوو ركاتی، یازده ئەڵلاهو ئەكبەری واتیادا، كە ئەڵلاهو ئەكبەری نوێژ دابەستن‌و هەر ركاتەی پێنج ئەڵلاهو ئەكبەر.

ب- هەموو نوێژێكی سێ ركاتی حەڤدە ئەڵلاهو ئەكبەری واتیا كە ئەڵلاهو ئەكبەری نوێژ دابەستن‌و ئەڵلاهو ئەكبەری هەستانەوە لە تەحیاتی یەكەم‌و هەر ركاتەی پێنج تەكبیرە.

ج- نوێژی چوار ركاتی بیست‌و دوو ئەڵلاهو ئەكبەری واتیادا.

د- لە پێنج فەرزەكەدا، نەوەدو چوار ئەڵلاهو ئەكبەری واتیادا.

هـ- لەیەك ركاتەكەی وەتریشا شەشی واتیادا.

ز- ئەم ئەڵلاهو ئەكبەرانە هەموویان سوننەتن، جگە لە ئەڵلاهو ئەكبەری نوێژ دابەستن، ئەو فەرزو پێویستە.

٣. دانیشتنەكانی ناو نوێژ، كە لە زاراوی شەرعی پیرۆزدا پێیان دەگوترێ (جەلەساتی نوێژ) چوارن:

أ- دانیشتن لەنێوانی دوو كوڕنووشدا.

ب- دانیشتنی وچان (جەلسەی ئیستراحە) كەوا لەكۆتایی ركاتا، كە تەحیاتی تیادا نەبێ، وە لەپاش تەواو بوونی كوڕنووشی دووەم، نوێژكەر لە ركاتی یەكەم‌و لە ركاتی سێیەمدا، كەمێ دادەنیشێت‌و ئەوسا هەڵ دەستێ بۆ ركاتی دووەم، یا بۆ ركاتی چوارەم.

ج- دانیشتنی تەحیاتی یەكەم، لە نوێژی سێ ركاتی‌و چوار ركاتیدا، یا دانیشتنی تەحیاتی دووەم، یا سێیەم، یا چوارەم لە هەندێ كاتی تایبەتیدا، وەك ئەوە پاش نوێژ دواكەوتووبێ.

د- دانیشتنی تەحیاتی كۆتایی، بەمەرجێ كوڕنووشی هەڵەی تیادا نەبێ. وا سوننەتە ئەم دانیشتنانە هەموو لەسەر شێوەی إفتراش بن، تەنیا دانیشتنی كۆتا

تـەحيات نـەبێ، کـە سـوننـەتە لەسـەر شـێوەی تـورك بـێ، وەك تـەحياتی نوێـژی بەيانیو تەحياتی کۆتايی نوێژە فەرزەکانی تر، يـا دواتـرين تـەحيات لـە نوێـژی سوننەتدا. تەحياتی کۆتاييش ئەگەر کورنووشی هەڵەی تيا برد، تەنيا لـەنێوانی کورنووشەکەو سلاو دانەوەدا تورك دەکا.

٢٢١- حديث عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، عَنْ مُطَرِّفِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَـالَ: صَـلَّيْتُ خَلْـفَ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ (رضى الله عنه) أَنَا وَعِمْرَانُ بْنُ حُـصَيْنٍ ، فَكَـانَ إِذَا سَـجَدَ كَبَّـرَ ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ كَبَّرَ ، وَإِذَا نَهَضَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ كَبَّرَ ، فَلَمَّا قَـضَى الـصَّلاَةَ أَخَـذَ بِيَـدِي عِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنٍ فَقَالَ قَدْ ذَكَّرَنِي هَذَا صَلاَةَ مُحَمَّدٍ (صلى الله عليه وسـلم). أَوْ قَـالَ لَقَدْ صَلَّى بِنَا صَلاَةَ مُحَمَّدٍ (صلى الله عليه وسلم): [٢٢١]

عيمرانی کوڕی حوصەين (ڕەزای خوای لـێ بێ) لەبەصرە لەپـشت ئيـمامی عەلی يەوە (ڕەزای خوای لـێ بـێ) نوێـژی بەجەماعـەت کـرد، لـەپاش لێبوونـەوە عيمـران فـەرمووی:: ئـەم پيـاوە - واتـە/ پێـشەوا عـەلی - چۆنێتی ئـەو نوێـژەی کەلەپشت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆيـەوە بەجەماعـەت دەمـان کرد، ئەو چۆنيەتييەی ياد خستينەوە، ئەوجا باسی ئەوەی کـرد کەهـەمووجارێ کەهـەڵ دەسـايەوە يـا دادەنەويـەوە ئەڵلاهوئەکبـەری دەکـرد، بـەڵام کـاتێ لەچەمينەوە هەڵدەسايەوە (سمع الله) ی دەکرد.

موطەرريفی کوڕی عەبدوڵلا (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فـەرمووی: لەگـەڵ عيمرانـی کـوڕی حوصـەيندا، بـە کۆمـەڵی (بەجەماعـەت) نوێـژمانکرد، لەپـشتی ئيمامی عەلی کوڕی ئەبو گاليبەوە، کاتێ دەچوو بۆ کڕنووش و کڕنووشـی دەبـرد، ئەڵلاهوئەکبەری دەکرد، هەروا کە سەری لە کڕنووش بەرزەوە دەکـرد، هـەروەها کـە هەڵدەسـايەوە بـۆ ڕکـاتی تـازە ئەڵلاهوئەکبـەری دەکـرد. جـا کاتـێ عـەلی

[٢٢١] تەجريدی بوخاری/٢، ژمارە: ٤٢٦ = بخاری: ٧٨٤، مسلم ترقيم شيحا: ٨٧١.

بەرنوێژییەکەی بۆمان تەواوکرد، عیمرانی کوڕی حوصەین دەستی گرتم و فەرمووی:

(بەڕاستی ئەم پیاوە کە ئێستا ئەم نوێژەی بۆمانکرد، چۆنێتی نوێژی پێغەمبەری یادخستمەوە، کە لەژیانی خۆیدا دەیکرد بۆمان). یا عیمران فەرمووی: (بەخودا پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) جاران رێك ئاوا نوێژی بۆدەکردین!).

**(١١) باب: وجوب قراءة الفاتحة في كل ركعة وأنه إذا لم يحسن الفاتحة ولا أمكنه تعلمها، قرأ ما تيسر له من غيرها**

**خوێندنی فاتیحا لەهەموو رکاتێکا پێویستە، کەسێ فاتیحا نەزانێ و بۆشی لەبەر نەکرێ، زیکرێ تر دەخوێنێ هەتا لەبەری دەکا**

٢٢٣- وَعَنْ عُبَادَةَ بْنِ اَلصَّامِتِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِأُمِّ اَلْقُرْآنِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.[٢٢٣]

عوبادەی کوڕی صامیت (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ لەنوێژدا، لەهەموو رکاتێکا، سوورەتی فاتیحە نەخوێنێ نوێژەکەی دروست نییە). {تاج/١، زنجیرە: ٧٢، ژمارە: ٤٧١}.

**روونکردنەوە:**

عوبادەی کوڕی صامیت (رەزای خودای لێ بێ) ئەنصارییە، خەزرەجییە، ئەنصارەکان کە خەڵکی مەدینە بوون، زۆربەیان لەهۆزی خەزرەج و لەهۆزی

---

[٢٢٣] مسلم تخريج شيحا: ٨٧٢ = تخريج محمد فؤاد: ٣٩٤، تجریدی بوخاری/٤١١ = ٧٥٦، بخاری (شەرحی بلوغ المرام من أدلة الأحكام)/١، ژمارە: ٢٩٤ لاپەرە/٣٢٣.

ئەوس بوون، عوبادە ئامادەی پەیمانی عەقەبەی یەکەم‌و دووەم بووە، هەروا ئامادەی غەزای بەدرو جەنگی ئوحودو پەیمانی خۆشنوودی (بەیعەتی ریزوان)و هەموو شەڕگاکانی تری پێغەمبەر بووە، لەگەڵ پێغەمبەر خۆیدا، (دروودی خودای لەسەر بێ).

عوبادە لە پێغەمبەرەوە هەشتاو یەك فەرموودەی گێڕاوەتەوە، شەشیان پەسەندی هەردوو پیرن، (واتە: متفق علیە)ین، دوانیان لە بوخاریدا هەیە، بەڵام لە موسلیمدا نییە، دوانیشیان لەموسلیمدا هەیە، لەبوخاریدا نییە، یەکەم کەس بووە کەبووە بەقازی فەلەستین، پیاوێکی کەڵەگەتی قەویلەی قۆزی بەهرەمەند بووە، ساڵی (٣٤)ی کۆچی مردووە، گۆڕەکەی وا لەبەیتولمەقدیس، جێگەی زانراوە. لەئیستیعابا دەفەرموێ: لە فەلەستین مردووە، لە بەیتولمەقدیس نێژراوە. وەهەتا ئێستا گۆڕەکەی ناسراوە، ساڵی (٣٤) سیی‌و چواری کۆچی، لەتەمەنی (٧٢) حەفتاو دوو ساڵیدا مردووە. یەکێ بووە لەو کەسانەی کە لە سەردەمی پێغەمبەردا هەموو قورئانیان لەبەر بووە. {بڕوانە: تجریدی بوخاری بەرگی یەکەم ژمارە/١٨ لاپەڕە – ٣٧ چاپی یەکەم} .

٢٢٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قالَ: (فِي كُلِّ صَلَاةٍ يُقْرَأُ فَمَا أَسْمَعَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَسْمَعْنَاكُمْ وَمَا أَخْفَى عَنَّا أَخْفَيْنَا عَنْكُمْ وَإِنْ لَمْ تَزِدْ عَلَى أُمِّ الْقُرْآنِ أَجْزَأَتْ وَإِنْ زِدْتَ فَهُوَ خَيْرٌ).[٢٢٣]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (لەهەموو نوێژێکا قورئان دەخوێنرێ، جالەو جێگایانەدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدەنگی بەرز دەیخوێند هەتا ئێمە گوێمان لێ ی بێ، ئێمەیش کەبەرنوێژیبۆ ئێوە دەکەین لەسەرهەمان شێوە دەیخوێنین، وەلەو جێگانەیش دا کە پێغەمبەر

[٢٢٣] تجرید/١، ژمارە: ٤١٩، بخاری: ٧٧٢، شیحا: ١٠٣٧ - مسلم تخریج محمد فؤاد ژمارە: ٣٩٣.

(دروودی خودای لەسەر بێ) بەدەنگی نزم دەیخوێندو، بەپەنامەکی فاتیحەو سوورەتی لەناو نوێژەکەدا دەخوێند ئێمەیش بەپەنامەکی لەسەرهەمان شێوە بۆئێوەی دەخوێنین. ئەگەر تەنیا سورەتی فاتیحەیش لەگشت ڕکاتێکا بخوێنی برێتی دەکەوێ‌و قورئانخوێندنی پێویستی ناو ئەو رکاتەت لەکۆڵ دەکەوێ، بەڵام ئەگەر پتر بخوێنی ئەوە شتی چاکەو باشترە).

نمونەیێ لەشیکردنەوەی زانستی فەرموودەو ئاشنابوون لەحاڵی پیاوانی ڕشتەی ئەم فەرموودەیە لێرەدا ئاوایە: بوخاری، موسەددەد، ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم ئیبنو جورەیج، عەطاء، ئەبو هورەیرە ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم کەناوداره بەإبن علیە، فەرموودەزانی گەورە یەحیای کوڕی موعین قسەی هەیە لەسەری، کاتێ کەلەئیبنوجورەیجەوە گێڕانەوە ئەنجام بدا، وەك ئەم فەرموودەی واین لەخزمەتیدا، بەڵام لەبەرئەوەی ئەم زاتانە پەیڕەوی (موتابەعە) ی ئیسماعیلیان کردووە، لەگێڕانەوەی ئەم فەرموودەیەدا، فەرموودەکە بێ ڕەخنەیە، عەبدوڕەزاق‌و موحەممەدی کوڕی بەکرو یەحیای کوڕیئەبوحەجاج لەلایەن ئەبوعەوانەوە، غوندەر لەلایەن ئیمامی ئەحمەدەوە، خالیدی کوڕی حاریث لەلایەنی نەسائییەوە، قەیسی کوڕی سەعدو عمارەی کوڕی مەیموون لەلایەن ئەبوداوودەوە، حوسەینی المعلم لەلایەن ئەبونەعیمەوە لەئەلموستەخرەجدا، بەڵام هەیانە درێژی کردۆتەوەو هەیانە کورتی کردۆتەوە، هەیانە بەمەرفووعی‌و هەیانە بەمەوقووفی، ئەم گێڕانەوەی ئێرە بەڕواڵەت مەوقووفە لەسەر ئەبوهورەیرە، بەڵام بڕیار (حوکم) ی مەرفووعی هەیە، چونکە ئەم بڕگەیە (ما أسمعنا وما أخفى عنا) ئەوە دەگەیەنێ کەفەرموودەکە مەرفووع بێ نەك مەوقووف.

٢٢٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دَخَلَ الْمَسْجِدَ، فَدَخَلَ رَجُلٌ فَصَلَّى، ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى رَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَرَدَّ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَيْهِ السَّلاَمَ، قَالَ: « ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ ». فَرَجَعَ الرَّجُلُ فَصَلَّى كَمَا كَانَ صَلَّى، ثُمَّ جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « وَعَلَيْكَ السَّلاَمُ » ثُمَّ قَالَ: « ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ». حَتَّى فَعَلَ ذَلِكَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَقَالَ الرَّجُلُ: (وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أُحْسِنُ غَيْرَ هَذَا، عَلِّمْنِي، قَالَ: « إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلاَةِ فَكَبِّرْ، ثُمَّ اقْرَأْ مَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ، ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَعْتَدِلَ قَائِمًا، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا، ثُمَّ افْعَلْ ذَلِكَ فِي صَلاَتِكَ كُلِّهَا ».[٢٢٤]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هات بۆ مزگەوت، پیاوێکیش کەناوی خەللادی کوڕی رافیع بوو، هاتە ژوورەوەو نوێژی کردو چوو بۆلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ)و سلاوی لێ کرد، ئەویش سلاوەکەیی سەندەوەو فەرمووی: (بچۆرەوە نوێژەکەت بکەرەوە، چونکە ئەوە نوێژ نەبوو کە تۆ کردت) هەتا سێجار پیاوەکە نوێژەکەیی دەکردەوەو دەهاتەوە سلاوی لە پێغەمبەر دەکردو ئەویش وەلامی سلاوەکەیی دەدایەوەو دیسانەوە هەروای پێ دەفەرمووەوە، تا لەسەری جاری سێیەما پیاوەکە گوتی: بەو خودایەی کە تۆی کردووە بە پێغەمبەری راستو دروست لەمە باشتری لێ نازانم، دەی ئەی پێغەمبەری خودا! بفەرموو نوێژم فێربکە. ئەویش (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کە راوەستای بۆ

[٢٢٤] تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٤١٢، بخاری: ٧٣٧، مسلم ترقیم محمد فؤاد: ٣٩٧ = شیحا: ٨٨٢ - مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٢٨٢.

نوێژ لەپێشا نوێژ بەم شێوە دابەستەو بڵێ: ئەللاهو ئەکبەر، ئنجا چەندەت بۆ دەلوێ (لەو قورئانەی کە لەبەرتە) بیخوێنە، ئەوجا بچەمێرەوەو ئەوەندە لە چەمینەوە (روکووع)دا بمێنەرەوە هەتا لەشت لە جموجووڵ دەکەوێو ئەندامەکانت ئارام دەگرن، ئینجا رێك هەڵسەرەوەو پشت هەڵبڕە هەتا رەپو راست رادەوەستیت، ئەوسا دانەوێ بۆ کوڕنووش‌و کوڕنووشی یەکەم بەرەو ئەوەندە لە کوڕنووشدا بمێنەرەوە تا ئەندامەکانت ئارام دەگرن‌و جەستەت لە جموجووڵ دەکەوێ، ئەوجا سەر لە کوڕنووش بەرزکەرەوە هەتا قنج دادەنیشیت، ئینجا دیسانەوە کوڕنووشێکی تر، وەك کوڕنووشی یەکەم بەرەوە، ئیتر هەموو رکاتەکانی تریش هەتا سەر بەم شێوەیە بکەو، هەموو کاتێ لە نوێژەکانتا ئەمە کارت بێ). {تاج/١، زنجیرە: ٧٢، ژمارە: ٢/٤٧٠}.

### (١٣) باب: حجة من قال: لايجهر بالبسملة
### بەڵگەی ئەوانەی دەڵێن: بیسمیلا بە ئاشکرا ناخوێندرێ

٢٢٥- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ كَانُوا يَفْتَتِحُونَ اَلصَّلَاةَ بِـ(اَلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ اَلْعَالَمِينَ)} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.[٢٢٥]

لە تجریدا ئاوایە: ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و ئەبوبکرو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) بەخوێندنی سوورەتی (اَلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ اَلْعَالَمِينَ) دەستیان دەکرد بەنوێژ.

لەپوختەی موسلیمیشا ئاوایە:

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەپشتی پێغەمبەرو ئەبوبکرو عومەرو عوسمانەوە، نوێژی زۆرم بەجەماعەت (بەکۆمەڵ) کردووە، لێم

---

[٢٢٥] شەرحی بلوغ المرام من أدلة الأحكام بەرگی یەکەم، ژمارە: ٢٩٧.

نەبیستوون کە لەپێش سوورەتی فاتیحاوە (بِسْمِ اَللَّـهِ اَلـرَّحْمَنِ اَلـرَّحِيم) بخـوێنن.

{تاج/١، زنجیرە: ٧٢، ژمارە: ٤٧٧}.

## (١٦) باب: التشهد في الصلاة
## باسی تەحیات لەنوێژدا

٢٢٦- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {اِلْتَفَتَ إِلَيْنَا رَسُولُ اَللَّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ: " إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلْ: اَلتَّحِيَّـاتُ لِلَّـهِ، وَالـصَّلَوَاتُ، وَالطَّيِّبَاتُ، اَلسَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا اَلنَّبِيُّ وَرَحْمَةَ اَللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، اَلسَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اَللَّـهِ اَلصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اَللَّـهُ، وَحْـدَهُ لاَ شَـرِيكَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـدًا عَبْـدُهُ وَرَسُولُهُ، ثُمَّ لِيَتَخَيَّرْ مِنْ اَلدُّعَاءِ أَعْجَبُهُ إِلَيْهِ ، فَيَدْعُو} مُتَّفَـقٌ عَلَيْـهِ، وَاللَّفْـظُ لِلْبُخَـارِيِّ. وَلِلنَّسَائِيِّ: {كُنَّا نَقُولُ قَبْلِ أَنْ يُفْرَضَ عَلَيْنَا اَلتَّشَهُّدُ}. وَلِأَحْمَدَ: {أَنَّ اَلنَّبِـيَّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَلَّمَهُ اَلتَّشَهُّد، وَأَمَرَهُ أَنْ يُعَلِّمَهُ اَلنَّاس}.[٢٢٦]

{تجريـدى بوخـارى/١، ژمـارە: ٤٤٦ = ٨٣١، ٨٣٥، ١٢٠٢، ٦٢٣٠، ٦٢٦٥، ٧٣٨١، ٦٣٢٨ فتح البارى شرح صحيح البخارى. مسلم شيحا ٨٩٥ – ٨٩٩ = مسلم ٤٠٢. بڕوانە: پوختـەی موسـلیم ٣٠٤، ٣٠٥. نـسائى ٢/٢٣٧، ٣/٤٠. أبوداود رقـم: ٩٦٨. ترمـذى رقـم: ٢٨٩. ابـن ماجـه رقـم: ٨٩٩. احمـد ١/٣٨٢}:

ئەمە یەکێکە لەگێڕانەوەکانی بوخاری بۆ ئەم فەرموودەیە:

عەبـدوڵڵای کـوڕی مەسـعوود (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: لەپێـشدا لەپشتی پێغەمبەرەوە (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بەکۆمـەڵ نوێـژمان دەکـرد، لـەپێش دانـانی تـەحیاتا، دەمـانگوت: سـڵاو لـەخودا، سـڵاو لـەجوبرائیل، سـڵاو

---

[٢٢٦] شەرحی بلوغ المرام/١، ژمارە: ٣٣٣.

لەمیکائیل، سلاو لەم، سلاو لەو، هەتا رۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوڕی لێمان دایەوەو فەرمووی: (وا مەڵێن، چونکە خودا خۆی ناوی سەلامە، بەلام کاتێ لەنوێژدا دادەنیشن بۆ خوێندنی تەحیات بڵێن: (اَلتَّحِيَّاتُ لِلَّهِ، وَالصَّلَوَاتُ، وَالطَّيِّبَاتُ، اَلسَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا اَلنَّبِيُّ وَرَحْمَةَ اَللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، اَلسَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اَللَّهِ اَلصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اَللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ).

هەرچی هۆی قەدرو رێزە، چی بەگوتار، چی بەکردار، وەهەرچی نوێژو داخوازیو لالانەوەو پاڕانەوەو دوعاو نزایە، وەهەرچی سەرچاوەی پاکیو خاوێنییە، ئەمانە هەموویان لەڕاستیدا، هەر شایستەن بۆ خودای مەزن، درووود لەسەر تۆ ئەی پیغەمبەری خودا! لەگەڵ سۆزو میهرەبانیو پیتو فەڕو ڕەحمەتو بەرەکەتی خودا، درووود لەسەر ئێمەیش کە گەلی ئەو پێغەمبەرەینو لەسەر هەموو بەندە باشەکانی خودا، شایەتی دەدەم، بەزمان دەڵێمو بەدڵ باوەڕدەکەم: کە هەر خودای تاکو تەنیا خودایەو خودای تر نییە، وەشایەتی دەدەم بەهەمان شێوە: کە موحەممەد هەم بەندەی خوداو هەم پێغەمبەری خودایە).

چونکە هەرکەسێ ئەم وشەیە ئاوا بڵێو لەسەر ئەم شێوە درووود بنێرێو سلاو بکا، ئەوە سلاوەکەی بەر هەموو بەندەیەکی باشی خودا دەکەوێ، ئیتر ئەو بەندەیە خوای لەزەویدا بێ، وەخوای لە ئاسماندا بێ، ئەو سلاوو درووودە هەر دەیگرێتەوە، ئەنجا با بەئارەزووی خۆی بپاڕێتەوە، بۆ خۆی حەزی لەچی بێ، لەخودا داوا بکات). {تاج/١، زنجیرە: ٧٢، ژمارە: ٤٨٠} :

تائێرە (متفق علیە)یە، ئەمەیش لەفظی بوخاری بوو.

نەسائیش لەئیبنو مەسعوودەوە، ئاوا دەیگێڕێتەوە:

ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خوودای لێ بێ) فەرمووی: لەپێش ئەوەدا کەتەحیات پێویست بکرێ لەسەرمان، دەمانگوت: سڵاو لەخودا، سڵاو لە جوبرائیلو میکائیل، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (وا مەڵێن، بەڵام بڵێن: (التحياتُ لِلهِ... تادوایی).

ئەحمەدیش لەئیبنو مەسعوودەوە دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فێری تەحیاتی کردم، وەفەرمانی پێم کرد: کەفێری خەڵکانیشی بکەم).

## (١٧) باب: الصلاة على النبي صلى الله عليه وسلم بعد التشهد
## سەڵاواتو درووود لەسەر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەناو تەحیاتا، لەپاش شایەتمانەوە

٢٢٧- حديث كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ عن عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي لَيْلَى قَالَ: لَقِيَنِي كَعْبُ بْنُ عُجْرَةَ فَقَالَ أَلاَ أُهْدِي لَكَ هَدِيَّةً سَمِعْتُهَا مِنَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَقُلْتُ بَلَى ، فَأَهْدِهَا لِي . فَقَالَ سَأَلْنَا رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ الصَّلاَةُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الْبَيْتِ فَإِنَّ اللَّهَ قَدْ عَلَّمَنَا كَيْفَ نُسَلِّمُ . قَالَ « قُولُوا اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ ، وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ»: [٢٢٧]

کەعبی کوڕی عوجرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گوترا : ئەی پێغەمبەری خودا ؛ئێمە دەزانین سەلام لەدیاری تۆ بدەین، وەك ئەوەی لەتەحیاتا دەڵێین : (السلام عليك ايها النبيُّ ورحمة الله وبركاته) بەلام نازانین

---

[٢٢٧] تجرید/٤، ژمارە: ١٦٨٤، بخاری: ٤٧٩٧، مسلم: ٤٠٦ + شەرحی بلوغ المرام/١، ژمارە: ٣٣٦.




سەلاوات لەسەر تۆ چۆن دەدرێ؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: بڵێن: (اللّٰهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى الِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى الِ ابْرَاهِيمَ انَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ اللّٰهُمَّ بارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى الِ مُحَمَّدٍ كَمَا بارَكْتَ عَلَى ابْرَاهِيمَ وَعَلَى الِ ابْرَاهِيمَ انَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ) ئەی خودایە! بڕژێنە ڕەحمەت ومیهرەبانی بەسەر گیانی موحەممەد وبەسەر گیانی کەس وکاری موحەممەددا، هەروەك چۆن ڕەحمەت ومیهرەبانیت ڕژاندووە بەسەر ئیبراهیم وکەسو کاری ئیبراهیم دا، بەڕاستی تۆ خاوەنی سوپاسیت وشکۆ مەندیت، خودایە !پیت وفەڕ بڕێژە بەسەر گیانی موحەممەد وبەسەر گیانی کەس وکاری موحەممەدا هەروەك چۆن پیت وفەڕت ڕژاندووە بەسە رخانەوادەی ئیبراهیم دا، بەڕاستی تۆ سوپاسکراو وشکۆمەندی). (تاج/٧ ل/١٠٠ ژ/١٨ ز/١٦- سوورەتی ئەحزاب).

{پوختەی موسلیم ٣٠٩ = ٩٠٦ مسلم شیحا = مسلم ٤٠٥. تجریدی بوخاری/٤، ژمارە: ١٦٨٥ = ٤٧٩٨، ٦٣٥٨ فتح الباری شرح صحیح البخاری}:

له پوختەی موسلیما ئاوایە:

ئەبو مەسعوودی بەدری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەدیوەخانەکەی سەعدی کوڕی عوبادە، لەلای دانیشتبووین، حەزرەت (درووودی خودای لەسەر بێ) هات بۆلامان، بەشیری کوڕی سەعد پێی فەرموو: قووربان! ئەی پیغەمبەری خودا! خودای گەورەو سەرومر، فەرمانی پێمان کردووە کە صەڵاوات لەسەر تۆ بدەین، لەم ئایەتەدا پێمان دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا – الأحزاب/٥٦}.

باشە چۆن چۆنی صەڵاواتت لەسەر بدەین؟

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) تاوێ مات بوو، بێ دەنگییەکەی وا درێژەی کێشا، تەنانەت گوتمان: خۆزگە ئەم پرسیارەی لێ نەدەکرد، نەبادا لەو جۆرە پرسیارانە بێ، کە لەم ئایەتەدا نەهیان لێ کراوە: {لاَ تَسْأَلُواْ عَنْ أَشْيَاء إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ – المائدة/١٠١} . واتە:

پرسیار لەهەندی شت مەکەن، ئەگەر روون بکرێتەوە بۆتان دەبن بەمایەی نیگەرانی بۆتان!).

جا لەپاش ماوەیێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نیگاو سرووشی بۆ هاتو فەرمووی: (بلێن: «اللّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، فِي العَالَمِين، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ»).

ئەنجا فەرمووی: (ئەمە یەکێکە لەشێوە نایابەکانی سەلاواتدان لەسەرمن، لەکۆتایی تەحیاتا، وەشێوەی سلاوکردنیش لەمن، وەك لەتەحیاتا فێرکراون ئاوایە: بلێن: السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللّهِ وَبَرَكَاتُهُ: سلاو و دروودو سۆزو میهرەبانی‌و پیت‌و فەڕو پیرۆزیی خودا لەسەر تۆ ئەی پێغەمبەری خودا!).

**روونکردنەوە:**

١- لەهەندێ گێڕانەوەدا، کە لە فەتحولولهیمدا ئاماژەی بۆدەکا، دەفەرموێ: (فَسَكَتَ حَتَّى جَاءَهُ الوَحْيُ).

٢- ئەم فەرموودەیە لە شەرحی صەحیحی موسلیمدا، پێشەوا نەوەوی (رەحمەتی خودای لێ بێ) لەژێر ئەم سەرباسەدا دایناوە، یا ئەم سەرباسەی بۆیداناوە: (بَابٌ: الصَّلاَةُ عَلَى النَّبِيِّ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم بَعْدَ التَّشَهُّدِ).

٣- بەپێی ڕاڤەنامە (شەرحە) گەورەکان، مەبەست لەم فەرموودەیە، بەم وەرگێڕانە، تەواو ڕوون دەبێتەوە، کە ئەوەیش مەبەستی سەرەکی بەندەیە، کە بەباشی لەمەبەستو ناوەڕۆکی فەرموودەکان تێ بگەین، تا سوودیان بەکردە لێ وەربگرین.

٤- مەبەست لەم ئایەتە کە دەفەرموێ: {لاَ تَسْأَلُواْ عَنْ أَشْيَاء} ئەو جۆرە پرسو داوایانەیە، کە جەخت لەسەر هەندێ پرسیاری وا بکرێ، کە سەردەکێشێ بۆ کارگرانیو بارگرانی گەلی ئیسلام، وەك ئەوە کە حەج فەرزبوو، لەسەر موسوڵمانان، هەندێ کەس عەرزی حەزرەتیان کرد: ئایا هەموو ساڵێ حەج فەرزە لەسەرمان؟ پێغەمبەریش وەڵامی نەدایەوە، سوراقە سێجار پرسیارەکەی لێ دووبارە کردەوە، ئەویش فەرمووی: (نەء، هەموو ساڵێ فەرزنییە، لەتەمەنا یەکجار فەرزە، وەلێ: نەدەبوو ئاوا وڕك لەم پرسیارە بگری، خۆ ئەگەر بمگوتبایە ئا هەموو ساڵێ فەرزە، فەرزدەبوو لەسەرتان، وە لەتواناشتانا نەبوو، کەمن بێ دەنگبووم ئێوەیش بێ دەنگ بن).

٥- لەکاتی بانگکردندا، صەڵاوات لەسەر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نادرێ، بۆ نموونە: کە کەسێ دەڵێ: (ئەی پیغەمبەری خودا!) یا (یا رەسولەڵڵا) یا (ئەی محمد!) باش نییە، کە لەدوای ئەم جۆرە بانگکردنو نیدائانەوە بگوترێ: (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم). ئێستا هەندێ کەس پەیدابوون، لەم کاتو شوێنانەدا صەڵاوات لەدیاری پێغەمبەر دەدەن، شتی وا لەپێشینانی ئەم نەتەوەی ئیسلامەدا نەبیستراوە، بەتایبەتی لەپەڕاوە ناودارەکانی فەرموودەداو لە زانایانی فەرموودەوە.

٦- ئەبو مەسعوودی بەدری، ناوی عوقبەی کوڕی عەمرە، ئەنصارییە، خەزرەجییە، بەدرییە، لەگەڵ حەفتا کەسەکەدا، بەکۆی دەنگ ئامادەی پەیمانی

عەقەبە بووە، لەوکاتەدا لەهەموویان بەتەمەن بچووکتر بووە، ئامادەی جەنگی ئوحــودو نەبــەردەکانی دوای ئوحــود بــووە، ســەدو دوو فــەرموودەی لــە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، لەبوخاریدا (١٠) دە فەرموودەی هەیە، لە موسلیمدا (١٦) شازدەی هەیە، (٩) نۆیان پەسەندی هەردوولایانن، واتە: بوخاریو موسلیم ئەو نۆیەیان گێڕاوەتەوە، کۆی فەرموودەکانی لەبوخاریو موسلیمدا یەکسانە بە (٩+١+٧ = ١٧) حەڤدە فەرموودە.

### بۆ ڕاهێنان ئەم کردارە ژمارەییە، شیی دەکەینەوە:

١- پەسەندی هەردوولا (٩) نۆیە.

٢- بوخاری (١٠) دەی هەیە (٩) نۆکەی لێ دەرکە، ئاوا (١٠ - ٩ = ١) واتە: یەك فەرموودەی لە ئەفرادی بوخارییە لەم دە فەرمووددەیە، ئەو نۆکەی تریان، موسلمیش گێڕاویەتەوە.

٣- موسلیم (١٦) شازدەی هەیە (٩) نۆکەی لێ دەرکە، ئاوا: (١٦ — ٩ = ٧) واتە: حەوت فەرموودەی لەئەفرادی موسلیمە.

٤- جا پاش ئەوە کەزانیمان چەند پەسەندی هەردوو لایانەو چەند لە ئەفرادی بوخارییە، یا لەئەفرادی موسلیمە، پەسەندەکەو هەردوو ئەندازە ئەفرادەکە کۆدەکەینەوە، سەرجەمی فەرموودەکانی ئەو کەسە لە صەحیحەیندا دەردەکەوێ، لێرەدا ئاوا: (٩+١+٧ = ١٧) حەڤدە فەرموودە، سەرجەمی فەرموودەکانی ئەبو مەسعوودی بەدری لە بوخاریو موسلیمدا.

ئەبو مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) لەلایەنگیرانی عەلی بوو، لە کووفە نیشتەجێ بوو، هەرلەوێش مردووە، (ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لەهەموو هاوەڵان بێ).

**٧- دانـەری بلـوغ المـرام مامۆسـتای گـەورەو سـەروەر شـێخی عەسـقەلانی لەکۆتاوە دەفەرموێ: (موسلیم گێڕاویەتەوە، هەروا ئیبنـو خوزەیمـە لەگـەڵ ئـەم زیادەیەدا: (باشە چۆن چۆنی صەڵاواتت لەسـەربدەین، کاتـێ لـەناو نوێـژەکانمانا، صەڵاواتت لێ بدەین؟).**

**٢٢٨- عَنْ ابي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيُّ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّهُمْ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللّٰهِ كَيْـفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ): (قُولُـوا: اللّٰهُـمَّ صَـلِّ عَلَـى مُحَمَّدٍ وَازْوَاجِهِ وَذُرِّيَتِهِ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَـى الِ ابْـرَاهِيمَ وَبَـارِكْ عَلَـى مُحَمَّـدٍ وَازْوَاجِـهِ وَذُرِّيَتِهِ كَمَا بارَكْتَ عَلَى الِ ابْرَاهِيمَ انَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ).[٢٢٨]**

**ئـەبو حومەیـدی سـاعیدی (ڕەزای خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: عـەرزی حەزرەتیان کرد: چۆن چۆنی درووودت لە دیدار بدەین؟ فەرمووی: بڵێن: (اللّٰهُـمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَازْوَاجِهِ وَذُرِّيَتِهِ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَـى الِ ابْـرَاهِيمَ وَبَـارِكْ عَلَـى مُحَمَّـدٍ وَازْوَاجِهِ وَذُرِّيَتِهِ كَمَا بارَكْتَ عَلَى الِ ابْرَاهِيمَ انَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ).**

**واتـە: ئـەی خودایـە! بڕژێنـە میهرەبـانی و ڕەحمـەت بـۆ سـەرموحەممەدو کەس وکاری موحەممەد، وەك ئەو میهرەبانی و ڕەحمەتەی کەڕژاندووتە بەسەر ئیـبراهیم و کـەس وکـاری ئیـبراهیم دا، وەپیـتو فەڕوبەرکـەت بڕژێنـە بەسەر موحەممەدو بنماڵەی موحەممـەددا وەك ئـەو پیتو فـەڕو بەرەکەتـەی کـە ڕژاندووتـە بەسـەر ئیـبراهیم و بنەماڵـەی ئیـبراهیم دا، بەڕاسـتی تـۆ ئـەی خودایـە! شایـستەی هـەموو سـوپاس و ستایـشێکیت، وەخودایـەکی گـەلێ گـەورەو پیرۆزیت (تاج/١ ل/٢٥٤ ز/٧٢ ف/١٣ باسی بنیات (روکن)ەکانی نوێژ+ تاج/٩ ل/٢٤٤ ز/٨٨ ف/١ - باسـی صـەلاوتدان لەدیـداری پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر) + ریاض/٣ ل/١٠٠٩ ف/١١- باسی نامەی سەلاواتدان لەدیداری پێغەمبەر).**

---

[٢٢٨] تجريد/٤، ژمارە: ١٣٥٣، بخاری: ٣٢٦٩، مسلم: ٤٠٧ = شيحا: ٩١٠.

## (١٨) باب: التسميع والتحميد والتأمين

## باسی کردنی (سمع الله) و (الحمد لله) و ئامین کردن

٢٢٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إذا قَالَ الْإِمَامُ سَمْعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَ فَقُلوا: اللهّ رَبَّنا لَكَ الحَمدُ فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ قَوْلُـهُ قَـوْلَ الْمَلَائِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذنْبِهِ).[٢٢٩]

**ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتی پێشنوێژ گوتی (سمع الله لمن حمدة) ئێوەیش بڵێن: (أللهم ربنا ولك الحمد) چونکە فریشتەکانیش وەك ئێوە لەم کاتەدا وادەڵێن، دەی هەرکەسێ بۆی رێ بکەوێ لەگەڵ ئەوانا ئەم وشەپیرۆزمیە بڵێ خودا لەگوناهی لەومبەری خۆش دەبێ). (ت/١/٣/٢٧٤ ز-٨٤ ز-٥٢٥ = ش/د/ ت/ ن).**

### ڕوونکردنەوە:

**هەرکەسێ سوورەتی فاتیحا بخوێنێ، لەنوێژدا یالەکاتی تـرا، سـوننەتە ئامین بکا، سوننەتە بۆ خەڵکی تریش ئامین بکەن، چ لەناونوێژدابن، چ لەناو نوێژدا نەبن بەڵام بۆکەسێ لەناو نوێژدابێ راجیایی تیادایە، هەندێ لەزاناکان دەفەرموون هەر لەگەڵ پێشنوێژی خۆیدا سوننەتەو بەس. لەسەر ئەم بنیاتە (سمع الله لمن حمده ربنا ولك الحمد) یش ئاوایە.**

٢٣٠- عَنْ أَبِی هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « إِذَا أَمَّنَ الإِمَامُ فَأَمِّنُوا، فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلاَئِكَةِ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ. قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: « آمِينَ».[٢٣٠]

---

[٢٢٩] تجريد/١، البخاري: ٧٩٦، مسلم: ٤٠٩ - ٩١٢، ترقيم شيحا.

ئەمە دەقی ژمارە (٢٨٤)ی پوختەی موسلیمە:

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەری خـودا (دروودی خـودای لەسـەر بێ) دەفـەرموێ: (کاتێ پـێش نوێـژ لـەپاش خوێنـدنی فاتیحا، بە دەنگی بەرز دەڵێ: ئامین، ئێوەیش لەگەڵ ئەودا بڵێن ئـامین، چونکە فریشتە لەم کاتەدا دەڵێن ئامین، هەر کەسێـکیش بۆی ڕێ بکەوێ، لەگـەڵ ئـامین کردنی فریشتەکاندا ئامین بکـا، خـودای گـەورە لـە گونـاهی لـەوەو پێشی خۆش دەبێ).

ئیبنـو شـیهاب دەفـەرموێ: پێغەمبـەر خـۆی (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـەپاش (وَلاَ الـضَّالِّين) دەیفـەرموو: (ئـامین). {تـاج/١، لاپـەڕە: ٢٦٢، زنجـیرە: ٧٦، چاپی/١، ژمارە: ٤٩٧ و ٤٩٨ و ٤٩٩}.

گێڕانەوەی ئێرە ئاوایە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (کاتێ کەسێ لەئێوە لەدوا خوێندنی سوورەتی فاتیحە بڵێ ئامین.... تادوایی).

٢٣١- حديث أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رسول الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « إِذَا قَالَ الإِمَامُ ( غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ ) فَقُولُوا آمِينَ . فَإِنَّهُ مَنْ وَافَـقَ قَوْلُـهُ قَـوْلَ الْمَلاَئِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»: [٢٣١]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لـێ بێ) فەرمووی: حـەزرەت (دروودی خـودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ پێشنوێژ لـەپاش خوێنـدنی فاتیحا بـەدەنگی بـەرز دەڵـێ ئـامین، ئێـوەیش بڵێن ئـامین چونکە فریـشتە لـەم کاتـەدا دەڵێن ئـامین، هەرکەسێکیش بۆی ڕێ بکەوێ، لەگەڵ ئـامین کردنـی فریـشتەکان دا ئـامین بکـا،

---

[٢٣٠] مسلم ترقيم شيحا: ٩١٧، بخاری: ٧٨٠، ٧٨١ + تجريد/٤٢٤، مختصر صحيح مـسلم/١، ژمـارە: ٢٨٤.

[٢٣١] تجريد/١، ژمارە: ٤٢٤، بخاری: ٧٨٠، مسلم: ٤١٠ = ٩١٤.

خـوداى گـەورە لـەگوناهى لەوەبـەرى خـۆش دەبـێ). (ت/١/٢٦٢/١ ز-٦ ژ-٤٩٧ چ-٤ =ش/د/ ت/ ن).

## (١٩) باب: ائتمام المأموم بالإمام
## دەبێ پاشنوێژ پەیڕەوى پێشنوێژ بكا

٢٣٢- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَقَطَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ فَرَسٍ فَجُحِشَ شِقُّهُ الأَيْمَنُ، فَدَخَلْنَا عَلَيْهِ نَعُودُهُ، فَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ، فَصَلَّى بِنَا قَاعِدًا فَصَلَّيْنَا وَرَاءَهُ قُعُودًا، فَلَمَّا قَضَى الصَّلاَةَ قَالَ: إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا، وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا، وَإِذَا قَالَ: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) فَقُولُوا: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ) وَإِذَا صَلَّى قَاعِدًا فَصَلُّوا قُعُودًا أَجْمَعِينَ».[٢٣٢]

ئەنەسى كوڕى مالیك (ڕەزاى خوداى لەسەر بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) لە وڵاخێكى بەرزە بەرەوە بوو، لاى ڕاستى ڕووشا، بەم بۆنەیەوە چووین بۆ سەردانى، بۆ هەواڵپرسى، لە خزمەتیداماینەوە هەتا نوێژ بوو، جا بە دانیشتنەوە بەرنوێژییەكەى بۆمان كرد، ئێمەیش لە پشتیەوە، بەدانیشتنەوە بە جەماعەت نوێژمان كرد، كاتێ بەر نوێژییەكەى بۆمان تەواو كرد، فەرمووى: (بەرنوێژ (ئیمام) بۆ ئەوە كراوە بە بەرنوێژ كە پەیڕەوى بكرێ‌و، چاوى لێ بكرێ، جا كە ئەو گوتى ئەڵلاهو ئەكبەر، ئێوەیش بڵێن ئەڵلاهو ئەكبەر، هەتا ئەو نەڵێ ئەڵلاهو ئەكبەر، ئێوە مەڵێن ئەڵلاهو ئەكبەر، كە ئەو كوڕنووشى برد ئێوەیش كوڕنووش بەرن، وە هەتا ئەو كوڕنووش نەبا ئێوە كوڕنووش مەبەن، ئەگەر ئەو سەرى بەرزكردەوە لە چەمینەوە، یا لە كوڕنووش ئێوەیش دوا بەدواى ئەو سەر بەرزبكەنەوە، كاتێ دەڵێ: (سَمِعَ اللَّهُ

---

[٢٣٢] مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٢٧٦ = شیحا: ٩٢٠، بخارى: ٨٠٥.

لَمِنْ حَمِدَهُ) ئێوه بڵێن: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ) وه كاتێ پێش نوێژ لەبەر هۆیەكی رەوا، وەك نەخۆشیو شتی وا، بە دانیشتنەوە نوێژی كرد، ئێوەیش چاو لەو بكەنو ئەو بكەن بەسەر مەشقو بە دانیشتنەوە جەماعەتەكەتان بكەن، هەمووتان وەك ئەو بكەن). {تاج/١، لاپەڕە: ٣٨١، زنجیرە: ١٣٠، چاپی/١، ژمارە: ٧٧٧/١ و ٧٧٨/٢ و ٧٧٩/٣}.

**ڕوونكردنەوە:**

١- بەپێی ئەم فەرموودەیەو چەند فەرموودەیەكی تری ساخ، كۆمەڵێ بڕیاری فیقهی دەردەكەون، وەك پەیڕەویی پاش نوێژ بۆ پێش نوێژ لە تەكبیرو هەڵسانو وەستانو دانیشتنو چەمینەوەو كوڕنووشا، هەروا لە سلاودانەوەدا، لەدوو شتا ئەگەر پاش نوێژ لە پێش نوێژ پێش بكەوێ، نوێژەكەی پووچو بەتاڵە، لە ئەڵلاهو ئەكبەری نوێژ دابەستنو لە سلاودانەوەدا، لەوانی تردا ئەگەر پێشی بكەوێ كاری نابەجای كردووە، وەڵێ نوێژەكەی دروستە.

دوا كاری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتە سەر ئەوە، ئەگەر پێش نوێژ بە دانیشتنەوە نوێژی كرد، پاش نوێژ بە پێوە نوێژ بكا، جەماوەری زانایان دەفەرموون: لە نوێژی فەرزا، چی بۆ پێش نوێژ، چی بۆ پاش نوێژ، چی بە تەنیا، چی لە جەماعەتا، بۆ كەسێ بتوانێ بە پێوە نوێژ بكا، دروست نییە كە لەكاتی قیامو راوەستانا بە دانیشتنەوە نوێژ بكا. بەڵام بۆ نوێژی سوننەت نوێژكەر ئاغای خۆیەتی، چۆن حەز دەكا بۆی هەیە ئاوا نوێژ بكا. كۆمەڵێ زانا دەفەرموون: (توانا ئەگەر بە دانیشتنەوە نوێژی سوننەت بكا، نیوەی خێری راوەستاوی هەیە).

٢٣٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: (صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي بَيْتِهِ وَهُوَ شَاكٍ فَصَلَّى جَالِسًا وَصَلَّى وَرَاءَهُ قَوْمٌ قِيَامًا فَأَشَارَ إِلَيْهِمْ أَنْ اجْلِسُوا

فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ إِنَّمَا جُعِلَ الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ فَإِذا رَكَعَ فَارْكَعُوا وَإِذا رَفَعَ فَارْفَعُوا، وإذا صلى جالساً فَصَلوا جلوساً). (٢٣٣)

دیسان عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەسواری ئەسپێ گلا، سكالای لەدەست ئەم حالەبوو، لەماڵەكەی مندا بەرنوێژی بۆكۆمەڵێ لەیارانی كرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی بەدانیشتنەوە نوێژی دەكرد، كۆمەڵەكەیش لەپشتیەوە بەپێوە وەستان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاماژەی بۆكردن: (كەئێوەیش دانیشن) جاكاتێ لەنوێژەكەی لێ بۆوە فەرمووی: (پێشنوێژ بۆیە كراوە بەپێشنوێژ هەتا بكرێ بەپێشەواو سەرمەشقو چاوی لێ بكرێ، كەواتە هەركاتێ پێشنوێژ چووبۆ چەمینەوەو روكوعی برد، ئێوەیش یەكسەر بچەمێنەوەو روكوع ببەن، وەهەركاتێ ئەو لەچەمینەوە یالەكڕنووش سەر بەرزەوە دەكا ئێوەیش بەشوێن ئەودا سەر بەرزەوە بكەن، وەهەركاتێ ئەوبەدانیشتنەوە نوێژی كرد ئێوەیش بەدانیشتنەوە نوێژبكەن) (ت/١/١/٣٩٠ = ز-١٣٠ ژ-٧٧٧ ج-٤).

٢٣٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ – صلى الله عليه وسلم – « إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا ، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا ، وَإِذَا قَالَ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ . فَقُولُوا رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ . وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا ، وَإِذَا صَلَّى جَالِسًا فَصَلُّوا جُلُوسًا أَجْمَعُونَ». (٢٣٤)

واتاكەی بەتەواوی لەژمارە (٢٣٢) و (٢٣٣)دا رۆیشت بەتەواوی.

---

(٢٣٣) تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٣٨٧، بخاری: ٦٨٨، مسلم: ٤١٢، ٦٢٠ شیحا.

(٢٣٤) بخاری: ٧٣٤، مسلم: ٩٢٩، ٩٣٠.

## (٢١) باب: إستخلاف الإمام عرض له عذر من مرض وسفر وغيرهما من يصلي بالناس

## دروسته پێشنوێژ لەکاتی پێویستا، جێنشین بۆخۆی دابنێ، تا پێشنوێژی بۆ نوێژخوێنەکان بکات

٢٣٥- عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عنها) فَقُلْتُ لَهَا: أَلاَ تُحَدِّثِينِي عَنْ مَرَضِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ قَالَتْ: بَلَى، ثَقُلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ: أَصَلَّى النَّاسُ؟ قُلْنَا: لاَ، هُمْ يَنْتَظِرُونَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: « ضَعُوا لِي مَاءً فِي الْمِخْضَبِ، فَفَعَلْنَا، فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ ذَهَبَ لِيَنُوءَ، فَأُغْمِيَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَفَاقَ، فَقَالَ: أَصَلَّى النَّاسُ؟ قُلْنَا: لاَ، وَهُمْ يَنْتَظِرُونَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ: ضَعُوا لِي مَاءً فِي الْمِخْضَبِ، فَفَعَلْنَا، فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ ذَهَبَ لِيَنُوءَ، فَأُغْمِيَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَفَاقَ، فَقَالَ: أَصَلَّى النَّاسُ؟ قُلْنَا: لاَ، وَهُمْ يَنْتَظِرُونَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ: ضَعُوا لِي مَاءً فِي الْمِخْضَبِ، فَفَعَلْنَا، فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ ذَهَبَ لِيَنُوءَ، فَأُغْمِيَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَفَاقَ، فَقَالَ: أَصَلَّى النَّاسُ؟ فَقُلْنَا: لاَ، وَهُمْ يَنْتَظِرُونَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَتْ: وَالنَّاسُ عُكُوفٌ فِي الْمَسْجِدِ، يَنْتَظِرُونَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِصَلاَةِ الْعِشَاءِ الآخِرَةِ، قَالَتْ: فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى أَبِي بَكْرٍ أَنْ يُصَلِّيَ بِالنَّاسِ، فَأَتَاهُ الرَّسُولُ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَأْمُرُكَ أَنْ تُصَلِّيَ بِالنَّاسِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ وَكَانَ رَجُلاً رَقِيقًا: يَا عُمَرُ صَلِّ بِالنَّاسِ، فَقَالَ عُمَرُ: أَنْتَ أَحَقُّ بِذَلِكَ. قَالَتْ: فَصَلَّى بِهِمْ أَبُو بَكْرٍ تِلْكَ الأَيَّامَ. ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَجَدَ مِنْ نَفْسِهِ خِفَّةً فَخَرَجَ بَيْنَ رَجُلَيْنِ أَحَدُهُمَا الْعَبَّاسُ، لِصَلاَةِ الظُّهْرِ، وَأَبُو بَكْرٍ يُصَلِّي بِالنَّاسِ، فَلَمَّا رَآهُ أَبُو بَكْرٍ ذَهَبَ لِيَتَأَخَّرَ، فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ لاَ يَتَأَخَّرَ، وَقَالَ لَهُمَا: أَجْلِسَانِي إِلَى جَنْبِهِ،، فَأَجْلَسَاهُ إِلَى جَنْبِ أَبِي بَكْرٍ وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ يُصَلِّي وَهُوَ قَائِمٌ بِصَلاَةِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَالنَّاسُ يُصَلُّونَ بِصَلاَةِ أَبِي بَكْرٍ، وَالنَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَاعِدٌ. قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: فَدَخَلْتُ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ فَقُلْتُ

لَهُ: ألاَ أعْرِضُ عَلَيْكَ مَا حَدَّثَتْنِي عَائِشَةُ عَنْ مَرَضِ النبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ قَالَ: هَاتِ، فَعَرَضْتُ حَدِيثَهَا عَلَيْهِ، فَمَا أنْكَرَ مِنْهُ شَيْئًا، غَيْرَ أنَّهُ قَالَ: أسَمَّتْ لَكَ الرَّجُلَ الَّذِي كَانَ مَعَ الْعَبَّاسِ؟ قُلْتُ: لاَ، قَالَ: هُوَ عَلِيٌّ).[٢٣٥]

عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا فەرمووی: چووم بۆ خزمەتی عائیشە، (ڕەزای خودای لێ بێ) عەرزیم کرد: نافەرمووی کە باسی نەخۆشییەکەی سەرەمەرگی پێغەمبەرم بۆ بکەی؟ فەرمووی: بەڵێ باشە، بەچەند ڕۆژێ لە پێش مەرگی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) کاتێ نەخۆشینەکەی قورس بوو، جارێ موسوڵمانان لە مزگەوت کۆبوو بوونەوە، بۆ جەماعەتی نوێژی خەوتنان، حەزرەت (درودی خودای لێ بێ) فەرمووی پێمان: (ئەرێ موسوڵمانەکان نوێژیان کرد؟). گوتمان: نەء، ئەی پێغەمبەری خودا! چاوەڕوانی تۆیانە کە بەر نوێژییەکەیان بۆ بکەی. فەرمووی: (لە سوێنەیەکا ئاو بکەن بەسەرما، لە حەوت کوندە کە دەمبێنەکەیان نەکرابێتەوە). عائیشە فەرمووی: ئێمەیش وامان کرد، کە خۆی شۆرد، ئەزنەکی دا هەڵسێ، بەڵام نەیتوانیو بوورایەوە، کە هۆشی هاتەوە فەرموویەوە: (ئەرێ مەردوم نوێژەکەیان کرد؟). عەرزمان کردەوە: نەء، ئەی پێغەمبەری خودا! چاوەڕوانی تۆیانە کە نوێژەکەیان بۆ بکەی. فەرموویەوە: (لە سوێنەیەکا ئاو بکەن بەسەرما). عائیشە فەرمووی: جا لەناو سوێنەکەدا دانیشت، دیسان کە خۆی شۆرد ئەزنەکی دا، ویستی هەڵسێ، بەڵام نەیتوانیو دیسانەوە بوورایەوە، لەپاش کەمێ کە هۆشی هاتەوە، هەمدیسان فەرموویەوە: (ئەرێ خەڵکەکە نوێژەکەیان کرد؟) عەرزمان کردەوە: نەء، ئەی پێغەمبەری خودا! چاوەڕوانی تۆیانە کە خۆت بەر

---

[٢٣٥] تجرید/١، ژمارە: ٣٨٦، بخاری: ٦٨٧، مختصر صحیح مسلم/ ژمارە: ٣١٩ - مسلم: ٤١٨ = ٩٣٥ شیحا.

نوێژییەکەیان بۆ بکەی. فەرموویەوە: (لە سوێنەیەکا ئاو بکەن بەسەرما) جا لەناو سوێنەکەدا دانیشت، هەمدیسانەوە کە خۆی شۆرد ئەزنەکی دایەوە، کە هەڵسیٚو بچیٚ بۆ مزگەوت، پێش نوێژییەکە بۆ خەڵکەکە بکا، بەڵام نەیتوانیو هەمدیس بوورایەوە، لەپاشتر کە هۆشی هاتەوە دیسان فەرموویەوە: (ئەریٚ مەردوم نوێژیان کرد یانا؟) عەرزمان کردەوە: نەخێر هێشتا نوێژیان نەکردووە، لە مزگەوت گلێر بوونەتەوە، هەر چاوەنواڕی تۆیانە کە تەشریفت بچیٚ بەر نوێژییەکەی خەوتنیان بۆ بکەی.

عائیشە فەرمووی: ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) فروستادمیەکی نارد بۆ لای ئەبوبەکر، کە پێش نوێژیی بۆ موسوڵمانان بکا، کاتیٚ فروستادەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) فەرمانەکەی پێغەمبەری بە ئەبوبەکر ڕاگەیاند، ئەبوبەکر پیاوێکی دڵ نەرم بوو، لەبەرئەوە بە عومەری کوڕی خەتابی فەرموو: ئەی عومەر! تۆ جەماعەتەکە بۆ موسوڵمانان بکە، عومەریش پێی فەرموو: تۆ شایانتری بۆ ئەمە جا ئەبوبەکر ئەو چەند ڕۆژە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) نەخۆشییەکەی گران بوو، جەماعەتی بۆ موسوڵمانان دەکرد، هەتا ڕۆژیٚ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) کەمیٚ لەشی سووك بوو، ڕۆیشت بۆ مزگەوت، دوو پیاو چووبوونە ژێر هەردوو باڵی، یەکێکیان عەباسی مامەی بوو، بەلارە لارە بردیان، دەڵێی ئێستایش هەروا لەبەرچاوم کە چۆن چۆنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) لەبەر ئازاری نەخۆشیەکەی هەردوو پێی بەسەر زەوییەکەدا بە خشکە بەکێش دەکرد، کاتی نوێژی نیوەڕۆ بوو، ئەبوبەکر خەریکبوو پێش نوێژی بۆ خەڵکەکە دەکرد، کاتیٚ ئەبوبەکر هەستی پیٚ کردو بینی کەوا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) تەشریفی هێنا، ویستی جێگەکەی بۆ چۆڵ بکاو خۆی بچێتە دواوە، بەڵام

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاماژەی بۆیکرد: وەزع لەخۆت تێك مەدەو خەریکی کاری خۆت بە). وە بەدوو پیاوەکەی ژێر باڵەکانی فەرموو: (لە تەنیشتی ئەبوبەکرەوە دامنیشێنن، ئەوانیش بردیان، رێك لە ئاستی ئەبوبەکر، لەلای چەپیەوە، لە تەنیشتیەوە دایان نیشان، دانیشتو دەستی کرد بە نوێژ کردن، ئیتر ئەبوبەکر بۆ نوێژی خۆی پەیڕەوی پێغەمبەری دەکردو، خەڵکەکەی تریش پەیڕەوی ئەبوبەکریان دەکرد، ئەبوبەکرو خەڵکەکە بەپێوە نوێژیان دەکرد، پێغەمبەریش بە دانیشتنەوە.

عوبەیدوڵڵا دەفەرموێ: چووم بۆ خزمەتی عەبدوڵڵای کوڕی عەباس، پێم گوت: ئەگەر ئارەزوو دەکەی ئەو فەرموودە یەت بۆ دەوردەکەمەوە، کە عائیشە فەرمووی پێم، سەبارەت بە نەخۆشییەکەی سەرە مەرگی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)؟ فەرمووی: ئادەی فەرموو، منیش فەرموودەکەی عائیشەم بۆ دەور کردەوە، هیچی لێ رەت نەکردەوە، بەڵام گوتی: ئایا ناوی پیاوەکەی تری پێ گوتیت، کە لەگەڵ عەباسی مامەی چوو بوونە ژێر باڵی؟ گوتم: نەء، فەرمووی: عەلی کوڕی ئەبو طالیب بوو (رەزای خودای لێ بێ). (بڕوانە: تەجرید ژمارە: ٣٨٤، ٣٨٣، ٣٧٧ + تاج/١/٤٠٦، چاپی/١، ژمارە: ٨١٤، ٨١٥، ٨١٦، زنجیرە: ١٣٨، چاپی/٢).

٢٣٦- عنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: (لَمَّا ثقُلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَاشْتَدَّ بِهِ وَجَعُهُ اسْتَأْذنَ أَزْوَاجَهُ فِي أَنْ يُمَرَّض فِي بَيْتِي فَأَذنَّ لَهُ فَخرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَ رَجُلَيْنِ تَخُط رِجْلَاهُ فِي الْأَرْض بَيْنَ عَبَّاسٍ وَرَجُلٍ آخرَ قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ فَأَخْبَرْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ فَقَالَ أَتَدْرِي مَنْ الرَّجُلُ الْآخرُ قُلْتُ لَا قَالَ هُوَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ رَضيَ اللَّهُ عَنْهُ وَكَانَتْ عَائِشَةُ رَضيَ اللَّهُ عَنْهَا تُحَدِّث أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ بَعْدَمَا دَخَلَ بَيْتَهُ وَاشْتَدَّ وَجَعُهُ: هَرِيقُوا عَلَيَّ مِنْ سَبْعِ قِرَبٍ لَمْ تُحْلَلْ أَوْكِيَتُهُنَّ لَعَلِّي أَعْهَدُ إِلَى النَّاسِ وَأُجْلِسَ فِي مِخْضبٍ لِحَفْصَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثمَّ طفِقْنَا نَصُبُّ عَلَيْهِ تِلْكَ حَتَّى طفِقَ يُشِيرُ إِلَيْنَا أَنْ قَدْ فَعَلْتُنَّ ثمَّ خَرَجَ إِلَى النَّاسِ). [٢٣٦]

عائيشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ نەخۆشینەکەی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) قورس بوو، بەچەند ڕۆژێ لەپێش مەرگیدا، ڕوخسەتی لەهاوسەرەکانی خواست، کەلەماڵی من بمێنێتەوەو، لەوێ خزمەت بکرێ، ئەوانیش ڕێگەی ئەوەیان پێ دا، جا ڕۆژێ نەخۆشینەکەی کەشەنگ بوو، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (لەحەوت کوندە کەدەمبێنەکەیان نەکرابێتەوە ئاو بکەن بەسەرما، سابەشکوو کەمێ باری لەشم سووك ببێ، هەتا بچم بۆ مزگەوت بۆناو موسوڵمانان، تاوەسێتتان بۆ بکەم)جا سوێنەیەکی حەفصەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەبوو، پێغەمبەریان لەناویدا دانیشاند، ئەوجا ئێمەی هاوسەرانی حەزرەت لەحەوت کوندە، دەستمان کرد بەئاو کردن بەسەریدا، هەتا خۆی ئاماژەی بۆ کردین: کەئیتربەسە، ئەوەی پێویست بوو کردتان. جاتۆزێ باری لەشی سووك بوو، جا دوو پیاو چوونە ژێربالی، عەبباسو پیاوێکی تر بوو، بەدارە دارە بردیان بۆ نوێژ بۆ مزگەوت، هەردوو پێی دەخشان لەزەوییەکە. عوبەیدوڵلا فەرمووی: کاتێ ئەم فەرموودەیەی عائیشەم باس کرد بۆ ئیبنوعەباس، فەرمووی: ئایا دەزانی ئەو پیاوەکەی تر کێ بوو؟ گوتم: نەء، فەرمووی: عەلی بوو. بڕوانە (ژمارە/٣٧٦).

٢٣٧- حديث عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: لَقَدْ رَاجَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِي ذَلِكَ ، وَمَا حَمَلَنِي عَلَى كَثْرَةِ مُرَاجَعَتِهِ إِلاَّ أَنَّهُ لَمْ يَقَعْ فِي قَلْبِي أَنْ يُحِبَّ النَّاسُ بَعْدَهُ رَجُلاً قَامَ مَقَامَهُ أَبَدًا ، وَلاَ كُنْتُ أُرَى أَنَّهُ لَنْ يَقُومَ أَحَدٌ مَقَامَهُ إِلاَّ

[٢٣٦] تجريد/١، ژماره: ١٤٦، بخاری: ١٩٨، مسلم: ٩٣٧.

تَشَاءَمَ النَّاسُ بِهِ ، فَأَرَدْتُ أَنْ يَعْدِلَ ذَلِكَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ أَبِي بَكْرٍ: (٢٣٧)

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەچەند ڕۆژێ لەپێش مەرگی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ نەخۆشینەکەی قورس بوو، موسوڵمانان لەمزگەوت خڕبوونەوە بۆجەماعەتی نوێژی خەوتنان، حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (ئەرێ مەردوم نوێژیان کرد؟) عەرزمان کرد: نەء، ئەی پێغەمبەری خودا! چاوەڕوانی تۆیانە، بەرنوێژییەکەیان بۆبکەی. فەرمووی: (لەسوێنەیەکا ئاو بکەن بەسەرما لەحەوت کوندەکە دەمبێنەکەیان نەکرابێتەوە) عائیشە فەرمووی: ئێمەیش وامان کر، کەخۆی شۆرد ئەزنەکی دا هەڵسێ بەڵام نەیتوانیو بوورایەوە، کەهۆشی هاتەوە فەرموویەوە: (ئەرێ مەردوم نوێژەکەیان کرد؟) عەرزمان کردەوە: نەء، ئەی پێغەمبەری خودا! چاوەنواڕی تۆیانە کەبەرنوێژییەکەیان بۆبکەی. فەرموویەوە: (لەسوێنەیەکا ئاوبکەن بەسەرما). عائیشە فەرمووی: جالەناو سوێنەکەدا دانیشت، دیسان کەخۆی شۆرد ئەزنەکی دا، ویستی هەڵسێ بەڵام نەیتوانیو دیسانەوە بوورایەوە، لەپاش کەمێ کەهۆشی هاتەوە هەمدیسان فەرموویەوە: (ئەرێ مەردوم نوێژەکەیان کرد؟) عەرزمان کردەوە: نەو، ئەی پێغەمبەری خودا! چاوەنواڕی تۆیانە کەخۆت بەرنوێژیەکەیان بۆبکەی. فەرموویەوە: (لەسوێنەیەکا ئاوبکەن بەسەرما) جالەناو سوێنەکەدا دانیشت، هەمدیسانەوە کەخۆی شۆرد ئەزنەکی دایەوە کەهەڵسێو بچێ بۆ مزگەوت پێشنوێژییەکە بۆخەڵکەکە بکا، بەڵام نەیتوانیو هەمدیس بوورایەوە، لەپاشتر کەهۆشی هاتەوە دیسان فەرموویەوە: (ئەرێ مەردوم نوێژیان کرد یانا؟). عەرزمان کردەوە: نەخێر هێشتا نوێژیان

---

(٢٣٧) مسلم: ٩٣٨، شیحا، بخاری: ٤٤٤٥ + تەجرید/١، ژمارە: ٣٨٦، بخاری: ٦٨٧، مسلم: ٤١٨ — ٩٣٥.

نـەکردووە، لەمزگـەوت گلێـر بوونەتـەوە، چاوەنواڕی تۆیانـە کەتەشـریفت بـچیٚ پێشنوێژمیەکەی خەوتنانیان بۆبکەی.

ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) فروسـتادمیەکی نـارد بـۆلای ئەبوبـەکر، کەپێـشنوێژیی بـۆ موسـوڵمانان بکـا، کـاتیٚ فروسـتادمکەی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـیٚ) فەرمانەکـەی پێغەمبـەری بەئەبوبـەکر ڕاگەیانـد، ئەبوبەکر پیاوێکی دڵنەرم بوو، لەبەرئـەوە بەعومـەری کوڕی خـەتابی فـەرموو: ئـەی عومـەر! تۆجەماعەتەکـە بـۆ موسـوڵمانان بکـە، عومـەریش پێـی فـەرموو: تۆشایانتری بۆئەمە جائەبوبەکر ئەو چەند ڕۆژە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) نەخۆشییەکەی گران بـوو جەماعـەتی بـۆ موسـوڵمانان دمکـرد، هەتا ڕۆژیٚ.... بڕوانـە: ژمارە: ٣٧٧، ٣٨٣، ٣٨٤، ٢٤٦).

ئەنجا ئەمەی دواوە چاپ دمکریٚ کە تەرجەمەی حەدیثەکەی ئێرمیە:

عائیـشەی هاوسـەری پێغەمبـەر (دروودی خـودا لەسـەر پێغەمبـەرو ڕەزای خـودا لەهـەموو یـارو هـاوەڵو هـاوڕێو هاوسـەرانی بێـت) فـەرمووی: کاتـیٚ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـیٚ) دمسـتووری دا کـە ئەبوبـەکری بـاوکم بەرنوێژییەکـە بـۆ موسـوڵمانان بکـا، کـەخۆی لەبـەر نەخۆشـی نـەیتوانی بەرنوێژییەکـەیان بـۆ بکـات، مـن چـەند جاریٚ، کارەکـەم لـە پێغەمبـەر دووبـارە کردەوەو عەرزیمکرد: کە ئەبوبـەکر پیـاوێکی دڵ نەرمـە ئەگـەر لەجێگـەی تـۆدا ڕابوەستیٚ لەبەر گریان خۆی بۆ ڕاناگیریٚو ناتوانیٚ بەرنوێژیی بۆ خەڵکەکە بکا، بـەڵام لەدڵیـشەوە مەبەسـتم ئـەوەبوو: کـە بـاوکم لـەم کـاتی سـەرە مەرگـەدا لەجێگەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) ڕانەوەستیٚ، نـەبادا خەڵکەکـە بڵێن: ئەبوبەکر پێی ڕەش بـوو، جا لەبەرئەمـە ویـستم کـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) بەکەسیٚ تر بڵیٚ، کە پێـشنوێژییەکە بـۆ نوێژخوێنـەکان بکـاو

واز لە ئەبوبەکر بهێنێ بۆ ئەم کارە. (بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ١٣٨، ژمارە: ٨١٤، ٨١٥، ٨١٦، ٨١٧، ٨١٨).

٢٣٨- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: (لَمَّا مَرِض رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَضهُ الَّذي مَاتَ فِيهِ فَحَضرَتْ الصَّلَاةُ فَأُذنَ فَقَالَ مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ فَقِيلَ لَهُ إِنَّ أَبَا بَكْرٍ رَجُلٌ أَسِيفٌ إِذا قَامَ فِي مَقَامِكَ لَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يُصَلِّيَ بِالنَّاسِ وَأَعَادَ فَأَعَادُوا لَهُ فَأَعَادَ الثالِثَةَ فَقَالَ إِنَّكُنَّ صَوَاحِبُ يُوسُفَ مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ فَخَرَجَ أَبُو بَكْرٍ فَصَلَّى فَوَجَدَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ نَفْسِهِ خِفَّةً فَخَرَجَ يُهَادَى بَيْنَ رَجُلَيْنِ كَأَنِّي أَنْظرُ رِجْلَيْهِ تَخُطانِ مِنْ الْوَجَعِ فَأَرَادَ أَبُو بَكْرٍ أَنْ يَتَأَخَّرَ فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ مَكَانَكَ ثمَّ أُتِيَ بِهِ حَتَّى جَلَسَ إِلَى جَنْبِهِ وَكَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي وَأَبُو بَكْرٍ يُصَلِّي بِصَلَاتِهِ وَالنَّاسُ يُصَلُّونَ بِصَلَاةِ أَبِي بَكْرٍ (رَضِي اللَّه عَنْهُ).[٢٣٨]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنەخۆشینی سەرەمەرگا، کاتێ کەتەواو نەخۆشیەکەی کەشەنگ بوو، کاتێ نوێژ بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بڵێن بەئەبوبەکر، لەزمانی منەوە، بابەرنوێژییەکە بۆ مەردومەکە بکا) منیش عەرزیم کرد: قوربان! ئەبوبەکر پیاوێکی غەمگینی دڵ نەرمە، ئەگەر لەجێگەکەی تۆدا رابوەستێ دڵی گەرم دەبێ‌و لەبەرگریان خۆی بۆ راناگیرێ‌و ناتوانێ پێشنوێژیی بۆخەڵکەکە بکا، بەڵام عائیشە لەدڵەوە مەبەستی ئەوەبوو، کەباوکی لەم کاتی سەرەمەرگەدا لەجێگەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمیحرابەکەدا نەوەستێ، نەبادا خەڵکەکە بڵێن: ئەبوبەکر پێی رەش بوو. جادیسان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمایشتەکەی خۆی دووبارە

---

[٢٣٨] تەجرید/١، ژمارە: ٣٧٧، بخاری: ٦٦٤، مسلم: ٤١٨ - ٩٤٠ شیحا.

کــردەوە، عائیــشەیش دیــسانەوە قــسەکەی خــۆی دووبــارە کــردەوە، جابۆیــە پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر بــێ) لەســەری جــاری ســێیەما فــەرمووی: (لەزمانی منەوە بەئەبوبەکر بڵێن بالەجیاتی من بەرنوێژییەکە بۆ مەردومەکە بکا، ئێوەی ژنان وەك زلێخای یووسف وان، قسەی دەمتــانو نیــازی دڵتــان لەیــەك جیان!).

جائەبوبــەکر رۆیــشت بۆمزگــەوت، لەســەر فــەرمانی پێغەمبــەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشنوێژی یەکەی بۆخەڵکەکە کرد، وەچەند رۆژێ بــەردەوام بوو لەسەرئەوە، هەتا رۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەمێ لەشی سووك بوو، رۆیشت بۆمزگەوت، دووپیاو چووبوونە ژێربالی، بەلارە لارە بردیان، دەڵێی ئێستایش والەبەرچاوم کەچۆن چۆنی پێغەمبەر (دروودی خــودای لەســەر بــێ) لەبــەرئازاری نەخۆشــیەکەی هــەردوو پێــی بەســەر زەوییەکــەدا بەخــشکە بەکێش دەکرد، کاتێ ئەبوبەکر هەستی پێ کرد کەوا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هێنا ویستی جێگەکەی بۆچۆڵ بکــاو بکشێتە دواوە، بــەلام حــەزرەت (رەزای خــوای لــێ بــێ) ئامــاژەی بــۆکرد: وەزع لــەخۆت تێــك مــەدەو خــەریکی کــاری خــۆت بــە، ئــەوجا پێغەمبــەریان بــرد رێــك لەئاستی ئەبوبــەکر لەتەنیشتیەوە دانیشتو دەستی کرد بەنوێژکردن، ئیتر ئەبوبەکر بۆنوێژی خۆی پەیڕەویی پێغەمبــەری دەکــردو خەڵکەکــەی تــریش بۆنوێــژی خۆیــان پــەیڕەویی نوێژەکەی ئەبوبەکریان دەکرد. لەگێڕانەوەیەکدا: حەزرەت (رەزای خوای لێ بــێ) لــەلای چــەپی ئەبوبــەکرەوە دانیــشت، بــەلام ئەبوبــەکر بــەپێوە نوێــژی دەکــرد. (ت/١/٤٠٨/٣ ز-١٣٨ ژ-٨١٦ چ-٤) بڕوانە (ژمارە/١٤٦).

وعنها (رَضي اللهُ عَنْها) في رِواية: لما ثقُل النبيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) واشتدَّ وجعه استأذن أزواجه أن يمرض في بيتي فأذن له. وباقي الحديث تقدم آنفا:

لەگێڕانەوەیەکی تریدا: عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەخۆشییەکەی لەپێ ی خستو ئازارەکەی سەخت بوو، روخسەتی لەهاوسەرەکانی خواست کەلەماڵی من بمێنێتەوەو لەوێ خزمەت بکرێ، هاوسەرەکانیشی ڕێگەی ئەوەیان دا. بڕوانە: ژمارە: ٣٧٧)

٢٣٩- عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ لَمَّا ثَقُلَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - جَاءَ بِلاَلٌ يُؤْذِنُهُ بِالصَّلاَةِ فَقَالَ « مُرُوا أَبَا بَكْرٍ أَنْ يُصَلِّىَ بِالنَّاسِ » . فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ ، إِنَّ أَبَا بَكْرٍ رَجُلٌ أَسِيفٌ ، وَإِنَّهُ مَتَى مَا يَقُمْ مَقَامَكَ لاَ يُسْمِعُ النَّاسَ ، فَلَوْ أَمَرْتَ عُمَرَ . فَقَالَ « مُرُوا أَبَا بَكْرٍ يُصَلِّى بِالنَّاسِ » . فَقُلْتُ لِحَفْصَةَ قُولِى لَهُ إِنَّ أَبَا بَكْرٍ رَجُلٌ أَسِيفٌ ، وَإِنَّهُ مَتَى يَقُمْ مَقَامَكَ لاَ يُسْمِعِ النَّاسَ ، فَلَوْ أَمَرْتَ عُمَرَ . قَالَ « إِنَّكُنَّ لأَنْتُنَّ صَوَاحِبُ يُوسُفَ ، مُرُوا أَبَا بَكْرٍ أَنْ يُصَلِّىَ بِالنَّاسِ » . فَلَمَّا دَخَلَ فِى الصَّلاَةِ وَجَدَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - فِى نَفْسِهِ خِفَّةً ، فَقَامَ يُهَادَى بَيْنَ رَجُلَيْنِ ، وَرِجْلاَهُ يَخُطَّانِ فِى الأَرْضِ حَتَّى دَخَلَ الْمَسْجِدَ ، فَلَمَّا سَمِعَ أَبُو بَكْرٍ حِسَّهُ ذَهَبَ أَبُو بَكْرٍ يَتَأَخَّرُ ، فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - ، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - حَتَّى جَلَسَ عَنْ يَسَارِ أَبِى بَكْرٍ ، فَكَانَ أَبُو بَكْرٍ يُصَلِّى قَائِمًا ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - يُصَلِّى قَاعِدًا ، يَقْتَدِى أَبُو بَكْرٍ بِصَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - وَالنَّاسُ مُقْتَدُونَ بِصَلاَةِ أَبِى بَكْرٍ رضى الله عنه.(٢٣٩)

لەژمارە (٢٣٥)و (٢٣٧) ژمارە (٢٣٨)دا، واتاو مەبەست لەم فەرموودەیە بەتەواوی رۆیشت.

٢٤٠- عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ الْأَنْصَارِيُّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ أَبَا بَكْرٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) كَانَ يُصَلِّي لَهُمْ فِي وَجَعِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الَّذي تُوُفِّيَ فِيهِ حَتَّى إذا كَانَ يَوْمُ

(٢٣٩) بڕوانە: ژمارە: ٢٣٨.

الِاثْنَيْنِ وَهُمْ صُفُوفٌ فِي الصَّلَاةِ فَكَشَفَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سِتْرَ الْحُجْرَةِ يَنْظُرُ إِلَيْنَا وَهُوَ قَائِمٌ كَأَنَّ وَجْهَهُ وَرَقَةُ مُصْحَفٍ ثُمَّ تَبَسَّمَ يَضْحَكُ فَهَمَمْنَا أَنْ نَفْتَتِنَ مِنْ الْفَرَحِ بِرُؤْيَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَنَكَصَ أَبُو بَكْرٍ عَلَى عَقِبَيْهِ لِيَصِلَ الصَّفَّ وَظَنَّ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَارِجٌ إِلَى الصَّلَاةِ فَأَشَارَ إِلَيْنَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ أَتِمُّوا صَلَاتَكُمْ وَأَرْخَى السِّتْرَ فَتُوُفِّيَ مِنْ يَوْمِهِ).[٢٤٠]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەونەخۆشینەدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەفاتی کرد، ئەبوبەکر بەرنوێژی بۆمەردوم دەکرد، رۆژی دووشەممە لەنوێژدا ریز بووبووین، لەوکاتەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەردەی دەرگای هۆدەکەی خۆی لادا، کەلەسەر ژووری مزگەوت بوو، تەماشایەکی بەدڵو بەکوڵی کردین، دیمەنێکی گەلێ شیرینو رەنگین بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەپێوە وەستا بوو سەرنجی ئێمەی دەدا، دیاربوو بۆدواجار ئۆمەتەکەی لەژیانیدا بەسەردە کردەوەو، مالآوایی لەیارانی دەکرد، رەنگو روخساری لەبەرگەشیو نازداری لەرەنگو روخساری نەخۆشی نەدەکرد، بەڵکوو دەتگوت پەڕەی گوڵو رووپەڕەی قورئانە، نوور لەڕوخساری دەتکاو گوڵو گەوهەرو جەوهەری لێ دەباری، ئینجا زەردەخەنەیەکی کردو پێکەنی، جاکاتێ پێغەمبەرمان لەسەرئەم حالە بینی، لەخۆشییانا خەریك بووین بپەشۆکێینو وەختەبوو گەشکە بمان گرێو نوێژەکە بەجێ بهێڵین! جائەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێ) وایزانی کەوا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دێ بۆنوێژ لەبەرئەوە پاشەو پاش گەڕایەوە دواوە، تابچێتە ناو ریزەکەوەومیحرابەکە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چۆڵ بکا، بەلآم پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهاتو بەدەستی ئاماژەی بۆکردین:

---

[٢٤٠] تەجرید/١، ژمارە: ٣٨٤، بخاری: ٦٨٤، مسلم: ٤٢١ = ٩٤٨ شیحا.

کەنوێژەکەتان تەواو کەن، ئینجا دیسان پەردەکەی دادایەوە، ئیتر هەر ئەوڕۆژە گوڵ لەگوڵشەن بڕاو یار لەیاران دابڕاو، خۆری زانستو حیکمەت ماڵاوایی کرد لەگۆی زەویو دانیشتووەکانی، وەسەر رووی خاك خۆزگەی خواست بەناو تویی خاك، وەگوڵ خۆزگەی خواست بەگڵ، وە پێغەمبەری نازدار، ئەوکێوی نوروعیلمو عیرفانە کۆچی دوایی ی کردو نوبووەتو پێغەمبەرایەتی کۆتایی هاتو دەرگای وەحیو سرووش مۆرکرا. (تاج/ ١/٥/٤٠٩ = ز-١٣٨ ژ-٨١٨ = ش).

٢٤١- عَنْ أَنَسٍ قَالَ لَمْ يَخْرُجِ النَّبِيُّ – صلى الله عليه وسلم – ثَلاَثًا ، فَأُقِيمَتِ الصَّلاَةُ ، فَذَهَبَ أَبُو بَكْرٍ يَتَقَدَّمُ فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – بِالْحِجَابِ فَرَفَعَهُ ، فَلَمَّا وَضَحَ وَجْهُ النَّبِيِّ – صلى الله عليه وسلم – مَا نَظَرْنَا مَنْظَرًا كَانَ أَعْجَبَ إِلَيْنَا مِنْ وَجْهِ النَّبِيِّ – صلى الله عليه وسلم – حِينَ وَضَحَ لَنَا ، فَأَوْمَأَ النَّبِيُّ – صلى الله عليه وسلم – بِيَدِهِ إِلَى أَبِى بَكْرٍ أَنْ يَتَقَدَّمَ ، وَأَرْخَى النَّبِيُّ – صلى الله عليه وسلم – الْحِجَابَ ، فَلَمْ يُقْدَرْ عَلَيْهِ حَتَّى مَاتَ.[٢٤١]

واتاو مەبەست لێی لەژمارە (٢٤٠)دا رابورد.

٢٤٢- عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) أَنَّهَا قَالَتْ: (إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ فِي مَرَضِهِ مُرُوا أَبَا بَكْرٍ يُصَلِّي بِالنَّاسِ قَالَتْ عَائِشَةُ قُلْتُ إِنَّ أَبَا بَكْرٍ إذا قَامَ فِي مَقَامِكَ لَمْ يُسْمِعْ النَّاسَ مِنْ الْبُكَاءِ فَمُرْ عُمَرَ فَلْيُصَلِّ لِلنَّاسِ فَقَالَتْ عَائِشَةُ فَقُلْتُ لِحَفْصَةَ قُولِي لَهُ إِنَّ أَبَا بَكْرٍ إذا قَامَ فِي مَقَامِكَ لَمْ يُسْمِعْ النَّاسَ مِنْ الْبُكَاءِ فَمُرْ عُمَرَ فَلْيُصَلِّ لِلنَّاسِ فَفَعَلَتْ حَفْصَةُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَهْ إِنَّكُنَّ لَأَنْتُنَّ صَوَاحِبُ يُوسُفَ مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ لِلنَّاسِ فَقَالَتْ حَفْصَةُ لِعَائِشَةَ مَا كُنْتُ لِأُصِيبَ مِنْكِ خَيْرًا).[٢٤٢]

---

[٢٤١] بڕوانە: ژمارە (٢٤٠) لە پێشەوە رابورد.

[٢٤٢] تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٣٨٣، بخاری: ٦٧٩، مسلم: ٤١٨ = ٩٤٠.

عائیشه (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) فەرمووی: پیٚغەمبەر دروودی خودای لەسەر بیٚو سەروماڵو حاڵو مناڵو هەستو نەست گشتی بەقوربانی گەردی بەرئاستانەی ئارامگای نازدارو پیرۆزی بیٚ فەرمووی: (لەزمانی منەوە فەرمان بەئەبوبەکر بکەن کەپیٚشنویٚژییەکە بۆخەڵکەکە بکا) منیش عەرزیم کرد: ئەبوبەکر پیاویٚکی دڵ نەرمە، کەلەجیٚگەی تۆدا ڕابوەستیٚ، دڵی گەرم دەبیٚو لەبەر گریان نویٚژکەرەکان گوێیان لەدەنگی نابیٚ، کەواتە فەرمان بکە بە عومەر کە نویٚژ بۆ خەڵکەکە بکا، هەروا بەحەفصەی هەوێمم گوت: عەرزی پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) بکە: کەئەبوبەکر پیاویٚکی دڵنەرمە، کەلەجیٚگەکەی تۆدا ڕابوەستیٚ دڵی گەرم دەبیٚو لەبەرگریان نویٚژکەرەکان گویٚ یان لەدەنگی نابیٚ، کەواتە: فەرمان بەعومەر بکە کەنویٚژەکان بۆمەردومەکە بکا. حەفصەیش ئەمەی عەرز کرد، حەزرەت (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) فەرمووی: (وسبە! بیٚ گومان ئێوەی ژنان وەك زلێخای یووسف وان، قسەی دەمتان وەك نیازی دڵتان لەیەکترجیان! لەزمانی منەوە فەرمان بەئەبوبەکر بکەن، کەبەرنویٚژییەکە بۆ موسوڵمانان بکا). جا حەفصە بەعائیشە دەفەرمویٚ: قەت نەبوو لەتۆوە تووشی خێر ببم).

**(٢٢) باب: تقديم الجماعة من يصلى بهم إذا تأخر الإمام ولم يَخافوا مفسدة بالتقديم**

**نویٚژخویٚنەکان بۆیان هەیە کەسیٚ بکەن بە پیٚشنویٚژ کە نویٚژەکەیان بۆ بکا، ئەگەر پیٚشنویٚژ دواکەوت، بەمەرجیٚ نەبیٚ بەهۆی خراپەی**

٢٤٣- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَهَبَ إِلَى بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ لِيُصْلِحَ بَيْنَهُمْ فَحَانَتْ الصَّلَاةُ فَجَاءَ الْمُؤَذِّنُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ فَقَالَ أَتُصَلِّي لِلنَّاسِ فَأُقِيمَ قَالَ نَعَمْ فَصَلَّى أَبُو بَكْرٍ فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالنَّاسُ فِي الصَّلَاةِ فَتَخَلَّصَ حَتَّى وَقَفَ فِي الصَّفِّ فَصَفَّقَ النَّاسُ وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ لَا يَلْتَفِتُ فِي صَلَاتِهِ فَلَمَّا أَكْثَرَ النَّاسُ التَّصْفِيقَ الْتَفَتَ فَرَأَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَشَارَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ امْكُثْ مَكَانَكَ فَرَفَعَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يَدَيْهِ فَحَمِدَ اللَّهَ عَلَى مَا أَمَرَهُ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ ذَلِكَ ثُمَّ اسْتَأْخَرَ أَبُو بَكْرٍ حَتَّى اسْتَوَى فِي الصَّفِّ وَتَقَدَّمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَصَلَّى فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ يَا أَبَا بَكْرٍ مَا مَنَعَكَ أَنْ تَثْبُتَ إِذ أَمَرْتُكَ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ مَا كَانَ لِابْنِ أَبِي قُحَافَةَ أَنْ يُصَلِّيَ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا لِي رَأَيْتُكُمْ أَكْثَرْتُمْ التَّصْفِيقَ مَنْ رَابَهُ شَيْءٌ فِي صَلَاتِهِ فَلْيُسَبِّحْ فَإِنَّهُ إِذا سَبَّحَ الْتُفِتَ إِلَيْهِ وَإِنَّمَا التَّصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ).[٢٤٣]

سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چووبۆناو هۆزی بەنی عەمری کوڕی عەوف، بۆناوبژی هەتا ئاشتیان بکاتەوە، کاتێ نوێژبوو، بانگدەر کەبیلال بوو، هات بۆلای ئەبوبەکر عەرزی کرد: ئەگەر قامەت بکەم بەرنوێژییەکە دەکەی بۆخەڵکەکە؟ فەرمووی: بەڵێ، دەیکەم، جاکەئەبوبەکر نوێژی دابەست پاش کەمێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتەوە، هێشتا نوێژەکەیان تەواو نەکردبوو، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یەکەیەکە دڕی بەڕیزەکان دا، تاخۆی گەیاندە ڕیزی یەکەمو لەوێ وەستا، خەڵکەکە دەستیان کرد بەچەپڵە لێدان، ئەبوبەکریش عادەتی نەبوو کەلەناو نوێژدا لابکاتەوە بەڵام کەدی خەڵکەکە چەپڵەیەکی زۆر لێ دەدەن ئەویش ئاوڕی دایەوەو پێغەمبەری بینی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاماژەی بۆی کرد: کەلەشوێنی خۆت

[٢٤٣] تجرید/١، ژمارە: ٣٨٥ - بخاری: ٦٨٤، مسلم: ١، ژمارە: ٩٤٨ + مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٣٣٥ = ٩٥٣ شیحا.

بمێنـەرەوەو نوێژەکـەمان بۆتەواوکـە. بـەڵام ئەبوبـەکر هـەردوو دەسـتی خـۆی بەرزکردەوەو سوپاسـی خـودای کـرد لەسـەر ئـەم دەسـتی خێـرەی کـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لـەوی نـا، ئنجا پاشـەو پـاش گەڕایـەوە دواوە، هـەتا ڕێك چووە ناو ڕیزەکەوەو لـەوێ وەسـتا، پێغەمبـەریش (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) پێـشکەوتو بەرنوێژییەکـەی کـرد، کەلەنوێژەکـە بـۆوە فـەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): ئەی ئەبوبەکر کەفەرمانم پێ کردیت بۆنەمایتەوە لەشوێنی خۆت؟ ئەبوبەکریش (ڕەزای خوای لـێ بێ) فـەرمووی: بـۆمن نـەهاتووە کـەپێش تۆبکەوم ئەی پێغەمبەری خودا! ئینجا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بەنوێژکەرەکانی فەرموو: (ئەوە بۆئەو گشتە چەپڵەیەتان لێ دا، هەرکەسێ لەناو نوێژدا شتێکی لێ ڕووبدا بـابڵێ سـوبحانەڵڵاە، چـونکە کەسـوبحانەڵڵای کـرد، ئـیتر تێ دەگەن لەمەسەلەکە، وەلێ چەپڵە لێدان لەناو نوێژدا بۆژنانە). (ت/١/٤٠٦/١ ز-١٣٨ ژ-٨١٤ = ش/د/ ن).

ئەمەیش گێڕانەوەی ژمارە (٣٣٥)ی پوختەی موسلیمە:

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: (هەرکەسـێ لـەناو نوێـژدا شتێـکی لێ ڕووبـدا، بـا بڵێ سوبحانەڵڵاه، چونکە کە سوبحانەڵڵای کرد، ئیتر تێ دەگـەن لـە کارەکـە، وەلێ چەپڵە لێدان لەناو نوێژدا بـۆ ژنانـە). {تـەجریـد/١/٣٧٦، ژمـارە: ٣٨٥ = ٦٨٤، ١٢٠١، ١٢٠٤، ١٢١٨، ١٢٣٤، ٢٦٩٠، ٢٦٩٣، ٧١٩٣. تاج/١/٤٠٦، ژمارە: ٨١٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

**فیقهی ئەم فەرموودەیە ئەمەیە:**

**١- پیاو لەناو نوێژدا، ئەگەر پێشهاتێ وا ڕوویدا کە پێویستی بە ورریاکردنەوەی کەسێکی تر بوو، با سوبحانەڵڵا بکا، وەك وشیار کردنەوەی پێش نوێژ، کاتێ کە هەڵەیێ دەکا، تەحیات ناخوێنێ، یا جێگەی تەحیات نییەو دادەنیشێ بۆ تەحیات خوێندن، یا سۆپایێ لەلایا خەریکە گڕ دەگرێ، ئەویش نوێژ دەکا، بە دەنگی بەرز سوبحانەڵڵا دەکا، هەتا ئەوانەی گوێیان لە سوبحانەڵڵاکەیەتی وریا دەبنەوەو سۆپاکە دەکوژێننەوە، یا منالێ خەریکە کەتنێ دەکا.... تاد.**

**٢- لەهەموو ئەم کاتانەدا ژن لەباتی (سبحان الله) کردن چەپڵە لێ دەدا، بەبەری دەستی ڕاستی دەدا لە پشتی دەستی چەپی. {بڕوانە: فیقهی ئاسان/٢٠٤/١، زنجیرە: ٦٦ – ژن لە چەن شتێکا جیایە لە پیاو. بڕگەی: پێنجەم}.**

**(٢٣) باب: تسبيح الرجل وتصفيق المرأة إذا نابهما شئ في الصلاة**

**سوبحانەڵڵا لەناو نوێژدا، لەکاتی پێویستیدا بۆ پیاوە، بۆ ژنیش چەپڵەیە**

٢٤٤– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «التَّسْبِيحُ لِلرِّجَالِ وَالتَّصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ».[٢٤٤]

**لەژمارە (٢٤٣)دا بەتەواوی ڕابورد.**

---

[٢٤٤] **بڕوانە ژمارە (٢٤٣).**

## (٢٤) باب: الأمر بتحسين الصلاة وإتمامها والخشوع فيها
## فەرمان بەكردنی نوێژ بەجوانیو بەتەواویو بەملكەچیو بەڕێكوپێكی

٢٤٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (هَلْ تَرَوْنَ قِبْلَتِي هَا هُنَا فَوَاللَّهِ مَا يَخْفَى عَلَيَّ خُشُوعُكُمْ وَلَا رُكُوعُكُمْ إِنِّي لَأَرَاكُمْ مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِي).[٢٤٥]

**ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەئێوە وایە كەمنیش وەك ئێوە هەر رووی قیبلە، كەوا لەبەردەممەوە دەبینمو بەس، بەخودا زۆرباش ئاگام لەخوشوعو لەروكوعتانە لەناو نوێژەكەما، چونكە من لەپشتی سەریشمەوە بەباشی دەتان بینم، خودا بەهرەیەكی وای پێداوم كەبەردەمو پشتی خۆم هەردوولا لەیەك كاتا دەبینم!). (ت/١/٢٨٤/١ ز-٩٠ ژ-٥٥٠).**

٢٤٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ عَنِ النَّبِيِّ - صلى الله عليه وسلم - قَالَ « أَقِيمُوا الرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ ، فَوَاللَّهِ إِنِّى لأَرَاكُمْ مِنْ بَعْدِى - وَرُبَّمَا قَالَ مِنْ بَعْدِ ظَهْرِى - إِذَا رَكَعْتُمْ وَسَجَدْتُمْ».[٢٤٦]

**ئەنەسی كوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (چەمینەوەو كوڕنووش بەڕێكوپێكی ئەنجام بدەن، سوێندم بەخودای گەورە، من چۆن لەبەردەممەوە شت دەبینم، ئاوەها لەپشتی سەریشمەوە شت دەبینم، كەواتە: با ئەم بینینەی منە ببێ بە هاندەرێ بۆتان كە بەجوانی چەمینەوەو كوڕنووشو نوێژ بەجوانی ئەنجام بدەن، چونكە**

---

[٢٤٥] **تجريد/١، ژمارە: ٢٥٩، بخارى: ٤١٨، ٧٤١، مسلم: ٤٢٤ = ٩٥٧ شيحا.**

[٢٤٦] **مسلم: ٩٥٨، بخارى: ٧٤٢.**

مـن لەوكاتانـەدا چـاوم لێتانـەو دەتـانبینم). (بڕوانـە: مختـصر صـحیح مـسلم/١، ژمارە: ٣٢٧).

## (٢٥) باب: النهي عن سبق الإمام بركوع أو سجود ونحوهما

## جڵەوگیری لەپێشکەوتن لەپێشنوێژ، لەم کاتانەدا: لەکاتی چەمینەوەو کوڕنووش و وێنەی ئەمانەدا

٢٤٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (أَمَـا يَخْشَى أَحَدُكُمْ أَوْ لَا يَخْشَى أَحَدُكُمْ إِذا رَفَعَ رَأْسَهُ قَبْلَ الْإِمَامِ أَنْ يَجْعَلَ اللَّهُ رَأْسَهُ رَأْسَ حِمَارٍ أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ صُورَتَهُ صُورَةَ حِمَارٍ).[٢٤٧]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لـێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (ئەوکەسـەتان کەلەجەماعـەتا لـەپێش پێـشنوێژدا، سەرلەچەمینەوە (روکوع) یالەکوڕنووش بەرزدەکاتـەوە، ئـەدی ئـەوە چۆن لـەوە ناترسێ کەخودا لەسەر ئەو پەلە پەلە، سەری بکا بەسـەری کـەر) یـا فـەرمووی: (کەخودا شکڵی بکا بەشکڵی کەر).

## (٢٨) باب: تسوية الصفوف وإقامتها

## ڕێکخستنی ڕیزو ڕێك ڕاوەستان لە ڕیزی نوێژدا

٢٤٨ – حَديث عَنْ أَنَـسٍ عَـنِ النَّبِـيِّ (صـلى الله عليـه وسـلم) قَـالَ: «سَـوُّوا صُفُوفَكُمْ فَإِنَّ تَسْوِيَةَ الصُّفُوفِ مِنْ إِقَامَةِ الصَّلَاةِ».[٢٤٨]

---

[٢٤٧] تجرید/١، ژمارە: ٣٨٩، بخاري: ٦٩١، مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٢٩١ - تخریج محمد فؤاد: ٤٢٧ = ٩٦٣ شیحا.

[٢٤٨] بخاري. جماعه: ٧١٩، ٧١٨، مسلم. صلاة: ٩٧٤، ٩٧٦، تاج/١، ژمارە: ٧٩٦، زنجیرە: ١٣٤.

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەنوێژدا ڕیزەکانتان ڕێك بخەنو لارو خوارو چەوت لەڕیزی نوێژدا رامەوەستن، چونکە ڕێککردنی ڕیز بەشێکە لە ڕێكو پێکی نوێژو نیشانەی کردنیەتی بەجوانی!).

٢٤٩- عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: النبيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (أَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ وَتَرَاصُّوا فَإِنِّي أَرَاكُمْ مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِي).[٢٤٩]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: قامەتی نوێژکرا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رووی تێ کردینو فەرمووی: (ڕیزەکانتان راست بکەنەوەو پاڵ بدەن بەیەکتری یەوە، چونکە من لەپشتی سەریشمەوە چاوم لێتانەو سوور دەزانم کەڕیزەکانتان ناڕێکە، لەبەرئەوە فەرمانتان پێ دەکەم کەئەوهەڵەیە راست بکەنەوە، دەنا خودا تۆڵەی ئەوناڕێکییەتان لێ دەستێنێ!). (ت/١/٣٩٨ = ز-١٣٤ ژ-٧٩٦).

### ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن: قسەکردن لەنێوانی قامەتو نوێژدابەستن دا دروستە، ڕێکخستنی ڕیزەکانی نوێژ پێویستە، واتە: فەرزە، هەروا پڕکردنەوەی کەلێنو کەلو بۆشایی ناوڕیز، موعجیزەیەکی گەورەی تیادایە کەئەوەیە: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەپشت سەریشیەوە وەك بەردەمی خەڵکی بینیوە.

٢٥٠- عَنْ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (لَتُسَوُّنَّ صُفُوفَكُمْ أَوْ لَيُخَالِفَنَّ اللَّهُ بَيْنَ وُجُوهِكُمْ).[٢٥٠]

---

[٢٤٩] تەجرید/١، ژمارە: ٣٩٩، بخاری: ٧١٩، مسلم: ٣٤٣ = ٩٧٥ شیحا.

نوعمـانی کـوڕی بەشـیر (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (بـەخودا ڕیزەکانتـان ڕێك دەخـەن‌و لـەڕیزی نوێـژدا ڕێـك‌و ڕاسـت ڕادەوەسـتن یـاخوود ئەگـەر ئـەوە نەکـەن، خـودا رووتـــان تـــاق‌و لـــۆق دەکـــاو، دژایـــەتی‌و نـــاکۆکی‌و دووبـــەرەکی دەخاتـــە ناوتانەوە).(ت/١/٣٩٨/١ = ز-١٣٤ ژ-٧٩٣).

ئەمە ژمارە (٣٩٨)ی تەجریدبوو، لە پوختەی موسلیما ئاوایە:

ئـەبو مەسـعوود (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: جـاران کـە لـەڕیزی جەماعـەتی نوێـژدا ڕادەوەسـتاین، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـەم پـەڕی ڕیـزەوە تـا ئەوپـەڕی ڕیـز دەکەوتـە نـاو ڕیزەکـەوەو دەسـتی دەهێنـا بـە سـینگ‌و بـە شـانماناو ڕێـکی دەخـستین‌و دەیفـەرموو: (ڕێـك بوەســتن لــە ڕیزەکانتاناو، ناڕێك مەوەستن، دەنا ناڕێکی‌و ناکۆکیتان تێ دەکەوێ‌و دڵەکانتان تاق‌و لۆق دەکەن، با سەلارو هۆشیارو فامیدەکانتان لەمنـەوە نزیـك ببنـەوەو لـە ڕیزی پشت منەوە بن، ئـەنجا ئەوانـەی کـە لـەزرنگی‌و هۆشـیاریدا لـەوانی نزیـك دەکەنەوە، دووبارە فەرموویەوە: ئەنجا ئەوانەی کە لەزرنگی‌و هۆشیاریدا لـەوانی نزیك دەکەنەوە).

## ڕوونکردنەوە:

ئـەبو مەسـعوودی بـەدری نـاوی عوقبـەی کـوڕی عـەمرە،،، ئەنـصارییە، خەزرەجییـە، بەدرییـە، لەگـەڵ حـەفتا کەسـەکەدا، بـەکۆی ڕا، ئامـادەی پـەیمانی عەقەبە بووە، لەوکاتەدا لە هەموویان بەتەمەن بچووکتر بووە، ئامـادەی جـەنگی ئوحـودو نەبـەردەکانی دوای بـووە، سـەدو دوو فـەرموودەی لـە پێغەمبـەرەوە

---

[٢٥٠] تەجرید/١، ژمارە: ٣٩٨، بخاري: ٧١٧، مسلم: ٤٦٩ = ٩٧٧.

گێڕاوەتـەوە، لـە بوخاریـدا دە فـەرموودەی هەیـە، لـە موسـلیمدا شـازدەی هەیـە، نۆیان پەسەندی هەردوولان واتە: بوخـاریو موسـلیم ئـەو نۆیـەیان گێڕاوەتـەوە، کۆی فەرموودەکانی لە بوخاریو موسلیمدا یەکسانە بـە (٩+١+٧ = ١٧) فـەرموودە، لە لایەنگیرانی عەلی بوو، لە کووفە نیشتەجێ بوو، هـەر لـەوێش مـردووە (رەزاو رەحمەتی خودای گەورەو مەزنی لێ بێ).

بۆ روونکردنەوەی تـەواوی ئـەم باسـە، بڕوانـە: تـاجول ئوصـول، بـەرگی/١، لاپەڕە: ٣٩٨، چاپی/١، زنجیرە: ١٣٤ بە تەواوی، لە ژمارە: ٧٩٣وە هەتا ژمارە: ٨٠٠.

٢٥١- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِى النِّدَاءِ وَالصَّفِّ الأَوَّلِ، ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إِلاَّ أَنْ يَسْتَهِمُوا عَلَيْـهِ لاَسْتَهَمُوا وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِى التَّهْجِيرِ لاَسْتَبَقُوا إِلَيْهِ، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِى الْعَتَمَةِ وَالصُّبْحِ لأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا ».[٢٥١]

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگـەر ئـەو خەڵـکە دەیـانزانی خێـری بانگـدانو ریزی یەکەمی نوێژی جەماعەت چەندێ گەورەیە، وچاری تریان نەبوایە، جگە لەوە کە تیرو پشکیان لەسەر بکەن، ئەوا تیرو پشکیان لێ دەکردن، جا پـشکی کـێ دەربچوایە ئەوە بانگی دەدا، یـا لـە ریـزی یەکـەما دەوەسـتا، ئەگـەر ئـەو خەڵـکە دەشیان زانی کە خێری زوو چوون بـۆ نوێـژی قرچـەی گـەرمای نیـوەڕۆ چـەندە گەورەیە بە هەڕاکردن دەچوون بـۆی، وەك کـاتی پێـشبڕکێ، ئەگـەر دەیـشیانزانی خێری جەماعەتی خـەوتنانو جەماعـەتی بـەیانی، چـەنێ گەورەیـە، ئەگـەر بـە گاڵگۆڵکەیش بوایە دەهاتن بۆیان).

---

[٢٥١] مختصر صحیح بوخـاری/٣٥٧ - ٦١٥، ٦٥٤. مختـصر صـحیح مـسلم/١، ژمـارە: ٢٦٨ - شـیحا: ٩٨٠.

## (٢٩) باب: أمر النساء المصليات وراء الرِّجال أن لايرفعن رؤوسهن من السجود حتى يرفع الرجل

## دەستوور دراوە بە ژنان، کاتێ لەڕیزی نوێژی جەماعەتدا، لەپشتی پیاوانەوە نوێژ دەکەن، سەر لەکوڕنووش هەڵنەبڕن، هەتا پیاوان سەریان هەڵدەبڕن

٢٥٢- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْد (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَانَ رِجَالٌ يُصَلُّونَ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَاقِدِي أُزْرِهِمْ عَلَى أَعْنَاقِهِمْ كَهَيْئَةِ الصِّبْيَانِ وَيُقَالُ لِلنِّسَاءِ لَا تَرْفَعْنَ رُءُوسَكُنَّ حَتَّى يَسْتَوِيَ الرِّجَالُ جُلُوسًا).(٢٥٢)

سەهل (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەچاوی خۆم دیومە کەپیاوان بەرکۆش (ئیزار)ە کانیان، لەبەر تەسكو تروسكیو، نەبوونی جلو بەرگ، وەك بەروانکەی منالان، گرێ دەدا بەبەرۆکیانەوە، لەکاتی نوێژی جەماعەتدا، کەلەپشتی پێغەمبەرەوە دەیان کرد، پیاوێکیش بانگەوازی دەکرد: ژنان! ئێوە سەر بەرز مەکەنەوە، تاپیاوەکان هەڵدەسنەوەو، لەپاش کووڕنووشەوە ڕێك دادەنیشنەوە، نەوەك لەداوێنەوە شەرمیان دەرکەوێ!(ت/١/٣٩٢/٤=ز-١٣٠ژ-٧٨٠).

## (٣٠) باب: خروج النساء إلى المساجد إذا لم يترتب عليه فتنة وأنها لا تخرج مطيبة

## ژنان مافیان هەیە کە هامشۆی مزگەوت بکەن، بەمەرجێ نەبێ بەهۆی ئاژاوە بۆیان، وە نابێ بۆ چوون بۆ مزگەوت بۆنی خۆش بەکار بهێنن

٢٥٣- حديث ابن عمر، عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم): «إِذَا اسْتَأْذَنَتِ امْرَأَةُ أَحَدِكُمْ فَلاَ يَمْنَعْهَا».(٢٥٣)

---

(٢٥٢) تەجرید/١، ژمارە: ٢٢٩، بخاری: ٣٦٢، مسلم ترقیم محمد فؤاد: ٤٤١ = ترقیم خلیل شیحا: ٩٨٦.

(٢٥٣) تجرید/٤٦٤، بخاری: ٨٦٥، مسلم: ٩٩٠ شیحا.

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ - ڕەزای خودا لەخۆیو لە عومەری باوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی موسوڵمانینە! کاتێ ژنەکانتان داوایان لێتان کرد، کەبۆ نوێژو خواپەرستی، وەك نوێژی جەماعەتو نوێژی هەینی بچن بۆ مزگەوت، مۆڵەتیان پێ بدەنو ڕێگەیان پێ بدەن کە هاموشۆی مزگەوت بۆ کاری وابکەن).

٢٥٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ كَانَتِ امْرَأَةٌ لِعُمَرَ تَشْهَدُ صَلاَةَ الصُّبْحِ وَالْعِشَاءِ فِي الْجَمَاعَةِ فِي الْمَسْجِدِ ، فَقِيلَ لَهَا لِمَ تَخْرُجِينَ وَقَدْ تَعْلَمِينَ أَنَّ عُمَرَ يَكْرَهُ ذَلِكَ وَيَغَارُ؟ قَالَتْ وَمَا يَمْنَعُهُ أَنْ يَنْهَانِي قَالَ يَمْنَعُهُ قَوْلُ رَسُولِ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – « لاَ تَمْنَعُوا إِمَاءَ اللَّهِ مَسَاجِدَ اللَّهِ».(٢٥٤)

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: عاتیکەی کچی زەید، کە هاوسەری عومەری باوکم بوو، ئامادەی جەماعەتی نوێژی بەیانیو جەماعەتی نوێژی خەوتنان دەبوو، پێی گوترا: بۆچی دەچی بۆئەم نوێژانە، لەم کاتانەدا، خۆت دەزانی کە عومەری مێردت ئەمەی پێ خۆش نییەو زۆر بە تەنگی ناموسەوە هەیە لەم لایەنەوە؟

ژنەکەی گوتی: جا ئەگەر وایە، بۆچی عومەر خۆی جڵەوگیریم لێ ناکات، تا نەچم؟

فەرمووی: لەبەر ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر قەدەغەمت لێ ناکات، کە دەفەرموێ (درودی خودای لەسەر بێ): (کەنیزانی خودا، واتە: ژنان، قەدەغە مەکەن لەهاتوچۆی مزگەوتانی خودا).

٢٥٥- عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّهَا سَمِعَتْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عنها) زَوْجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَقُولُ: (لَوْ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَأَى

(٢٥٤) بخاري: ٩٠٠، مسلم: ٩٨٩.

مَا أَحْدَثَ النِّسَاءُ لَمَنَعَهُنَّ الْمَسْجِدَ كَمَا مُنِعَتْ نِسَاءُ بَنِي إِسْرَائِيلَ، قَالَ: فَقُلْتُ لِعَمْرَةَ: أَنِسَاءُ بَنِي إِسْرَائِيلَ مُنِعْنَ مِنَ الْمَسْجِدَ؟ قَالَتْ: نَعَمْ.(٢٥٥)

عەمرەی کچی عەبدورەحمان فەرمووی: بیستم لە خاتوو عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لە عائیشە بێ) دەیفەرموو: ئەمەی کە ئێستا ژنان بەرپایان کردووە، لەخۆ ئارایشدانو لەخۆ رازانەوە، ئەگەر پێغەمبەر نەمردایەو فریای ئەمە بکەوتایەو بەچاوی خۆی ئەمەی بدیایە، وەك ئێمە ئەمرۆ دەیبینین، مزگەوتی لە ژنان قەدەغە دەکرد، هەروەك چۆن لەکاتی خۆیانا، مزگەوت لە ژنانی نەوەی ئیسرائیل قەدەغە کرابوو، لە ئایینی خۆیانا، راوی ئەم فەرموودەیە لە عەمرەوە دەڵێ: منیش گوتم بە عەمرە: بۆچی مزگەوت لە ژنانی نەوەی ئیسرائیل، لەدینی خۆیانا قەدەغە کرابوو، رێگە بە ژنانی جوولەکە نەدەدرا، کە هاموشۆی کەنیشتەی خۆیان بکەن؟ عەمرە گوتی: بەڵێ.

**(٣١) باب: التوسط في القراءة في الصلاة الجهرية بين الجهر والإسرار إذا خاف من الجهر مفسدة**

**ئەگەر مەترسی ئەوە هەبوو، کە قورئانخوێندنی ناو نوێژ کێشەیێ دروست دەکا، با پێشەوا لەنوێژی ئاشکرا (جەهری)یدا، بە دەنگێکی مامناوەندی بخوێنێ**

٢٥٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) فِي قَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ ( وَلاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً) قَالَ: نَزَلَتْ وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُتَوَارٍ بِمَكَّةَ، فَكَانَ إِذَا صَلَّى بِأَصْحَابِهِ رَفَعَ صَوْتَهُ بِالْقُرْآنِ فَإِذَا سَمِعَ ذَلِكَ الْمُشْرِكُونَ سَبُّوا الْقُرْآنَ وَمَنْ أَنْزَلَهُ وَمَنْ جَاءَ بِهِ فَقَالَ اللَّهُ تَعَالَى لِنَبِيِّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (وَلاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ) فَيَسْمَعَ الْمُشْرِكُونَ قِرَاءَتَكَ (وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا) عَنْ أَصْحَابِكَ

(٢٥٥) مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٢٤٦، مسلم، شيحا: ٩٩٨، بخاري: ٨٦٩.

أَسْمِعْهُمُ الْقُرآنَ وَلاَ تَجْهَرْ ذَلِكَ الْجَهْرَ وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً يَقُولُ بَيْنَ الْجَهْرِ وَالْمُخَافَتَةِ).[٢٥٦]

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس، کەناسراوە بەئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی و لەباوکی) لەبارەی ڕافەی ئەم ئایەتەوە لێیان پرسی، کەدەفەرموێ: {وَلاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً} (سورة الإسراء-١٧/ ١١٠).

کەواتای وایە: لەقورئانخوێندنی ناو نوێژ دا، نەزۆر دەنگ بەرز بکەرەوەو نەزۆریش نزم، لەو نێوانەدا ڕێگەیەکی ناوەندی هەڵبژێرە.

ئیبنو عەبباسیش لەوەڵامی پرسیارەکەدا فەرمووی: ئەم ئایەتە لەکاتێکی وادا دابەزی، کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەمەککە لەترسی ناموسوڵمانە هاوبەشپەیداکەرەکان خۆی دەشاردەوەو، خۆی دەرنەدەخست، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەستووری وابوو کەبەرنوێژی بۆ هاوڕێکانی دەکرد، لەکاتی قورئانخوێندن دا دەنگی بەرزدەکردەوە، جاکاتێ کە ناموسوڵمانە بتپەرستەکان دەنگیان دەبیست، جنێویان دەدا بەقورئان و بەو کەسەش کەناردوویەتی و بەوکەسەیش کەهێناویەتی بۆسەرزەوی (واتە: جمێنیان بەخوداو قورئان و پێغەمبەرو جوبرائیل)دەدا.

ئیتر خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردو فەرمووی بەپێغەمبەری خۆی: {وَلاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ} واتە: بەدەنگی بەرز لەناو نوێژدا قورئان مەخوێنە، تا کافرەکان نەیبیستن و جنێو نەدەن بەقورئان، {وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا} وە ئەوەندەیش دەنگ نزم مەکەرەوە کە هاوڕێکانت نەیبیستن و سەریان لێ تێک بچێ، ئەوەندە دەنگ هەڵبڕە کەهاوەڵانت گوێیان لێت بێت و گوێیان لەقورئانخوێندنەکەی تۆبێ و بەس

---

[٢٥٦] تەجرید/٤، ژمارە: ١٦٧٢، بخاری: ٤٧٢٢، مسلم: ٤٤٦ - مختصر صحیح مسلم: ٥، ژمارە: ٢١٤٦، شیحا: ١٠٠٠.

{وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً} بەڵكوو بەدەنگێ بیخوێنە کەلەناوەندی ئەم دووپایەدا بێ، نەزۆر بەرزو نەزۆر نزم. (تاج/٤ ز/١٨ ژ/٣٩٧٣ – سوورەتی ئیسراء).

## (٣٢) باب: الإستماع للقراءة
## گوێگرتن لە قورئانی پیرۆز داواکراوە

٢٥٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) فِي قَوْلِهِ تَعَالَى ( لاَ تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لتعجلِ بِهِ) قَالَ كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يُعَالِجُ مِنَ التَّنْزِيلِ شِدَّةً ، وَكَانَ يُحَرِّكُ شَفَتَيْهِ - فَقَالَ لِي ابْنُ عَبَّاسٍ أنا أُحَرِّكُهُمَا لَكَ كَمَا كَانَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يُحَرِّكُهُمَا فحرك شفتيه. فَقَالَ سَعِيدٌ أَنَا أُحَرِّكُهمَا كَمَا كَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ يُحَرِّكُهُمَا فَحَرَّكَ شَفَتَيْهِ - فَأَنْزَلَ اللّهُ عَزَّ وَجَلَّ ( لاَ تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ * إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ ) قَالَ جَمْعُهُ فِي صَدْرِكَ ثُمَّ تَقْرَؤُهُ . ( فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ ) قَالَ فَاسْتَمِعْ لَهُ وَأَنْصِتْ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا أَنْ تَقْرَأَهُ . قَالَ فَكَانَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) إِذَا أَتَاهُ جِبْرِيلُ - عَلَيْهِ السَّلاَمُ - اسْتَمَعَ فَإِذَا انْطَلَقَ جِبْرِيلُ قَرَأَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) كَمَا أَقْرَأَهُ).[٢٥٧]

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی و لەباوکی) فەرمووی: لەپێش دا کاتێ جوبرائیل (دروودی خودای لەسەر بێ) سرووش (وەحی)ی دەهێنا بۆ پێغەمبەر (دروودو سەلام و صەلاواتی خوداو فریشتەو ئەهلی ئیمانی لەسەر بێ و سەرو ماڵ و منداڵ و دایك و باوك و کەسوکارو هەست و نەست گشتی بەقوربانی گەردی بەرپێی دێنیکارانی گۆڕی پیرۆزی بێ) گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پەلە پەلی دەکردو خۆش خۆش لێوو زمانی خۆیی بۆدەبزاواندو، ئەم

---

[٢٥٧] تەجرید/١، ژمارە: ٥، بخاری: ٥، ٤٩٢٧، مختصر صحیح مسلم/٥، ژمارە: ٢١٧٣ – مسلم ترقیم شیحا: ١٠٠٤.

حاڵـە زۆر پەرێـشانی دەکـرد، لەبـەر ئـەوە ئـەم حاڵـەی پێـوە دیـاربوو، ئیبنـو عەبباس بەسەعیدی کوڕی جوبەیری فەرموو: وەکوو چۆن پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەربێ) لێوی بۆ ئەجووڵان، منیش ئاوا لێو بۆ تۆ دەجووڵێنم، هەتا لەو حاڵەتـەی پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) بەباشـی حـاڵی ببـی، وە ئیبنـو عەبباس بەهەمان شێوە لێوەکانی خۆی جووڵان.

سـەعیدی کـوڕی جوبـەیریش بەمووسـای کـوڕی ئـەبو عائیـشەی فـەرموو: منیش وەکوو چۆن ئیبنـو عـەبباس، لێوەکـانی خـۆیی دەجولانـد، منـیش ئاوەهـا لێوەکانی خۆم بۆ ئێوە دەجووڵێنم، وە سەعید لێوەکانی خۆی بزواند.

جا خودای باڵادەستو خـاوەن شـکۆ، ئـەم ئایەتانـەی نـاردە خـوارەوە بـۆی: {لاَ تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ، إِنَّ عَلَيْنَـا جَمْعَـهُ وَقُرْآنَـهُ} (سـورة القيامـة: سـورەتی ژمارە ٧٥ ئایەتی ژمارە ١٦ و ١٧).

واتە: لەکاتی وەرگرتنی قورئان دا، کاتـێ جوبـرائیـل بـە سـرووش دەیهێنـێ بۆت، پەلە پەلی لـێ مەکـەو، دەمـت نەیـەت بەیـەکاو مەترسـی ئـەوەت نـەبێ کـە بـۆت ڕەوان نـاکرێ، چـونکە ئێمـە بـەپێی بـەڵێنێك کەداومانـە پێـت، لەئایـەتی {سَنُقْرِؤُكَ فَلَا تَنسَى} دا، بەپێی ئەم بەڵێنـە لەسـەرمانە کـە کـۆی بکەینـەوەو لـە فەوتان ڕزگاری بکەینو زۆر بەجوانیش بەتۆی ڕەوان بکەین!

ئیبنـو عـەبباس (ڕەزای خـودا لـەخۆیو بـاوکی) فـەرمووی: واتـە: ئێمـە لەسـەرمانەو بەڵێنـەو دەیـدەین بـەتۆ کـە ئـەم قورئانـە بـەجوانی بـەتۆ ڕەوان بکەینو لەسەر زمانت ئاسانی بکەینو، بەدڵ باش باش تێی بگەیت، هەتا تـۆیش گەلی خۆت، سەرجەمی موسوڵمانان، فێری خوێندنو واتاو مانای قورئان بکەی؟

ئیبنـو عـەبباس (ڕەزای خودایـان لـێ بـێ = ڕەزای خـودا لـەخۆیو لـە عەبباسی باوکی) فەرمووی: ئیتر لەوە دوا کاتێ جوبرائیل سرووشی بۆی دەهێنا،

بەپێی ئەم ئایەتە: {فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ} کاتێ جوبرائیل دەیخوێندەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پێغەمبەر مات دەبوو، گوێی دەگرتو قسەی نەدەکرد، کاتێ جوبرائیل دەڕۆیشت، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) قورئانەکەی زۆر بەجوانیو بەڕەوانیو بەشێنەیی دەخوێند، دەق وەك ئەوەی کە جوبرائیل پێی خوێندبوو، وەك خودا بەڵێنو موژدەی ئەوەی پێ دابوو! (تاج/٤ ز/٥٨ ژ/٤١٩٥ — سوورەتی قیامەت).

٢٥٨- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) فِي قَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ (لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ) قَالَ: كانَ رسول اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُعالِج من التنزيل شِدَّةً وكانَ مِمّا يحرّكُ شَفَتَيْهِ فقالَ: ابن عباس فأنا أحَرّكُهُما لَكُمْ كَما كَانَ رسول الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُحَرِّكُهُما فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: {لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ، إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ} قَالَ: جمعه لَهُ في صَدْرِكَ وتَقْرَأُهُ فإذا قَرَأْناهُ فاتَّبِعْ قُرْآنه. قال: فاسْتَمِعْ لَهُ وَأَنْصِتْ. (ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنا بَيانَهُ) ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا أنْ تَقْرَأَهُ فَكَانَ رَسُولُ الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعْدَ ذلِكَ إذا أتاهُ جِبْرِيل استمع فإذا انطلقَ جبريلَ قَرَأَهُ النَّبِيّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَمَا قَرَأَهُ.[٢٥٨]

ئیبنوعەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەیفەرموو: لەپێش دا کاتێ جوبرائیل ـ دروودی خودای لەسەربێ ـ سرووشی دەهێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەلەپەلی دەکردو خۆش خۆش لێوو زمانی بۆ دەبزواندو ئەم حاڵە زۆر پەرێشانی دەکرد، لەبەرئەوە ئەم حاڵەی پێوەدیار بوو، ئیبنوعەبباس بەسەعیدی کوڕی جوبەیری فەرموو: وەکوو چۆن پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێوی بۆ ئەجوڵان منیش ئاوا لێو بۆتۆ دەجوڵێنم هەتا لەو حاڵەتەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەباشی حاڵی ببی، جا خودای باڵادەستو خاوەن شکۆ ئەم ئایەتانەی

[٢٥٨] تەجرید/١، ژمارە: ٥، بخاری: ٥، ٤٩٢٧، مسلم: ٤٤٨.

نارده خوارەوە بۆی: {لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ، إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ} (٧٥/ ١٦-١٧) لەکاتی وەرگرتنی قورئان دا، کاتێ جوبرائیل بەسروش دەیهێنێ بۆت، پەلە پەلی لێ مەکەو دەمت نەیە بەیەکاو مەترسی ئەوەت نەبێ کەبۆت رەوان ناکرێ، چوونکە ئێمە بەپێی بەڵێنێك کەداومانە پێت لەئایەتی (سنقرئك فلا تنسى) دا، بەپێی ئەم بەڵێنە لەسەرمانە کەکۆی بکەینەوەو لەفەوتان رزگاری بکەین و زۆر جوانیش بەتۆی رەوان بکەین، ئیبنوعەبباس (رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: (واتە: ئێمە لەسەرمانەو بەڵێنەو دەیدەین بەتۆ کەئەم قورئانە بەجوانی بەتۆ رەوان بکەین و لەسەر زمانت ئاسانی بکەین و بەدڵ باش باش تێ ی بگەیت، هەتا تۆیش گەلی خۆت فێری خوێندن و مانای قورئان بکەی! ئیبنوعەبباس (رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: ئیتر لەوە دوا کەجوبرائیل سرووشی بۆی دەهێنا، کەدەیخوێندەوە بۆی ئەو مات دەبوو، گوێی دەگرت و قسەی نەدەکرد، کاتێ دەڕۆیشت حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) قورئانەکەی بەرەوانی و بەشێنەیی دەخوێند، وەك خوا بەڵێن و مژدەی ئەوەی پێ دابوو (تاج/٧ ل/٢٢٩ ز/٥٨ = تاج/٤ ژ/٤١٩٥) = (تاج بەرگی/٧ ل/ ٢٢٩ زنجیرە/ ٥٨ فەرموودەی/ ١).

## (٣٣) باب: الجهر بالقراءة في الصبح والقراءة على الجن
## بە دەنگی بەرز قورئانخوێندن بۆ جنۆکەکان لە جەماعەتی نوێژی بەیانیدا

٢٥٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) قَالَ: مَا قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- عَلَى الْجِنِّ وَمَا رَآهُمْ، انْطَلَقَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- فِي طَائِفَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ عَامِدِينَ إِلَى سُوقِ عُكَاظٍ، وَقَدْ حِيلَ بَيْنَ الشَّيَاطِينِ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ وَأُرْسِلَتْ عَلَيْهِمُ الشُّهُبُ، فَرَجَعَتِ الشَّيَاطِينُ إِلَى قَوْمِهِمْ، فَقَالُوا: مَا لَكُمْ؟ قَالُوا: حِيلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ، وَأُرْسِلَتْ عَلَيْنَا الشُّهُبُ. قَالُوا: مَا ذَاكَ إِلاَّ مِنْ

شَيْءٍ حَدَثَ، فَاضْرِبُوا مَشَارِقَ الأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا، فَانْظُرُوا مَا هَذَا الَّذِي حَالَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ. فَانْطَلَقُوا يَضْرِبُونَ مَشَارِقَ الأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا فَمَرَّ النَّفَرُ الَّذِينَ أَخَذُوا نَحْوَ تِهَامَةَ - وَهُوَ بِنَخْلٍ - عَامِدِينَ إِلَى سُوقِ عُكَاظٍ وَهُوَ يُصَلِّي بِأَصْحَابِهِ صَلاَةَ الْفَجْرِ، فَلَمَّا سَمِعُوا الْقُرْآنَ اسْتَمَعُوا لَهُ وَقَالُوا: هَذَا الَّذِي حَالَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ. فَرَجَعُوا إِلَى قَوْمِهِمْ، فَقَالُوا: يَا قَوْمَنَا (إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا، يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ، فَآمَنَّا بِهِ وَلَنْ نُشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا). فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى نَبِيِّهِ مُحَمَّدٍ -صلى الله عليه وسلم-: (قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنَ الْجِنِّ).[٢٥٩]

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی و باوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نە قورئانی خوێندووە بۆ جنۆکەو نە بینیویانی، بەڵکوو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەگەڵ دەستەیێ لەهاوەڵانی دا، لەمەککەوە دەرچوون بۆ بازاڕی عوکاظ، کە شوێنی کۆبوونەوەی ساڵانەی کۆمەڵانی عەرەب بوو، لەو سەردەمەدا، هەتا سوود لەو بۆنەیە وەربگرێ، بۆ پەخشی ئیسلام‌و، عەرەبەکان بانگ بکا بۆ سەر ئایینی پیرۆزی ئیسلام، ئەمە لەو کاتەدا بوو کە شەیاتینی ڕێگەی ئەومیان لێ گیرابوو کە بەئاسمانا سەرکەون بۆ هەواڵ‌و دەنگوباس، هەر شەیتانێ هەوڵی ئەوەی بدایێ، بڵێسەی ئاگرو برووسکەو چەخماخە بەرەنگاری دەبوو، جاکاتێ شەیتانەکان بەنائومێدی دەگەڕانەوە، هۆزەکەیەان پێیان دەگوتن: ئەوە چیتانە؟ دەیانگوت: دەنگو باس‌و هەواڵی ئاسمانمان لێ قەدەغە کراوەو کەدەچین بۆ هەواڵهێنان بۆ ئاسمان، دەدرێینە بەر شووڵە ئاگرو برووسکە. جا شەیتان دەڵێ: دیارە کەشتێ رووی داوە لەجیهانا، بۆیە ڕێگەی ئاسمانتان لێ گیراوە، دەسادەی کون‌و قوژبنی

---

[٢٥٩] تەجرید/١، ژمارە: ٤٢٠، بخاری: ٧٧٣، مسلم ترقیم شیخ خلیل مأمون شیحا: ١٠٠٥ = مختصر صحیح مسلم/٢١٧٢.




سەرزەوی، چ لەرۆژ هەڵاتو چ لەرۆژئاوا، بگەڕێن‌و بزانن چی رووی داوە، کە بووە بەهۆی ئەم ئاگر بارانە.

جا ئەوانیش بەهەرچوار لادا بۆئەم مەبەستە دەردەچن‌و دەکەونە هەڵپەو جم‌و جووڵ‌و سوسەکردن، تا ئەوانەی کەبەرەو مەککە هاتن لەبەطنونەخلە تووشی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەبن، خەریك دەبێ بەرنوێژی نوێژی بەیانی بۆ هاورێکانی دەکا، کاتێ قورئانەکە دەبیستن، بەوردی گوێی لێ دەگرن‌و دەڵێن: ئەم قورئانەیە کە بووە بەهۆی ئەوەی کە ناهێڵێ ئێمە وەك جاران بەئاسمانا سەربکەوین‌و هەواڵ بگرین. ئەوسا دەگەڕێنەوە بۆلای گەلەکەیان‌و دەڵێن: ئەی گەلی ئێمە! {إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا، يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا} (سورة الجن٧٢/١-٢).

واتە: ئەی گەلی ئێمە! ئێمە قورئانێکمان بیستووە، جێگەی سەرسووڕمانە، ئەوەندە دلگیرو جوانە، رێگەی هەقناسین نیشانی کۆمەڵی ئادەمیزادو بەرەی پەری دەدا، ئێمەیش باوەڕمان پێ کردو چووینە سەر ئەو ئایینی یەکتا پەرستییە، کەئەم قورئانە بانگەوازی بۆدەکا، لەبەر ئەوە هەرگیز کەس ناکەین بەهاوبەش‌و هاوڕێ بۆخودای پەروەردگارمان. جا خودای گەورە ئەمەی ناردە خوارەوە بۆسەر پێغەمبەری خۆشەویستی خۆی (دروودی خوای لەسەربێ) {قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ} (الجن-١). واتە: ئەی رەهبەری خۆشەویست! تۆ بفەرموو: لەلایەنی خوداوە سرووش‌و وەحیم بۆ هاتووە، کە کۆمەڵێ لەبەرەی جنۆکە گوێیان لێ ڕاگرتووم لەکاتی دەوری قورئان دا.

تا تەواوی داستانەکە، کەوا لەسەرەتای سوورەتی جین دا، کە قسەو گوفتوگۆی جنۆکەکان بەدەق بەنیگا بۆ پێغەمبەر هاتبوو. (تاج/٤ ز/٥٥ ژ/٤١٨٩-سورەتی جین).

## (٤٩) باب: دنو المصلي من السترة
## ئەندازەی نزیکی نوێژکەر لە بەربەست

٢٨٥- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ (رَضِيَ اللّٰهُ عنهما) قَالَ: كَانَ بَيْنَ مُصَلَّى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَبَيْنَ الْجِدَارِ مَمَرُّ الشَّاةِ). {الحديث/١١٣٤. تجريد البخاري/١/٣٠٩، ژمارە: ٢٩٨ = ٤٩٦، ٧٣٣٤}: [٢٨٥]

سەهلی کوڕی سەعدی ئەل‌ساعیدی (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: نوێژگا (موصەللا)کەی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لەجێگەی پێکانیەوە، هەتا دیوارەکەی بەردەمی، بەقەد گوزەرگای مەڕێ، یا بزنێ، دەبوو). {تاج/١، زنجیرە: ٦٧، ژمارە: ٤٤٦}.

٢٨٦- عَنْ سَلَمَةَ قَالَ كَانَ جِدَارُ الْمَسْجِدِ عِنْدَ الْمِنْبَرِ مَا كَادَتِ الشَّاةُ تَجُوزُهَا. [٢٨٦]

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (دیواری مزگەوتەکەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەئاستی دوانگەکەی، بە ئاستەم مەڕو بزن بەنێوانیاندا تێ دەپەڕێ).

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: جاران پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) ئەوکاتە بەرنوێژی نوێژی شێوانی بۆ دەکردین، کە گۆی خۆر ئاوادەبێ).

---

[٢٨٥] تجرید/١، ژمارە: ٢٩٨ = ٤٩٦، ٧٣٣٤، مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٢٥٩ = ترقیم شیحا: ١١٣٤.

[٢٨٦] مسلم: ١١٣٥، بخاری: ٤٩٧، ٥٠٢ + مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٢٢٣.

**روونكردنەوە:**

رشتەی ئەم فەرموودەیە لە بوخاریدا، لە رشتە (سند)ە سێ كەسیەكانی بوخارییە، كە ئاوایە:

١- مەكی كوڕی ئیبراهیم.

٢- یەزیدی كوڕی ئەبی عوبەید.

٣- سەلەمەی كوڕی ئەكوەع، بەڵام لە رشتە چوارینەكانی ئیمامی موسلیمە، كە ئەم زاتانەن:

- ماموستاكەی موسلیم: قوتەیبەی كوڕی سەعید.
- حاتەمی كوڕی ئیسماعیل، كە ماموستای قوتەیبەیە.
- یەزیدی كوڕی ئەبو عوبەید، كە تابیعییە.
- سەلەمەی كوڕی ئەكوەع كە هاوەڵی پێغەمبەرە.

لەصەحیحی موسلیمدا، لە رشتەی چوارینی بەرزتر تیانیە، بەڵام لە بوخاریدا زیاتر لەبیست فەرموودەی واتیا، كە رشتەكەیان (ثلاثي) سێ كەسییە، لەم لایەنەوە بوخاری یەكەمەو خاوەنی ئەم شانازییەیە.

سەلەمەی كوڕی ئەكوەع، ناوی تەواوی: سەلەمەی كوڕی عەمری كوڕی ئەكوەعە، ئامادەی غەزای حودەیبییە بووە، ئامادەی پەیمانی خۆشنوودیی بووە، كە ناودارە بە (بیعة الرضوان) كە لەحودەیبییە كرا.

حەفتاو حەوت فەرموودەی هەیە، شازدەیان پەسەندی هەردوو پێڕی بوخاریو موسلیمن، بیستو یەكیان وان لە بوخاریدا، بیستو پێنجیان وان لە موسلیمدا، سەرجەمی فەرموودەكانی لە صەحیحەیندا دەكاتە: ١٦ + ٥ + ٩ = ٣٠ سیی فەرموودە.

سەلەمە پیاوێكی ئازای تیر ئەندازی تیژڕەو بوو، لە راكردندا وڵاخی بەرزەی بەجێ دەهێشت، پیاوێكی بەهرەمەندی خێركەر بوو، كۆمەڵەی

فەرمووده زانە گەورەكان، كەناودارن بە (الجماعة) فەرموودەیان لە سەلەمەوە گێڕاوەتەوە، وەك: شافیعیو ئیمام أحمدو بوخاریو موسلیمو ئەبو داوودو تیرمیزیو نەسائیو بەیهەقیو دارە قوطنیو ... تاد. لەرۆژی پەیمانی خۆشنوودیدا سێجار پەیمانی بەست لەگەڵ پێغەمبەردا، لە سەرەتای خەڵكەكەوەو لە ناوەڕاستەوەو لەدوا دوایانەوە، دەڵێن: گورگ قسەی لەگەڵدا كردووە، سەلەمە دەفەرموێ: لەپێش ئیسلام بوونما، جارێ گورگێ ئاسكێكی رفاند، نیشتمە سەری لە گورگەكەم سەندەوە، گورگەكە گوتی: خانە خراپ چیتە بەسەر منەوە رزقم دەبڕی، خۆ ئەمە مالّی تۆ نییە، رزقو رۆژییەكە، خودا رەخساندوویەتی بۆم، كەچی تۆ لێم دەسەنیتەوە، منیش گوتم: ئەی بەندەكانی خودا! بەڕاستی ئەمە شتێكی سەیرە، خۆ ئەوەتە گورگ قسە دەكا!

كەچی گورگەكە گوتی: لەمە سەیرتر ئەوەیە، كە پێغەمبەری خوا والەناو ئەو بنكە دارخورمایانەدا، بانگتان دەكا بۆسەر دینی هەقو خوا پەرستی راستو دروست، كەچی ئێوە هێشتا هەر دەست لەبتپەرستی هەڵناگرن!! ئیتر منیش رێك چووم موسوڵمان بووم.

كوڕەكەی دەیفەرموو: سەلەمەی باوكم قەت درۆی نەدەكرد، سەلەمە دەیفەرموو لە خزمەت پێغەمبەر خۆیدا ئامادەی حەوت غەزا بووم، لەحەوت غەزای تریشدا بەشداریم كردووە.

سەلەمە لەتەمەنی هەشتا ساڵیدا، لە مەدینە لەساڵی حەفتاو چواری كۆچیدا بەمردنی خوا مردووە، (رەزای خودای گەورەی لێ بێ) . {تەجریدی بوخاری/١، لاپەڕە: ١١٣ چاپی یەكەم. ژمارە: ١٠٩/٩٠ + عَيْني/٢/١٥٣} .

٢٨٧- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوعِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَهُ كَانَ يُصَلِّي عِنْدَ الْأُسْطوَانَةِ الَّتِي عِنْدَ الْمُصْحَفِ فَقُلْتُ يَا أَبَا مُسْلِمٍ أَرَاكَ تَتَحَرَّى الصَّلَاةَ عِنْدَ هَذهِ الْأُسْطوَانَةِ؟ قَالَ فَإِنِّي رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَحَرَّى الصَّلَاةَ عِنْدَهَا).(الحديث:٥٠٢).[٢٨٧]

یەزیدی کوڕی ئەبوعوبەید فەرمووی: سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (ڕەزای خوای لێ بێ) دەستووری وابوو لەلای کۆڵەکەکەی لای صندووقی قورئانەکەدا منەیی نوێژی دەکرد، منیش عەرزیم کرد: ئەی ئەبوموسلیم! سەرمەنجت دەدەم لەلای ئەم کۆڵەکەیەدا منەیی نوێژ دەکەی، هۆی ئەوە چییە؟ فەرمووی: دیومە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێرەدامنەیی نوێژی دەکرد.(تاج/١/٢٣٦/٢=ز-٦٧ ژ-٤٤٧).

## شیکردنەوە:

ئەم کۆڵەکەیە کۆڵەکەی ناوەڕاستە لەکۆڵەکەکانی ڕەوضەی موکەڕڕەمە، کەوا لەمزگەوتەکەی پێغەمبەر، لەمەدینەی نازدار، ناسراوە بەکۆڵەکەی کۆچکاران (اسطوانة المهاجرين).

دەگێڕنەوە: عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەیفەرموو: (ئەگەر مەردمەکە بەمە بزانن لەسەری دەیکەن بەشەڕە تیر، چونکە هەرکەسەیان خۆی دەیویست لەوێدا نوێژبکا). عائیشە بەنهێنی ئەم ڕازەی لای ئیبنوزوبەیر درکاندبوو، بۆیە ئیبنوزوبەیر زۆر لەوێدا نوێژی دەکرد.

---

[٢٨٧] تجرید/١، ژمارە: ٣٠٠، بخاری: ٥٠٢، مسلم: ٥٠٨ - ١١٣٥.




## (٥١) باب: الإعتراض بين يدي المصلي
## ڕاكشان لەبەردەم نوێژخوێندا

٢٨٨- عَنْ عَائِشَةَ أَخْبَرَتْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ - صـلى الله عليـه وسـلم - كَـانَ يُصَلِّي وَهْيَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ عَلَى فِرَاشِ أَهْلِهِ ، اعْتِرَاضَ الْجَنَازَةِ .(٢٨٨)

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: گەلێ جار وادەبوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نوێژی دەکرد، من لەوکاتەدا، وەك تەرم، لەبەر دەمیدا، لەسەر نوێنی هاوسەرەکەی رادەکشام، لەنێوانی ئەوو لەنێوانی رووگەکەیدا.

٢٨٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (كَانَ النَّبيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي وَأَنَا رَاقِدَةٌ مُعْتَرِضَةٌ عَلَى فِرَاشِهِ فَإِذا أَرَادَ أَنْ يُوتِرَ أَيْقَظَنِي فَأَوْتَرْتُ). (الحـديث: ٥١٢ طرفه في: ٥٩٩٦).(٢٨٩)

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: گەلێ جار وادەبوو من لەسەر نوێنەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رادەکشام‌و دەخەوتم، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپشت منەوە نوێژی دەکرد، من لەسەرشێوەی دانانی تەرم لەبەردەم نوێژکەیدا، رادەکشام‌و دەکەوتمە نێوانی پێغەمبەرو رووگەیەوە، کەواتە نوێژ کردن لەسەر ئەم شێوەیە دروستەو قەیدی نییە، جاکاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیویست نوێژی وەتر بکا، منی لەخەوهەڵدەستان، وەترەکەمم دەکرد.

٢٩٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عنها)،(وَذُكِرَ عِنْدَهَا مَا يَقْطَعُ الصَّلاَةَ: الْكَلْبُ وَالْحِمَارُ وَالْمَرْأَةُ) فَقَالَتْ عَائِشَةُ: قَدْ شَبَّهْتُمُونَا بِالْحَمِيرِ وَالْكِلاَبِ، وَاللَّهِ لَقَدْ

---

(٢٨٨) بخاري: ٥١٥ كتاب الصلاة، باب من قال: لايقطع الصلاة شئ. مسلم ترقيم شيحا: ١١٤٠.

(٢٨٩) تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٣٠٦، بخاري: ٥١٢، ٥٩٩٦. مسلم في الصلاة ژمارە: ٥١٢ = ١١٤١.

رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّى وَأَنَا عَلَى السَّرِيرِ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ مُضْطَجِعَةٌ، فَتَبْدُو لِى الْحَاجَةُ فَأَكْرَهُ أَنْ أَجْلِسَ فَأُوذِىَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَنْسَلُّ مِنْ عِنْدِ رِجْلَيْهِ). {الحديث/١١٤٣. تجريد البخارى/١/٣١١، رقم: ٣٠٣ = ٥٠٨، ٣٨٢ = فتح البارى، تاج/١، زنجيره: ٧١، ژماره: ٤٦٦} :[290]

هەندێ کەس لەخزمەتی عائیشەی دایکی موسوڵماناندا (ڕەزای خودای لێ بێ) باسی ئەو شتانەیان دەکرد کە گوایە ئەگەر بە بەردەم نوێژکەردا بڕۆن نوێژەکەی دەبڕن، وە گوتیان: سەگو کەرو ژن ئەگەر بە بەردەم نوێژدا بڕۆن، نوێژەکە دەبڕن!

عائیشەیش فەرمووی: ئەمە چۆن قسەیەکە، ئێمەی ژنان دەکەن بە هاوتای سەگو کەر؟! شتی وا ڕاست نییە، چونکە ڕێکەوتووە من خۆم لەسەر شێوەی دانانی تەرم لەبەردەم نوێژکەر لەسەری، ڕاکشاوم لەسەر تەختێ، لەبەردەم پێغەمبەردا، لەوکاتەدا نوێژی دەکرد، من لەسەر ئەو حاڵە لە بەینی پێغەمبەرو قیبلەکەیدا بووم، جا وادەبوو ئیشێکم بۆ پەیدا دەبوو، حەزم نەدەکرد کە ڕێکو ڕاست لەبەردەم نوێژەکەیدا دابنیشم، نەبادا ئازاری پێغەمبەر بدەم، لەبەرئەوە بە هێواشی لەلای پاینی چارپایەکەوە خۆم دەدزییەوەو دەچووم بۆ کارەکەمو پێغەمبەریش بەردەوام بوو لەسەر نوێژەکەی}.

٢٩١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (أَعَدَلْتُمُونَا بِالْكَلْبِ وَالْحِمَارِ؟ لَقَدْ رَأَيْتُنِي مُضطجِعَةً عَلَى السَّرِيرِ فَيَجِيءُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيَتَوَسَّط السَّرِيرَ

---

[290] تجريد البخارى = مختصر صحيح البخارى/١، ژمارە: ٣٠٣ = ٥٠٨، ٣٨٢. مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٢٦٠ = ٥١٢ = ١١٤٣.

فَيُصَلِّي فَأَكْرَهُ أَنْ أُسَنِّحَهُ فَأَنْسَلُّ مِنْ قِبَلِ رِجْلَيْ السَّرِيرِ حَتَّى أَنْسَلَّ مِنْ لِحَافِي). (الحديث: ٥٠٨ طرفه في: ٣٨٢).[٢٩١]

هەندێ کەس لەخزمەتی عائیشەی دایکی موسوڵمانانندا (ڕەزای خوای لێ بێ) باسی ئەوشتانەیان دەکرد کەگوایە ئەگەر بەبەردەم نوێژکەردا بڕۆن نوێژەکەی دەبڕن، وەگوتیان: سەگو کەروژن نوێژ دەبڕن! عائیشەیش فەرمووی: ئەمە چۆن قسەیەکە، ئێمەی ژنان دەکەن بەهاوتای سەگو کەر؟!

شتی وا ڕاست نییە، چونکە ڕێکەوتووە من خۆم لەسەر تەخت ڕاکشاوم کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی دەهاتەوە، ڕێك لەناوەڕاستی چارپایەکەی من لەسەری ڕاکشابووم ڕادەوەستاو نوێژی دادەبەست، جائەگەر لەوکاتەدا بۆ کارێ هەڵبستامایە حەزم نەدەکرد کەڕێك ڕووبەڕووی حەزرەت ڕاست ببمەوە، لەبەرئەوە بەهێواشی لەلای پاینی چارپایەکەوە خۆم دەدزییەوەو خۆم لەژێر لێفەکەمەوە دەکێشایەوە. (ت/١/٢٤٤/٤ = ز-٧١ ژ٤٦٦ = ش/د/ ن).

٢٩٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهَا قَالَتْ: (كُنْتُ أَنَامُ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَرِجْلَايَ فِي قِبْلَتِهِ فَإِذَا سَجَدَ غَمَزَنِي فَقَبَضْتُ رِجْلَيَّ فَإِذَا قَامَ بَسَطْتُهُمَا قَالَتْ وَالْبُيُوتُ يَوْمَئِذٍ لَيْسَ فِيهَا مَصَابِيحُ). (الحديث: ٣٨٢ أطرافه في: ٣٨٣، ٣٨٤، ٥٠٨، ٥١١، ٥١٢، ٥١٣، ٥١٤، ٥١٥، ٥١٩، ٩٩٧، ١٢٠٩، ٦٢٧٦).[٢٩٢]

عائیشەی هاوسەری حەزرەت (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەسەر عائیشە بێ) دەفەرموێ: جاری وادەبوو لەبەردەمی پێغەمبەردا لەسەر نوێنەکەم دەخەوتم، پێغەمبەریش لەهەمان نوێن نوێژی دەکرد، هەردوو

---

[٢٩١] تجريد/١، ژمارە: ٣٠٣ = ٥٠٨، ٣٨٢. مسلم: ٥١٢، ١١٤٢.

[٢٩٢] تەجرید/١، ژمارە: ٢٤٣ = بخاری: ٣٨٢، مسلم: ٥١٢ = ١١٤٥.

قاچیشم لەوکاتەدا لەرووی رووگەوە لەجێ سووژدەکەیدا دەبوو، جاکەدەیویست بەدەست تێوەی دەژەندم، منیش قاچم هەڵدەکێشا تاسوژدەکەی تەواو دەکرد جا کەئەو هەڵ دەسایەوە منیش دیسانەوە قاچم رادەکێشایەوە، ئەوسەردەمە هێشتا ماڵەکانمان چرای تیانەبوو، لەبەرئەوە ئەم دەزانی کەکەی کوڕنووش دەبا، دەنا پێش ئەوەی تێوەم بژنێ جێ کوڕنووشەکەم بۆی چۆڵ دەکرد. (ت/١/٢٤٤/٥ = ز-٧١ ژ-٤٦٧).

٢٩٣- عَنْ مَيْمُونَةَ قَالَتْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - يُصَلِّى وَأَنَا حِذَاءَهُ وَأَنَا حَائِضٌ وَرُبَّمَا أَصَابَنِى ثَوْبُهُ إِذَا سَجَدَ . قَالَتْ وَكَانَ يُصَلِّى عَلَى الْخُمْرَةِ[٢٩٣].

مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خوا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهاوسەرەکانی) فەرمووی: گەلێ جار رێ دەکەوت من بێنوێژ دەبووم، لەماوەی بێنوێژییەکەما نوێژم نەدەکرد، وادەبوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر بەرماڵۆچکەکەی کەلەپووشی خورما دروست کرابوو نوێژی دەکرد، منیش لەسەر ئەوحاڵە لەئاستی کوڕنووشگاکەی رادەکشام، کە حەزرەت (رەزای خوای لێ بێ) کڕنووشی دەبرد جلەکانی بەر من دەکەوت، کەواتە: زاتی بێنوێژ پاکە، لێکەوتنی زیانی نییەو نوێژ بەشتی وا پووچ نابێتەوە.

---

[٢٩٢] تەجرید/١، ژمارە: ٢١٥ = بخاری: ٣٣٣، مسلم: ١١٤٦.

## (٥٢) باب: الصلاة في ثوب واحد وصفة لبسه
## نوێژكردن بەیەك لۆجلەوە، وەچۆنیێتی لەبەركردنی

٢٩٤- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الصَّلاَةِ فِى الثَّوْبِ الْوَاحِدِ؟ فَقَالَ: « أَوَلِكُلِّكُمْ ثَوْبَانِ؟». {الحديث/١١٤٨. تجريد البخارى/١، لاپەڕە: ٢٤٠، ط/١، رقم: ٢٢٥ = ٣٥٨ فتح البارى}: [٢٩٤]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هەڵسا لە پێغەمبەری پرسی: ئایا نوێژ بەیەك لۆ جلەوە دروستە؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوە تۆ دەڵێی چی، ئەی چۆن دروست نییە، گوا هەركەسێ لە ئێوە بگری، دوو لۆ جلی هەیە؟).

٢٩٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (لَا يُصَلِّي أَحَدُكُمْ فِي الثوْبِ الْوَاحِدِ لَيْسَ عَلَى عَاتِقَيْهِ شَيْءٌ). (الحديث ٣٥٩ طرفه في: ٣٦٠). [٢٩٥]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەیەك پارچە جلی واوە نوێژ مەكەن، كەنەگاتەوە بەسەر هەردوو شانتانا). (ت/١/٢١٦/٢) = ز-٥٥ ژ-٣٩٧.

٢٩٦- عَنْ عُمَرَ بْنَ أَبِى سَلَمَةَ (رَضِىَ اللَّهُ عنهما) قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّى فِى ثَوْبٍ وَاحِدٍ مُشْتَمِلاً بِهِ فِى بَيْتِ أُمِّ سَلَمَةَ، وَاضِعًا

---

[٢٩٤] تجريد/١، ژمارە: ٢٢٥ = ٣٥٨، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٢٣٠ = ١١٤٨، مسلم ترقيم شيحا.

[٢٩٥] تجريد/١، ژمارە: ٢٢٦ = ٣٥٩، بخارى/مسلم: ٥١٦ - ١٦٦٤ شيحا.

طَرَفَيْـهِ عَلَـى عَاتِقَيْـهِ). {الحـديث/١١٥٢. تجريـد البخـاري/١/٢٣٩، رقـم: ٢٢٣ = ٣٥٤، ٣٥٥، ٣٥٦ = فتح الباري} : [٢٩٦]

عومەری كوڕی ئەبو سەلەمە (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەرم دی، بەیەك لۆ جلەوە نوێژی دەكرد، ئالاَندبووی لەخۆیەوە، هەردوو چمكەكەی لەسەر هەردوو شانی راستو چەپ كردبوو، لەوكاتەدا لەماڵی ئوم سەلەمە بوو).

روونكردنەوە:

عومەری كوڕی ئەبو سەلەمە (رەزای خودای لێ بێ) زڕ كوڕی پێغەمبەر بوو، كوڕی ئوممسەلەمەی هاوسەری پێغەمبەرە، لە خاكی حەبەشە لەدایك بووە، چەند فەرموودەیەكی لە صەحیحەیندا هەیە، تەنیا دوو فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە، لەسەردەمی جێنشینی عەبدولـەلیكی كوڕی مەڕواندا، لە مەدینە، لە هەشتاو سێی كۆچیدا، بەمردنی خودا مردووە، لە لایەنگیرانی ئیمامی عەلی بوو، لە جەنگی جەمەلدا لەگەڵ عەلی بوو، هەندێ بەهەڵە دەڵێن: لەو جەنگەدا كوژراوە. {بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ١٩٢، ژمارە: ١٠١٦و ژمارە: ١٠١٧ + تاج/٤، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٢٩٦٢ + تاج/٤، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٣٧ + تەجرید/٢، لاپەڕە: ١٢٨ چاپی یەكەم، ژمارە: ٧٠٥ = ١٤٦٧، ٥٣٦٩ فتح الباری}.

٢٩٧- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (خَرَجْتُ مَعَ النَّبِـيِّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي بَعْض أَسْفَارِهِ فَجِئْتُ لَيْلَةً لِبَعْض أَمْرِي فَوَجَدْتُهُ يُصَلِّي وَعَلَـيَّ ثـوْبٌ وَاحِدٌ فَاشْتَمَلْتُ بِهِ وَصَلَّيْتُ إِلَى جَانِبِهِ فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ مَا السُّرَى يَـا جَـابِرُ فَأَخْبَرْتُـهُ بِحَاجَتِي فَلَمَّا فَرَغْتُ قَالَ مَا هَذا الِاشْتِمَالُ الَّذي رَأَيْتُ قُلْتُ كَانَ ثوْبٌ يَعْني ضاقَ قَالَ

---

[٢٩٦] تجرید/١، ژمارە: ٢٢٣ = بخاری: ٣٥٤، مختصر صحیح مسلم/٢٣١ = ١١٥٢.

فَإِنْ كَانَ وَاسِعًا فَالْتَحِفْ بِـهِ وَإِنْ كَـانَ ضَـيِّقًا فَـاتَّزِرْ بِـهِ). (الحـديث ٣٦١ طرفـه في: ٣٥٢).[٢٩٧]

ئەمە دەقی عەرەبی تەجرید، ژمارە (٢٢٨) بوو.

جـابیری کـوڕی عەبـدوڵڵا (ڕەزای خوایـان لـێ بـێ) فـەرمووی: لەسـەفەرێکا لەخزمەتی حەزرەتدا بووم، شەوێ بۆ ئیشێکی خـۆم چـووم بـۆ خزمـەتی، کـاتێ چووم خەریکبوو نوێژی دەکرد، منیش یەك پارچە جلم پێوە بوو، راستو چەپ ئالاندبووم لەخۆمـەوەو، لەتەنیـشتیەوە دەسـتم کـرد بەنوێـژ کـردنو پـەیڕەوی (ئیقتدا)م پێـی کـرد، کـاتێ لەنوێژەکـەی بـۆوەو رووی لەڕووگـە نـەما فـەرمووی: (ئەی جابیر! بەم شەوە خێـرە هـاتووی؟) منـیش کارەکـەی خـۆمم عـەرزی کـرد، جاکاتێ ئیشەکەمم تەواو کرد، حەزرەت (ڕەزای خوای لـێ بـێ) فـەرمووی: (ئـەی جابیر! ئەگەر جلەکە فەرەح بوو دوو چمکەکەی راستو چەپ بکە، بەڵام ئەگـەر تەسك بوو بیبەستە بەکەمەرتەوە!)

**ڕوونکردنەوە:**

بۆ حاڵیبوونی تەواو ئەم فەرموودەیە لەتاجول ئوصووڵ راگوێز دەکـەین، جابیر فـەرمووی: (.. پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) هەڵسا نوێـژ بکـا، منیش یەك عەبای میلدارم لەبـەردا بـوو، ویـستم دوو چـمکەکەی راسـتو چـەپ بکـەم، پیامـا نەگەیـشتەوە، عاباکـە هـەنێ ڕێـشوو گـوێزو گوڵینکـەی پێـوە بـوو، سـەربەرەوخوارم کـردەوەو ئـەنجا لـەژێر هـەردوو باڵمـەوە هـەردوو چـمکەکەیم ڕاسـتو چـەپ کـردو، لەسـەر سـێنگم گـرێم دانو ملـم کـووڕ کـردەوە بەسـەریاو، بەملم گـرتم تابەرنەبێتـەوە، ئـەنجا چـووم لـەلای چـەپی پێغەمبـەرەوە وەسـتام،

---

[٢٩٧] تجرید/١، ژمارە: ٢٢٨ = بخاری: ٣٦١، مسلم: ٣٠١٠ - ٧٤٣٧.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی گرتمو سووڕاندمییەوەو، بردمی لەلای راستی خۆیەوە وەستاندمی، لەپاش دا جەبباری کوڕی صەخریش هاتەوەو، دەستنوێژی گرتو، هات لەلای چەپی پێغەمبەرەوە وەستا، حەزرەت (رەزای خوای لێ بێ) دەستی هەردوکمانی گرتو پاڵی پێوەناین بۆ دواوە، هەتاڕێك لەپشتی خۆیەوە ڕیزی کردینو رایوەستانین، ئاگام لێ نەبوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەرنجی منی دەدا، لەپاشا کەهەستم پێ ی کرد بەدەستی ئاوای کرد، واتە: ناوقەدت ببەستە، جاکاتێ لێ بۆوە، فەرمووی: (ئەی جابیر!) گوتم: بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (ئەگەر جلەکە فەرەح بوو دوو چمکەکەی راستو چەپ بکە، بەلاّم ئەگەر تەسك بوو بیبەستە بەکەمەرتەوە...) تاکۆتایی فەرموودەکە، بڕوانە: (بەرگی چوارەمی تاجولئوصول. کوردی لاپەڕە - ٣١٥ - فەرموودەی ژمارەیەك، زنجیرەی - ١١٠ = تاج-٢ ز-١١٠ ژ-٣١٨٥).

ئەمەیش دەقی کوردی فەرموودەکەی ئێرمیە:

موحەممەدی کوڕی مونکەدیر (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: جابیری کوڕی عەبدوڵلاّم بینی، لەیەك لۆ جلدا نوێژی دەکرد، وە فەرمووی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم بینی بەیەك لۆ جلەوە نوێژی دەکرد.

## ٥- كتاب المساجد ومواضع الصلاة
## نامەی مزگەوتو نوێژگا

٢٩٨- عَنْ أَبِى ذَرّ (رَضِي اللهُ عَنْـهُ) قَـالَ: قُلْـتُ: يـا رَسُـولَ اللّـهِ أَيُّ مَـسْجِدٍ وُضِعَ فِى الأَرْضِ أَوَّلُ؟ قَالَ: الْمَسْجِدُ الْحَرَامُ، قُلْتُ: ثُمَّ أَيُّ؟ قَالَ: الْمَسْجِدُ الأَقْصَى، قُلْتُ: كَـمْ بَيْنَهُمَـا؟ قَـالَ: أَرْبَعُـونَ سَـنَةً، وَأَيْنَمَـا أَدْرَكْـتَ الـصَّلاَةُ فَـصَلِّ فَهُـوَ مَـسْجِدٌ». {الحديث/١١٦١. تجريد/٤/٤٠، رقم/١٣٥٢ = ٣٣٦٦، ٣٤٢٥}: [٢٩٨]

ئەبو زەڕ (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لە پێغەمبەرم پرسی: کام مزگەوتە یەکەم مزگەوتە کە لەسەر ڕووی زەوی بۆ خوا پەرستی دروست کراوە؟ فەرمووی: (مەسجید ولحەرام، کەوا لە مەککە). گوتم: ئەی پاش ئەو کام مزگەوتە دروست کراوە؟ فەرمووی: (مەسجیدول ئەقصا). گوتم: چەند ساڵیان بەین بووە؟ فەرمووی: (چل ساڵ، پاش ئەمەش زەوی هەمووی بۆ تۆو بۆ هەموو موسوڵمانێ، لە حوکمو بڕیاری مزگەوتدایەو، لەهەرکوێ نوێژت لێ بوو نوێژی خۆت بکەو مەرج نییە کە نوێژکردن هەر لەناو مزگەوت دابێو بەس). {ریاض/٤، لاپەڕە: ١٣٦٩، ژمارە: ١٨٦٧/٦٠، زنجیرە: ٣٧٠} + {تاج/١/٣٤٩، زنجیرە: ١١٥، ج/١، ژمارە: ٦٩١ و ٦٩٢}.

٢٩٩- عنْ جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللّهِ (رَضِـيَ اللهُ عَنْهـا) (أَنَّ النَّبِـيَّ صَـلَّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ قَالَ أُعْطِيتُ خَمْسًا لَمْ يُعْطَهُنَّ أَحَدٌ مِنَ الأنبيـاءِ قَبْلِـي نُـصِرْتُ بِالرُّعْـبِ مَـسِيرَةَ شَهْرٍ وَجُعِلَتْ لِي الْأَرْض مَسْجِدًا وَطهُورًا فَأَيُّمَا رَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي أَدْرَكَتْهُ الـصَّلَاةُ فَلْيُـصَلِّ

---

[٢٩٨] تجريد/٤، ژمارە: ١٣٥٢ = بخاری: ٣٣٦٦، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٢٣٥ = مسلم: ١١٦١ شيحا.

وَأُحِلَّتْ لِي الْمَغَانِمُ وَلَمْ تَحِلَّ لِأَحَدٍ قَبْلِي وَأُعْطِيتُ الشَّفَاعَةَ وَكَانَ النَّبِيُّ يُبْعَثُ إِلَى قَوْمِهِ خَاصَّةً وَبُعِثْتُ إِلَى النَّاسِ عَامَّةً). (الحديث ٣٣٥ طرفاه في: ٤٣٨، ٣٢٢٢).[٢٩٩]

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (پێنج بەهرەی گەورەم لەلایەنی پەروەردگارەوە پێ خەڵات کراوە، ئەم پێنج بەهرەیە بەسەر یەکەوە بەهیچ پێغەمبەرێکی تر لەپێش منەوە بەکەس نەدراوە:

**یەکەم:** تاماوەی مانگەڕێ یەك، دوژمن لەسامو شکۆی خۆمو لەشکرم زەندەقیان دەچێو، هەر بەبیستنی ناوو شۆرەتی ئازایی سوپای ئیسلام لەسایەی خوداوە، ورە بەردەدەنو خۆگرییان دەڕوخێ، ئەمەیش بووە بەهۆی سەرکەوتن بۆ ئێمە،

**دووەم:** ڕووی زەویش هەمووی بۆ خۆمو نەتەوەی ئیسلام کراوە بەمزگەوتو، لەهەرشوێنێ مزگەوتی لێ نەبوو، لەسەر ڕووی زەوی نوێژی خۆمانی لێ دەکەینو، مەرج نییە کەئێمە وەك نەتەوەکانی تر هەر لەناو کڵێسەو پەرستگاکاندا نوێژ بکەینو بەس! لەهەمان کاتدا خۆڵەکەشی پاكو پاکەوەکەرە. لەکاتی پێویستدا خۆمانی پێ پاك دەکەینەوەوتەیەممومی پێ دەکەین، کەواتە: هەر موسوڵمانێ، لەهەرکوێ یەك بوو، خوای مزگەوتی لێ بوو یانا، وەخوای ئاو هەبوو بۆ دەستنوێژو شتی وا یانا، بابەکەماڵی حەواوەیی نوێژی خۆی لێ بکا.

**سێیەم:** ماڵی تاڵانی بێبڕواکانیش حەڵاڵ کراوە بۆ منو بۆ نەتەوەی ئیسلامم. لەپێش مندا بۆ کەسی تر خواردنی ماڵی تاڵانی کافران حەڵاڵ نەبووە،

---

[٢٩٩] تجرید/١، ژمارە: ٢١٧ = بخاری: ٣٣٥، مسلم/شیحا: ١١٦٣.

**چوارەم:** لەرۆژی قیامەتدا لەخزمەت خودای پەروەردگاردا تکاو شەفاعەت بۆ هەرکەسێ بکەم خودا تکاکەم قەبووڵ دەکا،

**پێنجەم:** جاران لەپێش مندا زوربەی پێغەمبەرەکان کەدەکران بە پێغەمبەر، بەتایبەتی رەوانە دەکران بۆسەر هۆزەکەی خۆیان‌و بەس، بەڵام من لەسایەی خوداوە، خودا کردوومی بە پێغەمبەرو رەوانەی کردووم بۆسەر هەمووکەسێ بەگشتی واتە: بۆ سەر بەرەی مرۆڤ). (ت/ ٤/٣٤٣/١ = ز-٥ ژ-٣٦ + ز-١١٤ ژ-٦٧٨).

ئەمە دەقی ژمارە (٢١٧)ی تەجریدە، ئەمەیش دەقی ئەم فەرموودەیە، لە پوختەی موسلیما، ژمارە (٢٥٧):

لە ئەبو هورەیرەوە (رەزای خودای لێ بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەم شەش خەڵاتە باوم دراوە بەسەر پێغەمبەرانی پێش خۆماو، ئەم شەش بەهرە گەورەیەم لە لایەنی پەروەردگارەوە پێ خەڵات کراوە، ئەم شەش بەهرەیە بەسەر یەکەوە، لەپێش مندا، بە هیچ پێغەمبەرێکی تر نەبەخشراوە:

١- فەرمایشتی پڕ واتاو فەرموودەی کۆ گیرم پێ بەخشراوە.

٢- تا ماوەی مانگە رێیەك دوژمن لەسام‌و شکۆی خۆم‌و لەشکرم زەندەقیان دەچێ‌و، هەر بە بیستنی ناوو شۆرەتی ئازایی سوپای ئیسلام، لەسایەی خوداوە، ورە بەردەدەن‌و، خۆگرییان دەرووخێ، ئەمەیش بووە بەهۆی سەرکەوتن بۆ ئێمەی گەلی ئیسلام.

٣- ماڵی تاڵانی بێ بڕواکانیش حەڵاڵ کراوە بۆ من‌و بۆ نەتەوەی ئیسلام، لەپێش مندا بۆ کەسی تر خواردنی ماڵی تاڵانی کافران حەڵاڵ نەبووە.

٤- رووی زەویش هەمووی بۆ خۆم‌و بۆ نەتەوەی ئیسلام دانراوە بە مزگەوت‌و، لەهەر شوێنێ مزگەوتی لێ نەبوو، لەسەر رووی زەوی نوێژی خۆمانی لێ

دەکەین‌و، مەرج نییە کە ئێمە وەك نەتەوەکانی تر هەر لەناو کڵێساو کەنیشتەو پەرستگاکاندا نوێـژ بکـەین‌و بـەس! لەهـەمان کاتـدا خۆڵەکەشـی پـاك‌و پاکـەوە کەرە، لەکاتی پێویستدا خۆمانی پێ پاك دەکەینـەوەو تەیـەمومی پـێ دەکـەین، کەواتە: هەر موسوڵمانێ، لەهەر کوێیـەك بـوو، خـوای مزگـەوتی لێ بـوو یانـا، وە خوای ئاو هەبوو بۆ دەسنوێژو شتی وا یانا، با بەکەماڵی حەواومیی نوێژی خۆی لێ بکا.

٥- جـاران لـەپێش منـدا، زۆربـەی پێغەمبـەرەکان کـە دەکـران بـە پێغەمبـەر، بەتایبەتی رەوانە دەکران بۆسەر هۆزەکـەی خۆیـان‌و بـەس، بـەڵام مـن لەسـایەی خوداوە، خودا کردوومی بە پێغەمبەرو رەوانەی کردووم بۆسـەر هـەموو کەسـێ، لە مرۆڤو لە جنۆکە بەگشتی.

کراوم بەدوا پێغەمبەرو دەرگای پێغەمبەرایەتی بەمن مۆر کراوەو لەپاش من هەرگیز پێغەمبەری تر نابێ!). {تاج/١/٣٦، ژمـارە: ٣٦ + تەجریـد/١/٢٢٥، ژمـارە: ٢١٧ = ٣٣٥، ٤٣٨، ٣١٢٢} .

٣٠٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (بُعِثْتُ بِجَوَامِعِ الْكَلِمِ وَنُصِرْتُ بِالرُّعْبِ فَبَيْنَا أَنَا نَائِمٌ أُتِيتُ بِمَفَاتِيحِ خَزَائِنِ الأَرْضِ فَوُضِعَتْ فِي يَدِي) قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَقَدْ ذَهَبَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَنْتُمْ تَنْتَثِلُونَهَا) (الحديث ٢٩٧٧، أطرافه في: ٦٩٩٨، ٧٠١٣، ٧٢٧٣).[٣٠٠]

ئـەبوهورەیرە(ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر(دروودی خـوای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودا منی کردوە بەپێغەمبەرو رەوانەی کـردوم بـۆ سـەر ئەو خەڵکە، قسەی نەستەق‌و فەرموودەی پڕمەعنای پێ بەخشیووم، وەتا مانگە

---

[٣٠٠] تجريد/٣، ژمارە: ١٢٢٠ = بخاری: ٢٩٧٧، مسلم: ٥٢٣ = ١١٦٨.

ڕێیەك دوژمن لەسامو شكۆی خۆمو لەشكرم زەندەقیان دەچێو ورە بەردەدەنو ئەمە بووە بەهۆی سەركەوتن بۆ ئێمە) وەهەروا فەرمووی: (لەخەونا بووم كلیلەكانی گەنجینەكانی زەویم پێ دراو، خرانە ناو دەستم).

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (ئەوەتا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) خۆی نەماوەو ئێوە بەرودوا لەپاش ئەو، خەزنەی ناو ئەو گەنجانە دەردەهێننو بەكێشیان دەكەنو ولآت لەدوا ئازادی دەكەن! مەبەست لە (جوامع الكلم) ئایەتەكانی قورئان وفەرموودە پڕواتاكانی پێغەمبەرە (بڕ: ژ: ٢١٧ تەجریید=٣٣٥ فەتح + تاج/١ل-٣٤٣ف -٤).

## (١) باب: إبتناء مسجد النبي صلى الله عليه وسلم
## باسی دروستكردنی مزگەوتەكەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ)

٣٠١- عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَدِمَ الْمَدِينَةَ فَنَزَلَ فِى عُلْوِ الْمَدِينَةِ فِى حَيٍّ يُقَالُ لَهَا: بَنُو عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، فَأَقَامَ فِيهِمْ أَرْبَعَ عَشْرَةَ لَيْلَةً، ثُمَّ إِنَّهُ أَرْسَلَ إِلَى مَلإِ بَنِى النَّجَّارِ، فَجَاءُوا مُتَقَلِّدِينَ بِسُيُوفِهِمْ، قَالَ: فَكَأَنِّى أَنْظُرُ إِلَى رَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى رَاحِلَتِهِ، وَأَبُو بَكْرٍ رِدْفُهُ، وَمَلأُ بَنِى النَّجَّارِ حَوْلَهُ حَتَّى أَلْقَى بِفِنَاءِ أَبِى أَيُّوبَ، قَالَ: فَكَانَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّى حَيْثُ أَدْرَكَتْهُ الصَّلاَةُ، وَيُصَلِّى فِى مَرَابِضِ الْغَنَمِ، ثُمَّ إِنَّهُ أَمَرَ بِالْمَسْجِدِ، قَالَ: فَأَرْسَلَ إِلَى مَلإِ بَنِى النَّجَّارِ فَجَاءُوا فَقَالَ: يَا بَنِى النَّجَّارِ ثَامِنُونِى بِحَائِطِكُمْ هَذَا، قَالُوا: لاَ وَاللّهِ مَا نَطْلُبُ ثَمَنَهُ إِلاَّ إِلَى اللّهِ، قَالَ أَنَسٌ: فَكَانَ فِيهِ مَا أَقُولُ: كَانَ فِيهِ نَخْلٌ، وَقُبُورُ الْمُشْرِكِينَ وَخِرَبٌ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالنَّخْلِ فَقُطِعَتْ، وَبِقُبُورِ الْمُشْرِكِينَ فَنُبِشَتْ، وَبِالْخِرَبِ فَسُوِّيَتْ، قَالَ: فَصَفُّوا النَّخْلَ قِبْلَةً، وَجَعَلُوا عِضَادَتَيْهِ حِجَارَةً، قَالَ: فَكَانُوا يَرْتَجِزُونَ، وَرَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَعَهُمْ، وَهُمْ يَقُولُونَ:

اللَّهُمَّ لاَ خَيْرَ إلاَّ خَيْرُ الآخِرَهْ          فَانْصُرِ الأَنْصَارَ وَالْمُهَاجِرَهْ

{الحديث/١١٧٣. بخاري (تجريد): ٢٦٤ = ٤٢٨، ٤٣٤، ١٣٤١، ٣٥٧٣، ١٨٦٨، ٣٩٣٢، ٢١٠٦، ٢٧٧١، ٢٧٧٤، ٢٧٧٩}: [٣٠١]

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆچی کرد بۆ مەدینە، لەپێشا لە عەوالی مەدینە دابەزی، عەوالی چەند گوندێك بوون، لە دەوری شاری مەدینە بوون، لەناو خێڵێکا کە پێیان دەگوتن: بەنی عەمری کوڕی عەوف، لەناویانا چوارده شەو مایەوە، ئەوجا هەواڵی نارد بۆ بەنی نەججاری خاڵوانی، کە هاتن هەموو شمشێرەکانیان کردبۆ شانیان‌و ئامادەیی تەواویان وەرگرتبوو، ئێستایش ئەڵێی ئەو دیمەنە لەبەرچاومە، کە چۆن پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە سواریی وشترەکەی ژێری بوو، بۆ زێدە رێز ئەبو بەکر لە پاشکۆیەوە سوار بوو بوو، لەگەڵیا بەرەو شاری مەدینە دەڕۆیشتن، تا گەیشتنە ناو شار ئێشکی پێغەمبەریان لەناحەز دەگرت، کە گەیشتنەجێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بارگەکەی لە حەوشەی ئەبو ئەیوبا خست، وە لەپێش دروست کردنی مزگەوتەکەیدا، لە کوێدا نوێژی لێ دەبوو لەوێدا نوێژی دەکرد، رێ دەکەوت لەناو پەچەڕانیشا نوێژی دەکرد، تا لە پاشتر فەرمانی کرد بە دروست کردنی مزگەوت، جا ناردی بەشوێن کۆمەڵەی بەنی نەجاردا، کەهاتنە خزمەتی پێی فەرموون: (ئەی بەنی نەجار! ئەم باخەی خۆتانم پێ بفرۆشن‌و نرخەکەیم پێ بڵێن لێتان دەکڕین‌و دەیکەین بە مزگەوت) گوتیان: نەبەخودا بە فرۆشتن

---

[٣٠١] تجرید/١، ژمارە: ٢٦٤، بخاری: ٤٢٨، مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٢٣٦، مسلم: ٥٢٤ - جهاد: ٤٦٤٧.

نایدەین، بەڵام بە خۆڕایی پێشکەشی دەکەین بەخوداو پێغەمبەری خوداو، بەهاکەیمان هەر لە خودا دەوێ‌و بەس.

ئەنەس دەیفەرموو: با پێتان بڵێم کەچی تیادا بوو: کۆمەڵێ دارخورماو چەند گۆڕێکی بتپەرستان‌و چەند کەلاوەیەکی تیادا بوو، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد: دارخورماکانیان بڕی‌و گۆڕی بتپەرستەکانیان هەڵتەکاندو چاڵایی شوێن گۆڕەکانیان پڕکردەوەو کەلاوەکانیان تەخت کردو دارخورماکانیان لەلای رووگەی مزگەوتەکەوە ریز کردو، هەردوو لاشیپانی دەرگاکەشیان لەتاشە بەرد دروست کرد، کاتێ کە تلە بەردەکانیان دەگواستەوە سۆزیان دەکردو پێغەمبەریش لەگەڵیان سۆزی دەکردو پێکەوە دەیانفەرموو:

**اللـهمَّ لا خَيْرَ إلاّ خيرُ الآخرهْ   فانْصُرِ الأنصارَ وَالمُهَاجِرَهْ**

واتە:

**خێر ئەو خێرەیە سبەی لەخوانە!   نەصرەت بۆ ئەنصار بۆ کۆچکارانە**

بە پەخشانیش واتە:

پەروەردگارا! باش ئەوەیە کە لەدوا رۆژا باش بێ و بەس، خودایە! یاریدەدەران‌و کۆچکاران سەرکەوتوو بکە. {تاج/١، زنجیرە: ٢٢٢، ژمارە: ١١٤٢، چاپی/٤} + {تاج/٤، لاپەڕە: ٣١٦، چ ١، ژمارە: ٣١٦١ و ٣١٦٠}. گەرچی جیاوازییەکی کەمیان هەیە، لەیەکتری، بەڵام هەتا خوێنەری ئازیز شارەزایی پەیدابکا، لەجیاوازی نێوانی گێڕانەوەکان، ئەویش دەنووسین:

ئەمەی رۆیشت دەقی پوختەی موسلیم ژمارە (٢٣٦) بوو، ئەمەیش دەقی تەجریدی بوخاری، ژمارە (٢٦٤)ی ئەم فەرموودەی ژمارە (٣٠١)ی ئێرەیە،

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەکۆچی کرد بۆ مەدینە، لەپێشا لەعەوالی مەدینە دابەزی، لەناو خێلێکا کەپێیان دەگوتن: بەنی عەمری کوڕی عەوف، لەناویانا چواردەشەو مایەوە، ئەوجا هەواڵی نارد بۆ بەنی نەججاری خاڵوانی، کەهاتن هەموو شمشێرەکانیان کردبووە شانیان، ئێستایش ئەڵێ ی ئەو دیمەنە لەبەرچاومە، کەچۆن پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەسوارییی وشترەکەی ژێری بوو، بۆ زێدە ڕێز ئەبوبەکر لەپاشکۆیەوە سوار بوو بوو، لەگەڵیا بەرەو شاری مەدینە دەڕۆیشتن، تاگەیشتنە ناوشار ئێشکی پێغەمبەریان لەناحەز دەگرت، کەگەیشتنەجێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بارگەکەی لەحەوشەی ئەبوئەیوبا خست، وەلەپێش دروستکردنی مزگەوتەکەیدا لەکوێدا نوێژی لێ دەبوو لەوێدا نوێژی دەکرد، ڕێ دەکەوت لەناو پەچەرانیشا نوێژی دەکرد، تالەپاشتر فەرمانیکرد بەدروست کردنی مزگەوت، جاناردی بەشوێن کۆمەڵەی بەنی نەجاردا، کەهاتنە خزمەتی پێ ی فەرموون: (ئەی بەنی نەجار! ئەم باخەی خۆتانم پێ بفرۆشن‌و نرخەکەیم پێ بڵێن؟) گوتیان: نەبەخودا بەفرۆشتن نایدەین، بەڵام بەخۆڕایی پێشکەشی دەکەین بەخوداو پێغەمبەری خوداو بەهاکەیمان هەر لەخودا دەوێ، ئەنەس دەیفەرموو: باپێتان بڵێم کەچی تیادابوو: چەند گۆڕێکی بتپەرستان‌و چەند کەلاوەیەك‌و بڕێ دارخورمای تیادابوو، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی دەرکرد گۆڕی بتپەرستەکانیان هەڵتەکاندو چاڵایی شوێن گۆڕەکانیان پڕ کردەوەو دارخورماکانیان بڕی‌و لەلای ڕووگەی مزگەوتەکەوە ڕیزیان کردن‌و، هەردوولاشیپانی دەرگاکەشیان لەتاشەبەرد دروست کرد، کاتێ کەتلە بەردەکانیان دەگواستەوە سۆزیان دەکردو پێغەمبەریش لەگەڵیان سۆزی دەکردو دەیفەرموو:

اللــهمَّ لاَ خَيْــرَ إلاَّ خَــيرِ الآخــرهْ   فانْــــصُرِ الأنـــــصارَ وَالمُهَـــاجِرَهْ

واتە:

خێر ئەو خێرەیە سبەی لەخوانە!   نەصرەت بۆ ئەنصار بۆ کۆچکارانە

(ت/١/٥٧٨/٢ ز-٢٢٣ ژ-١١٤٢ چ-٤ /ت/٤/٣١٦/٤).

(٢) باب: تحويل القبلة من القدس إلى الكعبة

گۆڕینی ڕووگە لە قودسەوە بۆ کەعبە

٣٠٢- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى بَيْتِ الْمَقْدِسِ سِتَّةَ عَشَرَ شَهْرًا حَتَّى نَزَلَتْ الآيَةُ الَّتِى فِى الْبَقَرَةِ (وَحَيْثُمَا كُنْتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ) فَنَزَلَتْ بَعْدَ مَا صَلَّى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَانْطَلَقَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ، فَمَرَّ بِنَاسٍ مِنَ الأَنْصَارِ وَهُمْ يُصَلُّونَ، فَحَدَّثَهُمْ بالحَدِيثِ، فَوَلَّوْا وُجُوهَهُمْ قِبَلَ الْبَيْتِ). {الحديث/١١٧٦. تجريد/١/٥٧، رقم: ٣٨ = ٤٠، ٣٩٩، ٤٤٨٦، ٤٤٩٢، ٧٢٥٢}: [٣٠٢]

بەرائی کوڕی عازیب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە مەککەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە، تا شازدە مانگ لە مەدینە لەگەڵ پێغەمبەردا، نوێژمان بەرەو (بيت المقدس) دەکرد، کەوا لەشاری قودس، لە وڵاتی شام، هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، کەوا لە سوورەتی بەقەرەدا،، کە دەفەرموێ: {وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوِهَكُمْ شَطْرَهُ - سورة البقرة/ ١٤٤}، کە بەپێی ئەم ئایەتە، پێغەمبەرو موسوڵمانان، خودا فەرمانی پێکردن، کە ئیتر لەمەودوا، لەباتی بەیتولەقدیس ڕووبکەنە کەعبە لە مەککە. جا لەدوائەوە کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە پێغەمبەرو موسوڵمانان نوێژی

---

[٣٠٢] تجريد/١، ژمارە: ٣٨، بخاری: ٤٠، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٢٦٢ = مسلم: ١١٧٦.

عەصریان بەجەماعەت کرد بەرەو کابە لەمەککە، جا پیاوێ لەم کۆمەڵەی کەلەگەڵ پێغەمبەردا نوێژی عەصریان بەرەو کابە کردبوو، هەمان رۆژ رێی دەکەوێتە مزگەوتێ لە مزگەوتەکانی ئەنصار لە مەدینە، تەماشا دەکا نوێژکەرەکان نوێژی عەصر دەکەن بە جەماعەت بەڵام بەوەیان نەزانیوە کە رووگە گۆڕاوەو وەك جاران روویان لە بەیتولمقدیسەو وان لە روکوعدا، جا پێیان دەفەرموێ: سوێند دەخۆم بەخودا، کە ئەم عەصرە، بە جەماعەت لەپشت پێغەمبەرەوە رووەو کەعبە نوێژی عەصرمان کرد، ئیتر ئەوانیش لەسەر شایەتییەکەی ئەو، هەر لەناو نوێژەکەدا بەرەو کابە، کەوا لەناو مەسجیدولحەرامدا، لەشاری مەککە، روویان وەرچەرخاندو باقی مەندەی ئەو نوێژەیان روەو کابە تەواو کرد). {تاج/١/٢١٠، زنجیرە:٥٣، ژمارە: ٣٨٧ و ٣٨٨ و ٣٨٩}.

**روونکردنەوە:**

بەرائی کوڕی عازیب ئەنصارییە، خەزرەجییە، لە رۆژی بەدرا، لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی تری پێغەمبەردا، بە بچووك دانران، لەبەرئەوەی رێگەی هاوبەشیکردنیان لەو غەزایەدا نەدرا، یەکەم غەزا کە بەشداری تیا کردووە، لەسەر فەرمایشتی واقیدی، غەزای خەندەق بووە، خۆی دەفەرموێ، وەك لە إصابەدا دەفەرموێ: ئامادەی چواردە نەبەرد (غەزا) بووم، لە خزمەت پێغەمبەر خۆیدا، هەروا دەفەرموێ: هەژدە سەفەریشم لە خزمەت پێغەمبەردا کردووە، بەراء دەیفەرموو: (مەرج نییە کە هەموو فەرموودەیێ، کە دەیگێڕینەوە بۆ ئێوە کە لەزاری خودی پێغەمبەر خۆیمان بیستبێ، هەیانە کە لە هاوڕێیانی خۆمانمان بیستووە، وە ئەوان لە پێغەمبەریان بیستووەو بۆ ئێمەیان گێڕاوەتەوەو ئێمەیش دەیگێڕینەوە بۆ ئێوە). ئامادەی شەڕگای (تستر) بووە،

لەگەڵ ئەبو موسادا، لە لایەنگیرانی ئیمامی عەلی بوو، ئامادەی شەڕی جەمەلو صفینو کوشتاری خەواریج بووە، لە کوفە نیشتەجێ بوو، لەوێ خانوویەکی دروستکرد بۆ خۆی، کۆمەڵێ فەرموودەی پێغەمبەری گێڕاوەتەوە، خۆیو عازیبی باوکی هاوڕێی پێغەمبەر بوون، لە صەحیحەینا دەفەرموێ: بەڕائی کوڕی عازیب فەرمووی: ئەبوبەکری صەدیق کۆپانە وشترێکی لە عازیبی باوکم کڕی، ئەبوبەکر بە باوکمی فەرموو: بە بەڕائی کوڕت بڵێ با ئەم کۆپانەم بۆ هەڵ بگرێ هەتا ماڵەوە، باوکیشم فەرمووی: (پێی ناڵێم هەتا بۆمان نەگێڕیتەوە کە چۆن کۆچت کرد لەگەڵ پێغەمبەردا ..... هەتا کۆتایی فەرموودەکە).

بەراء (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: یەکەمجار کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هات بۆ مەدینە، لەلای خاڵوانی دابەزی کەئەنصار بوون، تا شازدە مانگ، یا فەرمووی تاحەڤدە مانگ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینە لەنوێژدا ڕوی دەکردە بەیتوولەقدیس لەدڵیشەوە حەزی لەوەبوو کەکابەبێ بەڕووگەی ئیسلام، جاکاتێ کەخودا ئەم ئاواتەی هێنایەدیو بەیتوڵلا بوو بەقیبلەی موسوڵمانان یەکەم نوێژ کەموسوڵمانان لەگەڵ پێغەمبەردا بەرەو کەعبە کردیان نوێژی عەصر بوو، جا پیاوێ لەم کۆمەڵەی کەلەگەڵ پێغەمبەردا نوێژیان بەرەو کابە کردبوو، هەمان ڕۆژ ڕێ ی دەکەوێتە مزگەوتێ لە مزگەوتەکانی ئەنصار لەمەدینە، تەماشا دەکا نوێژکەرەکان نوێژی عەصر دەکەن، بەڵام بەوەیان نەزانیوەو وەك جاران رویان لەبەیتولەقدیسەو وان لەروکوع دا، جاپێیان دەفەرموێ: سوێند دەخۆم ئەم عەصرە بەجەماعەت لەپشت پێغەمبەرەوە بەرەو کەعبە نوێژی عەصرم کرد، ئیتر ئەوانیش لەسەر شایەتییەکەی ئەو هەر لەناو نوێژەکەدا بەرەو کابە، کەوا لەمەککە، ڕوویان وەرچەرخاندو باقی مەندەی ئەو نوێژەیان ڕوەو کابە تەواو کرد. خاوەن نامەکان ـ واتە: جوولەکەو گاورەکان ـ ئەوەیان پێ خۆش بوو کە پێغەمبەر

(درروودی خودای لەسەر بێ) رووەو بەیتولمەقدیس نوێژی دەکرد، بەڵام کاتێ کەرووی کردە کابە ئەومیان پەسەند نەکرد!).

## راڤەو لێکۆڵینەوە:

کابە: کەعبە: رووگە: قیبلە، ئەم پیاوەی کەئەم شایەتییەی دا عەببادی کوڕی نەهیك بوو، کاتێ کە رووگە گۆڕا یەکێ بوو لەوتاقمەیە کەلەگەڵ پێغەمبەردا دوو رکاتیان بەرەو قودس کردو دوو رکاتیان بەرەو مەککە کرد، ئەو مزگەوتەش کەهەواڵەکەی پێدان مزگەوتی بەنی سەلەمە بوو، کەوا لەمەدینە، ناسراوە بەمەسجیدولقیبلەتەین، واتە: مزگەوتی دوو قیبلە، لەگێڕانەوەی ئیبنوعومەرو ئەنەس دا (رەزای خودایان لێ بێ) هەیە کەجێگەکە قوباء بووە، نوێژەکەیش بەیانی بووە، کەپیاوەکە هات گوتی: رووگە گۆڕاوە، جا لەسەر یاسای دوو دەق، یادوو بەڵگە ئەگەر بەرامبەر یەکتر وەستانو بەتەئویلیش پێکەوە نەدەسازان، ئەوا بەهێزەکەیان پەسەند دەکرێو بێ هێزەکەیان ئایەخ دەکرێ، هەندێ زانا فەرموویانە: گێڕانەوەی ئەنەسو ئیبنوعومەر (رەزای خودایان لێ بێ) پەسەندە، چوونکە دووکەس گێڕاویانەتەوە، گێڕانەوەی بەراء ئایەخ دەکرێ، بەڵام هەردوو گێڕانەوەکە پەسەندن، رێگەچارەی یەکگرتنەوەیانو پێکەوە سازانیان ئاوایە: هەر گێڕانەوەیێ باسی رووداوێ دەکا، لەگێڕانەوەی بەراء دا پیاوێ لەخزمەت پێغەمبەردا نوێژی عەصر دەکاو دەچێ بۆ مزگەوتی بەنی سەلەمە تەماشا دەکا نوێژی عەصری هەمان رۆژ دەکەنو هەواڵەکەیان دەداتێ، لەگێڕانەوەی ئەنەسو ئیبنوعومەردا نوێژی عەصری لەگەڵ دا دەکاو بۆسبەینێ بەیانی دەچێ بۆ قوباءو هەواڵەکەیان دەداتێ، بەم شێوەیە هەردوو گێڕانەوەکە کۆ دەکرێنەوەو بەرابەر ناوەستن، ئیمامی نەوەوی (سڵاوی خوای لێ بێ)

دەفەرموێ: (بەهەر شێوەیێ دەگونجا کەدوو فەرمووده کۆبکرێنەوەو جیاوازی لەنێوانیان دا نەمێنێ ئەوە باشترە لەوەی کەفەرموودەیێ ئایەخ بکرێ کەپیاوانی راستو دروست لەصەحیح دا گێراویانەتەوە!) لەهەندێ گێرانەوەکانی بوخاری دا جیاوازیی لەنێوانی گێرانەوەی بەراءو ئیبنوعومەردا هەیە، کەسێ شارەزای مەشرەبی بوخاری نەبێ بەهەڵەدا دەچێو گومانی ئالۆزیو شێواوی بەگێرانەوە جۆراو جۆرەکانی بوخاری شەریف دەبا، بەلام دەبێ بزانین کەئەم جۆرە جیاوازی یە لەصەحیحی بوخاریو موسلیم دا، ئەگەر هەبوو، مەبەست لێی شتێکی تایبەتییە، کەفەرموودەزانەکان دەرکی ئەو مەبەستە دەکەن. خوایاربێ لەم کتێبە پیرۆزەدا بەپێ ی توانا لەم جۆرە بابەتانە دەدوێین، بەڵکوو لەبەخششی خوداوە سەردەقی ئەم کارە پیرۆزە بشکێو ئەم هەنگاوە ببێ بە رچەشکاندنێ لەم بوارەدا، شت هەر ئەوەندەی زەحمەتە هەتا دەستی پێ دەکەی، ئیتر بەرە بەرە رەورەوەی پێشکەوتن بەرەوپێشی دەبات. شت بەپەلە نابێ، مرۆڤ لەپڕێ نابێ بەکوڕێ، زمانی کوردی هێشتا زۆری ماوە کە موفرەداتو زاراوە تازەکانی جێ ی خۆیان بگرنو بەتەواوی لەجێگەی پێویستی خۆیان دا بچەسپێن! بەلام گومانم نییە کەزمانی ئەدەبی یەکگرتووی کورد لەسەدەی ئاییندەدا لەدایك دەبێ، وەئەم ئەدەبییاتەی ئێستە هەیە بۆی دەبێ بەسەرچاوەیەکی رۆشنو پرشنگدار. لەسەردەمی پێغەمبەردا لەناو شاری مەدینەدا نۆ مزگەوتی تر هەبوە: (ت/١ ل/٢١٠ ف/٤+٢+٣ ژمارە/٣٨٧،٣٨٨،٣٨٩).

٣٠٣- عَنْ الْبَرَاءَ (رضی الله عنه) قَالَ: صَلَّيْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صلی الله علیه وسلم) نَحْوَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ سِتَّةَ عَشَرَ - أَوْ سَبْعَةَ عَشَرَ - شَهْرًا ، ثُمَّ صَرَفَهُ نَحْوَ الْقِبْلَةِ [٣٠٣].

---

[٣٠٣] بخاری: ٤٤٩٢، مسلم/شیحا: ١١٧٧.


بەڕاء (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هەتا شازدە مانگ، یان هەتا حەڤدە مانگ (لەمەدینە) لەگەڵ پێغەمبەر خۆیدا (درودی خودای لەسەر بێ) نوێژمان بەرەو (بیت المقدس) دەکرد، لەپاشان بەفەرمانی خودا لەنوێژداو لەو تاعەتانەدا کەڕوو دەکرێتە رووگە، رومان کردە کەعبە). (تاج/١، ز ٥٣، ژمارە: ٣٨٧).

٣٠٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: بَيْنَا النَّاسُ بِقُبَاءٍ فِي صَلاَةِ الصُّبْحِ إِذْ جَاءَهُمْ آتٍ فَقَالَ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – قَدْ أُنْزِلَ عَلَيْهِ اللَّيْلَةَ قُرْآنٌ، وَقَدْ أُمِرَ أَنْ يَسْتَقْبِلَ الْكَعْبَةَ فَاسْتَقْبِلُوهَا، وَكَانَتْ وُجُوهُهُمْ إِلَى الشَّأْمِ، فَاسْتَدَارُوا إِلَى الْكَعْبَةِ. [٣٠٤]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئەوا موسوڵمانان لە قوباء، روویان بەرەو شام، خەریکن نوێژی بەیانی دەکەن، لەوکاتەدا، کەلەناو نوێژەکەدا دەبن، پیاوێ دێ، دەڵێ پێیان: ئەم شەو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئایەتی قورئانی بۆ هاتووەو فەرمانی پێکراوە کە ئیتر روو بکاتە کابە، جا ئێوەیش رووی تێ بکەن، ئیتر ئەوانیش روویان لەشام وەرچەرخان‌و هەر لەناو نوێژەکەدا رووی خۆیان کردە کەعبە). (تاج/١، ژمارە: ٣٨٨).

---

[٣٠٤] بخاری: ٤٠٢، ٤٤٨٨، ٤٤٩٠، ٤٤٩١، ٤٤٩٢، ٧٢٥١، مسلم: ١١٧٨، ١١٧٩، نسائی: ٤٩٢، ٧٤٤.

## (٣) باب: النهي عن بناء المساجد على القبور
## پێشگیری له دروستکردنی مزگەوت لەسەر گۆڕ

٣٠٥- عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ وَأُمَّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُنَّ) ذَكَرَتَا كَنِيسَةً رَأَيْنَهَا بِالْحَبَشَةِ فِيهَا تَصَاوِيرُ فَذَكَرَتَا ذلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « إِنَّ أُولَئِكِ إِذَا كَانَ فِيهِمُ الرَّجُلُ الصَّالِحُ فَمَاتَ بَنَوْا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِدًا وَصَوَّرُوا فِيهِ تِلْكَ الصُّوَرَ، أُولَئِكِ شِرَارُ الْخَلْقِ عِنْدَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ». {الحديث/١١٨١. تجريد البخاري/١/٢٧٤، رقم: ٢٦٣=٤٢٧، ٤٣٤، ١٣٤١، ٣٥٧٣}: [٣٠٥]

عائیشه فەرمووی: ئوممو حەبیبەو ئوممو سەلەمە، کە هەردووکیان وەك عائیشە، هاوسەری پێغەمبەر بوون (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو هاوسەرو یارانی بێ) عائیشە فەرمووی: ئەم دوو خاتوونە، لە وڵاتی حەبەشە، لەکاتی کۆچ کردنیاندا بۆ ئەوێ، کڵێسایەکیان دیبوو، بەناوی مارییە، باسی ئەو پەیکەرو وێنانەیان بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گێڕایەوە، کە لەناو ئەو کڵێسایەدا دیبوویانن. فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەوانە هۆزێکن کاتێ بەندەیەکی باش، یا پیاو چاکێ لەناویاندا هەڵدەکەوێ، کە دەمرێ دەچن مزگەوت لەسەر گۆڕەکەی دروست دەکەنو ئەو وێنانەی تیا دەکێشن، ئەم جۆرە کەسانەیش کە ئەم جۆرە رەوشتە نا پەسەندەیان داهێناوە، بەدترینی دروستکراوانی خودان، لەلای خودای مەزن لە رۆژی قیامەتدا). {تاج/١/٣٦٦، ژمارە: ٧٣٥}.

---

[٣٠٥] تجرید/١، ژمارە: ٢٦٣، بخاری: ٤٢٧، مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٢٥٦ = مسلم: ٥٢٨ = ١١٨١.

**ڕوونکردنەوە:**

ئوم حەبیبە هاوسەری پێغەمبەرە، (دروودی خودای لەسەر بێ) ناوی ڕەملەی کچی ئەبو سوفیانی کوڕی حەربە، خوشکی موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیانە، لەپێش پێغەمبەرایەتیدا بە حەڤدە ساڵ لە دایك بووە، لە موسوڵمانە پێشینەکانە، کۆچی کرد بۆ حەبەشە، لەوێ بێوەژن کەوت، ئوم حەبیبە دەفەرموێ: پیاوێ لە خەوما فەرمووی پێم: ئەی دایکی موسوڵمانان!! لەم خەونە شەڵەژام، بەڵام زۆری پێ نەچوو، هەر کە عیدەی شەرعیم لە مێردی پێشینم تەواو بوو،، پاشای حەبەشە کەنیزەکێکی خۆیی نارد بۆلام، کەناوی (أبرهة) بوو، پاشای حەبەشە لەڕێی ئەو کەنیزەکەیەوە خوازبێنی کردم بۆ پێغەمبەرو منیش ڕازی بوومو شووم پێکرد[1]، خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص کرد بە وەکیلی خۆم، وەکیلی پێغەمبەریش جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب بوو، نەجاشی لە جیاتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوار سەد لیرەی زێڕی کرد بە مارەییم، خالید وەری گرتو دوایی دایەوە بەخۆم، عائیشە دەفەرموێ: لەکاتی سەرە مەرگا، ئوم حەبیبە ناردی بەدواما، فەرمووی: خۆت دەزانی کە منو تۆ هەوێی یەکتری بووین، هەوێش لەوەزنی هەوێ ڕزگاری نابێ، کەواتە بەخێری خۆت گەردنم ئازاد بکە منیش گەردنیم ئازاد کردو لە خودا پاڕامەوە بۆی کە لە گوناهی خۆش بێ، ئەویش پێی فەرمووم: (بەڕاستی دڵت خۆش کردم خودا دڵت خۆش بکا) ئوم حەبیبە لەپێش بیعثەتدا بەحەڤدە ساڵ لەدایك بووە، لە چلو چواری کۆچیدا مردووە، نزیکەی حەفتاو دووساڵ ژیاوە، (ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێ). {بڕوانە: تجرید/٢، لاپەڕە: ٤، ژمارە: ٦١٤

---

[1] لە تەجریدو پوختەی موسلیمدا نووسراوە: (خالیدی کوڕی وەلید) ئەوە هەڵەیە. (وەرگێڕ)

+ تـاج/٣، لاپـەڕە: ٧٨ = تـاج/٢ ل/٤٨٨ ژ/٢٠٩٤ ز/٣٢ + تـاج/٥/١٥٨، زنجـيرە: ٣٩ = تاج/٣ ز/٣٩ ژ/٣٤٤٢}. بۆ سوننەتە دامەزراوەكان بڕوانە: تاج/١ ز/١٠٣.

٣٠٦- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْها عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: فِي مَرَضِهِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ: (لَعَنَ اللَّهُ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسْجِدًا) قَالَتْ: وَلَوْلاَ ذَلِكَ لأَبْرَزُوا قَبْرَهُ، غَيْرَ أَنِّي أَخْشَى أَنْ يُتَّخَذَ مَسْجِدًا. (الحديث ١٣٣٠).(٣٠٦)

عائیشه (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: كاتێ فریشتەی مەرگ هات بۆ خزمەتی حەزرەت -دروودی خوای لەسەر بێ- لەكاتی سەرەمەرگدا، حەزرەت -دروودی خوای لەسەر بێ- پارچەیەكی گوڵ گوڵی، دابوو بەسەر ڕووی خۆیدا، ناوبەناو كە پارچەكە خەفەو تەنگەنەفەسی دەكرد، ڕووی خۆی لادەدا وەلەم كاتی سەرەمەرگەدا فەرمووی: (لەعنەت و نەفرینی خودا لە جوولەكەو گاوربێ، كەگۆڕی پێغەمبەرەكانی خۆیان كردووە بەمزگەوت). پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- بەمە هەڕەشەی لەم كرداره ناپەسەندەیان دەكرد نەبادا موسوڵمانەكانیش چاو لەوان بكەن و گۆڕی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- بكەن بە مزگەوت و نوێژو پەرستشی تێدابكەن و بەرەبەرە لەپاش ڕۆژگارێكی دوورو درێژ گۆڕەكە خۆیشی بپەرستن. عائیشه (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەی ئەگەر لەبەر ئەم مەترسییە نەبوایە گۆڕەكەی پێغەمبەریان -دروودی خوای لەسەر بێ- دەرئەخست خانوویان بەسەرەوە نەدەكرد، گەرچی من هەرمەترسی ئەوەم هەیە كە گۆڕەكەی بكرێت بە مزگەوت) سوپاس بۆخوا كەهەتا ئێستا گۆڕەكەی ئەوپەڕی ڕێزی ئایینی لێ دەگیرێ، بەڵام ئەوەی عائیشه مەترسی لێ كردووە، لەسایەی خواوە ڕووی نەداوە. (بڕوانە: تاج /١/٣٦٦/١+٢+٣).

---

(٣٠٦) تجرید/٢، ژمارە: ٦٣٥، بخاری: ١٣٣٠، مسلم: ٥٢٩ - ١١٨٤.

٣٠٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «قَاتَلَ اللَّهُ الْيَهُودَ اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ». (٣٠٧)

خودا بچێ بەگژی جوولەکەکاندا، گۆڕی پێغەمبەرەکانی خۆیان کردووە بەمزگەوت!).

٣٠٨- عَنْ عَائِشَةَ وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عنهما) قَالاَ: لَمَّا نَزَلَ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) طَفِقَ يَطْرَحُ خَمِيصَةً لَهُ عَلَى وَجْهِهِ فَإِذَا اغْتَمَّ بِهَا كَشَفَهَا عَنْ وَجْهِهِ، فَقَالَ، وَهُوَ كَذَلِكَ: « لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ». يُحَذِّرُ مِثْلَ مَا صَنَعُوا). {الحديث/١١٨٧. تجريد/١/٢٧٧، ژمارە: ٢٦٧ = ٤٣٦، ١٣٣٠، ١٣٩٠، ٣٤٥٣، ٤٤٤١، ٤٤٤٣، ٥٨١٩} : (٣٠٨)

عائیشەو عەبدوڵڵای کوڕی عەباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان: (کاتێ فریشتەی گیان کێشان هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی سەرە مەرگا، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) پۆپەشمینێکی گوڵ گوڵی دابوو بەسەر روخساری خۆیدا، ناو بەناو کە پۆپەشمینەکە خەفەو تەنگە نەفەسی دەکرد، رووی خۆی لادەدا، وە لەکاتی ئەم سەخڵەتی سەرە مەرگەدا فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (لەعنەتو نەفرینی خودا لەسەر جوولەکەو گاور بێ، کە گۆڕی پێغەمبەرەکانی خۆیان کردووە بە مزگەوت).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم فەرمایشتە هەڕەشەی لەم کردارە ناپەسەندەیان دەکرد، نەبادا موسوڵمانانیش چاو لەوان بکەن و، هەمان تاوان بکەن و، گۆڕی پێغەمبەر بکەن بە مزگەوت و نوێژو پەرستشی تیادا

(٣٠٧) بخاری: ٤٣٧، مسلم: ١١٨٥.

(٣٠٨) تجرید/١، ژمارە: ٢٦٧، بخاری: ٤٣٦، مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٢٥٥، مسلم: ١١٨٧.




بکەن‌و، بەرە بەرە لەپاش ڕۆژگارێـکی دوورو درێـژ، گۆڕەکـە خۆشـی بپەرسـتن).
{تاج/١، زنجیرە: ١٢١، ژمارە: ٧٣٦} .

**ڕوونکردنەوە:**

١- مەبەست ئەوەیە کە گۆڕەکە بکرێ بە هۆدەو شتی واو، ئەوسا لـەناویا وەك مزگەوت نوێژ بکرێ بەتایبەت لەباتی ڕووگەو قیبلـە ڕوو بکرێتـە گۆڕەکـە بۆ ڕێزو بەگەورە زانین. پەنا بەخوا لە هەڵەی وا.

٢- مەبەسـت ئەوەنییـە کـە شـوێنی گـۆڕو جێـگەی گۆڕسـتان نـەکرێ بـە مزگەوت، چونکە شتی وا، بەپێی مەرجی تایبەت دروستە.

### (٤) باب: فضل بناء المساجد والحث عليها
### خێری دروستکردنی مزگەوت لەڕێگەی خوادا

٣٠٩- عَنْ عُثمَانَ بْنَ عَفَّانَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ: (عِنْدَ قَوْلِ النَّاسِ فِيهِ حِـينَ بَنَى مَسْجِدَ الرَّسُولِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّكُمْ أَكْثرْتُمْ وَإِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ مَنْ بَنَى مَسْجِدًا يَبْتَغِي بِهِ وَجْهَ اللَّهِ بَنَـى اللَّـهُ لَـهُ مِثلَـهُ فِـي الْجَنَّـةِ). (الحديث: ٤٥٠).[٣٠٩]

پێشەوا عوثمان (ڕەزای خوای لـێ بـێ) لـەکاتی جێنـشینی خۆیـدا ویـستی مزگەوتەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گـەورە بکـا، خەڵکەکـەیش پێیان ناخۆش بوو، بێزاری یان دەربڕی، ئیمامی عوثمان فەرمووی: ئەمە کردنتان بەچی ئەوەندە لەسەری دەڕۆن، من خۆم لەم لایەنەوە لەئێوە باشـتری لێ دەزانم، چـونکە بـەگوێ ی خـۆم لـەزاری پـیرۆزی پێغەمبـەرم زنـەوت دەیفـەرموو:

---

[٣٠٩] تەجرید/١، ژمارە: ٢٧٤، بخاری: ٤٥٠، مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٢٤٠، مسلم: ١١٩٠.

(هەرکەسێ مزگەوتێ دروست بکا، ساخ لەبەر ڕەزای خودا، خودایش لەقیامەتا، لەپاداشی ئەوەدا، لەبەهەشتا تەلارێکی بۆ دروست دەکا، لەوێنەی ئەو مزگەوتە)

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

واتە: مزگەوتە دروستکراوەکە تاگەورەترو باشتربێ، تەلارەکەیش باشتر دەبێ لەبەهەشتا.

مەحمودی کوڕی لەبید فەرمووی: پێشەوا عوثمانی کوڕی عەففان (ڕەزای خودای لێ بێ) لەکاتی جێنشینی خۆیدا، ویستی مزگەوتەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەورە بکا، خەڵکەکەیش ئەوەیان پێ ناخۆش بوو، بێزارییان دەربڕی، حەزیان دەکرد وازی لێ بهێنێو وەك خۆی بمێنێ، ئەویش فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو: (هەرکەسێ مزگەوتێ دروست بکا، ساخ لەبەر ڕەزای خودا، خودایش لە قیامەتا، لە پاداشی ئەوەدا، لە بەهەشتا، تەلارێکی بۆ دروست دەکا). {تاج/١، زنجیرە: ١١٤، ژمارە: ٦٧٥، چاپی/٤، لاپەڕە: ٢٤٢، چاپی/١}.

### (٥) باب: الندب إلى وضع الأيدي على الركب في الركوع ونسخ التطبيق
### دەست گرتن بە ئەژنۆوەو نەسخی تەطبیق

٣١٠- عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: صَلَّيْتُ إِلَى جَنْبِ أَبِي، قَالَ: وَجَعَلْتُ يَدَيَّ بَيْنَ رُكْبَتَيَّ، فَقَالَ لِي أَبِي: اضْرِبْ بِكَفَّيْكَ عَلَى رُكْبَتَيْكَ، قَالَ: ثُمَّ فَعَلْتُ ذَلِكَ مَرَّةً أُخْرَى فَضَرَبَ يَدَيَّ، وَقَالَ: إِنَّا نُهِينَا عَنْ هَذَا، وَأُمِرْنَا أَنْ نَضْرِبَ بِالأَكُفِّ عَلَى الرُّكَبِ. {الحديث/١١٩٤. تجريد/١/٤٠٩، رقم/٤٢٨ = ٧٩٠}: [٣١٠]

---

[٣١٠] تجرید/١، ژمارە: ٤٢٨، بخاری: ٧٩٠، مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٢٩٣، مسلم: ١١٩٤.

موصـعەبی کـوڕی سـەعدی کـوڕی ئـەبو وەقـاص (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فەرمووی: لە تەنیـشتی باوکمـەوە نوێـژم دەکـرد، لـەکاتی چـەمینەوەدا، هـەردوو لەپەکانم نووساند بەیەکەوەو دامنان لەنێوانی هەردوو ڕانمدا، کاتێ لە نوێژەکە بوومەوە، باوکم پێی فەرمووم: شتی وا مەکە، جاران ئێمە ئاوامان دەکـرد، بـەڵام لە پاشتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیی لێکردین لـەوە، وە بـاوکم پێی فەرمووم: هەردوو لەپەکانت بگرە بە هەردوو ئەژنۆکانتەوە).

فـەرمووی: جـارێ تـریش لـەوەدوا، هـەمان شـتم کـردەوە، بـاوکم کێـشای بەهەردوو دەستمداو، فەرمووی: جاران ئێمـە ئاوامـان دەکـرد، بـەڵام ئـاخر شت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەو گیریـی لێـکردین لـە کردنـی ئـەوە، وە فەرمانی پێـکردین کە لە چەمینەوەدا دەست بگرین بە ئەژنۆمانەوە).

(٧) **باب: تحريم الكلام في الصلاة ونسخ ما كان من إباحته**

**قسەکردن لەناو نوێژدا حەرامە، لەپێشدا ڕەوا بووە بەڵام لەپاشا پوچ کرایەوە**

٣١١- عَنِ إبْنِ مَسعُودٍ رَضِيِ اللّٰهُ عَنْهُ قال: كُنـا نُـسَلِمُ علـى النَبِـيّ وَهُـوَ في الصَّلاة، فَيَرُدُ عَلَينا، فَلَمّا رَجَعْنا مِنْ عِنْدِ النَّجاشيّ، سَلَّمْنا عَلَيْه فَلَمْ يَرُدَّ عَلَينـا، وَقـالَ: (إنَّ في الصَّلاةِ شُغُلاً) الحَديث ١١٩٩- طَرَفاهُ في:١٢١٦، ٣٨٧٥:[٣١١]

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود، کەناسراوە بـە ئیبنومەسـعوود (ڕەزای خـوای لێ بـێ) دەفـەرموێ: (لەپێـشدا لـەناو نوێـژدا سـڵاومان لەپێغەمبـەر -درووی خـوای لەسەر بێ- دەکرد، ئـەویش سـڵاوەکەی وەڵام دەدایـنـەوە، تـا ئەوکاتـەی کـە لـەلای نەجاشی پادشای حەبەشە گەڕاینەوە، ئیتر کـە لـەناو نوێـژدا سـڵاومان لێ دەکـرد وەڵامی سڵاوەکەمانی نەئەدایەوە، جا عـەرزیمان کـرد: ئـەی پێغەمبـەری خـودا ! جـاران کـە لـەناو نوێـژدا سـڵاومان لێ دەکردیـت، وەرامـی سـڵاوەکەت دەدایـنـەوە،

[٣١١] تجريد/٢، ژمارە: ٥٩٠، بخاري: ١١٩٩، صحيح مسلم/١٢٠١ شيحا.

کەچی ئێستا وەلامی نادەیتەوە، هۆی ئەمە چییە؟ فەرمووی -دروودی خوای لەسەر بێ- : (بەڕاستی نوێژ خەریکبوونی گەرەکە، کەواتە: نوێژکەر لەناو نوێژەکەیدا دەبێ هەردڵی لای نوێژەکەی بێ و بەس). (تاج/١/٢٢٠).

ئەمەیش کۆمەڵێ فەرموودەیە لەم بابەتە، بۆ سوودی زیاتر راگوێزیان دەکەم:

عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ الْحَكَمِ (رَضِي اللهُ عَنْـهُ) قَـالَ: بَيْنَمَـا أَنَـا أُصَلِّى مَـعَ رَسُـولِ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، إِذْ عَطَسَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ، فَقُلْتُ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ، فَرَمَانِى الْقَـوْمُ بِأَبْصَارِهِمْ، فَقُلْتُ: (وَاثُكْلَ أُمِّيَاهْ! مَا شَأْنُكُمْ؟ تَنْظُرُونَ إِلَىَّ؟! فَجَعَلُوا يَـضْرِبُونَ بِأَيْـدِيهِمْ عَلَى أَفْخَاذِهِمْ، فَلَمَّا رَأَيْتُهُمْ يُصَمِّتُونَنِى، لَـكِنِّى سَكَتُّ، فَلَمَّا صَلَّى رَسُـولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَبِأَبِى هُوَ وَأُمِّى، مَا رَأَيْتُ مُعَلِّمًا قَبْلَهُ وَلاَ بَعْدَهُ أَحْسَنَ تَعْلِيمًا مِنْـهُ، فَوَاللَّهِ مَا كَهَرَنِى، وَلاَ ضَرَبَنِى، وَلاَ شَتَمَنِى، ثُمَّ قَالَ: « إِنَّ هَذِهِ الـصَّلاَةَ لاَ يَـصْلُحُ فِيهَـا شَىْءٌ مِنْ كَلاَمِ النَّاسِ، إِنَّمَا هُوَ التَّسْبِيحُ وَالتَّكْبِيرُ وَقِرَاءَةُ الْقُرْآنِ، أَوْ كَمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّى حَدِيثُ عَهْـدٍ بِجَاهِلِيَّـةٍ وَقَـدْ جَـاءَ اللَّـهُ بِالإِسْلاَمِ، وَإِنَّ مِنَّا رِجَالاً يَأْتُونَ الْكُهَّانَ، قَالَ: « فَلاَ تَـأْتِهِمْ ». قَـالَ: قُلْتُ: وَمِنَّـا رِجَـالٌ يَتَطَيَّرُونَ. قَالَ: « ذَلِكَ شَىْءٌ يَجِدُونَهُ فِى صُدُورِهِمْ فَلاَ يَصُدَّنَّهُمْ ».

(قَالَ ابْنُ الصَّبَّاحِ: فَلاَ يَصُدَّنَّكُمْ) قَالَ: وَكَانَتْ لِى جَارِيَةٌ تَرْعَى غَنَمًا لِى قِبَلَ أُحُدٍ وَالْجَوَّانِيَّةِ، فَاطَّلَعْتُ ذَاتَ يَوْمٍ فَإِذَا الذِّيبُ قَدْ ذَهَبَ بِشَاةٍ مِنْ غَنَمِهَا، وَأَنَا رَجُلٌ مِنْ بَنِى آدَمَ آسَفُ كَمَا يَأْسَفُونَ، لَـكِنِّى صَكَكْتُهَا صَكَّةً، فَأَتَيْتُ رَسُـولَ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فَعَظَّمَ ذَلِكَ عَلَىَّ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلاَ أُعْتِقُهَا؟ قَالَ: « ائْتِنِى بِهَا ». فَأَتَيْتُـهُ بِهَا فَقَالَ لَهَا: « أَيْنَ اللَّهُ؟ قَالَتْ: فِى السَّمَاءِ، قَالَ: « مَنْ أَنَا؟» قَالَتْ: أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ. قَالَ: «أَعْتِقْهَا فَإِنَّهَا مُؤْمِنَةٌ». {الحديث/١١٩٩ = ١١٨٠ ف.م}:

موعاوییەی کوڕی حەکەم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لە پشتی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی جەماعەتم دەکرد، پیاوێ لە ڕیزەکەدا پژمی، منیش وەك واباوە، گوتم: (یَرْحَمُكَ اللّه: خوا ڕەحمت پێ بکا).

خەڵکەکەی ناو نوێژەکەیش، بە ناڕەزایی‌و بێزارییەوە بەچاو ئاماژەیان بۆ کردم، کە چۆن لەناو نوێژدا قسە دەکەم منیش گوتم: ئەی کۆستی دایکم بکەوێ بە مردنی من، دەبێ چی بێ وێڵییەکم کردبێ، کەوا ئەو خەڵکەی وا بێزار کردووە لێم، ئەوە چیتانە وا لێم مۆڕ دەبنەوە؟! ئەوانیش دەستیان دەکێشا بەڕانیانا هەتا من بێ دەنگ بکەن، جا منیش (گەرچی لە کارەکەشیان تووڕە بوو بووم) بەڵام کە دیم وا بێ دەنگم دەکەن خامۆش بووم‌و قسەی ترم نەکرد.

جا کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەر نوێژییەکەی تەواو کرد فەرمووی: (بەڕاستی ئەم نوێژە بە کەڵکی قسەی دنیایی نایێ، چونکە نوێژ دەبێ هەر بڕیتی بێ لە تەسبیحات کردن‌و ئەڵڵاهو ئەکبەر کردن‌و باسی ستایش‌و گەورەیی خودا کردن‌و قورئان خوێندن).

فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یا ئاوای فەرموو، یا فەرمایشتێکی لەم بابەتەی فەرموو.

موعاوییە فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! من مرۆیەکی نۆ موسوڵمانم، تازە لەسەردەمی نەزانی دابڕاوم، ئێستایش خودای گەورە ئەم ئایینە پیرۆزەی ئیسلامی هێناوە، ئێمە لەسەردەمی نەزانیدا، هەندێ شت هەبوون دەمانکردن، وەك ئەوەی دەچووین بۆ لای کوڵە نانی‌و کاهینان‌و بۆ هەندێ کاروباری غەیبیی خۆمان پرس‌و رامان پێ دەکردن؟ فەرمووی: (ئیتر هاموو شۆیان مەکەن). گوتم: نوقڵانەشمان لێ دەدا؟ فەرمووی: (ئەوە شتێکەو دێ بە دڵتاناو عادەت‌و خووتان پێیەوە گرتووە، بەڵام بایەخی نییەو دەربەستی مەبن‌و

پاش ئەم باس و خواسەیش، ئەی خەڵکە! ئێوە لەدوو گیا دەخۆن، من بەخودی خۆم بە پیسیان دەزانم، ئەو دووەیش پیازو سیرن، من بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دیوە، ئەو کەسەی لەناو مزگەوتەکەی خۆیدا، بۆنی یەکێ لەم دوو گیایەی لێ بکردایە، فەرمانی دەدا لە مزگەوت دەریان دەکردو دەیان برد بۆ بەقیع، کە گۆڕستانی موسوڵمانانە لە مەدینە، وا لە نزیک مزگەوتەکەی پێغەمبەرەوە، جا هەرکەسێ دەیانخوات با بیان کوڵێنێ، تا بۆنەکەیان بمرێ، جا ئەوسا بەکوڵاوی لەناو چێشتا یا بەتەنیا بیانخوات). {تاج/١، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٧٢٦ + تاج/٣، زنجیرە: ٥، ژمارە: ١٩٧٤ و ١٩٧٥ + تاج/١، لاپەڕە: ١٠٧، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ١٥٨/١٣}.

## (١٩) باب: السهو في الصلاة والسجود له
## هەڵەی ناو نوێژو کوڕنووش بردن بۆی

٣٣٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِذَا نُودِيَ لِلصَّلاَةِ أَدْبَرَ الشَّيْطَانُ، وَلَهُ ضُرَاطٌ حَتَّى لاَ يَسْمَعَ التَّأْذِينَ، فَإِذَا قَضَى التَّأْذِينُ أَقْبَلَ حَتَّى إِذَا ثُوِّبَ بِالصَّلاَةِ أَدْبَرَ حَتَّى إِذَا قَضَى التَّثْوِيبَ أَقْبَلَ، حَتَّى يَخْطُرَ بَيْنَ الْمَرْءِ وَنَفْسِهِ يَقُولُ لَهُ: اذْكُرْ كَذَا، اذْكُرْ كَذَا . لِمَا لَمْ يَكنْ يَذْكُرُ مِنْ قَبْلُ، حَتَّى يَظَلَّ الرَّجُلُ مَا يَدْرِي كَمْ صَلَّى». {الحديث/ ١٢٦٧. تجريد البخاري/١/٣٥١، رقم: ٣٥٢ = ٦٠٨، ١٢٢٢، ١٢٣١، ١٢٣٢، ٣٢٨٥}:(٣٣٤)

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ بانگ دەدرێ بۆ نوێژ شەیتان هەڵدەتۆڕێنێ و جرت لێ دەدا، تا گوێی لە بانگەکە نەبێ، جا کە بانگەکە تەواو

---

(٣٣٤) تجرید/١، ژمارە: ٣٥٢ = ٦٠٨، مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١٩٦ = ٣٨٩ - ١٢٦٧ شیحا.

دەبێ، دیسان دێتەوە تاقامەت دەکرێ بۆ نوێژ ئەوجا دووبارە هەڵدەتۆرێنێتەوە، کە قامەت تەواو دەبێ دیسان دێتەوە، دەچێتە بنکلێشەی نوێژکەرەوەو پێی دەڵێ: بیر لەمە بکەرەوەو بیر لەوە بکەرەوە، وە ئەوشتانەی لەناو نوێژەکەدا وەبیردێنێتەوە کە لەوەپێش لەبیری نەبوون، هەتا خەریکی بکاو دڵی لەلای نوێژەکەی نەبێو خوضوعو خوشوعی لێ تێك بدا، هەتا بەڕادەیەکی وا، دڵی بێ ئاگادەکا، لەئاستی نوێژەکەی، کەنازانێ چەن رکات نوێژی کردووە). {تاج/١/٢٢٢، زنجیرە: ٥٩، ژمارە: ٤١٤}.

گێڕانەوەی ئێرەی ئەصڵەکە، کە (اللؤلؤ والمرجان)ە، ئەمەی زیاترە: (جا ئەگەر کەسێ وا سەری لێ شێوا، کە نەیدەزانی چەند رکاتی کردووە، وەك ئەوە نەیدەزانی کە سێ رکاتی کردووە، یا چوار رکات، با لەدانیشتنی تەحیاتا دوو کوڕنووشی هەڵە ببات).

**٣٣٥**- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ ابْنَ بُحَيْنَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) (وَهُوَ مِنْ أَزْدِ شَنُوءَةَ وَهُوَ حَلِيفٌ لِبَنِي عَبْدِ مَنَافٍ وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى بِهِمْ الظهْرَ فَقَامَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ لَمْ يَجْلِسْ فَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ حَتَّى إِذا قَضى الصَّلَاةَ وَانْتَظرَ النَّاسُ تَسْلِيمَهُ كَبَّرَ وَهُوَ جَالِسٌ فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ ثمَّ سَلَّمَ). (الحديث ٨٢٩- أطرافه في: ٨٣٠، ١٢٢٤، ١٢٢٥، ١٢٣٠، ٦٦٧٠).[٣٣٥]

عەبدوڵلای کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) کەدایکی ناوی بوحەینەیە، کەلەهۆزی ئەزدی شەنووئەیە، کەهاوپەیمانی نەوەی عەبدومەنافە، کەیەکێکە لەهاوڕێ یانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: رۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی نیوەڕۆی بۆکردین، لەڕکاتی

---

[٣٣٥] تجرید/١، ژمارە: ٤٤٥ = ٨٢٩، مسلم: ١٢٦٩، ١٢٧٠، ١٢٧١.

دوەمیدا یەکسەر هەڵسایەوەو، تەحیاتی یەکەمی نەخوێند، نوێژکەرەکانیش لەگەڵیدا هەڵسانەوە، جاکاتێ نوێژەکەی تەواو کرد، مەردوم چاوەڕوانی ئەوە بوون کەسلاو بداتەوە، لەوکاتەدا بەدانیشتنەوە ئەڵلاهوئەکبەری کردو لەپێش سلاودانەوەدا دوو کوڕنووشی برد، لەجیاتی ئەو تەحیاتەی کەلەیادی چوو بوو، ئەوجا سلاوی دایەوە. خەڵکەکەیش لەگەڵ ئەودا ئەم دوو کوڕنووشەیان برد. (ت/١/٣٢٥/٤ ز-١٠٩ ژ-٦٣٧ = ش/د/ت/ن).

عەبدوڵلای کوڕی مالیك، یەکێکە لە هاوڕێ ناودارەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بوحەینەی دایکیشی صەحابییە بووە، دەڵێن: باوکیشی لە هاوڕێیانی پێغەمبەر بووە، لە هۆزی ئەزدە، لە مێژەوە موسوڵمان بوو بوو، پیاوێکی سۆفیلکەی خوا پەرست بوو، ئەم زاتانە فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە: ئەعرەج و حەفصی کوڕی عاصم و عەلی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی بوحەینە، لە ئاخرو ئۆخری جێنشینیی موعاوییەدا، لەکاتی فەرمانڕەوایی مەروان لەسەر مەدینە، لە پەنجاو شەشی کۆچیدا مردووە، یەکێکە لە پیاوانی صەحیحەین.

٣٣٦- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بنْ مسعود (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (صَلَّى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِبْرَاهِيمُ الراوي عن علقمة الراوي عن ابن مسعود: لَا أَدْرِي زَادَ أَوْ نَقَصَ فَلَمَّا سَلَّمَ قِيلَ لَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَحَدَث فِي الصَّلَاةِ شَيْءٌ؟ قَالَ وَمَا ذاكَ؟ قَالُوا صَلَّيْتَ كَذا وَكَذا فَثنَى رِجْلَيْهِ وَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ ثمَّ سَلَّمَ فَلَمَّا أَقْبَلَ عَلَيْنا بِوَجْهِهِ قَالَ إِنَّهُ لَوْ حَدَث فِي الصَّلَاةِ شَيْءٌ لَنَبَّأْتُكُمْ بِهِ وَلَكِنْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثلُكُمْ أَنْسَى كَمَا تَنْسَوْنَ فَإِذا نَسِيتُ فَذكِّرُونِي وَإِذا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ فَلْيَتَحَرَّ الصَّوَابَ فَلْيُتِمَّ

عَلَيْهِ ثمَّ لِيُسَلِّمْ ثمَّ يَسْجُدُ سَجْدَتَيْنِ). (الحديث:٤٠١ أطرافه في: ٤٠٤، ١٢٢٦، ٦٦٧١، ٧٢٤٩).[٣٣٦]

عەبدوڵلای کوری مەسعوود (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرنوێژی نوێژی نیوەڕۆ بۆ یارانی دەکا، ئیبراهیم کەئەم فەرموودەیە لەعەلقەمەوە، لەئیبنومەسعوودەوە دەگێڕێتەوە، لێ ی تێك چوو بوو، دەیفەرموو: نازانم: پێغەمبەر لەنوێژەکە زیاد دەکا، یالێ ی کەم دەکاتەوە. جاکاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سلاو دەداتەوە عەرزی دەکەن: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا هیچ گۆڕانێ لەنوێژدا رووی داوە؟ فەرمووی: (بۆچی چی بووە؟) گوتیان: وا وانوێژت کرد، وەك رۆژان بەئاسایی نوێژت نەکرد. جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر چۆك بەرەورووگە دانیشت، وەك بۆ تەحیات دابنیشێ ئاوا، وەدوو کڕنووشی هەڵەی برد، ئەوجا سلاوی دایەوە، پاشتر کاتێ رووی تێ کردین فەرمووی: (ئەگەر گۆڕانێ لەنوێژدا رووی بدایە پێم دەگوتن، منیش ئادەمیزادم وەکوو ئێوە، چۆن ئێوە شتتان لەبیردەچێ منیش ئاوەها جاروبار شتم لەبیردەچێ، جائەگەر رێکەوت جارێ شتێکم لەیاد نەمابوو، ئێوە بیخەنەوە یادم، ئەگەر لەنوێژەکەتاندا گومانتان بۆ پەیدا بوو، وەك ئەوە کەنەتاندەزانی کەسێ رکاتتان کردووە یادووڕکات، ئەوە لەباردۆخی وادا، بانوێژخوێن بەووردی بیربکاتەوەو، مشووری رووی بە راستی بخواتو جاچی بەڕاست دەزانێ لەسەرنەوەوە نوێژەکەی تەواو بکات، ئەمجار سلاو بداتەوە، ئەوجا دوو کڕنووشی هەڵە ببات) (ب/١/٩/٣٢٧ ز-١٠٩ ژ-٦٤٢ چ-٤).

---

[٣٣٦] تجرید/١، ژمارە: ٢٥٤ = ٤٠١، مسلم: ٥٧٢ = ١٢٨١.

**ڕوونکردنەوە:**

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) ناسراوە، بە ئیبنو مەسعوود، یەکێکە لەگەورە هاوەڵانی پێغەمبەری ئازیزو خۆشەویست، لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکانە، دوو کۆچی کردووە، لەپێناوی ئیسلاما، کۆچێ بۆ حەبەشەو کۆچێ بۆ مەدینەی نازدار، هۆی ئەم کۆچانەی سەحابەکان ئەوەبوو، بێباوەڕانی مەککە ئازاریان دەدان، لەسەر قەبووڵی ئیسلام، هەیان بوو لەم پێناوەدا شەهید دەبوو، وەك خاتوو سومەییەی دایکی عەمماری کوڕی یاسیر {بڕوانە: پوختەی موسلیم زنجیرە: ٣٠٤، ژمارە: ٤١١ – ڕوونکردنەوە} .

ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) ئامادەی غەزای بەدرو شەڕگاکانی تری پاشی بووە، هەمیشە لەخزمەت پێغەمبەردا بوو، مەگەر چۆنەها خزمەتی ئەوی چۆڵ بکردایە، خزمەتی پێڵاوەکانی پێغەمبەری دەکرد، لەکاتی هەستانا پێڵاوەکانی بۆی دادەنا، وەك تر سۆڵەکانی پێغەمبەری دەکردە قۆڵی خۆی، هەشت سەدو چلو هەشت فەرموودەی پێغەمبەری گێڕاوەتەوە، چلو چواریان پەسەندی هەردوو پیرن، واتە: شێخی بوخاریو شێخی موسلیم، کە لەزانستی فەرموودەدا ناسراون بە شەیخەین، ئەو چلو چوارەیان گێڕاوەتەوە، بیستو یەك فەرموودەی تری، بێجگە لەو چلو چوارەیش، لە بوخاریدا هەیە، لە موسلیمدا نین، سیو پێنج فەرموودەی تریشی بێجگە لەو چلو چوارە، لە صەحیحی موسلیمدا هەیە، لەبوخاریدا نین، کەواتە: ٤٤ + ٢١ = ٦٥ فەرموودە، کۆی فەرموودەکانی ئیبنو مەسعوود لە صەحیحی بوخاریدا، ٤٤ + ٣٥ = ٧٩ فەرمووده = کۆی فەرموودەکانی ئیبنو مەسعوود لە صەحیحی موسلیمدا، ٦٥ + ٧٩ = ١٤٤ = کۆی فەرموودەکانی ئیبنو مەسعوود لە صەحیحەیندا، ٤٤ + ٢١ + ٣٥ = ١٠٠ فەرموودە لە صەحیحەینا، بەبێ دووبارە.

ئیبنـو مەسـعوود (رەزای خـودای لێ بـێ) دەیفـەرموو: لـەزاری پـیرۆزی پێغەمبەری ئازیزو خۆشەویستو نـازدار خـۆی، (دروودو سڵاوی خـودای لەسـەر بێ)، حەفتا سوورەتی قورئانم لەبەرکردووە، ئیبنو مەسعوود یەکـەم کـەس بـوو، کـە لەمەککـە بـە ئاشـکرا قورئـانی دەخوێنـد، ئەوەنـدە بـەردەوام لەگـەڵ مـاڵی پێغەمبـەردا تێکـەڵ بـوو، لـە خـەڵکی وابـوو، کـە یەکێکـە لـەخێزانی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

ناوداربوو بە صاحیبی سیواکی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) موژدەی بەهەشتی پێ داوە، بکوژی ئـەبو جەهل بوو (بڕوانە: بەرگی/٤، تەجریدی بوخاری، ژمارە: ١٥٢٦/٣٩٦٢).

ئیبنـــو مەســـعوود رووەو قیبلەتـــەین نوێـــژی کـــردووە، واتـــە: لـــەو موسوڵمانانەیە کە لەپێشا، کە نوێژیان دەکرد روویان دەکردە مەسجیدول ئەقصا لـە قـودس، دوایـی خـودای گـەورە فـەرمانی پێیـانکرد، کـە لەنوێـژدا رووبکەنـە کەعبە، کەوا لە مەسجیدولحەرام لەمەککەی پیرۆز.

ئیبنـو مەسـعوود مامۆسـتایەکی مـەزنی قورئـانزانو فـەرموودەزان بـوو، قوتابیو فەقێی زۆری هەیە لەم دوو بوارەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بێ) دەیفەرموو: (دوو لاقە لەڕەکانی ئیبنو مەسعوود، لە قیامەتدا، لە تـەرازووی کێشانی خێرو شەڕدا، لەکێوی ئوحود قورسترن).

لەساڵی (٣٢) سییو دووی کۆچیدا، لەشاری مەدینە، لە تەمـەنی شەسـتو هەنددا، بەمردنی خودا مردووەو کۆچی دوایی کردووە، ئیمامی عوسمـان نوێـژی تـەرمی لەسـەر کـردووە، لـە گۆڕسـتانی بـەقیع، بـەخاك سـپێرراوە، بـۆ زیـاتر شارەزابوون لـە ژیاننامـەی ئـەم هاوڕێ مەزنـەی پێغەمبـەر بڕوانـە: (تەجریـدی

بوخاری بەکوردی/٤، ژمارە: ١٤٧٣ + پوختەی موسلیم، ژمارە: ٣٥ + تاج/٣، زنجیرە: ٣ لەژمارە: ٣٤٠١وە هەتا ژمارە: ٣٤١٠).

٣٣٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِحْدَى صَلاَتَيِ الْعَشِيِّ، إِمَّا الظُّهْرَ وَإِمَّا الْعَصْرَ، فَسَلَّمَ فِي رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَتَى جِذْعًا فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ فَاسْتَنَدَ إِلَيْهَا مُغْضَبًا، وَفِي الْقَوْمِ أَبو بَكْرٍ وَعُمَرُ (رَضِيَ اللّهُ عنهما)، فَهَابَا أَنْ يَتَكَلَّمَا، وَخَرَجَ سَرَعَانُ النَّاسِ قَالُوا: قُصِرَتِ الصَّلاَةُ، فَقَامَ ذُو الْيَدَيْنِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَقُصِرَتِ الصَّلاَةُ أَمْ نَسِيتَ؟ فَنَظَرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَمِينًا وَشِمَالاً فَقَالَ: « مَا يَقُولُ ذُو الْيَدَيْنِ؟». قَالُوا: صَدَقَ، لَمْ تُصَلِّ إِلاَّ رَكْعَتَيْنِ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ كَبَّرَ ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ كَبَّرَ فَرَفَعَ، ثُمَّ كَبَّرَ وَسَجَدَ، ثُمَّ كَبَّرَ وَرَفَعَ. قَالَ: وَأُخْبِرْتُ عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ أَنَّهُ قَالَ: وَسَلَّمَ». {الحديث/١٢٨٨ = ١٢٥٥ = فـم = فَتْحُ الْمُلْهِمِ = ٤٨٢ تجريد = ٧١٤، ٧١٥، ١٢٢٧، ١٢٢٨، ١٢٢٩، ٦٠٥١، ٧٢٥٠}:[٣٣٧]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرنوێژیی نوێژی نیوەڕۆ (یا عەسر)ی بۆ دەکردین، دوو ڕکاتی بۆمان کردو سلاوی دایەوە، تەختەیەك لەناو مزگەوتا، لەرووی رووگەوە هەڵ سەپێنرا بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسا پاڵی دا بەو تەختەیەوە، کە برێتی بوو لەو کۆتەرە خورمایە، کە پێغەمبەر لەپێش دروستکردنی دوانگەکەیدا پاڵی پێوەی دەدا، وەك عاجزو زیز وابوو، دەستی راستی نایە سەر دەستی چەپیو پەنجەکانی تێك پەڕاندو روومەتی لای راستی دانا لەسەر پشتی دەستی چەپی، وە ئەوانەی بە پەلەبوون لە دەرگاکانی مزگەوتەوە چوونە دەرەوە، نوێژکەرەکانی تریش لەبەرخۆیانەوە گوتیان: نوێژ

---

[٣٣٧] مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٣٥٢ = مسلم ترقيم شيحا: ١٢٥٥.

کورت کراوەتەوە؟ ئەبوبەکرو عومەریش (رەزای خودایان لێ بێ) لەناو کۆمەڵەی نوێـژ خوێنـەکانا بـوون، پرکێـشییان نـەکرد کـە لـەم بارەیـەوە قـسە لەگـەڵ حەزرەتدا بکەن، لەناو کۆمەڵەکەدا پیاوێ هەبوو، هـەردوو دەسـتی کـەمێ درێـژ بوون، لەبەرئەوە پێیان دەگوت: ذولیەدەین (واتە: دوو دەست درێژکەلە) جا ئەو پیاوە هەڵسا، عـەرزی خۆشەویـستی کـرد: قوربـان! ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئایا نوێژ کورت کراوەتەوە، یاتۆ لەیادت نەبووە، کەوا لەباتی چوار رکات دوو رکاتت کـرد؟ پێغەمبـەریش (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (ئـەم دوو شـتە هیچیان رووی نەداوە، نە من لەبیرم چووەو نە نوێژیش کورت بۆتـەوە، ئـەویش عـەرزی کـرد: بـا، ئـەی پێغەمبـەری خـودا! یـەکێ لـەم دوو شـتە رووی داوە، پێغەمبـەریش (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بەراسـتو بـە چـەپا تەماشـای خەڵـکەکەی کـردو رووی تـێ کـردنو فـەرمووی: (ئایـا شـتی وا رووی داوە، وەك ذولیەدەین دەڵێ وایە؟) گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبـەری خـودا! قسەکەی تـەواوە، تەنیا دوو رەکاتت کرد، ئەنجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) گەڕایـەوە بـۆ جێـگەی نوێژەکـەی خـۆیو، پێـشکەوتەوەو دوو رکـاتی تـری کـردو، بـە دانیشتنەوە، لەپاش سڵاودانەوە، دوو کوڕنووشی هەڵەی لەسەر ئەم شێوەیە برد: لەپاش سڵاودانەوەی جاری دووەم، ئەڵڵاهو ئەکبەری کردو کوڕنووشێکی ئاسایی برد، یان کەمێ درێـژتر، ئـەوجا ئـەڵڵاهو ئەکبـەری کـردو لـە کوڕنووشـی یەکـەم هەڵسایەوە، ئـەوجا ئـەڵڵاهو ئەکبـەری کـردو کوڕنووشـێ ئاسایی تـری بـرد، یـان کەمێ درێژتر لە کوڕنووشی ئاسـایی، دیسانەوە ئـەڵڵاهو ئەکبـەری کـردو سـەری بەرزەوە کردو بۆ جاری سێیەم سڵاوی دایەوە). {تاج/١/٣٢٦، زنجیرە: ١٠٩، ژمـارە: ٦٤٠، ٦٤١، ٦٤٢}.

## (٢٠) باب: سجود التلاوة
## باسی کوڕنووشی قورئان خوێندن

٣٣٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّهُ عنهما): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): كَانَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، فَيَقْرَأُ سُورَةً فِيهَا سَجْدَةٌ، فَيَسْجُدُ وَنَسْجُدُ مَعَهُ حَتَّى مَا يَجِدُ بَعْضُنَا مَوْضِعًا لِمَكَانِ جَبْهَتِهِ». {الحديث/١٢٩٥ = ١٢٦٢ فم. تجريد/١/٥١٨، رقم: ٥٤٣ = ١٠٧٥، ١٠٧٦، ١٠٧٩}: [٣٣٨]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە ئەو سوورەتانەی ناو قورئانی بۆمان دەخوێند، کە کوڕنووشیان واتیادا، کاتێ دەگەیشتە ئەو ئایەتەی کە شوێنی کوڕنووشەکەیە، خۆی کوڕنووشی دەبردو ئێمەش کوڕنووشمان لەگەڵیدا دەبرد، تەنانەت لەبەر زۆری عەشاماتەکە، هەندێکمان جێگەی دەست نەدەکەوت، هەتا لەکاتی کوڕنووشەکەدا تەوێڵی لەسەر دانێ). {تاج/١/٣٣٠، زنجیرە: ١١٠، ژمارە: ٦٤٦}..

٣٣٩- عَنْ عَبْدِ اللّهِ بن مسعود (رَضيَ اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: (قَرَأَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ النَّجْمَ بِمَكَّةَ فَسَجَدَ فِيهَا وَسَجَدَ مَنْ مَعَهُ غَيْرَ شَيْخٍ، أَخَذَ كَفًّا مِنْ حَصًى، أَوْ تُرَابٍ فَرَفَعَهُ إِلَى جَبْهَتِهِ، وَقَالَ يَكْفِينِي هَذا، فَرَأَيْتُهُ بَعْدَ ذلِكَ قُتِلَ كَافِرًا). (الحديث: ١٠٦٧- اطرافه في: ٤٨٦٣،٣٩٧٢،٣٨٥٣،١٠٧٠). [٣٣٩]

عەبدڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەمەککە، جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سورەتی(والنجم)ی خوێندو کوڕنوشی تیادا برد، ئەوا نەیش کەلەوێ بوون لەگەڵیا کوڕنووشیان برد، تەنیا پیرەمێردێ نەبێ، کەگوێلێ چەو، یالاگوێلێ خۆڵی هەڵگرت و بەرزی کردەوە بۆتەوێڵی و

---

[٣٣٨] مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٣٥٢ = ١٢٥٥ شيحا.

[٣٣٩] تەجرید/١، ژمارە: ٥٣٨، بخاری: ١٠٦٧، مسلم: ٥٧٦ = ١٢٩٧.





گوتی: پێویست بەکورنووش ناکائەمەم بەسە، لەوەدوا ئەوپیرەمێردەم دی بەکافری کوژرا. (تاج/١/٣٣٢/٨ ز-١١٠ ژ-٦٥٢ = ش/د/ت/ن).

عەسقەلانی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرمووێ: (لەتۆڵەی ئەوەدا کەکورنوشی نەبرد بەبێبڕوایی کوژرا، وادیارە ئەوانەی کەلەورۆژەدا بەم بۆنەیەوە تەوفیق دران بۆکڕنوش بردن، خودای گەورە ئاخر خێری بەنسیبی هەموویان کردووە، بەپیرۆزی ئەو کڕنوشە، لەئەنجاهەموویان موسوڵمان بوون).

٣٤٠- حديث زيد بن ثابت عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ ، أَنَّهُ سَأَلَ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ (رضى الله عنه) فَزَعَمَ أَنَّهُ قَرَأَ عَلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) ( وَالنَّجْمِ) فَلَمْ يَسْجُدْ فِيهَا.[٣٤٠]

عەطائی کوڕی یەسار فەرمووی: زەیدی کوڕی ثابیت (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: سوورەتی (والنجم)م دەورکردەوە بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کورنووشی تیادا نەبرد. (تاج/١/٣٣٤ = زنجیرە: ١١١، ژمارە: ٦٥٨ = ش/د/ت/ن).

٣٤١- عَنْ أَبِى رَافِعٍ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ)،، صَلاَةَ الْعَتَمَةِ، فَقَرَأَ: (إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ) فَسَجَدَ فِيهَا، فَقُلْتُ لَهُ: مَا هَذِهِ السَّجْدَةُ؟ قَالَ: سَجَدْتُ بِهَا خَلْفَ أَبِى الْقَاسِمِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلاَ أَزَالُ أَسْجُدُ بِهَا حَتَّى أَلْقَاهُ». {الحديث/١٣٠٦ = ١٢٧٣ فم}:[٣٤١]

ئەبو رافیع (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) بەرنوێژیی نوێژی خەوتنانی بۆ کردین، سوورەتی {إِذَا السَّمَاء انشَقَّتْ}ی خوێند، کە گەیشتە ئایەتی: {وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ الْقُرآنُ لَا يَسْجُدُونَ}

---

[٣٤٠] تجرید/١، ژمارە: ٥٤١ = بخاری: ١٠٧٢، مسلم: ٥٧٧ = ١٢٩٨.

[٣٤١] تجرید/١، ژمارە: ٤١٧ = ٧٦٦، مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٣٥٤ = ١٣٠٦.

کوڕنووشی برد. که له نوێژ بووینەوە گوتم: ئەم کوڕنووشە چی بوو؟ فەرمووی: لەپشتی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژم کردووەو لەدوای ئەم ئایەتەوە لەناو ئەو نوێژەدا، لەگەڵ حەزرەتدا، کوڕنووشی قورئان خوێندنم بردووە، لەبەرئەوە هەتا دەگەمەوە بە خزمەتی لەودنیا، لەم شوێنەدا، ئەم کوڕنووشە هەر دەبەمو هەرگیز تەرکی ناکەم).
{تاج/١/٣٣٣،زنجیرە:١١٠،ژمارە:٦٥٤} + {تجرید/١/٤٠١، ژمارە:٤١٧=٧٦٦، ٧٦٨، ١٠٧٤، ١٠٧٨} .

ئەمەیش دەقی فەرموودەی ژمارە (٣٧٢)ی شەرحی بلوغ المرامە کۆمەڵێ زانیاری گرنگی جوانی واتیادا:

وَعَنْ اَلْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَـا) {أَنَّ اَلنَّبِـيَّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) بَعَثَ عَلِيًّا إِلَى اَلْيَمَنِ (فَذَكَرَ اَلْحَدِيثَ) قَالَ: فَكَتَبَ عَلِيٌّ (رَضِيَ اللَّـهُ عَنْـهُ) بِإِسْلَامِهِمْ، فَلَمَّا قَرَأَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) اَلْكِتَابَ خَرَّ سَاجِدًا شُكْراً عَلَى ذَلِكَ} رَوَاهُ اَلْبَيْهَقِيُّ. وَأَصْلُهُ فِي اَلْبُخَارِيِّ. {بیهقی ٢/٣٦٩. پوختەی بوخاری/٤، ژمارە: ١٦٠٠ = ٤٣٤٩ فتح الباری} :

بەرائی کوڕی عازیب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەلی نارد بۆ یەمەن، فەرموودەکەی گێڕایەوە، هەتا ئەوێ که دەفەرموێ: عەلی نامەی نووسی بۆ پێغەمبەر بۆ مەدینە کە سەرجەم گەلی یەمەن ئیسلام بوون، کە کاغەزەکەی عەلی گەیشتو پێغەمبەر خوێندیەوەو ئەم هەواڵە خۆشەی تیابوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپەوروو کوڕنووشێکی سوپاسی برد بۆ خودای گەورە، لەسەر ئەم مۆزدە خۆشە).




بەیهەقی گێڕاویەتەوە، ئەمەیش ئەصڵەکەیەتی لەبوخاریدا، کە دانەری بلوغ المرام ئاماژەی بۆ دەکا: {تجریدی بوخاری/٤، ژمارە: ١٦٠٠}.

بەرائی کوڕی عازیب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ خالیدی کوڕی وەلیددا، ناردینی بۆ یەمەن، بۆ غەزاکردن، لەپاش گەڕانەوەمان لەتائیف، لەپاش ماوەیێ، عەلی نارد لەشوێن خالید، وەبەعەلی دەفەرموێ: (بەهاوڕێکانی خالید بڵێ: ئەوەی کە حەزدەکا لەگەڵ خالیددا بگەڕێتەوە بۆ مەدینە، ئەوە کەیفی خۆیەتی، وەئەوەیشی کە حەزدەکا لەگەڵ تۆدا بمێنێتەوەو لەپاشدا لەگەڵ تۆدا بگەڕێتەوە بۆ یەمەن، ئەویش هەر ئارەزووی خۆیەتی، من خۆم یەکێك بووم لەوانەی کە لەگەڵ عەلیدا، گەڕاینەوە بۆ یەمەنو، لەگەڵیدا ماینەوە لەوێ، جا ئەندازەیەکی باش پارەو پوولم لەتالآن وەدەست کەوت!). {تاج/٤، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٤٦٤٨}.

**روونکردنەوە:**

١- ئەم باسە لە بلوغ المرامدا (٣٧٢ — ٣٤٨ = ٢٤) بیستو چوار فەرموودەیە.

٢- کوڕنووشی هەڵە، سوننەتە یا فەرزە، وەجێگەکەی کوێیە، ئەڵلاهوئەکبەری بۆ دەکرێ یانا، یا چی تیادەخوێندرێ، باسێکی دوورودرێژە، لە فەرموودەکاندا، ئاماژە بۆ وەلامی ئەم پرسیارانە کراوە، ئێمە لێرەدا پوختەی مەزهەبی شافیعی دەنووسین (رەحمەتی خودای لێ بێ).

**یەکەم:** لەمەزهەبی کوردەواری خۆماندا، کە مەزهەبی شافیعییە:

١- کوڕنووشی هەڵە سوننەتێکی گەورەیە فەرز نییە.

٢- دوو کوڕنووشی بەرودوایە، لەرووکنو فەرزو سوننەتو مەرجدا، ڕێك وەك کوڕنووشی ئاسایی ناو نوێژ وایە.




٣- جێگەی پێش سڵاودانەوەی کۆتاییە.

٤- بۆ هەموو نوێژخوێنێ سوننەتە، تاك بێ، یان بەجەماعەت نوێژ بکا، بەڵام ئەگەر بەرنوێژکار کوڕنووشی نەبرد، نابێ پاشنوێژ کوڕنووش بەرێ.

٥- نوێژەکە فەرز بێ، یا سوننەت بێ، جیاوازیی نییە، ئەگەر نوێژخوێن هەڵەی کرد، سوننەتە کوڕنووشی هەڵە ببات.

٦- کاتێ دەچێ بۆ کوڕنووشەکە ئەللاهوئەکبەر دەکا، کەبەم تەکبیرە دەگوترێ ئەللاهوئەکبەری ئیحرامی سجودی سەهو، کەسەری لەکوڕنووشی یەکەم هەڵبڕی ئەللاهوئەکبەر دەکاو دانیشتنی وچانی نێوان دوو سەجدە ئەنجام دەدا، ئەوجا ئەللاهوئەکبەر دەکاتەوەو کوڕنووشی دووەم دەبا، ئەوجا ئەللاهوئەکبەر دەکاو هەڵدەستێتەوەو ڕێك وەك بۆ تورکی تەحیات دابنیشێ ئاوا دائەنیشێ، ئەوجا بەلای ڕاستو بەلای چەپا سڵاو دەداتەوەو کۆتایی بەنوێژ دەهێنێ.

٧- ویردی ناو کوڕنووشی هەڵە، وەك ویردی ناو کوڕنووشی ناو نوێژ وایە، کە ئەمەیە (سُبْحانَ رَبِّيَ ٱلأَعْلى وَبِحَمْدِهِ).

**دووەم:** نوێژخوێن یەك هەڵە بکا، یازیاتر، یەکجار دوو سەجدە دەباو تەواو. (بڕوانە: فیقهی ئاسان، بەرگی یەکەم، زنجیرە: ٦٩ — کوڕنووشی هەڵەو هۆیەکانی).

**سێیەم:** لەلای شافیعییەکان، کە مەزهەبی پەیڕەوکراوی کوردەواری خۆمانە:

١- کوڕنووشی تیلاوەت سوننەتە، فەرز نییە.

٢- بۆ گوێگرو بۆ خوێنەر سوننەتە، بۆ نێرومێ، بۆ گەورەو گچکە.

٣- لەناو نوێژیشا، ئەگەر ئایەتی سەجدە خوێندرا، کوڕنووشی تیلاوەت سوننەتە، چی نوێژخوێن تەنها بێ، چی بەکۆمەڵ نوێژ بکا، تەنها لەنوێژی تەرما کوڕنووشی تیلاوە نابرێ، هەروا ئەگەر لەناو روکوعو إعتدالو سەجدەو تەحیاتا ئایەتی سەجدە بخوێنێ، نابێ سجدە ببا.

٤- کوڕنووشی تیلاوەت یەك کوڕنوووشە.

٥- ئەم چوار شتە بۆ غەیری نوێژخوێن، فەرائیزی کوڕنووشی تیلاوەتن:

آ- نێتی کوڕنووشی قورئانخوێندن بهێنێ.

ب- ئەڵڵاهوئەکبەری تەحەرووم بکا.

ج- یەك کوڕنووش ببا، وەك کوڕنووشی نوێژ.

د- سڵاودانەوە، وەك سڵاودانەوەی نوێژ، بەهەردوو لادا.

٦- واپەسەندە بەدانیشتنەوە نێت بهێنێو ئەڵڵاهوئەکبەری تەحەرووم بکا.

٧- چی سوننەتە یاواجبە، لەکوڕنووشی نوێژدا، لەکوڕنووشی تیلاوەتیشدا سوننەتە، یان واجبە، وەك ئەوە لەسەر حەوت ئێسك کوڕنووش ببا.

٨- ئەمەیش مەرجەکانیەتی، چی لەکوڕنووشی نوێژدا مەرجە، لەکوڕنووشی قورئانخوێندنیشا مەرجە، وەك: پاکیو پۆشینی شەرمگاو رووکردنە رووگەو هاتنی کاتی کوڕنووشەکە، کە ئەومیە ئایەتی سەجدەکەی بەتەواوی خوێندبێ، نابێ یەك پیتی بمێنێ.

٩- سوننەتە لەناویا ئەم ویردە بخوێنێ: «سَجَدَ وَجْهِيَ لِلَّذِي خَلَقَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ بِحَوْلِهِ وَقُوَّتِهِ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ». بەڵام ئەگەر بەیەکجار (سبحان ربی الأعلی)یش ئیکتیفا بکا دەبێ.




١٠- خوێنەر لەغەیری نوێژدا کوڕنووشیش نەبا، بۆ بیسەر سوننەتە کوڕنووش ببا.

١١- تەکبیراتو ئەڵڵاهوئەکبەرەکانی:

آ- لەکاتی نێت دابەستندا، ئەڵڵاهوئەکبەر دەکاو هەردوو دەستی بەرزدەکاتەوە، وەك کاتی ئەڵڵاهوئەکبەری نوێژدابەستن.

ب- ئەوجا بەبێ دەست بەرزکردنەوە (الله اکبر) دەکاو دادەنەوێتەوەو تەوێڵ دەنێتە سەر جێگە نوێژەکەیو یەك کوڕنووش دەبا، کە لە روکنو مەرجو سونەندا، رێك وەك کوڕنووشی نوێژ وەهایە، ئەوجا لەپاش خوێندنی ویرد، بەبێ ئەوە دەستەکانی بەرز بکاتەوە، ئەڵڵاهوئەکبەر دەکاو رێك وەك تەحیات دابنیشێ، ئاوا دەدادەنیشێو یەکسەر سڵاو دەداتەوە، لەپێشدا بەلای ڕاستدا، ئەوسا بەلای چەپدا.

١٢- کوڕنووشی تیلاوەت، ئەگەر لەنوێژدا نەبوو، بەجەماعەت ناکرێ، خوێنەرو بیسەر، هەر کەس پەیوەندی بەخۆیەوە هەیەو بەس.

١٣- مەرجی کوڕنووشی قورئانخوێندن، وەك مەرجی نوێژکردن وەهایە، کەواتە: نابێ قسە بکا، یان شت بخوا، یان ڕووی لەڕووگە وەرچەرخێنێ، یان دەسنوێژی بشکێ، یان شەرمگای دەرکەوێ.

١٤- لەناو نوێژدا کوڕنووشی قورئانخوێندن ئاوایە:

آ- پاشنوێژ (مەئمووم) شوێن پێشنوێژ دەکەوێ، نابێ خۆی بەتەنها کوڕنووش ببا، بەبێ پێشنوێژ.

ب- کاتێ ئایەتەکە بەتەواوی دەخوێنێ، ئەڵڵاهوئەکبەر دەکاو بەبێ ئەوە دەستەکانی بەرزبکاتەوە، دادەبەزێو یەك کوڕنووشی ئاسایی دەبا، ئەوجا بەبێ دەست بەرزکردنەوە ئەڵڵاهوئەکبەر دەکاو هەڵدەستێتەوە سەر پێ، بەتەواوی،

جا ئەگەر حەزکا، یەکسەر ئەڵلاهوئەکبەر دەکاو دەچێ بۆ چەمینەوە، ئەگەر حەزیش بکا، قورئانی تریش دەخوێنێ، ئەوسا دەچی بۆ چەمینەوە، واسوننەتە هەندێ قورئانی تر بخوێنێ، ئەوسا بچێ بۆ چەمینەوە.

**چوارەم:** ئەگەر لەیەك رکاتدا، چەند ئایەتێکی سەجدەی خوێند، ئەوە هەموو جارێ سەجدە دەبات، بەوێنە: ئەگەر لەیەك رکاتدا خەتمەیەکی کرد، ئەوە چواردەجار سەجدە دەبات.

**پێنجەم:** کوڕنووشی تیلاوەت قەزا کردنەوەی نییە.

**شەشەم:** سەجدەکانی تیلاوەت چواردەن:

١ ، ٢- دوو سەجدە لە حەجا ٣- والنجم ٤- الانشقاق ٥- اقرأ ٦- الأعراف ٧- الرعد ٨- النحل ٩- الإسراء ١٠- مريم ١١- الفرقان ١٢- النمل ١٣- ألم تنزيل ١٤- حم السجدة.

**حەوتەم:** کوڕنووشی سوپاس، کە جێگەکەی دەرەوەی نوێژە، لەلای شافیعییەکان، ئاوایە:

لەنوێژدا دروست نییە، بریتیە لەیەك کوڕنووش، رێك وەك کوڕنووشی تیلاوەتی دەرەوەی نوێژ وایە، لەروکنو مەرجو فەرزو سوننەتو چۆنیەتو پووچکەرەوەدا، لەوەیشدا کە قەزا ناکرێتەوە هەر ئەوەندە بەسە کە بڵێ: (سبحان ربی الأعلی) بەڵام واباشە، کە ویردی زۆر موناسیب بخوێنێ.

**هەشتەم:** هۆی کوڕنووشی سوپاس، ئەم چوار شتەیە:

١- کوڕنووشی سوپاس سوننەتە، کاتێ موژدەیەکی خۆش وەردەگری، یان هەست بە پەیدابوونی خەڵاتێ، یان بەخششێ دەکەی، وەك منداڵبوونو شادبوون بە پلەو پایەو گەڕانەوە لەسەفەری دووورو هاتنەوەو بینینی کەسی نادیاری دوورە وڵاتو شتی تری ئاوا، کەدابنرێ بەنازو خەڵاتو بەهرەو

نیعمەتی خودا، وەك دەرچوون لە ئەزموونێ، وەرگرتنی بڕوانامەی کۆتایی ساڵ، بۆ قوتابیو خوێندکار، بەم جۆرە دەگوترێ (هجوم النعمة).

٢- هەروا کوڕنووشی سوپاس سوننەتە، کاتێ لەچورتومێ، لەبەڵایێ، لەکێشەیێ، مرۆڤ رزگاری دەبێ، وەك ئەوە لە کارەساتێ، یان لەئاگربەربوونەوەیێ، خۆی، یان کەسێکی، یان سامانێکی رزگاری دەبێ، یان لەخنکانێ رزگاری دەبێ، بەم جۆرەیش دەگوترێ (اندفاع نقمة) رزگار بوون لەبەڵایێ.

٣- کاتێ دووچاری دەردێ، بەڵایێ، کێشەیێ دەبێ، ئیتر ئەو دووچارییە جەستەیی بێ، یاسامانی، یان شتی تر، وەك بینینی گوڵێ، یان کەسێ تەنها یەك کوڕی هەیە، لەکارەساتێکی دڵتەزێنا، دەمرێ یان دەکوژرێ، بەم جۆرەیش دەگوترێ: (رؤیة مبتلی) لەکاتی وادا کوڕنووشی سوپاس سوننەتە، لەسەر نیعمەتی سەلامەتیو ئاسوودەیی.

٤- کاتێ دەبینێ بەدکارێ، تاوانێ، گوناهێکی گەورە ئەنجام دەدا، وەك ئەوە بە بەرچاوی خەڵکەوە ئارەق دەخواتەوە، یان لەپارکی ئازادی دانیشتووە چەتیوێ والەباوەشیا، خوا پەنامان بدا، لەم کاتانەیشدا، کوڕنووشی سوپاس سوننەتە، کە خودا بە بەخششی خۆی لەشتی وا پیسو چەپەڵ پاراستوویەتی، چونکە قۆرتو چورتەو دووچار بوونی زیانی ئایینی، گەلێ خراپترە، لەقۆرتو زیانو ماڵوێرانی جیهانی، بەم جۆرەیش دەگوترێ (رؤیة العاصی).

**(تێبینی):**

لەکاتی هۆی کوڕنووشی سوپاسدا ئەم سێ شتە سوننەتە:

١- کوڕنووشی سوپاس بەتەنیاو بەس.

٢- خێرکردن بەتەنیا، بەنیازی سوپاسی خودا، لەسەر شادبووون بەو بەهرەیە، یان رزگاربوون لەو بەڵایە.

٣- دوو رکات نوێژی سوپاس، کە پێی دەگوترێ (صلاة الشكر) نوێژەکە دوو رکات زیاتریش بێ دەبێ.

٤- بەڵام لەهەمووی باشتر ئەوەیە کە لەپێشا کوڕنووشی سوپاس ئەنجام بدا، ئەنجا خێریش بکا، ئەنجا دوورکات نوێژی سوپاس بکا.

٥- **پوختەی مەبەست:** سوپاسی خودا لەم کاتانەدا بەم سێ شێوەیە دێتەدی، ئیتر ئەم سێ شتە بەتەنها بکرێن، یان تەنها دووانیان بکرێن، یان هەرسێکیان پێکەوە بکرێن.

**نۆیەم:** کوڕنووش بردن لەکاتی رووداني نیشانەکانو قەوماني کارەساتی گەورەدا، وەك: خۆرگیرانو مانگگیرانو بوومەلەرزەو بای سەختو گەردەلوولو زریانو تاریکی سەختو مردنی نزیکانی بارەگای خودای پەروەردگار.

**دەیەم:** کەواتە جۆرەکانی کوڕنووش پێنج جۆرن:

١- کوڕنووشی ئاسایی نوێژ، هەموو رکاتێ دوو کوڕنووشی واتیادا، کە ئەمەیان ئاشکراو زانراوە.

٢- کوڕنووشی هەڵە، دوو کوڕنووشن، کەموکوڕی نوێژیان پێ پڕدەکرێتەوە، لەپێشەوە روونکرانەوە.

٣- کوڕنووشی قورئانخوێندن، یەك کوڕنووشە. لەپێشەوە روونکرانەوە.

٤- کوڕنووشی سوپاس یەك کوڕنووشە، لەپێشەوە روونکرایەوە.

٥- کوڕنووشی رووداني نیشانە گەورەکان کەناسراوە بە (سُجُودُ مطلق الآياتِ). {بڕوانە ژمارە: ٥٣٣ لە کتێبی (شەرحی بلوغ المرام)}.

بۆ دڵنیا بوون لەم بابەتە، بفەرموو بڕوانە:

١- تاجول ئوصول/لاپەڕە — ٣١٠، زنجيرە: ١٠٥، لەژمارە: ٦٣٤وههەتا ژمارە: ٦٤٤ چاپی چوارەم.

٢- تاجول ئوصول/١، زنجيرە: ١١٠ لاپـەڕە ٣١٥، ژمـارە: ٦٤٥ هـەتا ٦٦١ چـاپی چوارەم.

٣- تاجول ئوصول/١، زنجيرە: ١١٢، ژمارە: ٦٦٢ هەتا ٦٦٣ چاپی چوارەم.

٤- تاجول ئوصول/١، زنجيرە: ١٧١، ژمارە: ٩٣٤.

٥- إعانةُ الطالبين ج/١ ص٤٠٨ دار الفيحاء ط/١/١٤٢٩ه = ٢٠٠٨م.

٦- مغنى المحتاج المجلد الآول ص٢١٤ طبعة ١٣٧٧ — ١٩٥٨م.

٧- رياض الصالحين زنجيرە: ٢١١، ژمارە: ١١٥٩.

## (٢٣) باب: الذكر بعد الصلاة
## ويردو يادی خودا لەپاش تەواو بوونی نوێژ

٣٤٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) قَالَ: كُنَّا نَعْرِفُ انْقِضَاءَ صَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ بِالتَّكْبِيرِ. {الحديث/١٣١٦ = ١٢٨٣ فَتْحُ الْمُلْهِمِ = ف.م = مختصر صحيح البخاری/١/٤٢٩، رقم:٤٥٢ = ٨٤١، ٨٤٢}: [٣٤٢]

ئيبنو عەبباس (ڕەزای خودايان لێ بێ) فەرمووی: جاران بەوە دەمانزانی کە نوێژەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەواو بووە، لەپاش سلاّودانەوە بە دەنگی بەرز ئەللاّهو ئەکبەرو يادو زيکری خودای دەکرد).

[٣٤٢] تجريد/١، ژمارە: ٤٥٢ = ٨٤١، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٣١٣ = ٥٨٣ = ١٣١٦، ١٣١٨.

روونکردنەوە:

لە فەتحولمولهیمدا، لە (المشكاة)ەوە راگوێز دەکا، مەبەست لەم زیکرە ئەومیە کەوا لەم فەرموودەی موسلیمدا: کە دەفەرموێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش هەموو نوێژێ کە سڵاوی دەدایەوە بە ئەوپەڕی دەنگی بەرز دەیفەرموو: « لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَلاَ نَعْبُدُ إِلاَّ إِيَّاهُ، لَهُ النِّعْمَةُ وَلَهُ الْفَضْلُ، وَلَهُ الثَّنَاءُ الْحَسَنُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ».
{بڕوانە: رقم: ١٣٤٢ صحيح مسلم بشرح النووي تخريج الشيخ خليل مأمون شيحا فەرموودەی ژمارە: ١٢٨٥ فتح الملهم}.

## (٢٤) باب: إستحباب التعوذ من عذاب القبر
## پەناگرتن بەخودا لەسزای ناو گۆڕ سوننەتە

٣٤٣- عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ دَخَلَتْ عَلَيَّ عَجُوزَانِ مِنْ عُجُزِ يَهُودِ الْمَدِينَةِ فَقَالَتَا لِي إِنَّ أَهْلَ الْقُبُورِ يُعَذَّبُونَ فِي قُبُورِهِمْ ، فَكَذَّبْتُهُمَا ، وَلَمْ أُنْعِمْ أَنْ أُصَدِّقَهُمَا ، فَخَرَجَتَا وَدَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ – صلى الله عليه وسلم – فَقُلْتُ لَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ عَجُوزَيْنِ وَذَكَرْتُ لَهُ ، فَقَالَ « صَدَقَتَا ، إِنَّهُمْ يُعَذَّبُونَ عَذَابًا تَسْمَعُهُ الْبَهَائِمُ كُلُّهَا » . فَمَا رَأَيْتُهُ بَعْدُ فِي صَلاَةٍ إِلاَّ تَعَوَّذَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ.[٣٤٣]

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لە پێغەمبەرو رەزای خودا لەهاوسەرە پاکیزەکانی بێ) فەرمووی: جارێك دوو پیرێژن، لە جوولەکەکانی مەدینە هاتن بۆلام، گوتیان: (مردوو لەگۆڕا سزا دەدرێ!).

---

[٣٤٣] بخاری: ٦٣٦٦، مسلم/شیحا: ١٣١٩.

منیش بەدرۆم خستنەوەو گوتم شتی وانییە، شتی وا درۆیە، وە حەزم نەکرد، کەباوەڕ بەقسەکەیان بکەم، جا پیرەژنەکان رۆیشتن، پێغەمبەر هات بۆلام، عەرزیمکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو دوو پیرەژنە قسەیەکی وەهایان گوت، منیش باوەڕم بەقسەکەیان نەکرد، تۆ لەمبارەیەوە دەفەرمووی چی؟ فەرمووی: (قسەکەیان راستە، مردوو لەگۆڕا سزاو ئەشکەنجە دەدرێ، هەموو ئاژەڵەکان دەیبیستن!) عائیشە فەرمووی: ئیتر لەوەدوا، هەرچەند دەمبینی وانوێژدەکا، پەنای دەگرت بەخودا لەسزای گۆڕ.

## (٢٥) باب: ما يستعاذ منه في الصلاة

## ئەو شتانەی کە لەنوێژا پەنا دەگیرێ بەخوا لەشەڕیان

٣٤٤- أَنَّ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَسْتَعِيذُ فِي صَلَاتِهِ مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ.[٣٤٤]

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گوێم لێ بوو، لەناو نوێژدا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پەنای دەگرت بەخودا، لەشەڕی ئاژاوەی جەجاڵ، وەك لە فەرموودەی ژمارە (٣٤٥)دا روونکراوەتەوە.

٣٤٥- عَنْ عُرْوَةَ بْنُ الزُّبَيْرِ أَنَّ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) زَوْجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَخْبَرَتْهُ: أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَدْعُو فِي الصَّلَاةِ: « اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ ». قَالَتْ: فَقَالَ لَهُ قَائِلٌ: مَا أَكْثَرَ مَا تَسْتَعِيذُ مِنَ الْمَغْرَمِ يَا رَسُولَ اللَّهِ! فَقَالَ: « إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا غَرِمَ حَدَّثَ فَكَذَبَ، وَوَعَدَ فَأَخْلَفَ ». {الحديث/١٣٢٥ = ١٢٩٢ فَتْحُ الْمُلْهِمِ} + {تجريد

---

[٣٤٤] بخاری: ٧١٢٩، مسلم: ١٣٢٣.

البخـــاري/١، ژمـــاره: ٤٤٧ = ٨٣٢، ٨٣٣، ٢٣٩٧، ٦٣٦٨، ٦٣٧٥، ٦٣٧٦، ٦٣٧٧، ٧١٢٩ فـــتح الباری} :[٣٤٥]

عوروەی کوڕی زوبەیر فەرمووی: عائیشەی پوورم کە هاوسەری پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر بێ) هەواڵی پێمدا فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، لە نوێژدا، لە کۆتایی تەحیاتدا، لەپێش سلاودانەوەدا، دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ: خودایە! پەنا دەگرم بەتۆ لە سزای گۆڕ، پەنا دەگرم بەتۆ لە ئاژاوەو ئاشووبی جەجاڵە کوێرەی جادووگەر، پەنادەگرم بەتۆ لە ئاژاوەی ژیانو مردن، خودایە! پەنادەگرم لە تاوانباریو لە باری نالەباری ژێرباری قەرزاری). عائیشە فەرمووی: یەکێ عەرزی کرد: قوربان! بۆ ئەوەندە دادتە لە دەست باری ژێر قەرزاریی؟ فەرمووی: (چونکە پیاو کەبوو بەژێر باری قەرزو قۆڵەوە تووشی درۆو دەلەسە دەبێ، ئەوجا بەڵێن دەداو بەڵێنەکەیشی بۆ ناچێتە سەر).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١- سزای گۆڕ ڕاستەو هەقە، بەپێی ئەم فەرموودەیە، کە بوخاریو موسلیم گێڕاویانەتەوە، ئەم قسە خۆشە بەم بۆنەیەوە لە (فَتْحُ الْمُلْهِمَ)ەوە ڕاگوێز دەکەم: موعتەزیلەکان باوەڕیان بە سزای گۆڕ نییەو ئینکاری دەکەن، جا جارێ مەلایەکی سوننی نوێژی مردوو لەسەر تەرمی کابرایەکی موعتەزیلە

---

[٣٤٥] تجريدالبخاری/١، زماره: ٤٤٧ = ٨٣٢، مختصر صحيح مسلم/١، زماره: ٣٠٦ - شيحا: ١٣٢٥.

دەکا، لە نزاکەیدا دەڵێ: (خودایە! سزای گۆڕی پێ بچێژە، چونکە بڕوای پێی نەبوو بەدرۆی دەزانی!).

٢- بەڵگەیە لەسەر هەبوونی جەجاڵ، کە زوو یا درەنگ جەجاڵ هەڵ دەسێ.

پەنا گرتن بەخودا، لەهەموو شتێکی خراپ سوننەتە، هەروا لەشتی رەوایش کە زوو یا درەنگ سەربکێشێ بۆ شتی خراپ سوننەتە، وەك سواڵو قەرزاری زۆر. {تاج/١/٢٩٠، زنجیرە: ٩٣، ژمارە: ٥٦٥}.

٣٤٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدْعُو وَيَقُولُ: (اللّٰهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ عَذَابِ النَّارِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ). (الحديث ١٣٧٧):[٣٤٦]

ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەردەوام پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ئەم نزایەی دەکرد: (اللّٰهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ عَذَابِ النَّارِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ: خودایە! پەنا دەگرم بەتۆ لەسزای گۆڕو، لەسزای ئاگری دۆزەخ و، لەفیتنەو ئاژاوەی ژیان و مردن و، لەفیتنەو ئاژاوەی جەجاڵە کوێرەی هەلاتباز). (تاج /١/٥٨٤- ش-/ن).

## (٢٦) باب:إستحباب الذكر بعد الصلاة وبيان صفته
## ویردی پاش سڵاودانەوەی نوێژ سوننەتەو چۆنە؟

٣٤٧- عَنْ وَرَّادٍ مَوْلَى الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: كَتَبَ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ إِلَى مُعَاوِيَةَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ إِذَا فَرَغَ مِنَ الصَّلاَةِ وَسَلَّمَ، قَالَ: « لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اللّٰهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ».

---

[٣٤٦] تجرید/١، ژمارە: ٦٥٧ - ١٣٧٧، مسلم: ٥٨٨ = ١٣٢٧.

{الحديث/ ١٣٣٧ = ١٣٠٥ ف.م = فتح الملهم. تجريد/١/٤٣١، رقم: ٤٥٤ = ٨٤٤، ١٤٧٧، ٢٤٠٨، ٥٩٧٥، ٦٣٣٠، ٦٤٧٣، ٦٦١٥، ٧٢٩٢ = فتح الباري} : [٣٤٧]

وەرادى نۆكەرى موغيرەى كوڕى شوعبە (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: موغيرە نامەى نووسى بۆ موعاوييە، لەسەر داواى موعاوييە خۆى، لەوكاتەدا كە موعاوييە فەرمانڕەواى موسوڵمانان بوو، موغيرەيش میرى سەر كووفە بوو لەلايەن موعاوييەوە كرابوو، بە كارمەندى سەر كووفە، موغيرە دەيگوتو من دەمنووسى. بۆى نووسى: جاران كاتێ پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) لە نوێژ دەبۆوەو سلاوى دەدايەوە، ئەم ويردەى دەخوێند: (لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ وَحْـدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهْوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ:

واتە: تەنها خودا خودايەو بەس، خوداى تر نييە بێجگە لەو، خوايەكى تاكو تەنهايە، بێ هاوەڵە، هيچ هاوبەشى نييە، موڵكو داراييو دەسەلات هەمووى لە راستيدا هەر بۆ ئەوە، سوپاسو ستايش هەر بۆ ئەوە، تواناى هەموو شتێكى هەيە، ئەى پەروەردگارم! ئەوەى كە تۆ بيدەى بەكەس نابڕێت، هەرچيش تۆ نەيدەيت بەكەس نادرێ، دارايى داراو، دەستداريى دەستدار، هيچ دادێكيان نادەن لەلاى تۆ، تەنيا سۆزو ميهرى تۆ فرياى بەندە دەكەوێو بەس). {تاج/١، ٣١٧،چاپى/١،زنجيرە:١٠٨،ژمارە:٦٢٦} .

٣٤٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (جَاءَ الْفُقَرَاءُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالُوا ذَهَبَ أَهْلُ الدُّثُورِ مِنْ الْأَمْوَالِ بِالدَّرَجَاتِ الْعُلَا وَالنَّعِيمِ الْمُقِيمِ يُصَلُّونَ كَمَا نُصَلِّي وَيَصُومُونَ كَمَا نَصُومُ وَلَهُمْ فَضْلٌ مِنْ أَمْوَالٍ يَحُجُّونَ بِهَا وَيَعْتَمِرُونَ وَيُجَاهِدُونَ وَيَتَصَدَّقُونَ قَالَ أَلَا أُحَدِّثُكُمْ إِنْ أَخَذْتُمْ به أَدْرَكْتُمْ مَنْ سَبَقَكُمْ وَلَمْ يُدْرِكْكُمْ

---

[٣٤٧] تجريد/١، ژمارە: ٤٥٤ = ٨٤٤، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٣١٢ = ١٣٣٧.

أَحَدٌ بَعْدَكُمْ وَكُنْتُمْ خَيْرَ مَنْ أَنْتُمْ بَيْنَ ظَهْرَانَيْهِ إِلَّا مَنْ عَمِلَ مِثْلَهُ تُسَبِّحُونَ وَتَحْمَدُونَ وَتُكَبِّرُونَ خَلْفَ كُلِّ صَلَاةٍ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ قال الراوى فَاخْتَلَفْنَا بَيْنَنَا فَقَالَ بَعْضُنَا نُسَبِّحُ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ وَنَحْمَدُ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ وَنُكَبِّرُ أَرْبَعًا وَثَلَاثِينَ فَرَجَعْتُ إِلَيْهِ فَقَالَ تَقُولُ سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَاللَّهُ أَكْبَرُ حَتَّى يَكُونَ مِنْهُنَّ كُلِّهِنَّ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ). (الحديث ٨٤٣ - طرفه في: ٦٣٢٩).[٣٤٨]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: هەژاران هاتن بۆخزمەتی حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) گوتیان: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! هەرچی پایەی بەرزو نازو نیعمەتو پایەی گەورە هەیە، هەمووی داراو دەوڵەمەندەكان، دەیبەن بۆخۆیان، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: چۆن؟ عەرزیان كرد: چونكە ئەوان وەكوو ئێمە نوێژدەكەنو، وەك ئێمە ڕۆژوو دەگرنو، سەرەڕای ئەوەیش ماڵیان هەیە، خێرو خێراتی لێ دەكەنو، حەجو عەمرەی پێ دەكەنو پێی دەچن بۆغەزاو هەموو جۆرە چاكەیەكی تری بۆڕەزای خودا پێ دەكەن، بەڵام ئێمە لەبەرئەوەی كەماڵمان نییە ئەم جۆرە خێرانەمان بۆناكرێ. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ( دەی باكارێكتان پێ بڵێم، ئەگەر جێ بەجێ ی بكەن، ئەوانەی پێ دەگرنەوە كەپێشتان كەوتوون، وەكەسیش لەپاش ئێوە بەو پایەیە ناگا، وەئێوە دەبن بەباشترینی چینی دەووروبەری خۆتانو كەس ناگا بەم پایە گەورەیەی ئێوە مەگەر كەسێ وەك ئێوە ئەو كارەبكا؟!) گوتیان: فەرموو بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (لەپاش هەموو نوێژێ سیو سێ جار (سبحان الله)و سیو سێ جار (الحمدلله)و سیو سێ جار (الله اكبر) بكەن).

---

[٣٤٨] تجريد/١، ژمارە: ٤٥٣ = ٨٤٢، مسلم: ٥٩٥ = ١٣٤٦، ١٣٤٧.

راوی دەفەرموێ: لەناو خۆمانا بووین بەدووبەرە، هەندێکمان دەیان گوت: سیی‌و سێ (سبحان الله) سیی‌و سێ (الحمدلله) دەکەین‌و سیی‌و چوار (الله أكبر) بکەین، من چوومەوە بۆ خزمەتی‌و لەم بارەیەوە لێیم پرسی، فەرمووی: سیی‌و سێ جار دەڵێیت: ( سبحان اللهو الحمدللهو الله أكبر). (ت/١/٣١٨/٥ ز-١٠٨ ژ-٦٢٨ = ش/د/ت).

## (٢٧) باب: ما يقال بين التكبيرة الإحرام والقراءة
## چی نزایێ دەخوێندرێ، لەپاش ئەڵڵاهو ئەکبەری نوێژدابەستن‌و لەپێش خوێندنی فاتیحەدا

٣٤٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (يَسْكُتُ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَبَيْنَ الْقِرَاءَةِ إِسْكَاتَةً فَقُلْتُ بِأَبِي وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللَّهِ إِسْكَاتُكَ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةِ مَا تَقُولُ؟ قَالَ أَقُولُ اللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ اللَّهُمَّ نَقِّنِي مِنْ الْخَطَايَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَض مِنْ الدَّنَسِ اللَّهُمَّ اغْسِلْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ). (الحديث رقم: ٧٤٤ في فتح الباري شرح صحيح البخاري).[٣٤٩]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستووری وابوو، لەدوای ئەڵڵاهوئەکبەری نوێژ دابەستن لەپێش دەست کردن بەخوێندنی فاتیحە، ئێست (سكته خفيفه: وێستانێکی کەم) ی دەکرد، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بەباوکم‌و دایکمەوە بەقوربانت بم لەم ئێستەدا بەنهێنی چی دەخوێنی؟ فەرمووی: دەڵێم: (اللهم باعد بيني وبين خطاياى كما باعدت بين المشرق والمغرب، اللهم نقني من خطاياى كما ينقى الثوب الأبيض من الدنس، اللهم اغسل خطاياى بالماء والثلج والبرد): خودایە! لەگوناه دوورم

---

[٣٤٩] تجرید/١، ژمارە: ٤٠٥ = ٧٤٤، مسلم: ٥٩٨ = ١٣٥٣.




بخەرەوە وەك دووریی خۆرهەڵاتو خۆرئاوا، خودایە! لەگوناه پاکم بکەرەوە وەك پارچەیێ بلووری ی سپی ی بێ گەرد، خودایە! گوناهەکانم بەئاوو بەبەفرو بەتەرزە پاك پاك بشۆرەوە). (ت/١/٢٥٧/١ ز-٧٤ ژ-٤٩٢ چ-٤ = ش/د/ن).

**روونکردنەوە:**

نزای سەرەتای نوێژ چەند شێوەیەکی هەیە، ئەم نزایە یەکێکە لەوشێوانە، بۆزانینی ئەو شێوانە بڕوانە: (فیقهی ئاسان/١/١٥٢ز-٦٢).

ئێستا لەناو شافیعی مەزهەبەکانا واباوە، لەنێوانی ئێستێ پاش ئامینو لەنێوانی خوێندنی سورەتدا، پێشنوێژ بەنهێنی ئەم نزایە والەم فەرموودەیەدا دەخوێنێ، هەتا پاش نوێژەکان لەخوێندنی فاتیحە دەبنەوە، یاقورئان بەنهێنی دەخوێنێ، ئەوسا دەست دەکا بە سوورەت.

**(٢٨) باب: إستحباب إتيان الصلاة بوقار وسكينة والنهي عن إتيانها سعيا**
**دەشێ نوێژکەر بەشینەیی بڕوا بۆ نوێژو هەڵەشەییو پەلە پەل نەکات**

٣٥٠- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ نُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَمِعَ جَلَبَةً، فَقَالَ: « مَا شَأْنُكُمْ؟» قَالُوا: اسْتَعْجَلْنَا إِلَى الصَّلاَةِ، قَالَ: «فَلاَ تَفْعَلُوا، إِذَا أَتَيْتُمُ الصَّلاَةَ فَعَلَيْكُمُ السَّكِينَةُ، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا، وَمَا سَبَقَكُمْ فَأَتِمُّوا». {الحديث/١٣٦٢. تجريد = مختصر صحيح البخاری/١، لاپەڕە: ٣٦٠، چاپی/١، رقم: ٣٦٤ = ٦٣٥ فتح}:[٣٥٠]

ئەبو قەتادە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) رۆژێ بەرنوێژیی بۆ دەکردین، لەوکاتەدا گوێی لێ بوو کەوا چەن پیاوێ کردوویانە بە گاڵە گاڵو غەڵبە غەڵبو زرمە زرم، جا کە نوێژەکەی

[٣٥٠] بخاری: ٩٠٨، مسلم: ١٣٥٨ + مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٢٤٤ = شیحا: ١٣٦٢.

تـەواو کـرد فـەرمووی: (ئـەوە چـیتان بـوو، بـۆ واتـان کـرد؟) یـاران فـەرموویان: پەلەی نوێژمان بوو، کە بگەین بە جەماعەتا. فەرمووی: (وامەکەن، بەڵکو کاتێ دێن بۆ نوێژ لەسەرە خۆو ئارام بن، بە هێمنیو بە هێوریو بە شێنەیی بچن بۆ نوێـژ، ئـیتر چـەندەی فریاکـەوتن بـە جەماعـەت بیکـەن، ئەوەیـشی کـە پیانەگەیشتن، خۆتان بە تەنها تەواوی بکەن!). {تاج/١، لاپەڕە: ٣٧٩، زنجیرە: ١٢٥، ژمارە: ٢٥٥، چاپی دووەم}.

ئەم فەرموودەیە لە ئەصڵەکەدا لە ئەبوهورەیرەوەیە.

٣٥١- عَنْ أَبِى قَتَادَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ بَيْنَمَا نَحْنُ نُـصَلِّى مَـعَ النَّبِـىِّ - صـلى الله عليه وسلم - إِذْ سَمِعَ جَلَبَةَ رِجَالٍ فَلَمَّا صَلَّى قَالَ « مَا شَأْنُكُمْ » . قَالُوا اسْتَعْجَلْنَا إِلَى الصَّلاَةِ . قَالَ « فَلاَ تَفْعَلُوا ، إِذَا أَتَيْتُمُ الصَّلاَةَ فَعَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ ، فَمَا أَدْرَكْـتُمْ فَـصَلُّوا وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا ».(٣٥١)

بەتەواوی لەژمارە (٣٥٠)دا رابورد.

## (٢٩) باب: متى يقوم الناس للصلاة؟
## کەی پاشنوێژەکان هەڵدەستن بۆ نوێژی بەکۆمەڵ؟

٣٥٢- عَنْ أبي سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ سَمِعَ أَبَـا هُرَيْـرَةَ (رَضِـي اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ: أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، فَقُمْنَا فَعَدَّلْنَا الصُّفُوفَ قَبْـلَ أَنْ يَخْـرُجَ إِلَيْنَـا رَسُـولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَأَتَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) حَتَّـى إِذَا قَـامَ فِـى مُصَلاَّهُ قَبْلَ أَنْ يُكَبِّرَ، ذَكَرَ (أي تَذَكَّرَ شَيْئاً وَهُوَ لُزُومُ الإغْتِسَالِ) فَانْصَرَفَ، وَقَـالَ لَنَـا: « مَكَانَكُمْ ». فَلَمْ نَزَلْ قِيَامًا نَنْتَظِرُهُ حَتَّى خَرَجَ إِلَيْنَا وَقَـدِ اغْتَـسَلَ يَنْطِـفُ رَأْسُـهُ مَـاءً،

---

(٣٥١) بڕوانە ژمارە (٣٥٠) لەپێشەوە رابورد.

فَكَبَّرَ فَصَلَّى بِنَا). {الحديث/١٣٦٦. تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري/١، ص ٢٠٤، رقم: ١٩١ = ٢٧٥، ٦٣٩، ٦٤٠ فتح الباري}: [٣٥٢]

ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف، دەفەرموێ: گوێم لە ئەبو هورەیرە بوو دەیفەرموو: جارێ قامەتی نوێژکراو ئێمە هەڵساینو لە ریزدا وەستاینو ریزەکانمان رێك خست بەرلەوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە شوێنەکەی خۆی دەربچێو بێ بۆلای ئێمە، جا پێغەمبەر لە هۆدەکەی خۆیەوە تەشریفی هاتە دەرەوەو هات لە نوێژگاکەی خۆیدا، لەناو میحرابەکەدا، لە پێشمانەوە راوەستا، جا بەرلەوە ئەڵلاهو ئەکبەری تەحورروم بکاو نوێژ دابەستێ، بیری کەوتەوە کە لەشی گرانەو لەشپیسی لەسەرە، جا فەرمووی پێمان: (لە جێگەی خۆتان لەسەر ئەم حاڵە بمێننەوە تا دێمەوە). ئەوجا رۆیشتەوە بۆ ماڵەوە، کە حوجرەی یەکێ لە هاوسەرەکانی بوو، کە دەرگای لەناو ماڵی مزگەوتا بوو، ئیتر ئێمەیش ئاوا بە پێوە راوەستاینو چاوەڕوانی ئەومان دەکرد، هەتا گورج خۆی شۆرد، کە هاتەوە بۆلامان سەری ئاوی لێ دەتکا، هی خۆشۆردنەکەی، ئینجا ئەڵلاهو ئەکبەری نوێژ دابەستنی کردو ئێمەیش لە پشتیەوە بە جەماعەت لەگەڵیدا نوێژمان دابەستو نوێژەکەی بۆمان کرد).

عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَلاَ تَقُومُوا حَتَّى تَرَوْنِي». {الحديث/١٣٦٤. تجريد البخاري/١/٣٦٠، رقم: ٣٦٥ = ٦٣٧، ٦٣٨، ٩٠٩ فتح الباري شرح صحيح البخاري}:

ئەبو قەتادە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ قامەتی نوێژ دەکرێ، هەڵ مەسن بۆ نوێژ، هەتا

---

[٣٥٢] تجريد/١، ژمارە: ١٩١ = ٢٧٥، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٢٦٦ - ٦٠٥ = ١٣٦٦ شيحا.




کاتێ کەوا من دەبینن دێم بۆ نوێژ). {تاج/١/٣٨٠، چاپی/١، زنجیرە: ١٢٥، ژمارە: ٧٥٦}.

**ڕوونکردنەوە:**

ئیمامی نەوەوی لە ڕاڤەی ئەم فەرموودەیەدا، ئاوا ڕوونی دەکاتەوە:

١- ڕای جیا جیا هەیە لەم بارەیەوە، مەزهەبی شافیعی و کۆمەڵێ لە زانایان وایە: کەس هەڵ نەسێ بۆ نوێژ هەتا بانگ بێژ لە قامەت دەبێتەوە.

٢- ڕای ئیمامی مالیك و زۆرینەی زانایان، دەڵێن: وا جوانە هەر لەگەڵ بانگ بێژ دەستی کرد بە قامەت کردن، ئەوان هەڵسن.

٣- ئیمامی ئەنەسی کوڕی مالیك ئەوکاتە هەڵ دەسا، کە قامەتکەر دەڵێ: (قَدْ قامَتِ الصلاة) ئیمامی ئەحمەدیش هەروا دەڵێ.

٤- جەماوەر دەفەرموون: کاتێ پێشنوێژ نوێژ دادەبەستێ کە قامەت تەواو بووبێ، دیارە کە پاشنوێژ لەپاش پێشنوێژ نوێژ دادەبەستێ، وە نابێ لە ئەڵڵاهو ئەکبەری تەحەڕروما پێشی بکەوێ (پێشنوێژ و پاشنوێژ واتە: ئیمام و مەئموم).

منیش کە وەرگێڕم عەرزتان دەکەم: کە کارکردن بەهەر کامێ لەم ڕایانە، بۆ ئێمەی عەوام و ڕەشە خەڵك دروستە.

## (٣٠) باب: من أدرك ركعة من الصلاة فقد أدرك تلك الصلاة
## كەسێ فریای یەك ڕكات بكەوێ لە هەر نوێژێ، لەكاتی ناسایی ئەو نوێژەدا، ئەوە فریای كردنی ئەو نوێژە بە ئەدا، بەحازر كەوتووە

٣٥٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النبي (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الصَّلاَةِ فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلاَةَ». {الحديث/١٣٧٠. بخاري. مواقيت الصلوة:٥٨٠} :[٣٥٣]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەركەسێ لەهەر نوێژێ، فریای یەك ڕكاتی بكەوێ، لەكاتی دیاریكراوی خۆیداو ڕكاتەكانی تریشی لەدوا ئەو ڕكاتەوە بكا، ئەوە بەتەواوی فریای ئەو نوێژە كەوتووەو بەحازری كردوویەتی، نەوەك بە قەزا). {تاج/١، لاپەڕە: ٢٠٠، زنجیرە: ٤٨، ژمارە: ٣٦٥}.

## (٣١) باب: أوقات الصلوات الخمس
## كاتەكانی پێنج نوێژە فەرزەكان

٣٥٤- سَمِعْتُ أَبَا مَسْعُودٍ يَقُولُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - يَقُولُ « نَزَلَ جِبْرِيلُ فَأَمَّنِي ، فَصَلَّيْتُ مَعَهُ ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ». يَحْسُبُ بِأَصَابِعِهِ خَمْسَ صَلَوَاتٍ.[٣٥٤]

ئەبو مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (جوبرائیل (سڵاوی خودای لێ بێ) هاتە خوارەوە بۆئەوەی كەفێری نوێژم بكا، جا هەرنوێژێ لەكاتی دیاریكراوی خۆیدا بەرنوێژی ئەو نوێژەی كرد بۆم، لەپێشا نوێژی نیوەڕۆم بەجەماعەت لەگەڵی

---

[٣٥٣] بخاری: ٥٨٠، مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٢٢٨، ل/٢٩٣ = شیحا: ١٣٧٠.

[٣٥٤] بخاری: مواقیت: ٥٢١، مسلم. صلاە: ١٣٧٨، ١٣٧٩.

کرد، لەپاشان نوێژی عەصریشم لەگەڵی کرد، لەپاشان نوێژی شێوانیشم لەگەڵی کرد، لەپاشان نوێژی خەوتنانیشم لەگەڵی کرد، لەپاشان نوێژی بەیانیشم لەگەڵی کرد. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بە پەنجەکانی هەرپێنج نوێژە فەرزەکانی ژمارد. ئەنجا فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): (خودا فەرمانی پێکردووم بەکردنی ئەم پێنج نوێژە لەم پێنج کاتەدا). (تاج/١، زنجیرە: ٤٧، ژمارە: ٣٤٨ چ/٤).

٣٥٥- عَنْ إبنْ مَسْعود الأنصاري (رَضي اللهُ عَنْهُ): ( أَنَهُ دَخَلَ عَلىَ المغيرة بنْ شعبة وقدْ أَخَّرَ الصَّلَاةَ يَوْمًا وَهُوَ بِالْعِرَاقِ فَدَخَلَ عَلَيْهِ أَبو مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيُّ فَقَالَ مَا هَذا يَا مُغِيرَةُ أَلَيْسَ قَدْ عَلِمْتَ أَنَّ جِبْرِيلَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَزَلَ فَصَلَّى فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثمَّ صَلَّى فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثمَّ صَلَّى فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثمَّ صَلَّى فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثمَّ صَلَّى فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثمَّ قَالَ بِهَذا أُمِرْتُ). (الحديث ٥٢١- طرفه في: ٣٢٢١، ٤٠٠٧):[٣٥٥]

موغیرەی کوڕی شوعبە لەوسەردەمەدا کەفەرمانڕەوای کووفە بوو لەعێراق نوێژی عەصری دواخست، ئەبومەسعودی ئەنصاری (ڕەزای خوای لێ بێ) ڕۆیشت بۆسەری‌و پێی فەرموو: ئەمەچییە؟ ئەی موغیرە! ئایا نازانی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: جوبرائیل (سەلامی خودای لێ بێ) هاتەخوارەوە بۆئەوەی کەفێری نوێژم بکا، جاهەرنوێژەی لەکاتی خۆیدا بەرنوێژییەکەی بۆکردم، لەپێش دا نوێژی نیوەڕۆم لەگەڵ دا کرد، لەکاتی عەصریش دا نوێژی عەصرم لەگەڵدا کرد، هەروا نوێژی شێوان‌و نوێژی خەوتنان‌و نوێژی بەیانی، هەرنوێژەی لەکاتی تایبەتی خۆیدا لەگەڵ جوبرائیل

---

[٣٥٥] تجرید/١، ژمارە: ٣٠٩ = مسلم: ٦١٠ = ١٣٧٨، ١٣٧٩.




دا کـردم) لەپاشـا حـەزرەت (ڕەزای خـوای لــێ بـێ) فـەرمووی: (خـودای گـەورە فەرمانی پێ کردووم بەکردنی ئەم پێنج نوێژە لەم پێنج کاتـەدا). (ت/١/١٩٣/١ = ز-٤٧ ژ-٣٤٨ چ-٤ = ش/د/ ن).

لێرەدا لەسەرەتاوە ئاوایە:

ئیبنو شەهاب (کە ناسراوە بە زوهری) دەفەرموێ: ڕۆژێ عومەری کوڕی عەبدولعـەزیز نوێـژی عەصری دواخـست، جـا عـوروەی کـوڕی زوبـەیر دەچـێ بـۆلای و پێـی دەفـەرموێ: موغـەیرەی کـوڕی شـوعبە لـەو سـەردەمەدا کـە فەرمانڕەوای کووفە بوو لە عێراق... هەتا کۆتایی فەرموودەکە).

جـا عومـەری کـوڕی عەبدولعـەزیز بـە عـوروەی فـەرموو: بەباشـی فەرموودەیێ کە دەیگێڕیتەوە، بیزانەو ڕەوانی بکەو بچۆرە بـنج و بنـاوانی، ئایـا وایـە وەك تـۆ دەیڵێیـت: جوبرائیـل دابـەزیوەو کـاتی ئـەم پێـنج فـەرزەی ئـاوا دەستنیشان کردووە بۆ پێغەمبەر؟

عوروە فەرمووی: بەڵێ، ئەمەی کـە گێڕامـەوە بـۆ تـۆ لـە بەشـیری کـوڕی ئەبو مەسعوودم بیستووە، کە بەشیر دەیفەرموو: ئەمەم لەباوکم بیستووە.

عـوروەی کـوڕی زوبـەیر (ڕەزای خـودای لێ بـێ) کچەزای حـەزرەتی ئەبوبـەکری صەدیقە، فەقێی عائیشەی پووری بووە، کە هاوسـەری پێغەمبـەر بـوو، زانایـەکی گـەورە بـوو، هەمیـشە لەگـەڵ کۆمـەڵێ زانـای تـری وەك خـۆی، ئامـادەی کـۆڕی زانـستی عائیـشەی پـووری دەبـوون، کـە عائیـشە لـەماڵی خۆیـدا، لەمەدینـە دەیبەست، بۆ پەخشی زانستو ڕاگەیاندنی فەرموودەکانی پێغەمبـەرو تەفسیری ئایەتەکانی قورئان. عوروە یەکێکە لەپێشەوا هەرە ناودارە بەرزەکانی پـەیڕەوان (واتە: تابیعین) کە پێشیان دەگوترێ: (تـابیعین: شوێنکەوتوان: چینی دووەمـی




موسـولْمانان لـەپاش پێغەمبـەر، کەچـینی یەکـەم هـاوەڵو یـارو یـاوەرانو یاریدەدەرانیەتی، وەچینی دووەم شوێنکەوتوانی ئەوانن).

یەکێکە لەحەوت مەلا گەورەکانی جیهانی ئیسلامی، کە لەزاراوی شەرعدا نـاودارو ناسـراون بـە (فوقـەهای سـەبعە = حـەوت شـەریعەتزانەکان) کـە ئـەم زاتانەن:

١- عوروە.

٢- سەعیدی کوڕی موسەییەب.

٣- عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبە.

٤- قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری صەدیق.

٥- سلێمانی کوڕی یەسار.

٦- خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی ثابیت.

٧- سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر.

دایکـی عـوروە نـاوی ئـەسمای کـچی ئەبوبـەکری صـەدیقە، کـە خوشـکی باوکیی عائیشەیە، خاوەنی ئەم شانازییانەیە:

١- پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) زاوایـەتی، مێـردی پـوورە عائیشەیەتی.

٢- ئەبوبەکری صەدیق باپیریەتی، باوکی دایکیەتی.

٣- زوبـەیری کـوڕی عـەوام باوکیـەتی {بڕوانـە: مختـصر صـحیح مـسلم بەکوردی: بەرگی/٤، لاپەڕە: ٣٤٢، ژمارە: ١٦٤٥} .

٤- ئەسمائی کچی ئەبوبەکری صەدیق دایکێتی.

٥- عائیشەی کچی ئەبوبەکری صەدیق لەدایکەوە پووریەتی.

عوروه سالّی (٢٠) بیستی کۆچی لەدایك بووه، لەنەوەدو چواری کۆچی مردووه، کۆمەڵەی فەرموودەزانەکان، فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە. واتە: جێگەی متمانەی ئەوانە، کەواتە: لەپیاوانی صەحیحی بوخاریو موسلیمە، لەناو پەیڕەواندا، عوروەی کوڕی زوبەیر ناوی تریان تیادا نییە، بۆ بەهرەی پترو شارەزابوونی تەواو لەژیننامەی ئەم بنەماڵە مەزنە بڕوانە: {مختصر صحيح مسلم/٢، لاپەڕە: ٢٠٨، ژمارە: ٧٠١ + تاج/٣، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٣٣١٢، ٣٣١٩ + تەجریدی بوخاری بەرگی یەکەم ژمارە: ٣ + ژمارە: ٣٤٩ = ٦٠٢ بوخاری + ژمارە: ٧٥ تەجرید + تاج/٣، زنجیرە: ٣٧ چاپی چوارەم + تاج/١، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ٢٠٢ + تاج/٥، زنجیرە: ٩٧، ژمارە: ٥٥٣٩ چاپی چوارەم} .

## ڕوونکردنەوە:

عوروەی کوڕی زوبەیری کوڕی عەوام، کچەزای حەزرەتی ئەبوبەکری صەدیقە، فەقێی عائیشەی پووری بوو، زانایەکی گەورە بوو، هەمیشە لەگەڵ کۆمەڵێ زانای تردا، ئامادەی کۆڕی زانستی عائیشەی پووری دەبوون، کە عائیشە لەماڵی خۆیدا، لەمەدینە دەیبەست، بۆ پەخشی زانستو ڕاگەیاندنی فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وە بۆ ڕوونکردنەوەو ڕاڤەو تەفسیری ئایەتەکانی قورئان.

عوروە یەکێکە لەپێشەوا هەرە ناودارە ڕێزدارە مەزنەکانی پەیڕەوان، کەپێیان دەگوترێ: (تابیعین، واتە: چینی دووەمی موسوڵمانان، کەفریای پێغەمبەر نەکەوتوون، بەڵام فریای صەحابەکانی کەوتوون).

عوروە یەکێکە لە حەوت مەلا ناودارە گەورەکانی جیهانی ئیسلامی، کە لەزاراوەی شەرعدا ناودارو ناسراون بە (فوقەهای سەبعە = حەوت شەرعزانەکان) کە ئەم زاتانەن:

١- عوروەی کوڕی زوبەیری کوڕی عەوام.

٢- سەعیدی کوڕی موسەییب.

٣- عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبە.

٤- قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری صەدیق.

٥- سلێمانی کوڕی یەسار.

٦- خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی ثابیت.

٧- سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر.

دایکی عوروە ناوی ئەسمائی کچی ئەبوبەکری صەدیقە، کەخوشکی باوکی عائیشەیە، خاوەنی ئەم بەهرەو شانازییانەیە:

١- پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زاوایەتی، مێردی پووریەتی.

٢- ئەبوبەکری صەدیق باپیریەتی باوکی دایکیەتی.

٣- زوبەیری کوڕی عەوام باوکیەتی.

٤- ئەسمائی کچی ئەبوبەکری صەدیق دایکیەتی.

٥- عائیشەی کچی ئەبوبەکری صەدیق پووریەتی، خوشکی دایکیەتی، عوروە ساڵی (٢٠) بیستی کۆچی لەدایك بووە، لە (٩٤) نەوەدو چواری کۆچیدا مردووە، واتە: (٩٤ – ٢٠ = ٧٤) حەفتاو چوار ساڵ ژیاوە. کۆمەڵەی فەرموودە شوناسەکان فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، واتە: جێگەی متمانەی ئەوانە، کەواتە: لەپیاوانی صەحیحی بوخاریو صەحیحی موسلیمە، لەناو پەیڕەوان

(تـابعين)دا، عـوروەی کـوڕی زوبـەیر نـاوی تریـان تیـادا نییـە، بـۆ زێـدە بـەهرەو شارەزابوون بڕوانە: ئەم ژمارانە، لەم پەڕاوە:

١- ژمارە/٣٤ ئەسمائی کچی ئەبوبەکری صەدیق.

٢- ژمارە/٣٣٨ ئەبوبەکری صەدیق.

٣- ژمارە/٩٢١ عوروة بن زبیر + ژمارە/٩٤١.

هـەروا بڕوانـە: (تـاج/٣، زنجـیرە: ١٠، ژمـارە: ٣٣١٢، ٣٣١٩ – مـەزناهی زوبەیری کوڕی عەوام + ژمارە: ٣، لە تجریدی بوخـاری، بـەرگی یەکـەم + ژمـارە: ٣٤٩ = ٦٠٢ بوخـاری + ژمـارە: ٧٥ تجریـد + تـاج/٣، زنجیرە: ٣٧ ژیاننامـەی خـاتوو عائیشە + ریاض/١، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ٢٠٢ + تاج/٥، زنجیرە: ٩٧، ژمارە: ٥٥٣٩).

**ڕوونکردنەوە:**

ئیمامی زوهری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) ناوی (ئەبوبەکر: موحەممـەدی کـوڕی موسـلیم)ە، نازنـاوی – واتـە: لەقـەبی – زوهرییـە، ناسـراوە لـەناو فەرموودەشوناسەکاندا بە ئیبنو شەهاب، لەپەیڕەوانە، کە مەشهورن بـەتابیعین، لەپەیڕەوە بچکۆلەکانە، لە پەنجا – هەتا – پەنجاو شەشی کۆچی لـەدایك بـووە، لـەپیاوانی شـەش پەڕاوەکەیـە، واتـە: لـەریجالی کوتـوبی سیتتـەیە، کـە بوخـاریو موسلیمو ئەبوداوودو تەرمەزیو نەسائیو ئیبنـو ماجـەن، فـەرموودەی لـەئیبنو عومـەرو ئەنـەسو هـاوەڵانی تـرەوە وەرگرتـووە، ئیبنـو عومـەری بینیـوەو بەخزمـەتی گەیـشتووە، وە فـەرموودەی لەویـشەوە گێڕاوەتـەوە. هەنـدێ دەفەرموون: تەنیا دوو فەرموودەی لەئیبنو عومەرەوە وەرگرتووە، کـەخۆی لێـی بیستبێ، زوهری فەقیەو شەرعزانێکی گەورە بووە، یەکێ لەفەقێو شـاگردەکانی زوهـری، پێـشەوای دادپـەروەرو خوانـاس: عومـەری کـوڕی عەبدولعـەزیز بـووە،

کەپێشەوایەکی گەورەی دادپەروەری ناسراوە، کەپێش ئەوەی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بکرێ بەجێگەنشینی موسوڵمانان، ئەوەندە موسوڵمانێکی ڕێکوپێك بوو، ئیمامی ئەنەسی کوڕی مالیك جەماعەتی لەپشتیەوە دەکرد، پێشەوا عومەری کوڕی عەبدولعەزیز کاتێ دەمرێ، هەندێ پارچە نینۆك و مووی پێغەمبەری هەبوو، ڕایسپارد کەلەناو کفنەکەیدا دایبنێن و لەگەڵیدا بۆ پیرۆزی بینێژن.

ئیمامی زوهری هەروەك شێخ و مامۆستای زۆری هەبووە، کەشەرع و فەرموودەو زانستی ئیسلامی لێیان وەرگرتووە، فەقێ و شاگردی زۆریشی هەبووە، کە فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوەو قەلای ئایینی ئیسلامیان پێ قایمتر کردووەو خەرمانی یاسانامەی ئیسلامیان پێ دەوڵەمەندو دارا بوون.

نزیکەی دوو هەزار فەرموودەی هەیە، کەلە هەموو بابەتە ئیسلامییەکان دەدوێن، وەك نوێژ، ڕۆژوو، حەج، زەکات، هەواڵەکانی پێغەمبەرو هاوەڵانی، نزیکەی نیوەیان موسنەدن.

لەیث دەفەرموێ: زوهری فەرمووی: (هەرچیم لەبەر کردبێ لەبیرم نەچۆتەوە!).

زوهری (ڕەحمەتی لێ بێ و خودا لەخاك و پای ئەم پیاوچاکانەدا حەشرو نەشرمان بکات) پیاوێکی زۆر بەخشندە بوو، دەڵێن: ساڵی پەنجای کۆچی لەدایك بووە، وە لە ڕەمەزانی ساڵی سەدوبیست و پێنجی کۆچیدا مردووەو مەرگ بووە بەمیوانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ).

٣٥٦- عن عَائِشَةُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - كَانَ يُصَلِّى الْعَصْرَ ، وَالشَّمْسُ فِي حُجْرَتِهَا قَبْلَ أَنْ تَظْهَرَ.[٣٥٦]

عائیشه (رهزای خودای لیٚ بیٚ) فهرمووی: گهلیٚ جار که پیٚغهمبهر (درودی خودای لهسهر بیٚ) بهرنویٚژیی نویٚژی عهصری دهکرد، هیٚشتا خۆر دهیدا لهناو هۆدهکهی من، ئهوکاتهبوو که سیٚبهری ههموو شتیٚ بهقهد خۆی دهبیٚ، بهبیٚ زیادو کهم، که ئهمه سهرهتای داهاتنی نویٚژی عهصره، که لهم کاتهدا سیٚبهری شت لهلای رۆژههلاٚتیهوه پهیدا نابیٚ).

## (٣٢) باب: إستحباب الإبراد بالظهر في شدة الحر لمن يمضي إلى جماعة وينالـه الحر في طريقه

## کردنی نویٚژی نیوهرِۆ سوننهته دوابخریٚ بۆ کاتی فیٚنکی لهکاتی گهرمای سهختتدا، ئهگهر نویٚژکهر لهریٚگه گهرمای دهبوو

٣٥٧- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَذَّنَ مُؤَذِّنُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالظُّهْرِ، فَقَالَ النبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « أَبْرِدْ أَبْرِدْ » أَوْ قَالَ: «انْتَظِرِ انْتَظِرْ» وَقَالَ: إِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ، فَإِذَا اشْتَدَّ الْحَرُّ فَأَبْرِدُوا عَنِ الصَّلاَةِ » . قَالَ أبو ذَر: حَتَّى رَأَيْنَا فَيْءَ التُّلُولِ. {الحديث/ ١٣٩٩، تجريد بخارى/١/٣٢٢، رقم: ٣١٦ = ٥٣٩، ٥٣٥ فتح البارى}:[٣٥٧]

ئهم فهرموودهیه لیٚرهدا له ئهبو هورهیرهوهیه، بهلاٚم له بوخاریدا ئاوایه، باشترین شهرحو رافهیه بۆ ئهم گیٚرانهوهی موسلیم: ئهبو زهرِی غیفاری (رهزای

---

[٣٥٦] بخاری: ٥٢١، بروانه ژماره (٣٥٥) لهپیٚشهوه. مسلم: مسلم ترقیم محمد فؤاد: ٦١٠ ترقیم شیحا: ١٣٨٠، ١٣٧٩، ١٣٨١، ١٣٨٢.

[٣٥٧] تجریدم١، ژماره: ٣١٦ = بخاری: ٥٣٩، ٥٣٥، مسلم: ٦١٦، محمد فؤاد = شیحا: ١٣٩٩ = مختصر صحیح مسلم/١، ژماره: ٢١٢.




خوداى لىٚ بىٚ) فەرمووى: لەسەفەرێكا، لە خزمەتى پێغەمبەردا بووين، بانگبێژ كە بيلال بوو، ويستى بانگى نيوەڕۆبدا، پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بىٚ) پێى فەرموو: (بيخەرە كاتى فێنكى) لەپاشا پاش ماوەيێ تريش بيلال ويستى بانگ بدا، ديسان پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بىٚ) پێى فەرموو: (زياتريش بيخەرە فێنكى). ئيتر هەموو جارێ كە بيلال دەيويست بانگ بدا، پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بىٚ) پێى دەفەرموو: (زياتريش با فێنك بكا) هەتا روانيمان كەوا گردو تەپۆڵكەى دەوروبەرمان سێبەرى لاى ئێوارەيان پەيدا كردووە، ئەوجا حەزرەت (دروودى خوداى لەسەر بىٚ) رێگەى بيلالى دا، بانگى ئەو نيوەڕۆيەى دا).

لێرەدا ئەمەى پترە: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بىٚ) فەرمووى: (كە گەرما داهات، بەفێنكى نوێژى نيوەڕۆ بكەن‌و ماوەيێ دواى بخەن، لەقرچەى گەرماى نيوەڕۆدا مەيكەن، چونكە گەرماى قرچەى نيوەڕۆ لە هالاوى ئاگرى دۆزەخە).

ئەبوزەڕى غيفارى (ڕەزاى خواى لىٚ بىٚ) فەرمووى: لەسەفەرێكا لەخزمەتى پێغەمبەردا بووين، بانگدەر كەبيلال بوو، ويستى بانگى نيوەڕۆ بدا، پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بىٚ) پێى فەرموو: (بيخەرە فێنكى) لەپاشا پاش ماوەيێ تريش بيلال ويستى بانگ بدا، ديسان پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بىٚ) پێى فەرموو: (زياتريش بيخەرە كاتى فێنكى) ئيتر هەمووجارێ كەبيلال دەيويست بانگ بدا، پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بىٚ) پىٚ ى فەرموو: (زياتريش بافێنك بىٚ) هەتا روانيمان وا تەپۆلكەكانى دەورو بەرمان سێبەرى لاى ئێوارەيان بۆپەيدا بوو، ئەوجا حەزرەت (دروودى خواى لىٚ بىٚ) رێگەى بيلالى دا بانگى ئەو نيوەڕۆيەى دا).

**٣٥٨- عَنْ أَبِي ذَرّ قَالَ أَذَّنَ مُؤَذِّنُ النَّبِيِّ - صلى الله عليه وسلم - الظُّهْرَ فَقَالَ « أَبْرِدْ أَبْرِدْ - أَوْ قَالَ - انْتَظِرِ انْتَظِرْ » . وَقَالَ « شِدَّةُ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ ، فَإِذَا اشْتَدَّ الْحَرُّ فَأَبْرِدُوا عَنِ الصَّلاَةِ » . حَتَّى رَأَيْنَا فَيْءَ التُّلُولِ.(٣٥٨)**

**لەژمارە (٣٥٧)دا رابورد.**

**٣٥٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إذا اشْتَدَّ الْحَرُّ فَأَبْرِدُوا بِالصَّلَاةِ فَإِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ وَاشْتَكَتْ النَّارُ إِلَى رَبِّهَا فَقَالَتْ يَا رَبِّ أَكَلَ بَعْضِي بَعْضا فَأَذِنَ لَهَا بِنَفَسَيْنِ نَفَسٍ فِي الشِّتَاءِ وَنَفَسٍ فِي الصَّيْفِ فَهُوَ أَشَدُّ مَا تَجِدُونَ مِنْ الْحَرِّ وَأَشَدُّ مَا تَجِدُونَ مِنْ الزَّمْهَرِيرِ). (الحديث ٥٣٧- طرفه في: ٣٢٦٠):(٣٥٩)**

**ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ گەرما دادێ، بەفێنکی نوێژی نیوەڕۆ بکەنو ماوەیێ دوای بخەن، لەقرچەی گەرمای نیوەڕۆدا مەیکەن، چونکە قرچەی گەرما لەهاڵاوی ئاگری دۆزەخە، ئاگر لەلای خودا سکاڵا لەحاڵی خۆی دەکاو دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! ناوسکی خۆمم خواردۆتەوەو پیشاوم بەسەریەکا، لەناو خۆما پەنگم خواردۆتەوە، پشوویەکم بدەرێ، جاخودا ڕێگەی دا کەدوو هەناسەبدا، هەناسەیێ لەزستاناو هەناسەیێ لەهاوینا، دەی قرچەی گەرمای هاوینو تەشقی سەرمای زستان ـ کەئێوە هەستیان پێ دەکەن ـ برێتین لەو دوو هەناسەیەی دۆزەخ، کەلەزستانو هاوینا دەیان دا). (ت/١/١٩٧/٨ ز-٤٧ ژ-٣٥٥ ج-٤ = ش/د/ت/ ن).**

---

**(٣٥٨) برزوانە: ژمارە (٣٥٧) کە لەپێشەوە ڕابورد.**

**(٣٥٩) تجريد/١، ژمارە: ٣١٥، بخاری: ٥٣٧، ٣٢٦٠، مسلم: ٦١٥ - ١٤٠٠.**

بۆنموونــە لەســەر لێکۆڵینــەوەی پــسپۆڕانە، هــەتا بەباشــی لــەکورۆکی دەق‌و ئامــاژەی ئــەم فەمایــشتە نەســتەقانە حــاڵی بــبین‌و، شــوێن بۆچــوونی لاوازی ناپــسپۆڕان نەکــەوین، ئــەم نموونــە لەشــیکردنەوەو بۆچــوونی جیاجیــا، لەفەتحولباری یەوە، راگوێز دەکەم:

(راجیایی هەیە لەناو زانایانا، کەئایا ئەم سکاڵایە، بەزمانی حاڵە، یابەزمانی گوتارە؟ هەردەستەیێ یەکێ لەم دوورایەی بەلاوە پەسەندە، ئیبنوعەبدولبەڕ دەفەرموێ: هەریەکێ لەم دوو فەرمایشتەرووی ئاراستەی هەیە، وەوێنەی تری لەدەقی ئایینی دا هەیە، بەلام بۆچوونی یەکەم دامەزراوترە) قازی عەیازیش دەفەرموێ: (رای یەکەم دیاری ترە) قورطوبی دەفەرموێ: (گفتەو لەفظەکە ببڕدرێ بەسەر حەقیقەتدا، شتی وا بۆخوا کارێکی نەستەم‌و مەحاڵ نییە، لەم جێگەیەدا، هەرکاتێکیش پێغەمبەری راستگۆ، لەبابەت کارێکی واوە، کەڕوودانی لەتوانادا هەبێ، وەپێویستی بەتەئویل (ساخ کردنەوە) نەبێ، هەواڵێکی راگەیاند، لەکاتی وادا ئەو فەرمایشتە ببڕدرێ بەسەر واتای راستەقینەیی دا باشترە، نەك بەسەر واتای مەجازیدا) نەوەویش هەروا دەفەرموێ: بۆیە دەفەرموێ: بڕینی بەسەر راستەقینەییدا دروستی تەواوە. تۆرپشتیش هەروا دەفەرموێ: بەلام شێخی بەیضاوی دەفەرموێ: (بڕینی بەسەر واتای مەجازیدا لەبارترە: کەواتە: مەبەست لەسکاڵای دۆزەخ کڵپەسەندن‌و تاو سەندنیەتی، وەمەبەست لەوە کەدەڵێ ناوسکی خۆمم خواردۆتەوەو پیشاوم بەسەریەکا، پاڵەپەستۆو بەسەریەکا ترشانی پارچەکانیەتی، وەمەبەست لەهەناسەدانی برێتی یە لەو گەرماو سەرمایەی کەلێ ی دەردەچێ. زەینی کوڕی مونیریش دەفەرموێ: هەڵبژاردە بڕینیەتی بەسەر واتای راستەقینەدا، چونکە شتی وا لەتوانای دەستەلاتدا هەیە، وەلەبەر ئەوەیش گەرچی گوتار ئیستیعارە دەکرێ بۆتەعبیر لەحاڵێ، وەشتی واکارێکی ناسراوو بیسراوە، لەگوفتوگۆدا، بەلام لەسەر ئەم

شیوەی وا لەم فەرموودەدا، دوورە لەمەجازەوە، لەشێوازی گوفتوگۆی ئاسایی کەباوو سانایی بێ بەدەرە، چونکە ئەوەتا لەسەرەتاوە وشەی سکاڵا بەکارهێنراوە، ئەوسا روون کراوەتەوە کەدەقی سکاڵاکە چۆنە، سکاڵاکە قەبوولکراوەو ڕێگەی پێ دراوە دووهەناسە بداو، دوایی روونیش کراوەتەوە کەهۆی سەرمای زستانو گەرمای هاوین ئەو دوو هەناسەی دۆزەخە، وەهەناسەکانیش تەنیا دوانن‌و بەس). فەرمایشتی فەتحولباری تەواو.

وشەیەکی دڵ هەژین: لەعەینی دا دەفەرموێ: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کەدۆزەخ شت تێ دەگاو هۆشی هەیە، لەکتێبا دەڵێ: شت نیە کەوەك بەهەشت‌و دۆزەخ گوێی سووك بێ. هەروا لەڕیوایەت دا هاتووە کە دۆزەخ گوفتوگۆ لەگەڵ حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) دا دەکا، وەبانگی موسوڵمان دەکا: (تێپەربە ئەی خاوەن بڕوا، واشەوقی رووناکی تۆ گڕی منی کوژانەوە!).

## (٣٣) باب: إستحباب تقديم الظهر في أول الوقت في غير شدة الحر سوننەتە ئەگەر گەرما نەبوو، نوێژی نیوەڕۆ زوو بەزوو بکرێ، لەسەرەتای کاتیەوە

٣٦٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضى الله عنه) قَالَ كُنَّا نُصَلِّى مَعَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فِي شِدَّةِ الْحَرِّ ، فَإِذَا لَمْ يَسْتَطِعْ أَحَدُنَا أَنْ يُمَكِّنَ وَجْهَهُ مِنَ الأَرْضِ بَسَطَ ثَوْبَهُ فَسَجَدَ عَلَيْهِ.[٣٦٠]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران کە لەقرچەی گەرمای نیوەڕۆدا، نوێژی نیوەڕۆمان لەگەڵ پێغەمبەردا دەکرد، ئەگەر

---

[٣٦٠] بخاری: ٣٨٥، مسلم: ١٤٠٦.

لەبەر سەختی گەرما نەمانتوانیایە، کە لەکوڕنووشا، تەوێڵ بنێینە سەر زەوی، چمکی جلەکەی خۆمان رادەخستو لەسەری کوڕنووشمان دەبرد.

ئەمەیش دەقی ژمارە (٢١١)ی پوختەی موسلیمە، دەیکەین بە پاڵپشت بۆ باسەکە:

عَنْ خَبَّابٍ (رَضِي اللهُ عَنْـهُ) قَـالَ: أَتَيْنَـا رَسُـولَ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ)، فَشَكَوْنَا إِلَيْهِ حَرَّ الرَّمْضَاءِ، فَلَمْ يُشْكِنَا، قَالَ زُهَيْـرٌ: قُلْتُ لأَبِـي إِسْحَاقَ: أَفِـي الظُّهْـرِ؟ قَالَ: نَعَمْ، قُلْتُ: أَفِي تَعْجِيلِهَا؟ قَالَ: نَعَمْ). {الحديث/ ١٤٠٥} :

خەبباب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: چووینە خزمەتی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) سکاڵای گەرمی چەوولی جێگە کوڕنووشی خۆمان لە خزمەتدا کرد، کە ڕێگەمان پێ بدا، کە نوێژ دوا بخەین، هەتا فێنك دەکا، بەڵام سکاڵای نەپرسینو ڕێگەی ئەوەی نەداین. زوهەیر (کە مامۆستای مامۆستاکەی موسلیمە لە گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیەدا) دەفەرموێ: لە ئەبو ئیسحاقی مامۆستای خۆمم پرسی: ئایا مەبەست لەم نوێژە لەمکاتە گەرمەدا نوێژی نیوەڕۆیە؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتم: ئایا سکاڵای ئەوەیان لە خزمەت پێغەمبەردا کردووە کە نوێژەکە لە قرچەی گەرمای نیوەڕۆدا نەکەنو دوای بخەن هەتا فێنك دەکا، ئەویش ڕێگەی ئەوەی نەداون؟ فەرمووی: بەڵێ.

## ڕوونکردنەوە:

١- کاتی زۆرباش بۆ کردنی هەموو نوێژێ، سەرەتای کاتەکەیەتی.

٢- خەببابی کوڕی ئەرەت (ڕەزای خودای لێ بێ) لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکانە، ئازاری زۆری چەشتووە لەسەر ئیسلامەتی لە زوربەی شەڕو شەرگاکانی ئیسلامدا بەشداری کردووە، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) پەیمانی برایەتی بەست، لەنێوانی ئەوو جەبری کوڕی عەتیکدا، سیو دوو

فەرموودەی هەیە، بوخاری پێنجیانی گێڕاوەتەوە، لەسەردەمی نەزانیدا ئاسنگەر بوو، شمشێری دروست دەکرد، خەبباب دەیفەرموو: جارێ لەسەر ئیسلامەتی ئاگرێکیان کردەوە بۆم، ئەوجا رایانکێشام بەسەریدا، بەرە بەرە چەوریو بەزی پشتم ئاگرەکەی کوژاندەوە! پشتی بەهۆی ئەم کارەساتی سووتاندنەوە چاڵو چوێڵ بوو بوو، لە کووفە نیشتەجێ بوو، لە تەمەنی شەستو سێ ساڵیدا، لە کووفە، لە (٣٧) سییو حەوتی کۆچیدا بە مەرگی خودا مرد، پێشەوا عەلی نوێژی لەسەر تەرمەکەی کرد.

## (٣٤) باب: إستحباب التبكير بالعصر

## سوننەتە نوێژی عەصر زوو بەزوو لەسەرەتای کاتیەوە بکرێ

٣٦١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يُصَلِّي الْعَصْرَ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ حَيَّةٌ، فَيَذْهَبُ الذَّاهِبُ إِلَى الْعَوَالِي فَيَأْتِي الْعَوَالِيَ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ، وَبَعْضُ الْمَوَالِي من المدينة عَلَى أَرْبَعَةِ أَمْيَالٍ أو نَحْوِه). {الحديث/ ١٤٠٧، تجريد البخاري/١/٣٢٧، رقم: ٣٢٢ = ٥٥٠ فتح الباري شرح صحيح البخاري} :[٣٦١]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جەماعەتی نوێژی عەصری بۆمان دەکرد، هێشتا خۆر بەرزو بەتینو بەشەوق بوو، هەبوو دوائەوە دەچوو بۆ عەوالی کە دەگەیشتە ئەوێ هێشتا هەر خۆر بەرز بوو. عەوالی چەند گوندێك بوون، لە دەوری شاری مەدینە بوون، نزیکەکەیان دوو میل دوور بوو، لە مەدینەوە،

---

[٣٦١] مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٢١٣ = ٦٢١ = ١٤٠٧، تجريد/١، ژمارە: ٣٢٢، بخاري: ٥٥٠.

دوورەکەیان هەشت میل دەبوو، هەیان بوو دەوری چوار میل دوور بوو).
{تاج/١، زنجیره: ٤٧، ژماره: ٣٥٧}.

٣٦٢- حديث أنس بن مالك، عن أَبِي أُمَامَةَ قال: صَلَّيْنَا مَعَ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ الظُّهْرَ ، ثُمَّ خَرَجْنَا حَتَّى دَخَلْنَا عَلَى أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ فَوَجَدْنَاهُ يُصَلِّي الْعَصْرَ فَقُلْتُ يَا عَمِّ ، مَا هَذِهِ الصَّلَاةُ الَّتِي صَلَّيْتَ قَالَ الْعَصْرُ ، وَهَذِهِ صَلَاةُ رَسُولِ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – الَّتِي كُنَّا نُصَلِّي مَعَهُ.[٣٦٢]

ئەبو ئومامە فەرمووی: لەگەڵ عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا نوێژی نیوەڕۆمان بەجەماعەت کرد، ئەوجا دەرچووین و چووین بۆلای ئەنەسی کوڕی مالیك، کەچووین تەماشامانکرد وا نوێژی عەصر دەکا، منیش پێیم گوت: ئەی مامە! ئەم نوێژە چییە کە ئێستە کردت؟ فەرمووی: (ئەوە نوێژی عەصر بوو، جاران پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەمکاتەدا بەرنوێژیی نوێژی عەصری بۆمان دەکرد).

ئەمەیش گێڕانەوەیەکی تری ئەم فەرموودەیە، کە ژمارە (٢١٤)ی پوختەی موسلیمە:

عَنِ الْعَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) فِي دَارِهِ بِالْبَصْرَةِ حِينَ انْصَرَفَ مِنَ الظُّهْرِ، وَدَارُهُ بِجَنْبِ الْمَسْجِدِ، فَلَمَّا دَخَلْنَا عَلَيْهِ، قَالَ: أَصَلَّيْتُمُ الْعَصْرَ؟ فَقُلْنَا لَهُ: إِنَّمَا انْصَرَفْنَا السَّاعَةَ مِنَ الظُّهْرِ، قَالَ: فَصَلُّوا الْعَصْرَ، فَقُمْنَا فَصَلَّيْنَا فَلَمَّا انْصَرَفْنَا قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: « تِلْكَ صَلاَةُ الْمُنَافِقِ يَجْلِسُ يَرْقُبُ الشَّمْسَ، حَتَّى إِذَا كَانَتْ بَيْنَ قَرْنَيِ الشَّيْطَانِ فَنَقَرَهَا أَرْبَعًا لاَ يَذْكُرُ اللَّهَ فِيهَا إِلاَّ قَلِيلاً». {الحديث/ ١٤١١}:

---

[٣٦٢] بخاری: ٥٤٩. مسلم: ١٤١٢. بڕوانە: مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٢١٤ = ١٤١١ شيحا.





عەبدوڵڵا کوڕی عەبدوڕەحمان فەرمووی: چووین بۆ خزمەتی ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) بۆ ماڵەکەی ئەنەس خۆی کە لەپاڵ مزگەوتدا بوو، لەشاری بەصرە، هەر کە لەجەماعەتی نوێژی نیوەڕۆ بووینەوە یەکسەر چووین بۆ خزمەتی، ئەنەس پێی فەرمووین: ئایا نوێژی عەصرتان کردووە؟ پێمان گوت: نوێژی عەصری چی؟ ئێمە ئا ئێستا لەنوێژی نیوەڕۆ بووینەوە، نوێژی عەصر زۆری ماوە کە ببێ!! فەرمووی: دەههەڵسن نوێژی عەصر بکەن، دوایی تێتان دەگەیەنم، ئێمەیش هەڵساین و لەوێ، لەلای ئەو، نوێژی عەصرمان بەجەماعەت کرد، کە سلاومان دایەوە ئەنەس فەرمووی: (لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: ئەو جۆرە نوێژە، کە نوێژ خوێن چاوەنواڕی خۆر دەکا، هەتا دەچێتە نێوانی دوو شاخەی شەیتانەوە، کەکاتی خۆرئاوا بوون و خۆرکەوتنە، ئەوسا بە پەلەپەل، وەك مەلێ دەنووك بدا لە زەوی، چوار رکات نوێژی عەسر دەکا، یا دوو رکات نوێژی بەیانی دەکا، ئەوە ئەو جۆرە نوێژ کردنە، لەم دوو کاتە ناپەسەندەدا، نوێژی ناپاك و مونافیقانە، کە بەدەگمەن یادی خودای تیادەکەن).

**ڕوونکردنەوە:**

بۆ تێگەیشتنی تەواو لە واتای دوو شاخەی شەیتان، بفەرموو بڕوانە ڕوونکردنەوەکەی ئەوەوی لە فەرموودەی ژمارە: (٢٠٥)ی موختەصەری صەحیحی موسلیم، بەرگی یەکەم. کە کەمێ لەمەوپێش رابورد، هەروا بڕوانە رای نەوەوی لەپاش فەرموودەی ژمارە: (٢١٠)ی پوختەی موسلیم/١.

عەلای کوڕی عەبدوڕەحمانی یەعقوب لە ریجالی کوتوبی ئەربەعەیە، عەبدوڵڵای کوڕی ئیمام ئەحمەد دەفەرموێ: متمانە پێکراوە، نەمدیوە کەسێ

ناوی بەخراپە بەرێ، گێرانەوەی لە باوکیو ئیبنو عومەرو ئەنەسو کەسانی ترەوە ئەنجام داوە.

٣٦٣- عن رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ - رضى الله عنه - قَالَ كُنَّا نُصَلِّى مَعَ النَّبِىِّ - صلى الله عليه وسلم - الْعَصْرَ فَنَنْحَرُ جَزُورًا ، فَتُقْسَمُ عَشْرَ قِسَمٍ ، فَنَأْكُلُ لَحْمًا نَضِيجًا قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ.[٣٦٣]

رافیعی کوڕی خەدیج (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەخزمەتی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) نوێژی عەصرمان بە کۆمەڵی دەکرد، ئەوسا وشترێ سەردەبڕرا، دەکرا بە دە بەشەوە، ئەوجا لێ دەنرا، بەر لەخۆر ئاوابوون لەگۆشتی کوڵاوی ئەو وشترە سەربڕاوەمان دەخوارد!).

لە بلوغ المراما دەفەرموێ:

وَعَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ قَالَ: {كُنَّا نُصَلِّي اَلْمَغْرِبَ مَعَ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَيَنْصَرِفُ أَحَدُنَا وَإِنَّهُ لَيُبْصِرُ مَوَاقِعَ نَبْلِهِ} . مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. {پوختەی بوخاری = تەجریدی بوخاری/١ ژمارە: ٣٢٩ = ٥٥٩ فتح الباری. مسلم/٦٣٧ = ١٤٣٩ شیحا}:

رافیعی کوڕی خەدیج (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەوسا کە لەگەل پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی شێوانمان دەکرد، کە دەگەڕاینەوە بۆ شوێنی خۆمان، هێشتا دونیا ئەوەندە ڕووناك بوو، شوێنی دەمە تیرمان دەبینی کەدەمیدا لەزەوی، کە دەمان تەقاند. {تاج/١، زنجیرە: ٤٧، ژمارە: ٣٥٩}.

---

[٣٦٣] بخاری: ٢٤٨٥. مسلم: ١٤١٤.

**روونكردنەوە:**

رافیعـــی كـــوڕی خـــەدیج (رەزای خـــودای لێ بـــێ) مەدینـــەیـــیـــە، لەیاریدەدەرانــە، لــەهۆزی ئەوســە، لــەرۆژی جــەنگی بــەدردا، لەبــەر ئــەوەی كــە مێردمنـاڵ بـوو، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) رێگـەی نـەدا پێـی كـە بەشـداری لـەو غەزایـەدا بكـا، بـەڵام لـەرۆژی جـەنگی ئوحـوددا پەسـەندی كـرد بەجـەنگاوەرو، رێگـەی پێـدا كـە بەشـداریی تیـادا بكـات، لـەم جەنگـەدا تـیرێ بەریكەوت، شوێنی ئەو تیرە، لەپاش دەوری حـەفتا ساڵێ، هـەڵی دایـەوەو بووبـە تێـراوێو، لەحــەفتاو چواری كۆچـیدا، لەتەمــەنی هەشـتاو شـەش ساڵیدا، ئـەو تیراوێیــە كوشــتی، لەمەدینــە مــرد، ئیبنــو عومــەر نوێــژی مــردووی لەســەر تەرمەكـەی كـردو، تەرمەكـەی بـەڕێكرد، كۆمـەڵێ ژن، بەقیـژەو هـاوار، شـوێنی تەرمەكەی دەكەون، بۆ سەر گۆڕستان، ئیبنو عومەر پێیان دەفەرموێ: (وس بن، ئەم پیرە مێردە گوناهبار مەكەن، خۆی پیرەمێردێكی ئیختیـارە، بەرگـەی سـزای خودای گـەورە نـاگرێ!). {بڕوانـە: تـەجریـد/١، ژمـارە: ١٠٢٥ + پوختـەی موسـلیم ژمارە: ٥١٣}.

## (٣٥) باب: التغليظ في تفويت صَلاَة العَصْرِ
## هەڕەشەكردن لەو كەسەی كە نوێژی عەصری دەچێت

٣٦٤- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « الَّذِي تَفُوتُهُ صَلاَةُ الْعَصْرِ كَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلَهُ وَمَالَهُ». {الحديث/ ١٤١٦. بخاری/٥٥٢ = تجريد البخاری/١/٣٢٨، ژمارە: ٣٢٣}:[٣٦٤]

---

[٣٦٤] تجريد/١، ژمارە: ٣٢٣. بخاری: ٥٥٢. مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٢١٦ = ٦٢١ - ١٤١٦.




عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ نوێژی عەسری بچێ، وەك ماڵو منداڵو کەسوکاری خۆی بەفیڕۆ دابنێ وایە). {تاج/١/١٩٠/٤، ژمارە: ٣٤٠ – ش/د/ت}.

## (٣٦) باب: الدَّليل لِمَنْ قالَ الصَّلاَة الوُسطَى هي صلاة العَصْرِ
## بەڵگەی ئەوڕایە کەدەڵێ: (نوێژی ناوەڕاست (صەلاتول وستا) نوێژی عەصرە

٣٦٥– عَنْ عَلِيّ – رضى الله عنه – قَالَ لَمَّا كَانَ يَوْمُ الأَحْزَابِ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – « مَلأَ اللَّهُ بُيُوتَهُمْ وَقُبُورَهُمْ نَارًا ، شَغَلُونَا عَنِ الصَّلاَةِ الْوُسْطَى حِينَ غَابَتِ الشَّمْسُ».(٣٦٥)

عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی غەزای خەندەق، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودا خانەو ماڵو گۆڕیان پڕبکا لەئاگر، بەهۆی ئەوانەوە نەمان پەرژا کە نوێژی ناوەڕاست بکەین، کە نوێژی عەصرە، هەتا کاتەکەی بەسەرچوو بە ئاوابوونی خۆر، لەپاشان پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەستنوێژی گرتو ئێمەیش دەستنوێژمان گرتو لەنێوانی نوێژی شێوانو نوێژی خەوتناندا، بەجەماعەت نوێژەکەی عەصری بۆمانکرد). (تاج/١، زنجیرە: ٤٥، ژمارە: ٣٤٢ ج/٤).

٣٦٦– عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ): أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، (رَضِي اللهُ عَنْهُ)، يَوْمَ الْخَنْدَقِ، جَعَلَ يَسُبُّ كُفَّارَ قُرَيْشٍ، وَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ مَا كِدْتُ أَنْ أُصَلِّيَ الْعَصْرَ حَتَّى كَادَتْ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «فَوَاللَّهِ إِنْ صَلَّيْتُهَا».

---

(٣٦٥) بخاری/جهاد/٢٩٣١، ٤١١١. مسلم،صلاە: ١٤١٩.

فَنَزَلْنَا إِلَى بُطْحَانَ، فَتَوَضَّأَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَتَوَضَّأْنَا فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْعَصْرَ بَعْدَ مَا غَرَبَتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ صَلَّى بَعْدَهَا الْمَغْرِبَ. {الحديث/ ١٤٢٨. تجريد/١، لاپەڕە: ٣٤٢، ژمارە: ٣٤٥ = ٥٩٦، ٦٤١، ٥٩٨، ٩٤٥، ٤١١٢}:[٣٦٦]

ئەمە دەقی پوختەی موسلیمە، ژمارە (٢٢١) بەرگی/١.

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی غەزای خەندەق، لەپاش خۆرئاوا، عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خودای لێ بێ) هاتو دەستی کرد بەجنێودان بە بێباوەڕانی قوڕەیش، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! بەخودا، خەریك بوو خۆرئاوا دەبوو، ئەوسا نوێژی عەصرم بۆکرا؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەخودا من هێشتا نوێژی عەصرم نەکردووە!).

ئەوجا هەڵساین چووین بۆ شیوی بوطحان کەوا لەمەدینە، لەوێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستنوێژی گرت بۆ نوێژو، ئێمەیش هەروا دەستنوێژمان گرت بۆی، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەقەزا، نوێژی عەصری بەکۆمەڵ، لەپاش خۆرئاوا بوون بۆ کردین، لەپاشا بەحازری، نوێژی شێوانیشی بەجەماعەت بۆ کردین).

[٣٦٦] تجرید/١، ژمارە: ٣٤٥ - بخاری/٥٩٦. مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٢٢١. مسلم: ٦٣١ - ١٤٢٨ شیحا.

## (٣٧) باب: فضل صلاتي الصبح والعصر والمحافظة عليهما

## خێرو گەورەیی نوێژی بەیانیو نوێژی عەصرو نلگاداریی کردنیان کە نەفەوتێن

٣٦٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ يَتَعَاقَبُونَ فِيكُمْ مَلَائِكَةٌ بِاللَّيْلِ وَمَلَائِكَةٌ بِالنَّهَارِ وَيَجْتَمِعُونَ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ وَصَلَاةِ الْعَصْرِ ثُمَّ يَعْرُجُ الَّذِينَ بَاتُوا فِيكُمْ فَيَسْأَلُهُمْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِهِمْ كَيْفَ تَرَكْتُمْ عِبَادِي؟ فَيَقُولُونَ تَرَكْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ وَأَتَيْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ). (الحديث ٥٥٥- أطرافه في: ٣٢٢٣، ٧٤٢٩، ٧٤٨٦).[٣٦٧]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: چەن فریشتەیێ بەشەوو، چەن فریشتەیەکی تر بەڕۆژ بەرودوا بەدیارتانەوە دەبنو، بەسەرەنێشکتان دەگرن، وەهەردوو لایان لەنوێژی بەیانیو نوێژی عەصردا یەکتر دەگرنو یەکتری دەگۆڕن، جاکاتێ ئەوتاقمە فریشتەیەی کەوا شەو لەدیارتان بوون، سەردەکەونەوە بۆ خزمەتی خودای گەورەو پەروەردگار، لێیان دەپرسێ ـ هەرچەندە کەخۆشی باشتر حاڵیان دەزانێ ـ دەفەرموێ: کەئێوە هاتنەوە لەلای ئەو بەندانەی منەوە چییان دەکردو خەریکی چی بوون؟ دەڵێن: کەئێمە چووین بۆلایان ئەوان نوێژیان دەکرد، کەئێمەیش هاتینەوە دیسان هەر نوێژیان دەکرد). (ت/١/١٨٤/٦ ز-٤٤ ژ-٣٣٨ ج-٤ = ش/ ن).

٣٦٨- عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (فَنَظَرَ إِلَى الْقَمَرِ لَيْلَةً يَعْنِي الْبَدْرَ فَقَالَ إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ هَذَا الْقَمَرَ لَا تُضَامُّونَ فِي رُؤْيَتِهِ فَإِنْ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ لَا تُغْلَبُوا عَلَى صَلَاةٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ

---

[٣٦٧] تجريد/١، ژمارە: ٣٢٦. بخاری: ٥٥٥. مسلم: ٦٣٢ - ١٤٣٠ مسلم ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا.

وَقَبْلَ غُرُوبِهَا فَافْعَلُوا ثُمَّ قَرَأَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ).
(الحديث ٥٥٤- اطرافه في: ٥٧٣، ٤٨٥١، ٧٤٣٥، ٧٤٣٦).[٣٦٨]

جەریر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: شەوێ لەخزمەتی حەزرەت دا بووین، شەوی چاردەی مانگ بوو، تەماشایەکی مانگی کردو فەرمووی: چۆن ئێستاکە هەمووتان بەئاسانیو ئاسوودەیی ئەم مانگە دەبینن بەبێ پاڵەپەستۆ، لەقیامەتیشا ئاوا خودای خۆتان دەبینن، بۆبینینی تووشی هیچ نارەحەتیو پاڵەپەستۆیێ نابن، جاتادەتوانن ئاگاداری نوێژی بەیانیو نوێژی عەسربنو مەیان چۆێنن، چوونکە ئەم دوونوێژە هۆی چوونە بەهەشتو دیتنی خودان، ئینجا حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (وسبح بحمد ربك قبل طلوع الشمس وقبل غروبها) ١٣٠/٢٠/ ـ واتە: بەباشی ئاگاداری ی نوێژی بەیانیو نوێژی عەصر بکەنو هەمیشە لەناو نوێژدا سوپاسو ستایشی خودای خۆتان بکەن). (ت/١/١٩٠/٢- ش/د/ ت).

٣٦٩- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَنْ صَلَّى الْبَرْدَيْنِ دَخَلَ الْجَنَّةَ).[٣٦٩]

ئەبو موسای ئەشعەری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ دوو نوێژە فێنکەکە بکا، کەنوێژی بەیانیو نوێژی عەصرن، دەچێتە بەهەشت) (ت/١/١٩٠/٣ ز-٤٤ ژ-٣٤٠ چ-٤ = ش).

ژمارە (٢٠٨)ی پوختەی موسلیم، کە لەم بابەتەیە دەفەرموێ:

---

[٣٦٨] تجرید/١، ژمارە: ٣٢٥. بخاری: ٥٥٤. مسلم: ٦٣٣ = ١٤٣٢.

[٣٦٩] تجرید/١، ژمارە: ٣٣٥. بخاری: ٥٧٤. مسلم: ٦٢٥ = ١٤٣٦ شیحا.

ئەبوبەکری کوڕی عومارەی کوڕی روئەیبە (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: عومارەی باوکم فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (هەر موسوڵمانێ نوێژی بەیانی بکا، کە هەتا خۆرکەوتن دەمێنێ، هەروەها نوێژی عەسریش بکا، کە هەتا خۆرئاوا بوون دەمێنێ، هەر موسوڵمانێ ئەم دوو نوێژە لەکاتی خۆیاندا بکا، هەرگیز ناچێتە ناو ئاگری دۆزەخ).

پیاوێکی خەڵکی بەصرە پێی دەفەرموێ: (ئایا تۆ بۆخۆت ئەمەت لەزاری پیرۆزی پێغەمبەر خۆی، بەگوێی خۆت بیستووە کەوا بفەرموێ؟).

فەرمووی: بەڵێ، پیاوەکەیش فەرمووی: دەی منیش شایەتی دەدەم کە ئەم فەرموودەیەم بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستووە، وە بەدڵیشم تێی گەیشتووم).

**روونکردنەوە:**

عومارەی کوڕی رەئوبەی ئەقەفی، کونیەی ئەبو زهرەیە، کووفییە، دوو فەرموودەی هەیە، ئەمە یەکێکیانە، ئەم زاتانە لەوەوە گێڕانەوەیان ئەنجامداوە: ئەبوبەکری کوڕیو حوصەینو عەبدولەلیکی کوڕی عومەیر.

### (٣٨) بابُ: بَيَانِ أنَّ أوَّلَ وَقْتِ المغرِبِ عند غروب الشمس
### کەخۆر ئاوابوو، سەرەتای نوێژی شێوانە

٣٧٠- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يُصَلِّي الْمَغْرِبَ إِذَا غَابَتِ الشَّمْسُ). {الحديث/ ١٤٣٨. بخاري. مواقيت الصلاة/ ٥٦١}: [٣٧٠]

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوکاتە بەرنوێژی نوێژی شێوانی بۆ دەکردین، کە گۆی خۆر ئاوادەبێ).

**ڕوونکردنەوە:**

ڕشتەی ئەم فەرموودەیە لە بوخاریدا، لە ڕشتە (سند)ە سێ کەسیەکانی بوخارییە، کە ئاوایە:

٤- مەکی کوڕی ئیبراهیم.

٥- یەزیدی کوڕی ئەبی عوبەید.

٦- سەلەمەی کوڕی ئەکوەع، بەڵام لە ڕشتە چوارینەکانی ئیمامی موسلیمە، کە ئەم زاتانەن:

- مامۆستاکەی موسلیم: قوتەیبەی کوڕی سەعید.
- حاتەمی کوڕی ئیسماعیل، کە مامۆستای قوتەیبەیە.
- یەزیدی کوڕی ئەبو عوبەید، کە تابیعییە.
- سەلەمەی کوڕی ئەکوەع کە هاوەڵی پێغەمبەرە.

---

[٣٧٠] بخاری. مواقیت: ٥٦١. مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٢٢٣ = ١٤٣٨ ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا.

لەصەحیحی موسلیمدا، لە رشتەی چوارینی بەرزتر تیانیە، بەلام لە بوخاریدا زیاتر لەبیست فەرموودەی واتیا، کە رشتەکەیان (ثلاثي) سێ کەسییە، لەم لایەنەوە بوخاری یەکەمەو خاوەنی ئەم شانازییەیە.

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع، ناوی تەواوی: سەلەمەی کوڕی عەمری کوڕی ئەکوەعە، ئامادەی غەزای حودەیبییە بووە، ئامادەی پەیمانی خۆشنوودیی بووە، کە ناودارە بە (بیعة الرضوان) کە لەحودەیبییە کرا.

حەفتاو حەوت فەرموودەی هەیە، شازدەیان پەسەندی هەردوو پێڕی بوخاریو موسلیمن، بیستو یەکیان وان لە بوخاریدا، بیستو پێنجیان وان لە موسلیمدا، سەرجەمی فەرموودەکانی لە صەحیحەیندا دەکاتە: ١٦ + ٥ + ٩ = ٣٠ سیی فەرموودە.

سەلەمە پیاوێکی ئازای تیر ئەندازی تیژڕەو بوو، لە راکردندا ولاخی بەرزەی بەجێ دەهێشت، پیاوێکی بەهرەمەندی خێرکەر بوو، کۆمەڵەی فەرموودە زانە گەورەکان، کەناودارن بە (الجماعة) فەرموودەیان لە سەلەمەوە گێڕاوەتەوە، وەك: شافیعیو ئیمام أحمدو بوخاریو موسلیمو ئەبو داوودو تیرمیزیو نەسائیو بەیهەقیو دارە قوطنیو ... تاد. لەرۆژی پەیمانی خۆشنوودیدا سێجار پەیمانی بەست لەگەڵ پێغەمبەردا، لە سەرەتای خەڵکەکەوەو لە ناوەڕاستەوەو لەدوا دوایانەوە، دەڵێن: گورگ قسەی لەگەڵدا کردووە، سەلەمە دەفەرموێ: لەپێش ئیسلام بوونما، جارێ گورگێ ئاسکێکی رفاند، نیشتمە سەری لە گورگەکەم سەندەوە، گورگەکە گوتی: خانە خراپ چیتە بەسەر منەوە رزقم دەبڕی، خۆ ئەمە ماڵی تۆ نییە، رزقو رۆژییەکە، خودا رەخساندوویەتی بۆم، کەچی تۆ لێم دەسەنیتەوە، منیش گوتم: ئەی بەندەکانی خودا! بەڕاستی ئەمە شتێکی سەیرە، خۆ ئەوەتە گورگ قسە دەکا!

کەچی گورگەکە گوتی: لەمە سەیرتر ئەوەیە، کە پێغەمبەری خوا والەناو ئەو بنکە دارخورمایانەدا، بانگتان دەکا بۆسەر دینی هەقو خوا پەرستی راستو دروست، کەچی ئێوە هێشتا هەر دەست لەبتپەرستی هەڵناگرن!! ئیتر منیش رێك چووم موسوڵمان بووم.

کوڕەکەی دەیفەرموو: سەلەمەی باوکم قەت درۆی نەدەکرد، سەلەمە دەیفەرموو لە خزمەت پێغەمبەر خۆیدا ئامادەی حەوت غەزا بووم، لەحەوت غەزای تریشدا بەشداریم کردووە.

سەلەمە لەتەمەنی هەشتا ساڵیدا، لە مەدینە لەساڵی حەفتاو چواری کۆچیدا بەمردنی خوا مردووە، (رەزای خودای گەورەی لێ بێ) . {تەجریدی بوخاری/١، لاپەرە: ١١٣ چاپی یەکەم. ژمارە: ١٠٩/٩٠ + عَيْنِي/٢/١٥٣}.

٣٧١- عَنْ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قالَ: (كُنَّا نُصَلِّي الْمَغْرِبَ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيَنْصَرِفُ أَحَدُنَا وَإِنَّهُ لَيُبْصِرُ مَوَاقِعَ نَبْلِهِ). (الحديث ٥٥٩):[٣٧١]

رافیعی کوڕی خەدیج (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەوسا کەلەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی شێوانمان دەکردو،دەگەڕاینەوە بۆ شوێنی خۆمان هێشتا دنیا ئەوەندە رووناك بوو شوێنی دەمەتیرمان دەبینی، کەتیرمان دەتەقاند دەمان بینی لەکوێ دەدا لەزەوی. (ت/١/١٩٨/١٢ ز-٤٧ ژ-٣٥٩ ج-٤).

---

[٣٧١] تجريد/١، ژمارە: ٣٢٩. بخاری: ٥٥٩. مسلم: ٦٣٧ = ١٤٣٩.

## (٣٩) باب: وقت العشاء وتأخيرها
## كاتى نويژى خەوتنانو دواخستنى

٣٧٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (أَعْتَمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةً بِالْعِشَاءِ وَذلِكَ قَبْلَ أَنْ يَفْشُوَ الْإِسْلَامُ فَلَمْ يَخْرُجْ حَتَّى قَالَ عُمَرُ نَامَ النِّسَاءُ وَالصِّبْيَانُ فَخَرَجَ فَقَالَ لِأَهْلِ الْمَسْجِدِ مَا يَنْتَظِرُهَا أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الْأَرْضِ غَيْرَكُمْ). (الحديث ٥٦٦ ـ أطرافه في: ٥٦٩، ٨٦٢، ٨٦٤):[٣٧٢]

عائيشه (ڕەزاى خواى لێ بێ) فەرمووى: بەرلەوەى كەئيسلامەتى لە شوێنانى تريش جگە لەناوشارى مەدينە، بلاوببێتەوە، شەوێ لەشەوان، پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) نوێژى خەوتنانى دواخستو درەنگ كردى، هەتا عومەر هاوارى لێ هەڵساو فەرمووى: ئەى پێغەمبەرى خودا! بفەرموو جەماعەتەكەمان بۆ بكە، درەنگە، ژنانو منالآن لەناو مزگەوتا خەويان لێ كەوتووە، لەمە زياتر ناتوانن چاوەڕوانى جەماعەت بكەن، ئەوسا حەزرەت (ڕەزاى خواى لێ بێ) هاتەدەرەوەو هات بۆناو مزگەوتو، بەئامادەبوانى ناومزگەوتەكەى فەرموو: (ئەم چاوەنوارِى كردنە بەكەم مەزانن، ئەمە بەهرەيەكى گەورەيە، خودا لەم كاتەدا بەس بەئێوەى داوە، كەسێ ترنييە جگە لەئێوە، لەدانيشتوانى سەر رووى زەوى، كەلەم دەمەدا چاوەنوارِى ئەم نوێژەبكا، وەك ئێوە چاوەنوارِى دەكەن!)

**راڤەو شيكردنەوە:** بڕوانە فەرموودەى ژمارە: ٣٣٤ لە تەجريدى بوخارى.

---

[٣٧٢] تجريد/١، ژمارە: ٣٣٢. بخارى: ٥٦٦. مسلم: ٦٣٨ - ١٤٤٩، ١٣٦٠شيحا.

٣٧٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - شُغِلَ عَنْهَا لَيْلَةً ، فَأَخَّرَهَا حَتَّى رَقَدْنَا فِي الْمَسْجِدِ ، ثُمَّ اسْتَيْقَظْنَا ثُمَّ رَقَدْنَا ثُمَّ اسْتَيْقَظْنَا ، ثُمَّ خَرَجَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ - صلى الله عليه وسلم - ثُمَّ قَالَ « لَيْسَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ يَنْتَظِرُ الصَّلاَةَ غَيْرُكُمْ».(٣٧٣)

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) فەرمووی: شەوێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەیپەرژا کە لەسەرەتای کاتەوە، نوێژی خەوتنانمان بۆ بکا، لەبەرئەوە دوای خست، تەنانەت هەندێکمان کە چاوەڕوانی جەماعەتمان دەکرد،لەناو مزگەوتەکەدا خەومان لێ کەوت، لەپاشا خەبەرمان بۆوە، بەڵام دیسان خەوتینەوە، ئەنجا لەخەو هەڵسایین، ئەوجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەرچوو، هات بۆلامانو جەماعەتەکەی بۆکردینو ئەجا فەرمووی: (لەدانیشتوانی سەر ڕووی زەوی، بێجگە لەئێوە، کەسی تر نییە کە چاوەڕوانی کردنی ئەم نوێژە بکا لەم کاتەدا!).

ئەنجا بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم فەرموودەیە ئەم فەرموودەی تری تەجریدی بوخاری دەنووسین کە ژمارە (٣٣٣)یە.

عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كُنْتُ أَنَا وَأَصْحَابِي الَّذِينَ قَدِمُوا مَعِي فِي السَّفِينَةِ نُزُولًا فِي بَقِيعِ بُطحَانَ وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْمَدِينَةِ فَكَانَ يَتَنَاوَبُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِنْدَ صَلَاةِ الْعِشَاءِ كُلَّ لَيْلَةٍ نَفَرٌ مِنْهُمْ فَوَافَقْنَا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَا وَأَصْحَابِي وَلَهُ بَعْض الشُّغْلِ فِي بَعْض أَمْرِهِ فَأَعْتَمَ بِالصَّلَاةِ حَتَّى ابْهَارَّ اللَّيْلُ ثمَّ خَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَصلَّى بِهِمْ فَلَمَّا قَضى صَلَاتَهُ قَالَ لِمَنْ حَضرَهُ عَلَى رِسْلِكُمْ أَبْشِرُوا إِنَّ مِنْ نِعْمَةِ اللَّهِ عَلَيْكُمْ أَنَّهُ لَيْسَ أَحَدٌ مِنْ النَّاسِ يُصَلِّي

(٣٧٣) بخاری: ٥٧٠. مسلم: ١٤٤٥ ترقيم شيحا.

هَذِهِ السَّاعَةَ غَيْرُكُمْ أَوْ قَالَ مَا صَلَّى هَذِهِ السَّاعَةَ أَحَدٌ غَيْرُكُمْ لَا يَدْرِي أَيَّ الْكَلِمَتَيْنِ قَالَ قَالَ أَبُو مُوسَى فَرَجَعْنَا فَفَرِحْنَا بِمَا سَمِعْنَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

ئەبوموسا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەیەمەن بووین هەواڵمان بیست کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆچی کردووە بۆ مەدینە، جاخۆمو دووبرامو پەنجاو سێ کەسی لەخزمەکانم، کۆچمان کرد بۆلای، سواری پاپۆڕێ بووین لەحەبەشە هەڵی ڕشتین لەلای نەجاشی، لەوێ تووشی جەعفەری کوڕی ئەبوطالیبو هاوڕێکانی بووین، وەلەوێ ماینەوە هەتا کاتێ گشتمان پێکەوە بەگەمێ گەڕاینەوە بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینە بوو، هەموو شەوێ دەستەیێ لەیارانی، لەکاتی نوێژی خەوتنانا بەنۆرە ئێشکی پێغەمبەریان دەگرت، کاتێ خۆمو هاوڕێکانم چووین بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لێ بێ) وارێکەوت خەریکی سوپا ڕێکخستن بوو، لەبەرئەوە نوێژی خەوتنانی دواخست،هەتا شەو تەواودرەنگ بووشەوتەواو زرنگایەوە، ئەوجاهاتەدەرەوەو هات بۆ مزگەوتو نوێژی خەوتنانی بەکۆمەڵی بۆکردین، کەنوێژەکەی ی تەواو کرد بەئامادەبوانی فەرموو: (هێواش بن، لەجێگەی خۆتان مەبزوێن، مژدەتان لێ بێ، یەکێکە لەنازو بەهرەکانی خودا کەرژاندوویەتی بەسەر ئێوەدا، ئەوەیە کەلەم کاتەدا ئەم نوێژە دەکەن، کەجگە لەئێوە لەم دەمەدا کەسی تر ئەم نوێژە ناکا) یا حەزرەت فەرمووی: (بەس ئێوە لەم کاتەدا ئەم نوێژە دەکەن) راوی دەفەرموێ: نازانم حەزرەت (دروودی خوای لێ بێ) کام لەم دووشتەی فەرموو. ئەبوموسا فەرمووی: ئیتر زۆر زۆر بەشادمانی گەڕاینەوە لەخۆشی ئەم مژدە خۆشەی کەلەپێغەمبەرمان بیست). (بڕوانە: تاج/ ٤/٣٢٧/١ز ـ ١٠٢ تاج-٣ ژ-٣١٦٧ چ-٤ = کوردی).

٣٧٤- حديث أنس: قال: حُمَيْدٍ قَالَ سُئِلَ أَنَسٌ هَلِ اتَّخَذَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - خَاتَمًا فَقَالَ نَعَمْ ، أَخَّرَ لَيْلَةً صَلاَةَ الْعِشَاءِ إِلَى شَطْرِ اللَّيْلِ ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ بَعْدَ مَا صَلَّى فَكَأَنِّى أَنْظُرُ إِلى وَبِيصِ خَاتَمِهِ، فَقَالَ: « صَلَّى النَّاسُ وَرَقَدُوا وَلَمْ تَزَالُوا فِي صَلاَةٍ مُنْذُ انْتَظَرْتُمُوهَا». (٣٧٤)

حومەيد (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لە ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) پرسیارکرا: ئایا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەموستیلەی لەدەست دەکرد؟ فەرمووی: (بەڵێ، شەوێ نوێژی خەوتنانی دواخست، تانیوەی شەو، یا هەتا نزیکی نیوە شەو، ئەوجا ڕووی تێکردین‌و تەشریفی هات‌و فەرمووی: (خەڵکی نوێژی خۆیان کردووەو خەوتوون، بەڵام ئێوە لەوکاتەوە کە چاوەڕوانی نوێژ دەکەن کە بەجەماعەت بیکەن، هەر بەنوێژ حلێبە بۆتان).

ئەنەس فەرمووی: ئێستایش هەر دەڵێی لەبەرچاومە کە ئەو ئەموستیلەیەی کە لەپەنجە تووتەی دەستی چەپی پێغەمبەردا بوو، چۆن دەچریسکایەوە.

٣٧٥- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كُنْتُ أَنَا وَأَصْحَابِي الَّذينَ قَدِمُوا مَعِي فِي السَّفِينَةِ نُزُولًا فِي بَقِيعِ بُطحَانَ وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْمَدِينَةِ فَكَانَ يَتَنَاوَبُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِنْدَ صَلَاةِ الْعِشَاءِ كُلَّ لَيْلَةٍ نَفَرٌ مِنْهُمْ فَوَافَقْنَا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَا وَأَصْحَابِي وَلَهُ بَعْض الشُّغْلِ فِي بَعْض أَمْرِهِ فَأَعْتَمَ بِالصَّلَاةِ حَتَّى ابْهَارَّ اللَّيْلُ ثمَّ خَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَصَلَّى بِهِمْ فَلَمَّا قَضى صَلَاتَهُ قَالَ لِمَنْ حَضرَهُ عَلَى رِسْلِكُمْ أَبْشِرُوا إِنَّ مِنْ نِعْمَةِ اللَّهِ عَلَيْكُمْ أَنَّهُ لَيْسَ أَحَدٌ مِنْ النَّاسِ يُصَلِّي هَذهِ السَّاعَةَ غَيْرُكُم أَوْ قَالَ مَا صَلَّى هَذهِ السَّاعَةَ أَحَدٌ غَيْرُكُمْ لَا يَدْرِي أَيَّ

(٣٧٤) مسلم: ١٤٤٦. بخاری: کتاب اللباس (٧٧) باب فص الخاتم (٤٨).

الْكَلِمَتَيْنِ قَالَ قَالَ أَبُو مُوسَى فَرَجَعْنَا فَفَرِحْنَا بِمَا سَمِعْنَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (الحديث ٥٦٧):[٣٧٥]

ئەبومووسا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەیەمەن بووین هەواڵمان بیست کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆچی کردووە بۆ مەدینە، جاخۆمو دووبرامو پەنجاو سێ کەس لەخزمەکانم، کۆچمان کرد بۆلای، سواری پاپۆڕێ بووین لەحەبەشە هەڵی ڕشتین لەلای نەجاشی، لەوێ تووشی جەعفەری کوڕی ئەبوطالیبو هاوڕێکانی بووین، وەلەوێ ماینەوە هەتا کاتێ گشتمان پێکەوە بەگەمێ گەڕاینەوە بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینە بوو، هەموو شەوێ دەستەیێ لەیارانی، لەکاتی نوێژی خەوتنانا بەنۆرە ئێشکی پێغەمبەریان دەگرت، کاتێ خۆمو هاوڕێکانم چووین بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لێ بێ) واڕێکەوت خەریکی سوپا ڕێکخستن بوو، لەبەرئەوە نوێژی خەوتنانی دواخست،هەتا شەو تەواودرەنگ بووشەوتەواو زرنگایەوە، ئەوجاهاتەدەرەوەو هات بۆ مزگەوتو نوێژی خەوتنانی بەکۆمەڵی بۆکردین، کەنوێژەکەی ی تەواو کرد بەئامادەبوانی فەرموو: (هێواش بن، لەجێگەی خۆتان مەبزوێن، مژدەتان لێ بێ، یەکێکە لەنازو بەهرەکانی خودا کەرژاندوویەتی بەسەر ئێوەدا، ئەوەیە کەلەم کاتەدا ئەم نوێژە دەکەن، کەجگە لەئێوە لەم دەمەدا کەسی تر ئەم نوێژە ناکا) یا حەزرەت فەرمووی: (بەس ئێوە لەم کاتەدا ئەم نوێژە دەکەن) ڕاوی دەفەرموێ: نازانم حەزرەت (دروودی خوای لێ بێ) کام لەم دووشتەی فەرموو. ئەبومووسا فەرمووی: ئیتر زۆر زۆر بەشادمانی گەڕاینەوە لەخۆشی ئەم مژدە خۆشەی کەلەپێغەمبەرمان بیست).

(بڕوانە: تاج/ ١/٣٢٧/٤از ـ ١٠٢ تاج-٣ ژ-٣١٦٧ چ-٤ = کوردی).

---

[٣٧٥] تجريد/١، ژمارە: ٣٣٣. بخاري: ٥٦٧. مسلم: ٦٤١ = ١٤٤٩.

٣٧٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) قَالَتْ: (أَعْتَمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةً بِالْعِشَاءِ وَذلِكَ قَبْلَ أَنْ يَفْشُوَ الْإِسْلَامُ فَلَمْ يَخْرُجْ حَتَّى قَالَ عُمَرُ نَامَ النِّسَاءُ وَالصِّبْيَانُ فَخَرَجَ فَقَالَ لِأَهْلِ الْمَسْجِدِ مَا يَنْتَظِرُهَا أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الْأَرْضِ غَيْرَكُمْ). (الحديث ٥٦٩ طرفه في: ٥٦٦).[٣٧٦]

بڕوانە فەرموودەی ژمارە ٣٣٢ لێرەدا ئەمەی زیاترە: عائیشە فەرمووی: ئەوسەردەمە نوێژ بەجەماعەت هەر لەمەدینە دەکرا، چوونکە لەمەککە نوێژ بەدزی دەکرا، شوێنەکانی تریش ئیسلامەتی یان پێ نەگەیشتبوو، دەستووری پێغەمبەرو یارانی وابوو: نوێژی خەوتنانیان لەنێوانی ئاوابوونی سوورایی کەناری ئاسمانو تێپەڕبوونی سێیەکی یەکەمی شەودا دەکرد.

وفي رِواية: عَنْ ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضي اللهُ عَنْهُما) (فَخَرَجَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ الْآنَ يَقْطُرُ رَأْسُهُ مَاءً وَاضِعًا يَدَهُ عَلَى رَأْسِهِ فَقَالَ لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لَأَمَرْتُهُمْ أَنْ يُصَلُّوهَا هَكَذا فَاسْتَثْبَتُّ عَطاءً كَيْفَ وَضعَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى رَأْسِهِ يَدَهُ كَمَا أَنْبَأَهُ ابْنُ عَبَّاسٍ فَبَدَّدَ لِي عَطاءٌ بَيْنَ أَصَابِعِهِ شَيْئًا مِنْ تَبْدِيدٍ ثُمَّ وَضعَ أَطرَافَ أَصَابِعِهِ عَلَى قَرْنِ الرَّأْسِ ثُمَّ ضمَّهَا يُمِرُّهَا كَذلِكَ عَلَى الرَّأْسِ حَتَّى مَسَّتْ إِبْهَامُهُ طرَفَ الْأُذنِ مِمَّا يَلِي الْوَجْهَ عَلَى الصُّدْغِ وَنَاحِيَةِ اللِّحْيَةِ لَا يُقَصِّرُ وَلَا يَبْطشُ إِلَّا كَذلِكَ. وروى عنْ أَنَسْ (رَضي اللهُ عَنْهُ) هذا الحديث فقال فيه: كأني أنظر إلى وبيص خاتمة ليلتئذ). (رواية ابن عباس ٥٧١ ـ طرفه في: ٧٢٣٩. ورواية أنس الحديث ٥٧٢ ـ أطرافه في: ٦٠٠، ٦٦١، ٨٤٧، ٥٨٦٩):

لەگێڕانەوەی ئیبنوعەباسدا (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: جاکەعومەر هەڵساو فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! بفەرموو جەماعەتەکەمان بۆ بکە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی شۆردبوو، کەلەهۆدەکەی خۆی

[٣٧٦] تجرید/١، ژمارە: ٣٣٤. بخاری: ٥٦٩، ٥٦٦، ٥٧١، ٧٢٣٩. مسلم: ١٤٤٤، ١٤٥٠.

هاتەدەرەوە بۆناو مزگەوت هێشتا سەری تەڕبوو، ئێستایش هەردەڵێی شێوەی ئەوکاتەی والەبەرچاوم، سەری ئاوی لێ دەتکا، هەردوو دەستی لەسەر سەری دانابوو، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (مەبادا زەحمەتی ئۆمەتم بدەم، دەنا فەرمانم پێ دەکردن کەلەم دەمەدا نوێژی خەوتنان بکەن) ئیبنوعەباس بەکردەوە گێڕایەوە کەچۆن چۆنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی لەسەر سەری خۆی دانابوو، جاتۆزێ پەنجەکانی بڵاو کردەوەو ئەوجا نووکی پەنجەکانی لەسەر لاسەری داناو، ئەوجا پەنجەکانی بەیەکەوە لکان، وەئاوا پەنجەکانی راکێشا بەسەر سەریدا بەرەولای خوارەوە، هەتا هەردوو پەنجەکەڵەی لەئاستی لاجانی دایان لەنووکی گوێکانی، لەلای روویەوە. وەلەسەر هەمان شێوە دەستی هێنا بەسەر لاجانگیو بەسەر سەریشیدا، پێشەوا ئەنەسیش (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە، لەگێڕانەوەیەکا لەدواکەیەوە دەفەرموێ: ئێستایش دەڵێی بریسکەی ئەنگوستیلەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) والەبەرچاوم، کەلەوشەوەدا دەدرەوشایەوە). (ت/١/١٩٩/١٣ + ز-٤٧ ژ-٣٦٠ ت/٤ ز-٣٥ ل-١١٦).

**شیکردنەوە:**

بڕوانە فەرموودەی ژمارە: (١١٤)ی تەجرید ئەم فەرموودەیەیش یەکێکە لەو دەدوازدە حەدیثەی کە ئیبنوعەباس بەخودی خۆی لە پێغەمبەر خۆیی بیستووە. هەروا بڕوانە شەرحی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیم ج/٥ ص ١٤١، مبحث (باب وقت العشاء وتأخيرها).

## (٤٠) باب: استحباب التبكير بالصبح في أوَّل وَقْتِها وَهُوَ التغليسُ وَبيان قَدرِ القِراءَةِ فِيهَا

**سوننەتە نوێژی بەیانی زوو بەزوو بکرێ، لەسەرەتای کاتەوە، بە تاریکو لێڵەکە، لەگەڵ ڕوونکردنەوەی ئەو ئەندازە قورئانەی کە لەنوێژی بەیانیدا دەخوێندرێ**

٣٧٧– عن عَائِشَةَ أَخْبَرَتْهُ قَالَتْ كُنَّ نِسَاءُ الْمُؤْمِنَاتِ يَشْهَدْنَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – صَلاَةَ الْفَجْرِ مُتَلَفِّعَاتٍ بِمُرُوطِهِنَّ ، ثُمَّ يَنْقَلِبْنَ إِلَى بُيُوتِهِنَّ حِينَ يَقْضِينَ الصَّلاَةَ ، لاَ يَعْرِفُهُنَّ أَحَدٌ مِنَ الْغَلَسِ.[٣٧٧]

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ژنە موسوڵمانەکان، بۆ جەماعەت لەگەڵ پێغەمبەردا، ئامادەی نوێژی بەیانی دەبوون بە چارۆکەو شاڵینەکانیان خۆیان دەپێچایەوە، کە دەگەڕانەوە بۆماڵەوە، لەپاش کردنی جەماعەتی نوێژی بەیانی، لەرێگە لەبەر تاریکولێڵەکە، کەس نەیدەناسینەوە!). (تاج/١، زنجیرە: ٤٧، ژمارە: ٣٥٢).

٣٧٨– عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو (بْنِ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيّ) (رَضِيَ اللَّهُ عنهم)، قَالَ: لَمَّا قَدِمَ الْحَجَّاجُ الْمَدِينَةَ، فَسَأَلْنَا جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ، فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي الظُّهْرَ بِالْهَاجِرَةِ، وَالْعَصْرَ وَالشَّمْسُ نَقِيَّةٌ، وَالْمَغْرِبَ إِذَا وَجَبَتْ، وَالْعِشَاءَ أَحْيَانًا يُؤَخِّرُهَا وَأَحْيَانًا يُعَجِّلُ، كَانَ إِذَا رَآهُمْ قَدِ اجْتَمَعُوا عَجَّلَ، وَإِذَا رَآهُمْ قَدْ أَبْطَئُوا أَخَّرَ، وَالصُّبْحَ كَانُوا أَوْ – قَالَ – كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّيهَا بِغَلَسٍ. {الحديث/ ١٤٥٨ = تجريد البخاري بەرگی/١، لاپەڕە: ٣٣٢، ژمارە: ٣٣٠ = ٥٦٠، ٥٦٥ = فتح الباري شرح صحيح البخاري}:[٣٧٨]

---

[٣٧٧] بخاری. أذن: ٨٦٧، مسلم: ١٤٥٥، ١٤٥٦، ١٤٥٧.

[٣٧٨] تجريد البخاری/١، ژمارە: ٣٣٠، بخاری: ٥٦٠، ٥٦٥، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٢٠٧، مسلم: ١٤٥٨ شيحا.

موحەممەدی کوڕی حەسەنی کوڕی ئیمامی عەلی (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: کاتێ حەججاج هات بۆ مەدینە، لە جابیری کوڕی عەبدوڵلامان پرسی: لەچی کاتێکا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژە فەرزەکانی دەکرد؟ فەرمووی: لە قرچەی گەرمای نیوەڕۆدا، نوێژی نیوەڕۆی دەکرد، کە نوێژی عەصریشی دەکرد خۆر هێشتا بەگوڕ بوو، تینی مابوو، زەرد هەڵنەگەڕابوو، کە خۆریش ئاوا دەبوو نوێژی شێوانی دەکرد،، نوێژی خەوتنانیشی جاروبار پێش دەخستو، جاروباریش دوای دەخست، لەسەر ئەم شێوەیە: ئەگەر نوێژ خوێنەکان زوو کۆببونایەتەوە، ئەوا زوو بەزوو جەماعەتی خەوتنانی بۆ دەکردین، بەڵام ئەگەر نوێژکەرەکان درەنگ بهاتنایە، ئەویش جەماعەتی نوێژی خەوتنانی دوادەخست، بە تاریکو لێڵەکەیش نوێژی بەیانیانیان دەکرد، یا فەرمووی: تاریکو لێڵەکەیش پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی بەیانی بۆ دەکردن). {تاج/١/١٩٦، ژمارە: ٣٥١/٤}.

**روونکردنەوە:**

١- هۆی ئەم پرسیارەیان ئەوەبوو، کە حەجاجی کوڕی یوسوفی ئەقەفی بوو بە فەرمانڕەوای مەدینە، بە پێچەوانەی سوننەتەوە، نوێژە فەرزەکانی لەکاتی پەسەندی خۆیان دوادەخست.

٢- لەپاش شەهید کردنی عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر، عەبدولەلیکی کوڕی مەڕوان، حەجاجی کرد بە میری سەر مەدینەو مەککەو دەوروبەریانو دواتر گواستیەوە بۆ عێراق. (فتح رقم: ٥٦٠).

موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوطالیب، لە پیاوانی ئەم پەڕاوانەی فەرموودەیەو خاوەنانی ئەم پەڕاوانە، فەرموودەی

پێغەمبەریان لەوەوە گێڕاوەتەوە: بوخاریو موسلیمو ئەبو داوودو نەسائی، واتە: جێی باوەڕی ئەم زاتانە بووە، گێڕانەوەی لەم زاتانەوە ئەنجامداوە: (لەزەینەبی کچی عەلی کەپووری باوکی بووە، لە ئیبنو عەبباسو لە ئیمامی جابیرەوە).

٣٧٩- حديث أَبِي بَرْزَةَ الأَسْلَمِيِّ وقد سُئِلَ عَنْ وَقْتِ الصَّلَوَاتِ فَقَالَ كَانَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) يُصَلِّي الظُّهْرَ حِينَ تَزُولُ الشَّمْسُ ، وَالْعَصْرَ وَيَرْجِعُ الرَّجُلُ إِلَى أَقْصَى الْمَدِينَةِ وَالشَّمْسُ حَيَّةٌ، (قال الراوي عن أَبِي بَرْزَةَ وَنَسِيتُ مَا قَالَ فِي الْمَغْرِبِ)، وَلاَ يُبَالِي بِتَأْخِيرِ الْعِشَاءِ إِلَى ثُلُثِ اللَّيْلِ وَلاَ يُحِبُّ النَّوْمَ قَبْلَهَا ، وَلاَ الْحَدِيثَ بَعْدَهَا ، وَيُصَلِّي الصُّبْحَ فَيَنْصَرِفُ الرَّجُلُ فَيَعْرِفُ جَلِيسَهُ ، وَكَانَ يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ أَوْ إِحْدَاهُمَا مَا بَيْنَ السِّتِّينَ إِلَى الْمِائَةِ: [٣٧٩]

سەییاری کوڕی سەلامە دەفەرموێ: لەخزمەت باوکم دا چووین بۆخزمەتی ئەبوبەرزەی ئەسلەمی (ڕەزای خوای لێ بێ) باوکم عەرزی کرد: پێغەمبەری خودا (دروودی خوادای لێ بێ) نوێژە فەرزەکانی چۆن دەکردو لەکەیا دەیکردن؟ فەرمووی: نوێژی قرچەی نیوەڕۆی ئەوکاتە دەکرد کەخۆر لەناوەڕاستی ئاسمان لادەدا، کەئێوە پێ ی دەڵێن:نوێژی یەکەم. کاتێ عەصریشی دەکرد خۆرهێشتا زیتو زیندوو بوو، واتە: بەگوڕو بەتین بوو، زەرد هەڵ نەگەڕابوو، جاری وادەبوو هەمان بوو لەپشت پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی عەصری بەکۆمەڵی دەکردو دەگەڕایەوە بۆماڵەوەی کەلەوپەڕی مەدینەوە بوو، وەلحاڵ هێشتا خۆر زیتو بەگووڕ بوو، سەییار فەرمووی: لەیادم نەماوە کەئەبوبەرزە سەبارەت بەکاتی نوێژی شێوان چی فەرموو، دەستووری حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) وابوو: لەپێش کردنی نوێژی

---

[٣٧٩] تجريد/١، ژمارە: ٣٢٠، بخاري: ٥٤٧، مسلم: ١٤٦٠، ١٤٦٢.

خەوتناندا حەزی لەنووستن نەبوو، لەپاش کردنی نوێژی خەوتنانیش حەزی لەگوفتوگۆ نەبوو، کاتێکیش لەنوێژی سبەینێ دەبۆوە پیاو هاونشینی خۆی دەناسییەوە، حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) دەوری شەست ئایەت تاسەد ئایەتی لەنوێژی بەیانیدا دەخوێند). (رياض الصالحين/٤/١٣٦٦/١).

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

ئەبوبەرزە لەموسوڵمانە پێشینەکانە، ئامادەی ئازادکردنی شاری مەککە بووە، لەوەدوایش هەتا حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) وەفات دەکا هەر لەخزمەتیدا غەزا دەکا، لەشەستو چواری کۆچیدا لەمەرو، یالەبەصرە، یالەبیابانی سەجستان دەمرێ، چوار فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە.

**(٤٢) باب: فضل صلاة الجماعة وبيان التشديد في التخلف عنها**

**خێرو گەورەیی نوێژی بەکۆمەڵو هەڕەشە کردنی سەخت لە نەکردنی!**

٣٨٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (تَفْضلُ صَلَاةُ الْجَمِيعِ صَلَاةَ أَحَدِكُمْ وَحْدَهُ بِخَمْسٍ وَعِشْرِينَ جُزْءًا وَتَجْتَمِعُ مَلَائِكَةُ اللَّيْلِ وَمَلَائِكَةُ النَّهَارِ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ فَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ (إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا. (الحديث ٦٤٨).[٣٨٠]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (نوێژ بەکۆمەڵی لەگەڵ کۆمەڵدا بیستو پێنج جار خێرترە لەنوێژی کەسێ کەبەتەنها خۆی بێ، ئەو فریشتانەی کەلەشەودا پاسەوانی ئادەمیزادن لەگەڵ ئەو فریشتانەدا کەلەڕۆژدا نیگابانی ئەون لەکاتی

(٣٨٠) تجريد/١، ژمارە: ٣٦٩، بخاری: ٦٤٨، مسلم: ٦٤٩ - ١٤٧١.

نوێـژی بـەیانیان دا یـەك دەگـرن). پاشـتر ئـەبوهورەیرە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) دەیفەرموو: ئەگەر حەزیش دەکەن ئەم قسەوباسەتان لەقورئانا پێ نیشان بدەم، فەرموون ئەم ئایەتە بخوێنن: (وقرآن الفجر إن قرآن الفجر كان مشهوداً) ئیسراء ـ ٧٨/١٧ ـ واتـە: وەنوێـژی کـاتی دەرکـەوتنی سـبەینێش بـەجێ بهێنـە، چـونکە بەڕاستی نوێژی بەیانی فریشتە پۆل پۆل دێنە دیاری!) (ب/١٣/٢٧٢/٦ تاج-٤ ز-١٨ ز-٣٩٦٣ ج-٤ = ب/ت).

ئەمـەیش ژمـارە: (٣٢٢)ی پوختـەی موسـلیمە کـە مەبەسـتەکە دووپـات دەکاتەوە:

عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِـي اللهُ عَنْـهُ) أَنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) قَـالَ: «صَـــلاَةُ الْجَمَاعَـــةِ أَفْـــضَلُ مِـــنْ صَـــلاَةِ أَحَـــدِكُمْ وَحْـــدَهُ بِخَمْـــسَةٍ وَعِـــشْرِينَ جُزْءًا».{الحديث/١٤٧٠=١٤٣٧ف م} :

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (نوێـژی جەماعـەت بـە بیـستو حـەوت پلـە گەورەترو خێرترە، لە نوێژی کەسێکتان کە هەر بە تـەنها خـۆی بـێ!). {تـاج/١، ژمارە: ٧٤٤} .

٣٨١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - قَالَ « صَلاَةُ الْجَمَاعَةِ تَفْضُلُ صَلاَةَ الْفَذِّ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً».[٣٨١]

واتاکەی لەژمارە (٣٨٠)دا رابورد.

٣٨٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَالَ: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِحَطبٍ فَيُحْطَبَ ثمَّ آمُرَ بِالـصَّلَاةِ فَيُـؤَذنَ لَهَا ثمَّ آمُرَ رَجُلًا فَيَؤُمَّ النَّاسَ ثمَّ أُخَالِفَ إِلَى رِجَالٍ فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ وَالَّذِي نَفْـسِي

---

[٣٨١] بخاری: ٦٤٥، مسلم: ١٤٧٥، شیحا.

بِيَدِهِ لَوْ يَعْلَمُ أَحَدُهُمْ أَنَّهُ يَجِدُ عَرْقًا سَمِينًا أَوْ مِرْمَاتَيْنِ حَسَنَتَيْنِ لَشَهِدَ الْعِشَاءَ». (الحديث ٦٤٤ ـ أطرافه في: ٦٧٥، ٢٤٢٠، ٧٢٢٤).[٣٨٢]

ئـەبوهورەيره (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سـەرنجی دا کـەوا چـەن کەسـێ لەچـەن نوێـژێکا بۆماوەیەکە دیارنین. جا حەزرەت (دروودی خوای لـێ بێ) بەتووڕەیی فـەرمووی: (بەوکەسـە کەگیانی منی بەدەستە، نیازم هەبوو کەگاڵ بـدەم گزرەدارێکـی زۆر کۆبکرێتـەوە کاتێکیش بانگ بوو، بەپیاوێ بڵێم کـەبانگ بـدا بـۆ نوێـژ ئـەوجا بـەپیاوێ بڵێم کەلەجیاتی خۆم بەرنوێژی یەکە بۆخەڵکەکـە بکـا، وەخۆشـم بـڕۆم بۆسـەر ئـەو پیاوانەکەلەنوێــژی جەماعــەت دوادەکــەون، وەفــەرمان بــدەم کەبەباوشــەدار ماڵـەکانیان بەسـەردا بـسوتێنن، سوێندم بەوکەسـەی کـەگیانی منـی والەدەسـتا: ئەوانە ئەگەر گرتکێکـی چـەوریان لەمزگـەوت گومـان ببردایـە دەهـاتن بۆنوێـژی خەوتنان بۆ مزگەوت هەتا بەبیانووی نوێژەکـەوە گرتکەکـەبخۆن، هـەروا ئەگـەر دوو سەنجووقیان لەمزگەوت شك ببردایـە، کەسـەنجوقێنیان پـێ دەکـرێ، دەهـاتن بۆ نوێـژکردن بـۆ مزگـەوت، بـەوبیانووەوە). (ت/١/٣٧٥/١ ز-١٢٣ ژ-٧٤٩ = ش/د/ت/ن).

٣٨٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ أَثْقَلَ صَلاَةٍ عَلَى الْمُنَافِقِينَ صَلاَةُ الْعِشَاءِ وَصَلاَةُ الْفَجْرِ وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَا لأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا، وَلَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِالصَّلاَةِ فَتُقَامَ، ثُمَّ آمُرَ رَجُلاً فَيُصَلِّيَ بِالنَّاسِ، ثُمَّ أَنْطَلِقَ مَعِي بِرِجَالٍ مَعَهُمْ حُزَمٌ مِنْ حَطَبٍ إِلَى قَوْمٍ لاَ يَشْهَدُونَ الصَّلاَةَ فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ بِالنَّارِ». {الحديث/١٤٨٠ = ١٤٤٧ ف.م} زَادَ فِي رِوايَةٍ: « وَلَوْ

[٣٨٢] تجرید/١، ژمارە: ٣٦٧، بخاری: ٦٤٤، مسلم: ٦٥١ = ١٤٧٥، ١٤٧٩.

